# سُنَنُ ابنِ مَاجَه

## بە کوردی

لِلإمَامِ أبي عَبدِاللهِ مُحَمَّدِ بنِ يَزِيدِ ابنِ مَاجَه القَزوِينيُّ



بەرگی دووەم



وەرگێڕانی

محمّد أحمد گردە شێخاڵی

حوکمی فەرموودەکان وەرگیراوە لە

الشيخ محمد صبحي بن حسن حلاق

پرۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرمووده



رێکخراوی پیت

بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی

# سُنَن ابن مَاجَه

## بەکوردی


**نووسینی: الإمام أبي عبد الله محمد بن يزيد ابن ماجه القزويني**

**وەرگێڕانـــی : محمد أحمد گردەشێخاڵی**

**دیزاینی ناوەوە : ستافی پیت**

**خـەتی بـەرگ : ستافی پیت**

**چـاپـی یەکـەم : ١٤٤٤ك - ٢٠٢٢ز**

**٦٣٠ لاپـــــەڕە**

**٢٤ × ١٧ ســـــم**

**بابـەت : ئـایینی**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ١١٥ )ـی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە

















# سُنَنُ ابنِ مَاجَه

## بەکوردی




نووسینی

الإمام أبي عبد الله محمد بن يزيد ابن ماجه القزويني

(209 هـ - 273هـ)

وەرگێڕان

محمد أحمد گردەشێخاڵی





## بابەت: سەردانکردنی نەخۆش

**١٤٣٣- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِلْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتَّةٌ بِالْمَعْرُوفِ: يُسَلِّمُ عَلَيْهِ إِذَا لَقِيَهُ، وَيُجِيبُهُ إِذَا دَعَاهُ، وَيُشَمِّتُهُ إِذَا عَطَسَ، وَيَعُودُهُ إِذَا مَرِضَ، وَيَتْبَعُ جِنَازَتَهُ إِذَا مَاتَ، وَيُحِبُّ لَهُ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ»[١].**

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان شەش مافی مسوڵمانی لەسەرە، کە بە چاکی ئەنجامیان بدات: ئەگەر پێی گەیشت سەلامی لێ بکات، هەرکات بانگهێشتی کرد بۆ میوانداری بە دەمیەوە بچێ، وە وەڵامی پژمینەکەی دەداتەوە (کاتێ دەپژمێ دەڵێ: «الحمد لله»، هەقە لەسەر مسوڵمان لە وەڵامدا بڵێ: «يرحمك الله»)، وە کاتێ نەخۆش دەکەوێ سەردانی دەکات، وە شوێن تەرمەکەی دەکەوێ کاتێ کە مرد، وە هەر شتێک بۆ خۆی پێی خۆشبێ، بۆ ئەویش پێی خۆش دەبێ.

**١٤٣٤- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لِلْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ أَرْبَعُ خِلَالٍ: يُشَمِّتُهُ إِذَا عَطَسَ، وَيُجِيبُهُ إِذَا دَعَاهُ، وَيَشْهَدُهُ إِذَا مَاتَ، وَيَعُودُهُ إِذَا مَرِضَ»[٢].**

واتە: ئەبو مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان چوار مافی هەیە بەسەر مسوڵمان: کاتێک پژمی نزای بۆ بکات، بە دەم میوانداریەکەیەوە بچێ، وە کاتێ دەمرێ ئامادەبێ (بۆ کفن و ناشتنی)، وە کاتێ نەخۆش دەکەوێ سەردانی دەکات.

**١٤٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَمْسٌ مِنْ حَقِّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ: رَدُّ التَّحِيَّةِ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ، وَشُهُودُ الْجِنَازَةِ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ إِذَا حَمِدَ اللَّهَ»[٣].**

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢٧٣٦.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٤٠، ومسلم: ٢١٦٢، وأبو داود: ٥٠٣٠، والترمذي: ٢٧٣٧، والنسائي: ١٩٣٨.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج شت هەیە کە مافی مسوڵمانە لەسەر مسوڵمان: وەڵامدانەوەی سڵاوو، بە دەمەوە چوونی میوانداریەکەی و، ئامادەبوون لەسەر جەنازەکەی و، سەردانی نەخۆش و، وەڵامدانەوەی پژمینەکەی ئەگەر گوتی: «الحمد لله».

**١٤٣٦-** عَنْ مُحَمَّدَ بْنَ الْمُنْكَدِرِ، يَقُولُ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «عَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَاشِيًا وَأَبُو بَكْرٍ، وَأَنَا فِي بَنِي سَلَمَةَ»[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی مونکەدیر، دەڵێ: گوێم لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ، بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیادە سەردانی کردم، وە هەروەها ئەبو بەکریش، منیش لە ناو هۆزی بەنو سەلەمە بووم.

**١٤٣٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يَعُودُ مَرِيضًا إِلَّا بَعْدَ ثَلَاثٍ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشی نەدەکرد تاکو سێ ڕۆژ تێدەپەڕی.

**١٤٣٨-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَخَلْتُمْ عَلَى الْمَرِيضِ، فَنَفِّسُوا لَهُ فِي الْأَجَلِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لَا يَرُدُّ شَيْئًا، وَهُوَ يُطَيِّبُ بِنَفْسِ الْمَرِيضِ»[3].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر چوونە لای نەخۆش لە کاتی مردن دووری بخەنەوە (بەوەی کە دڵخۆشی بکەن و دڵی بدەنەوە و دوعای بۆ بکەن) بێگومان ئەوەش هیچ شتێ ڕەت ناکاتەوە، بەڵام نەخۆش دڵی پێخۆش دەبێ و ئاسودە دەبێ.

**١٤٣٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، عَادَ رَجُلًا، فَقَالَ: «مَا تَشْتَهِي؟» قَالَ: أَشْتَهِي خُبْزَ بُرٍّ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ كَانَ عِنْدَهُ خُبْزُ بُرٍّ، فَلْيَبْعَثْ إِلَى أَخِيهِ» ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا اشْتَهَى مَرِيضُ أَحَدِكُمْ شَيْئًا، فَلْيُطْعِمْهُ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٧٧، ومسلم: ١٦١٦، وأبو داود: ٢٨٨٦، والترمذي: ٢٠٩٦، والنسائي: ١٣٨.

(٢) موضوع.

(٣) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٢٠٨٧.

(٤) ضعيف.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ سەردانی پیاوێکی (نەخۆشی) کرد، ئنجا فەرمووی: حەزت لە چییە؟ گوتی: حەزم لە نانی گەنمە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس نانی گەنمی هەیە با بۆ براکەی بنێرێ، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکات نەخۆشەکەتان حەزی بۆ شتێک چوو بیدەنێ بیخوات.

١٤٤٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى مَرِيضٍ يَعُودُهُ، فَقَالَ: «أَتَشْتَهِي شَيْئًا؟ أَتَشْتَهِي كَعْكًا؟» قَالَ: نَعَمْ، فَطَلَبُوا لَهُ[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای نەخۆشێک و سەردانی کرد، فەرمووی: ئایا حەزت بۆ هیچ شتێک دەچێ؟ ئایا حەزت لە کەعکە (جۆرە نانێکی فارسییە)؟ گوتی: بەڵێ، ئنجا بۆیان داوا کرد.

١٤٤١- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا دَخَلْتَ عَلَى مَرِيضٍ، فَمُرْهُ أَنْ يَدْعُوَ لَكَ؛ فَإِنَّ دُعَاءَهُ كَدُعَاءِ الْمَلَائِكَةِ»[٢].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ئەگەر چوویتە لای نەخۆش پێی بڵێ با دوعات بۆ بکات، چونکە بێگومان دوعا و نزای نەخۆش وەکو دوعای فریشتەکان وایە.

## بابەت: پاداشتی سەردان کردنی نەخۆش

١٤٤٢- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَتَى أَخَاهُ الْمُسْلِمَ، عَائِدًا، مَشَى فِي خَرَافَةِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَجْلِسَ، فَإِذَا جَلَسَ غَمَرَتْهُ الرَّحْمَةُ، فَإِنْ كَانَ غُدْوَةً، صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ كَانَ مَسَاءً، صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ»[٣].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک بێتە لای برای مسوڵمانی بۆ سەردان کردنی، تا ئەو کاتەی کە دادەنیشێ میوەکانی بەهەشت دەچنێتەوە، جا کاتێک کە دانیشت، سۆز و میهرەبانی خوا دایدەپۆشێ، جا

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٠٩٨، والترمذي: ٩٦٩.



ئەگەر کاتەکە بەیانی بوو تاکو ئێوارە حەفتا هەزار فریشتە نزای بۆ دەکەن، ئەگەر ئێوارەش بوو، حەفتا هەزار فریشتە تاکو بەیانی دەبێتەوە نزای بۆ دەکەن.

**١٤٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ عَادَ مَرِيضًا، نَادَى مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: طِبْتَ، وَطَابَ مَمْشَاكَ، وَتَبَوَّأْتَ مِنَ الْجَنَّةِ مَنْزِلًا»[١].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس سەردانی نەخۆش بکات، جارچییەک بانگ دەکات لە ئاسمانەوە (دەڵێ): زۆر باشت کرد وە ڕۆیشتنەکەشت زۆر باش بوو، وە ماڵێکت بۆ خۆت ئامادەکرد لە بەهەشتدا.

## بابەت: تەڵقینی مردوو بە وتەی: (لا إله إلا الله)

**١٤٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»[٢].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مردووەکانتان (ئەوانەی لە سەرەمەرگدان) تەڵقین بدەن بە: «لا إله إلا الله».

**١٤٤٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»[٣].**

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مردووەکانتان تەڵقین بدەن بە: «لا إله إلا الله».

**١٤٤٦- عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ لِلْأَحْيَاءِ؟ قَالَ: «أَجْوَدُ، وَأَجْوَدُ»[٤].**

واتە: ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مردووەکانتان تەڵقین بدەن بە: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ»،

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٠٠٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩١٧.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩١٦، وأبو داود: ٣١١٧، والترمذي: ٩٧٦، والنسائي: ١٨٢٦.

(٤) ضعيف.

واتە: هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا نەبێ کە خاوەنی هێدیی و مەندو بەخشندەییە، پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگاری عەرشی مەزن، سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانییان، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی (ئەم تەڵقینە) بۆ زیندووەکان چۆنە؟ فەرمووی: باشترینە و باشترین.

## بابەت: ئەوەی کە لەلای نەخۆش دەبێ بگوترێ کاتی گیان کێشانی

**١٤٤٧-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا حَضَرْتُمُ الْمَرِيضَ أَوِ الْمَيِّتَ، فَقُولُوا خَيْرًا، فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ» فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا سَلَمَةَ قَدْ مَاتَ، قَالَ: «قُولِي: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلَهُ، وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً» قَالَتْ: فَفَعَلْتُ: فَأَعْقَبَنِي اللَّهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ، مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[١].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لای نەخۆش یان لای کەسێک بوون کە لە سەرەمەرگدا بوو، قسەی چاکە بکەن، بێگومان فریشتەکان بۆ ئەوەی کە ئێوە دەیڵێن ئامین دەکەن (واتە: داوای قبوڵ بوونی دەکەن لە خوای پەروەردگار)، جا کاتێ ئەبو سەلەمە ﵁ مرد هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا ئەبو سەلەمە ﵁ مرد! فەرمووی: بڵێ: خودایە لە منیش و ئەویش خۆشبە، وە لە دوای ئەو باشە و چاکە بکە بە بەشم، گوتی: منیش وامکرد، ئنجا خوا باشتری لە ئەوە کردە بەشم، کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوا بوو (دوای ئەبو سەلەمە ﵁ بوو بە خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ).

**١٤٤٨-** عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَءُوهَا عِنْدَ مَوْتَاكُمْ، يَعْنِي يس»[٢].

واتە: مەعقیلی کوڕی یەسار ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەسەر ئەوانەی کە لە سەرەمەرگدان بیخوێنن، مەبەستی سووڕەتی «یس» بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩١٩، وأبو داود: ٣١١٥، والترمذي: ٩٧٧، والنسائي: ١٨٢٥.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣١٢١.




١٤٤٩- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: لَمَّا حَضَرَتْ كَعْبًا الْوَفَاةُ أَتَتْهُ أُمُّ بِشْرٍ بِنْتُ الْبَرَاءِ بْنِ مَعْرُورٍ، فَقَالَتْ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنْ لَقِيتَ فُلَانًا، فَاقْرَأْ عَلَيْهِ مِنِّي السَّلَامَ، قَالَ: غَفَرَ اللَّهُ لَكِ يَا أُمَّ بِشْرٍ نَحْنُ أَشْغَلُ مِنْ ذَلِكَ، قَالَتْ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَمَا سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَرْوَاحَ الْمُؤْمِنِينَ فِي طَيْرٍ خُضْرٍ، تَعْلُقُ بِشَجَرِ الْجَنَّةِ» قَالَ: بَلَى، قَالَتْ: فَهُوَ ذَاكَ[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیک ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کاتێک کەعب لە گیان کێشاندا بوو، ئوممو بیشری کچی بەڕائی کوڕی مەعڕور هاتە لای و گوتی: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان ئەگەر بە فڵان کەس گەیشتی (دوای مردن) سەلامی منی پێبگەیەنە، ئەویش گوتی: خوا لێت خۆشبێ دایکی بیشر ئێمە زۆر لەوە سەرقاڵترین (کە بتوانین بەو شتانە ڕابگەین)، (دایکی بیشر) گوتی: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەتبیستووە کە دەیفەرموو: بێگومان ڕووحی ئیمانداران لەناو سینەی باڵندەیەکی سەوزدا هەڵواسراون بە درەختێکی بەهەشتەوە (وەک هێلانەیەک)؟ گوتی: بەڵێ (بیستوومە)، گوتی: جا ئەمە ئەوەیە.

١٤٥٠- عَنْ مُحَمَّدُ بْنُ الْمُنْكَدِرِ، قَالَ: «دَخَلْتُ عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ وَهُوَ يَمُوتُ، فَقُلْتُ: اقْرَأْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ السَّلَامَ»[2].

واتە: موحەممەدی کوڕی مونکەدیر، دەڵێ: لە کاتی مردنی جابیری کوڕی عەبدوڵڵادا چووم بۆ لای، ئنجا پێم گوت: سەلام بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگەیەنە.

## بابەت: ئەوەی کە بڕوادار لەسەر ناڕەحەتی ڕوح کێشان پاداشت وەردەگرێ

١٤٥١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا حَمِيمٌ لَهَا يَخْنُقُهُ الْمَوْتُ، فَلَمَّا رَأَى النَّبِيُّ ﷺ مَا بِهَا قَالَ لَهَا «لَا تَبْتَئِسِي عَلَى حَمِيمِكِ، فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ حَسَنَاتِهِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ چۆتە ماڵەکەی لەوکاتەدا یەکێک لە نزیکەکانی خۆی لەلای بوو کە لە ئازاری گیان کێشان دابوو، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ حاڵەکەی بینی پێی فەرموو: دڵت نارەحەت نەبێت بە حاڵی کەسە نزیکەکەت، بێگومان ئەو حاڵە لە چاکەکانی ئەژمار دەکرێ.

**١٤٥٢-** عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ ﵁، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْمُؤْمِنُ يَمُوتُ بِعَرَقِ الْجَبِينِ»[1].

واتە: ئیبنو بورەیدە ﵁ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار کاتێ دەمرێ ناوچاوانی عەرەق دەکات (لە توندی ئازاری مردن یان بەهۆی پاک بوونەوەی لە تاوان بەهۆی ئازاری مردنەوە).

**١٤٥٣-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: مَتَى تَنْقَطِعُ مَعْرِفَةُ الْعَبْدِ مِنَ النَّاسِ، قَالَ: «إِذَا عَايَنَ»[2].

واتە: ئەبو موسا ﵁ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: (کاتی گیان کێشان) کەی بەندە وای لێدێ کە خەڵکی نەناسێتەوە؟ فەرمووی: ئەو کاتەی کە (فریشتەی گیان کێشان) دەبینێ.

## بابەت: چاو داخستنی مردوو

**١٤٥٤-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى أَبِي سَلَمَةَ وَقَدْ شَقَّ بَصَرُهُ فَأَغْمَضَهُ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ»[3].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای ئەبو سەلەمە (کاتی مردنەکەی) ئەویش چاوەکانی کراوە بوون، (پێغەمبەر ﷺ) چاوەکانی بۆ داخست، پاشان فەرمووی: کاتێ کە ڕووح دەردەچێ چاوەکان شوێنی دەکەون.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٨٢، والنسائي: ١٨٢٨.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٢٠، وأبو داود: ٣١١٨.

١٤٥٥- عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا حَضَرْتُمْ مَوْتَاكُمْ، فَأَغْمِضُوا الْبَصَرَ؛ فَإِنَّ الْبَصَرَ يَتْبَعُ الرُّوحَ، وَقُولُوا خَيْرًا؛ فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تُؤَمِّنُ عَلَى مَا قَالَ أَهْلُ الْبَيْتِ»[١].

واتە: شەددادی كوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ كە مردووەكانتان گیانیان دەكێشرێ چاوەكانیان داخەن، بێگومان چاو بە شوێن ڕووح دەكەوێ، وە قسەی باش و چاكی لەسەر بكەن، چونكە بەڕاستی فریشتەكان داوای گیرابوونی ئەو قسەیە دەكەن، كە خەڵكی دەوروبەری (مردووەكە) دەیڵێن.

## بابەت: ماچكردنی مردوو

١٤٥٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «قَبَّلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَهُوَ مَيِّتٌ، فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى دُمُوعِهِ تَسِيلُ عَلَى خَدَّيْهِ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عوسمانی كوڕی مەزعونی ماچكرد بە مردوویی، وەک ئێستا لەبەر چاومە، كە فرمێسک بەسەر ڕومەتەكانیدا دەهاتە خوارێ.

١٤٥٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ «أَبَا بَكْرٍ، قَبَّلَ النَّبِيَّ ﷺ، وَهُوَ مَيِّتٌ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس و عائیشە ﷺ دەگێڕنەوە: كە ئەبو بەكر ﷺ پێغەمبەری ﷺ ماچكرد ئەوكاتەی كە وەفاتی كردبوو.

## بابەت: شوشتنی مردوو

١٤٥٨- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﷺ، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَنَحْنُ نُغَسِّلُ ابْنَتَهُ أُمَّ كُلْثُومٍ فَقَالَ: «اغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا، أَوْ خَمْسًا، أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُورًا، أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي» فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حَقْوَهُ، وَقَالَ: «أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ»[٤].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣١٦٣، والترمذي: ٩٨٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٥٥ و ٤٤٥٦ و ٤٤٥٧، والنسائي: ١٨٤٠.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٥٣، ومسلم: ٩٣٩، وأبو داود: ٣١٤٢، والترمذي: ٩٩٠، والنسائي: ١٨٨١ و ١٨٨٦ و ١٨٨٧ و ١٨٨٩ و ١٨٩٠ و ١٨٩٣.

واتە: ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: ئەوکاتەی کە ئوممو کولسومی ﵂ کچی پێغەمبەرمان ﷺ دەشۆرد پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لامان و فەرمووی: سێ یان پێنج جار یان زیاتر بیشۆن، ئەگەر واتان پێباشبوو، بە ئاوی سیدر وە جاری کۆتایی بە کافور یان شتێک لە کافور (بیشۆرن)، جا ئەگەر لێبوونەوە پێم بڵێن، جا کاتێ لێبووینەوە هەواڵمان پێدا، ئەویش کراسەکەی خۆی بۆمان هەڵدا و فەرمووی: بۆی بیکەنە ژێر کراس (لەسەر گۆشت بیکەنە بەری).

**سدر:** جۆرە ڕووەکێکە گەڵاکەی وشک دەکرێ بۆ خاوێن کردنەوە، بە کوردی پێی دەڵێن: مۆرد.

**١٤٥٩- عَنْ حَفْصَةُ ﵂، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ، بِمِثْلِ حَدِيثِ مُحَمَّدٍ، وَكَانَ فِي حَدِيثِ حَفْصَةَ «اغْسِلْنَهَا وِتْرًا» وَكَانَ فِيهِ «اغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا، أَوْ خَمْسًا» وَكَانَ فِيهِ «ابْدَءُوا بِمَيَامِنِهَا، وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا» وَكَانَ فِيهِ: أَنَّ أُمَّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: «وَمَشَطْنَاهَا ثَلَاثَةَ قُرُونٍ»**[1].

واتە: حەفصە ﵂ لە ئوممو عەتییەوە ﵂ گێڕاویەتەوە بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی موحەممەدی کوڕی سیرین (فەرموودەی پێشتر)، هی حەفصە ﵂ ئەوەشی تێدایە: (کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:) بە تاک بیشۆرن (واتە: شۆردنەکەتان تاک بن سێ یان پێنج وە هەروەها)، وە ئەوەشی تێدایە: سێ جار یان پێنج جار بیشۆرن، وە ئەوەشی تێدایە: بەلای ڕاستی دەست بە شۆردنی بکەن و، بە ئەندامەکانی دەستنوێژ، وە ئەوەشی تێدایە: ئوممو عەتیە ﵂ گوتی: قژەکەیان بۆ شانەکرد و کردمان بە سێ کەزییە.

**١٤٦٠- عَنْ عَلِيٍّ ﵁، قَالَ: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تُبْرِزْ فَخِذَكَ، وَلَا تَنْظُرْ إِلَى فَخِذِ حَيٍّ، وَلَا مَيِّتٍ»**[2].

واتە: عەلی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێمی فەرموو: ڕانت دەرمەخە، وە تەماشای ڕانی زیندوو یان مردوو مەکە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٥٤ و ١٢٥٨، ومسلم: ٩٣٩، وأبو داود: ٣١٤٣ و ٣١٤٥ و ٣١٤٧، والترمذي: ٩٩٠، والنسائي: ١٨٨٧.

(٢) ضعيف جداً. أخرجه أبو داود: ٣١٤٠ و ٤٠١٥.

**١٤٦١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِيُغَسِّلْ مَوْتَاكُمُ الْمَأْمُونُونَ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با ئەوانە مردووەکانتان بشۆرن کە لێیان دڵنیان (لەوەی کە لە کاتی شۆردنی مردووەکەدا، هەر شتێک دەبینن لە مردووەکە، دەیپارێزن).

**١٤٦٢-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ غَسَّلَ مَيِّتًا، وَكَفَّنَهُ، وَحَنَّطَهُ، وَحَمَلَهُ، وَصَلَّى عَلَيْهِ، وَلَمْ يُفْشِ عَلَيْهِ مَا رَأَى، خَرَجَ مِنْ خَطِيئَتِهِ، مِثْلَ يَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ»[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک مردووێک بشۆرێ، کفنی بکات و بۆنی خۆشی لێبدات و هەڵیبگرێ و نوێژی لەسەر بکات و هەر شتێکی لە مردووەکە بینی ئاشکرای نەکات، لە گوناهەکانی پاک دەبێتەوە وەکو ئەو ڕۆژەی کە تێیدا لە دایک بووە.

**١٤٦٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ غَسَّلَ مَيِّتًا، فَلْيَغْتَسِلْ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک مردووی شۆرد با خۆی بشواتەوە.

## بابەت: شوشتنی ژن لەلایەن مێردەکەیەوە وە شوشتنی پیاو لەلایەن ژنەکەیەوە

**١٤٦٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «لَوْ كُنْتُ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ، مَا غَسَّلَ النَّبِيَّ ﷺ غَيْرُ نِسَائِهِ»[٤].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: ئەگەر پێشتر بمزانیبایە نەک دواتر (حوکمی شۆردنی پیاو لەلایەن ژنەکەیەوە)، ئەوە جگە لە هاوسەرەکانی کەسی دیکە پێغەمبەری ﷺ نەدەشۆرد، (واتە: هاوسەرەکانی دەیانشۆرد).

---

(١) موضوع.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٤٦٢ و ٣١٦١، والترمذي: ٩٩٣.

(٤) حسن. أخرجه أبو داود: ٣١٤١ مطولًا.




**١٤٦٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْبَقِيعِ، فَوَجَدَنِي وَأَنَا أَجِدُ صُدَاعًا فِي رَأْسِي، وَأَنَا أَقُولُ: وَا رَأْسَاهُ، فَقَالَ: «بَلْ أَنَا يَا عَائِشَةُ وَا رَأْسَاهُ» ثُمَّ قَالَ: «مَا ضَرَّكِ لَوْ مِتِّ قَبْلِي، فَقُمْتُ عَلَيْكِ، فَغَسَّلْتُكِ، وَكَفَّنْتُكِ، وَصَلَّيْتُ عَلَيْكِ، وَدَفَنْتُكِ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەقیع گەڕایەوە، بینی کە ژانە سەرم لێیە، وە منیش دەمگوت: ئای سەرم (بە هۆی زۆر ئازارەکەوە)، فەرمووی: بەڵکو من ئەی عائیشە ئای سەرم (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش بووەو زانیویەتی کە عائیشە چاک دەبێتەوە، بەڵام پێ دەچێ ئەو کاتە نزیک وەفاتی بووبێ، بۆیە نەخۆشیەکەی ئاشکرا کردوە)، پاشان فەرموی: هیچ ناڕەحەت و زیانی نابێ بۆت کە تۆ پێش من بمری، خۆم بە کار وبارەکانت هەڵبستم و بتشۆم و کفنت بکەم و نوێژت لەسەر بکەم و بتنێژم.

## بابەت: شوشتنی پێغەمبەر ﷺ

**١٤٦٦-** عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ ﵁، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: لَمَّا أَخَذُوا فِي غُسْلِ النَّبِيِّ ﷺ، نَادَاهُمْ مُنَادٍ مِنَ الدَّاخِلِ: «لَا تَنْزِعُوا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَمِيصَهُ»[٢].

واتە: ئیبنو بوڕەیدە ﵁ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کاتێک ویستیان دەست بکەن بە شۆردنی پێغەمبەر ﷺ یەکێک بانگی کرد لەو شوێنەی کە لەوکاتەدا تێیدابوون گوتی: کراسەکە لەبەر پێغەمبەری خوا ﷺ دامەنێن.

**١٤٦٧-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁، قَالَ: لَمَّا غَسَّلَ النَّبِيَّ ﷺ ذَهَبَ يَلْتَمِسُ مِنْهُ مَا يُلْتَمَسُ مِنَ الْمَيِّتِ، فَلَمْ يَجِدْهُ، فَقَالَ: «بِأَبِي الطَّيِّبُ، طِبْتَ حَيًّا، وَطِبْتَ مَيِّتًا»[٣].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﵁ دەڵێ: کاتێک کە پێغەمبەری ﷺ شۆرد، وای بۆ دەچوو کە وەک هەر کەسێکیتر ئەو شتانەی لێدەردەچێ (کە لەکاتی مردندا بە هۆی شلبوونەوە دەردەچێ)، بەڵام هیچ شتێکی لێنەدی، ئەویش گوتی: بە باوکەوە فیدات بم، ئەی ئەو کەسەی کە بە پاکی ژیای و بەپاکی مردی.

---

(١) حسن. أخرجه البخاري: ٥٦٦٦ بعضه.

(٢) منكر.

(٣) صحيح.

١٤٦٨- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَنَا مُتُّ فَاغْسِلُونِي بِسَبْعِ قِرَبٍ مِنْ بِئْرِي، بِئْرِ غَرْسٍ»(١).

واته: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک من مردم، بە حەوت دۆڵچە ئاو بمشۆرن لە ئاوی بیرەکەم بیری غەرس.

## بابەت: کفنی پێغەمبەر ﷺ

١٤٦٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «كُفِّنَ فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ بِيضٍ يَمَانِيَةٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلَا عِمَامَةٌ» فَقِيلَ لِعَائِشَةَ: إِنَّهُمْ كَانُوا يَزْعُمُونَ أَنَّهُ قَدْ كَانَ كُفِّنَ فِي حِبَرَةٍ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: قَدْ جَاءُوا بِبُرْدِ حِبَرَةٍ، فَلَمْ يُكَفِّنُوهُ(٢).

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ لە سێ پۆشاکی سپی یەمانیدا کفن کرا، کە کراس و مێزەری لەگەڵدا نەبوو. بە عائیشەیان گوت: وا گومان دەبەن کە لە پۆشاکی حیبەرەدا کفن کراوە، عائیشەش ﷺ گوتی: پۆشاکی حیبەرەیان هێنا بەڵام لە ئەودا کفنیان نەکرد.

**الحبر:** جۆرە قوماشێکی خەتخەتی یەمەنی بووە.

١٤٧٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «كُفِّنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ثَلَاثِ رِيَاطٍ بِيضٍ سُحُولِيَّةٍ»(٣).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کفن کرا لە سێ پارچە قوماشی نەرم و تەنکی سوحولیدا.

**سحولية:** گوندێکە لە یەمەن.

١٤٧١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كُفِّنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ: قَمِيصُهُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ، وَحُلَّةٌ نَجْرَانِيَّةٌ»(٤).

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٦٤، ومسلم: ٩٤١، وأبو داود: ٣١٥١، والترمذي: ٩٩٦، والنسائي: ١٨٩٧_١٨٩٩.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣١٥٣.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سێ پۆشاکدا کفن کرا: ئەو کراسەی کە تێیدا گیانی کێشرا، دوو پۆشاکی نەجرانی.

## بابەت: ئەو شتانەی کە بۆ کفن کردن سوننەتن

١٤٧٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضُ، فَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ، وَالْبَسُوهَا»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترینی پۆشاکەکانتان پۆشاکی سپییە، مردووەکانتانی تێدا کفن بکەن وە لەبەری بکەن.

١٤٧٣- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ الْكَفَنِ الْحُلَّةُ»[٢].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین کفن جۆرە پۆشاکی حوللەیە (پۆشاکێکی یەمەنییە لە دوو پارچە پێکدێ).

١٤٧٤- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وَلِيَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ، فَلْيُحْسِنْ كَفَنَهُ»[٣].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان کار وباری کفن کردنی برایەکی کەوتە ئەستۆ، با بە جوانی کفنی بکات (پۆشاکەکان خاوێن و بۆن خۆش و تەواو بن).

## بابەت: تەماشاکردنی مردوو کاتێ دەخرێتە ناو کفن

١٤٧٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا قُبِضَ إِبْرَاهِيمُ ابْنُ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تُدْرِجُوهُ فِي أَكْفَانِهِ حَتَّى أَنْظُرَ إِلَيْهِ، فَأَتَاهُ، فَانْكَبَّ عَلَيْهِ، وَبَكَى[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٨٧٨ و ٤٠٦١، والترمذي: ٩٩٤.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣١٥٦.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٩٩٥.

(٤) ضعيف.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کاتێک ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، پێغەمبەر ﷺ پێیانی فەرموو: مەیخەنە ناو کفنەوە تاکو تەماشای دەکەم، ئنجا هات و خۆی دا بەسەریدا و گریا.

### بابەت: قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوەی هەواڵی مردوو

١٤٧٦- عَنْ بِلَالِ بْنِ يَحْيَى، قَالَ: كَانَ حُذَيْفَةُ ﷺ إِذَا مَاتَ لَهُ الْمَيِّتُ، قَالَ: لَا تُؤْذِنُوا بِهِ أَحَدًا، إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ نَعْيًا، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِأُذُنَيَّ هَاتَيْنِ، «يَنْهَى عَنِ النَّعْيِ»[١].

واتە: بیلالی کوڕی یەحیا، دەڵێ: کاتێ حوزەیفە ﷺ کەسێکی لێ دەمرد دەیگوت: هەواڵەکە بە کەس مەدەن لە ڕاستییدا دەترسم (ئەو هەواڵدانە) ببێتە ئەو شتەی کە نەهی لێکراوە، وە بەڕاستی من بەو دوو گوێیەی خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە نەهی دەکرد لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی مردوو.

### بابەت: ئامادە بوون لەسەر جەنازە

١٤٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَسْرِعُوا بِالْجِنَازَةِ، فَإِنْ تَكُنْ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إِلَيْهِ، وَإِنْ تَكُنْ غَيْرَ ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەلە بکەن لە شاردنەوەی جەنازە، خۆ ئەگەر چاکەکار بێ، بۆ شوێنێکی باشتری دەبەن، ئەگەر واش نەبێ، ئەوە شەڕ و ناڕەحەتیەکە لەسەر خۆتان لادەبەن.

١٤٧٨- عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ ﷺ: «مَنِ اتَّبَعَ جِنَازَةً فَلْيَحْمِلْ بِجَوَانِبِ السَّرِيرِ كُلِّهَا؛ فَإِنَّهُ مِنَ السُّنَّةِ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ فَلْيَتَطَوَّعْ، وَإِنْ شَاءَ فَلْيَدَعْ»[٣].

واتە: ئەبو عوبەیدە، دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ گوتی: هەر کەسێک شوێنی تەرمێک کەوت، با ئەو دارەبازە کە تەرمەکەی لەسەرە لە هەموو لایەکانییەوە

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٩٨٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣١٥، ومسلم: ٩٤٤، وأبو داود: ٣١٨١، والترمذي: ١٠١٥، والنسائي: ١٩١٠ و ١٩١١.

(٣) ضعيف.

هەڵبگرێ، چونکە بەڕاستی ئەوە سوننەتە، پاشان ئەگەر ویستی با هەر بەردەوام بێ لە هەڵگرتنی، وە ئەگەر ویستی با وازبێنێ.

**١٤٧٩- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى جِنَازَةً يُسْرِعُونَ بِهَا، فَقَالَ: «لِتَكُنْ عَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ»[١].**

**واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری ﷺ بینی جەنازەیەک زۆر بە پەلە دەبەن، بۆیە فەرمووی: پێویستە هێمن و لەسەرخۆ بن (واتە: نابێ زێدەڕۆیی بکرێ لە پەلەپەل کردنەکەدا).**

**١٤٨٠- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نَاسًا رُكْبَانًا عَلَى دَوَابِّهِمْ فِي جِنَازَةٍ، فَقَالَ: «أَلَا تَسْتَحْيُونَ أَنَّ مَلَائِكَةَ اللَّهِ يَمْشُونَ عَلَى أَقْدَامِهِمْ، وَأَنْتُمْ رُكْبَانٌ؟»[٢].**

**واتە: سەوبانی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بینی کە خەڵکێک بە سواری وڵاخەکانیان لەگەڵ جەنازەدا دەڕۆن، ئەویش فەرمووی: ئایا شەرم ناتانگرێ فریشتەکانی خوا بە پیادە دەڕۆن و ئێوەش بە سواری؟!**

**١٤٨١- عَنْ زِيَادِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ حَيَّةَ، سَمِعَ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ ﷺ، يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الرَّاكِبُ خَلْفَ الْجِنَازَةِ وَالْمَاشِي مِنْهَا حَيْثُ شَاءَ»[٣].**

**واتە: زیادی کوڕی جوبەیری کوڕی حەییە دەگێڕێتەوە، گوێی لە موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ بووە کە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەوەی کە سوارە با لە دوای جەنازە بڕوات، ئەوەیشی پیادەیە هەر چۆنێک دەیەوێ.**

## بابەت: ڕۆیشتن لەپێش جەنازەوە

**١٤٨٢- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ، وَعُمَرَ يَمْشُونَ أَمَامَ الْجِنَازَةِ»[٤].**

---

(١) منكر.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ١٠١٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١٨٠، والترمذي: ١٠٣١، والنسائي: ١٩٤٢ و ١٩٤٣ و ١٩٤٨.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١٧٩، والترمذي: ١٠٠٧، والنسائي: ١٩٤٤_١٩٤٥.

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﵄ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەرم بینیوە کە لە پێش جەنازە دەڕۆیشتن.

**١٤٨٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ يَمْشُونَ أَمَامَ الْجِنَازَةِ»[(١)].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان لە پێش جەنازە دەڕۆیشتن.

**١٤٨٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «الْجِنَازَةُ مَتْبُوعَةٌ وَلَيْسَتْ بِتَابِعَةٍ، لَيْسَ مَعَهَا مَنْ تَقَدَّمَهَا»[(٢)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جەنازە دەبێ بە دوایدا بڕۆی نەک لە دواتەوە بێ، هەر کەسێک پێشی بکەوێ ئەوە لەگەڵ جەنازەکەدا نیە.

## بابەت: قەدەغەکردنی جل لەخۆ داڕنین لە کاتی بردنی جەنازەدا (یاخود لەبەرکردنی پۆشاکی ماتەم و لابردنی پۆشاکی ئاسایی)

**١٤٨٥-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ، وَأَبِي بَرْزَةَ ﵄، قَالَا: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي جِنَازَةٍ، فَرَأَى قَوْمًا قَدْ طَرَحُوا، أَرْدِيَتَهُمْ يَمْشُونَ فِي قُمُصٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبِفِعْلِ الْجَاهِلِيَّةِ تَأْخُذُونَ؟ أَوْ بِصُنْعِ الْجَاهِلِيَّةِ تَشَبَّهُونَ؟ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَدْعُوَ عَلَيْكُمْ دَعْوَةً تَرْجِعُونَ فِي غَيْرِ صُوَرِكُمْ» قَالَ: فَأَخَذُوا أَرْدِيَتَهُمْ، وَلَمْ يَعُودُوا لِذَلِكَ[(٣)].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین و ئەبو بەرزە ﵄، گوتوویانە: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لەگەڵ جەنازەیەک، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) بینی خەڵکێک جلی سەرەوەیان داکەندبوو بە کراسەوە دەڕۆیشتن (شێوازی پۆشاکیان گۆڕی بوو وەکو

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٠١٠.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣١٨٤، والترمذي: ١٠١١.

(٣) موضوع.





دڵتەنگییەک بۆ مردووەکە)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا وەک کردەوەی سەردەمی جاهیلی و نەزانی دەکەن؟ یان خۆتان بە کردەوەی سەردەمی جاهیلی دەچوێنن؟ خەریک بوو نزایەکتان لێبکەم کە شێوازتان بگۆڕێ، گوتی: ئنجا عەباکانیان لەبەر کردەوە و جارێکی دیکە ئەو کارەیان نەکرد.

## بابەت: ئەوەی کە ئەگەر جەنازە ئامادەبوو دوانەخرێ وە بە ئاگرەوە شوێنی نەکەوی

١٤٨٦- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: « لَا تُؤَخِّرُوا الْجِنَازَةَ إِذَا حَضَتْ»[١].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک جەنازە ئامادە کرا دوای مەخەن.

١٤٨٧- عَنْ أَبَا بُرْدَةَ ﷺ حَدَّثَهُ قَالَ: أَوْصَى أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ ﷺ حِينَ حَضَرَهُ الْمَوْتُ، فَقَالَ: «لَا تُتْبِعُونِي بِمِجْمَرٍ، قَالُوا لَهُ: أَوَسَمِعْتَ فِيهِ شَيْئًا؟ قَالَ: نَعَمْ، مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: ئەبو بوردە ﷺ دەڵێ: ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ کاتێک کە لە گیان کێشان دابوو وەسیەتی کرد، ئنجا گوتی: بە بوخوردانەوە شوێن (جەنازەکەم) مەکەون، پێیان گوت: ئایا شتێکت دەربارەی بیستووە؟ گوتی: بەڵێ، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ.

## بابەت: ئەو کەسەی کۆمەڵێک لە مسوڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن

١٤٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى عَلَيْهِ مِائَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ غُفِرَ لَهُ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سەد مسوڵمان نوێژی لەسەر بکەن، لە گوناهەکانی دەبوردرێ.

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٧١ و ١٠٧٥.

(٢) حسن.

(٣) صحيح.

**١٤٨٩-** عَنْ كُرَيْبٍ ﷺ، مَوْلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: هَلَكَ ابْنٌ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، فَقَالَ لِي يَا كُرَيْبُ قُمْ فَانْظُرْ هَلِ اجْتَمَعَ لِابْنِي أَحَدٌ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: وَيْحَكَ كَمْ تَرَاهُمْ؟ أَرْبَعِينَ؟ قُلْتُ: لَا، بَلْ هُمْ أَكْثَرُ، قَالَ: فَاخْرُجُوا بِابْنِي، فَأَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ أَرْبَعِينَ مِنْ مُؤْمِنٍ يَشْفَعُونَ لِمُؤْمِنٍ، إِلَّا شَفَّعَهُمُ اللَّهُ»[١].

واتە: کوڕەیبی ﷺ خزمەتکاری عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: کوڕێکی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس مرد، ئنجا پێی گوتم: ئەی کوڕەیب هەستە تەماشا بکە بزانە کەس بۆ کوڕەکەم کۆبۆتەوە (بۆ نوێژ لەسەر کردن)، منیش گوتم: بەڵێ، ئەویش گوتی: هاوار بۆ تۆ چەند دەبن؟ چل (کەس دەبن)؟ گوتم: نەخێر بەڵکو زیاترن، گوتی: کەواتە کوڕەکەم بێننە دەرێ (بۆ نوێژ لەسەر کردن) گەواهی دەدەم کە بەڕاستی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە دەیفەرموو: هیچ بڕوادارێک نیە کە چل کەس لە بڕواداران تکای بۆ بکەن ئیللا خوا تکاکەیان وەردەگرێ.

**١٤٩٠-** عَنْ مَالِكِ بْنِ هُبَيْرَةَ الشَّامِيِّ ﷺ، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، قَالَ: كَانَ إِذَا أُتِيَ بِجِنَازَةٍ، فَتَقَالَّ مَنْ تَبِعَهَا، جَزَّأَهُمْ ثَلَاثَةَ صُفُوفٍ، ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا، وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا صَفَّ صُفُوفٌ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى مَيِّتٍ إِلَّا أَوْجَبَ»[٢].

واتە: مالیکی کوڕی هوبەیرەی شامیی ﷺ کە لە هاوەڵان بووە، دەڵێ: کاتێک کە جەنازەیەکیان دەهێنا و کەمی (خەڵک) لەگەڵ دابوو، ئەوە خەڵکەکەی دابەش دەکرد بۆ سێ ڕیز، پاشان نوێژی لەسەر دەکرد، وە گوتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک سێ ڕیز ڕیزبوون لە موسڵمانان بۆ (نوێژی) مردوو، (تکایان) جێگیر دەبێ (وەردەگیرێ).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٤٨، وأبو داود: ٣١٧٠.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٣١٦٦، والترمذي: ١٠٢٨.




## بابەت: باسکردنی مردوو بە چاکە

١٤٩١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: مُرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِجِنَازَةٍ، فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ: «وَجَبَتْ» ثُمَّ مُرَّ عَلَيْهِ بِجِنَازَةٍ، فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرًّا، فَقَالَ: «وَجَبَتْ» فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قُلْتَ لِهَذِهِ وَجَبَتْ، وَلِهَذِهِ وَجَبَتْ، فَقَالَ: «شَهَادَةُ الْقَوْمِ، وَالْمُؤْمِنُونَ شُهُودُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: جەنازەیەک بە لای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی جا ستایشی (مردووەکەیان) دەکرد، فەرمووی: پێویست بوو، پاشان جەنازەیەکی تر بەلایدا تێپەڕی، جا بە خراپە باسیان دەکرد، فەرمووی: پێویست بوو، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەیان فەرمووت: وەرگیرا، وە بۆ ئەوەشیان فەرمووت: وەرگیرا!! ئنجا فەرمووی: گەواهیدانی خەڵک بوو، وە بڕواداران گەواهیدەرانی خوان لەسەر زەوی.

١٤٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: مُرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِجِنَازَةٍ، فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْرًا فِي مَنَاقِبِ الْخَيْرِ، فَقَالَ: «وَجَبَتْ» ثُمَّ مَرُّوا عَلَيْهِ بِأُخْرَى، فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرًّا فِي مَنَاقِبِ الشَّرِّ، فَقَالَ: «وَجَبَتْ، إِنَّكُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الْأَرْضِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: جەنازەیەک بە لای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی، جا (خەڵکی) ستایشی چاکەیان دەکرد لە کارە چاکەکانیدا، ئەویش فەرمووی: وەرگیرا، پاشان یەکێکیتر بەلایدا تێپەڕی، جا (خەڵکی) باسی خراپەیان کرد، لە کارە خراپەکانیدا، ئەویش فەرمووی: پێویست بوو، بێگومان ئێوە گەواهیدەرانی خوان لەسەر زەوی.

## بابەت: شوێنی وەستانی پێشنوێژ لە کاتی نوێژکردنی لەسەر جەنازە

١٤٩٣- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ الْفَزَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «صَلَّى عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا، فَقَامَ وَسَطَهَا»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٦٧ و ٢٦٤٢، ومسلم: ٩٤٩، والترمذي: ١٠٥٨، والنسائي: ١٩٣٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٣٣، والنسائي: ١٩٣٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٢، ومسلم: ٩٦٤، وأبو داود: ٣١٩٥، والترمذي: ١٠٣٥، والنسائي: ١٩٧٦ و ١٩٧٩.



واتە: سەمورەی کوڕی جوندەبی فەزاریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر ژنێک کرد، کە منداڵ بوون مردبوو، جا لە ناوەڕاستی (جەنازەکەی) ڕاوەستا.

١٤٩٤- عَنْ أَبِي غَالِبٍ، قَالَ: رَأَيْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ «صَلَّى عَلَى جِنَازَةِ رَجُلٍ، فَقَامَ حِيَالَ رَأْسِهِ، فَجِيءَ بِجِنَازَةٍ أُخْرَى، بِامْرَأَةٍ» فَقَالُوا: يَا أَبَا حَمْزَةَ صَلِّ عَلَيْهَا، «فَقَامَ حِيَالَ وَسَطِ السَّرِيرِ» فَقَالَ لَهُ الْعَلَاءُ بْنُ زِيَادٍ: يَا أَبَا حَمْزَةَ هَكَذَا رَأَيْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ مِنَ الْجِنَازَةِ مُقَامَكَ مِنَ الرَّجُلِ، وَقَامَ مِنَ الْمَرْأَةِ مُقَامَكَ مِنَ الْمَرْأَةِ؟ قَالَ: «نَعَمْ، فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا، فَقَالَ: احْفَظُوا»[1].

واتە: ئەبو غالیب، دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ بینی نوێژی لەسەر جەنازەی پیاوێک کرد، جا لە ئاستی سەری ڕاوەستابوو، ئنجا جەنازەیەکی دیکەیان هێنا ژن بوو، جا گوتیان: ئەی باوکی حەمزە نوێژی لەسەر بکە، ئەویش لە ناوەڕاستی جەنازەکە ڕاوەستا، جا عەلائی کوڕی زیاد پێی گوت: ئایا بەو شێوەیە بینیوتە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی جەنازەی پیاو لە و شوێنە ڕاوەستاوە کە تۆ لێی ڕاوەستای، وە لە هی ئافرەت لەو شوێنە ڕاوەستا کە تۆ لێی ڕاوەستای؟ گوتی: بەڵێ، ئەویش ڕووی لە ئێمە کردوو گوتی: (بەم شێوەیە شێوازی نوێژی جەنازە) لەبەر بکەن.

## بابەت: خوێندنی قورئان لە نوێژی جەنازەدا

١٤٩٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «قَرَأَ عَلَى الْجِنَازَةِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر جەنازە سوورەتی فاتیحەی خوێندووە.

١٤٩٦- عَنْ أُمِّ شَرِيكٍ الْأَنْصَارِيَّةِ ﷺ، قَالَتْ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَقْرَأَ عَلَى الْجِنَازَةِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١٩٤ مطولًا، والترمذي: ١٠٣٤.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٠٢٦، والصحيح ما أخرجه البخاري: ١٣٣٥، وأبو داود: ٣١٩٨، والترمذي: ١٠٢٧، والنسائي: ١٩٨٧ و ١٩٨٨.

(٣) ضعيف.

واتە: ئوممو شەریکی ئەنصاریی ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووین کە سوورەتی فاتیحە لەسەر جەنازە بخوێنین.

## بابەت: دوعاکردن لە ناو نوێژی مردوو

١٤٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَى الْمَيِّتِ، فَأَخْلِصُوا لَهُ الدُّعَاءَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کاتێک نوێژتان لەسەر مردوو کرد، بە دڵسۆزییەوە دوعای بۆ بکەن.

١٤٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى عَلَى جِنَازَةٍ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا، وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الْإِسْلَامِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الْإِيمَانِ، اللَّهُمَّ لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلَا تُضِلَّنَا بَعْدَهُ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: هەرکات پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر جەنازە دەکرد دەیفەرموو: خوایە لە زیندوو و مردووەکانمان خۆشبە، وە لە ئامادەبووان و ئەوانەشی کە ئامادەنین، وە لە گچکە و گەورەمان، وە لە نێر و مێینەمان، خوایە ئەوەی ژیانت پێدا لە ئێمە ئەوە لەسەر ئیسلام بیژیێنە، وە ئەوەی ڕووحت لێ وەرگرتەوە ئەوە بە ئیمان و بڕواوە بیمرێنە، خوایە لە پاداشتی بێبەشمان مەکە، وە لە دوای ئەو توشی گومڕاییمان مەکە.

١٤٩٩- عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ ﷺ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَأَسْمَعُهُ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنَّ فُلَانَ بْنَ فُلَانٍ فِي ذِمَّتِكَ، وَحَبْلِ جِوَارِكَ، فَقِهِ مِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ، وَعَذَابِ النَّارِ، وَأَنْتَ أَهْلُ الْوَفَاءِ وَالْحَقِّ، فَاغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ»[3].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣١٩٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٠١، والترمذي: ١٠٢٤.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٠٢.

واتە: واسیلەی کوڕی ئەسقەع ﷛ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر پیاوێک لە مسوڵمانان کرد، منیش گوێم لێبوو دەیفەرموو: خوایە فڵانی کوڕی فڵان لە ئەستۆی تۆ دایە، وە لە ئەمن و سەلامەتی تۆ دایە، کەواتە بیپارێزە لە بەڵای گۆڕ و سزای ئاگر، وە تۆ خاوەنی وەفای بە بەڵێنەکانت بە هەق، سا لێی خۆشبە و بەزەییت پێدابێتەوە، بێگومان تۆ لێبووردە و بە بەزەییت.

**حبل الجوار:** ئەوەیە کە کاتی خۆی کەسێک بترسایە، ئەوە بەڵێنی لە گەورەی ئەو هۆزە وەردەگرت، هەتاکو لە سنووری ئەو دابێ، پارێزراو و سەلامەت بێ.

١٥٠٠- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ ﷛، قَالَ شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى عَلَى رَجُلٍ مِنَ الْأَنْصَارِ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ، وَاغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ، وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ، وَاغْسِلْهُ بِمَاءٍ وَثَلْجٍ وَبَرَدٍ، وَنَقِّهِ مِنَ الذُّنُوبِ وَالْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ بِدَارِهِ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلًا خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ، وَقِهِ فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَعَذَابَ النَّارِ» قَالَ عَوْفٌ، فَلَقَدْ رَأَيْتُنِي فِي مُقَامِي ذَلِكَ أَتَمَنَّى أَنْ أَكُونَ مَكَانَ ذَلِكَ الرَّجُلِ[١].

واتە: عەوفی کوڕی مالیک ﷛ دەڵێ: ئاگام لێبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد لەسەر پیاوێک لە ئەنصارەکان، جا گوێم لێبوو دەیفەرموو: خوایە سۆز و ڕەحمەتی خۆتی بەسەردا بڕێژە و لێی خۆشبە و بەزەییت پێیدابێتەوە، وە سەلامەتی بکەو، چاوپۆشی لێبکە، وە بیشۆرەوە (لە گوناهەکانی) بە ئاو و بەفر و تەرزە، وە لە گوناهان پاکی بکەوە هەر وەکو چۆن پۆشاکی سپی لە چڵک پاک دەکرێتەوە، وە بە ماڵێک قەرەبووی بکەوە و بۆی بگۆڕە کە لە ماڵەکەی خۆی چاکتر و باشتر بێ، وە خێزانێک کە لە خێزانەکەی باشتر بێ، وە بیپارێزە لە بەڵا و فیتنەی گۆڕو سزای ئاگر. عەوف دەڵێ: ئەگەر لەوکاتەدا منت بینیبا، ئەوە ئاواتەخواز بووم کە من لە شوێنی ئەو پیاوە بام.

١٥٠١- عَنْ جَابِرٍ ﷛، قَالَ: «مَا أَبَاحَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَا أَبُو بَكْرٍ وَلَا عُمَرُ فِي شَيْءٍ، مَا أَبَاحُوا فِي الصَّلَاةِ عَلَى الْمَيِّتِ» يَعْنِي لَمْ يُوَقِّتْ[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٦٣، والترمذي: ١٠٢٥، والنسائي: ١٩٨٣ و ١٩٨٤.

(٢) ضعيف.




واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: نە پێغەمبەری خوا ﷺو نە ئەبو بەکر و نە عومەر لە هیچ شتێک بە ئەندازەی کاتی نوێژی مردوو مۆڵەتیان پێنەداوین، واتە: کاتەکەی دیاری نەکراوە (واتە: هەموو کات دروستە نوێژی مردوو بکرێ).

سەرنج: زانایان بۆچوونێکی دیکەشیان هەیە لە ڕاڤەی ئەم فەرموودەیە، کە دەڵێن: مەبەستی پێ دوعاکردنە نەک نوێژ کردن!!

## بابەت: ئەوەی کە چوار (الله أكبر) هەیە لە نوێژی جەنازەدا

١٥٠٢- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «صَلَّى عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ، وَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعًا»[١].

واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر عوسمانی کوڕی مەزعون ﷺ کرد، وە چوار «الله أكبر»ـی لەسەر کرد (لە نوێژەکەدا).

١٥٠٣- عَنِ الْهَجَرِيِّ ﷺ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى الْأَسْلَمِيِّ ﷺ صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى جِنَازَةِ ابْنَةٍ لَهُ، فَكَبَّرَ عَلَيْهَا أَرْبَعًا، فَمَكَثَ بَعْدَ الرَّابِعَةِ شَيْئًا، قَالَ: فَسَمِعْتُ الْقَوْمَ يُسَبِّحُونَ بِهِ، مِنْ نَوَاحِي الصُّفُوفِ، فَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ: أَكُنْتُمْ تَرَوْنَ أَنِّي مُكَبِّرٌ خَمْسًا؟ قَالُوا: تَخَوَّفْنَا ذَلِكَ، قَالَ: لَمْ أَكُنْ لِأَفْعَلَ، وَلَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «كَانَ يُكَبِّرُ أَرْبَعًا، ثُمَّ يَمْكُثُ سَاعَةً، فَيَقُولُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، ثُمَّ يُسَلِّمُ»[٢].

واتە: هەجەریی، دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفای ئەسلەمی ﷺ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم لەسەر جەنازەی کچەکەی کرد، ئەویش چوار «الله أكبر»ی کرد، ئنجا لە دوای چوارەم «الله أكبر» کەمێک بە بێدەنگی مایەوە، گوتی: منیش گوێم لێبوو خەڵکی لە ڕیزەکاندا «سبحان الله» یان بۆ دەکرد، (وەکو ئاگادار کردنەوە)، ئنجا سەلامی دایەوە و گوتی: ئایا پێتان وابوو کە پێنج جار «الله أكبر» دەکەم؟ گوتیان: ترساین ئەوە بکەی! گوتی: نەخێر ئاوام نەدەکرد، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ چوار «الله أكبر»ـی دەکرد، پاشان کاتێکی کەم دەمایەوە ئەوەی کە پێی خۆش بووایە دەیفەرموو (لە دوعا کردن) پاشان سەلامی دەدایەوە.

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن لغيره.

**١٥٠٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «كَبَّرَ أَرْبَعًا»[١].**

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ چوار «الله أكبر»ـی دەکرد (لە نوێژی جەنازەدا).**

## بابەت: ئەوەی کە پێنج (الله أكبر)ـی کردوە

**١٥٠٥- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ﷺ، قَالَ: كَانَ زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ «يُكَبِّرُ عَلَى جَنَائِزِنَا أَرْبَعًا، وَأَنَّهُ كَبَّرَ عَلَى جِنَازَةٍ خَمْسًا» فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكَبِّرُهَا»[٢].**

**واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا ﷺ دەڵێ: زەیدی کوڕی ئەڕقەم چوار «الله أكبر»ـی لەسەر مردووەکانمان لێدەدا، وە ئەو لەسەر جەنازەیەک پێنج «الله أكبر»ـی کرد، منیش پرسیارم لێکرد، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە «الله أكبر»ـەی کردوە.**

**١٥٠٦- عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «كَبَّرَ خَمْسًا»[٣].**

**واتە: کەسیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ لە باوکییەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێنج «الله أكبر»ـی کردوە (لە نوێژی جەنازەدا).**

## بابەت: نوێژکردن لەسەر جەنازەی منداڵ

**١٥٠٧- عَنِ الْمُغِيرَةَ بْن شُعْبَةَ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الطِّفْلُ يُصَلَّى عَلَيْهِ»[٤].**

**واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: منداڵ نوێژی لەسەر دەکرێ.**

---

**(١) صحيح لغيره.**

**(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٥٧، وأبو داود: ٣١٩٧، والترمذي: ١٠٢٣، والنسائي: ١٩٨٢.**

**(٣) ضعيف.**

**(٤) صحيح.**





١٥٠٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اسْتَهَلَّ الصَّبِيُّ، صُلِّيَ عَلَيْهِ وَوُرِثَ»[١].

واته: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر منداڵی تازە لە دایک بوو دەنگی لێوە هات، ئەوە نوێژی لەسەر دەکرێ و میراتی لێدەگیردرێ.

١٥٠٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صَلُّوا عَلَى أَطْفَالِكُمْ، فَإِنَّهُمْ مِنْ أَفْرَاطِكُمْ»[٢].

واته: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژ لەسەر منداڵە (تازە لە دایک بووەکان)تان، بکەن ئەوانە پێشبارن بۆ ئێوە (بۆ قیامەت و لە پێش خۆتانەوە ڕەوانەیان دەکەن).

**فرط:** ئەو کەسەی پێش خەڵکەکەی دەکەوێ تاکو ئامادە سازییان بۆ بکات.

## بابەت: وەفاتی کوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ و، نوێژ لەسەر کردنی

١٥١٠- عَنْ إِسْمَاعِيلُ بْنُ أَبِي خَالِد، قَالَ: قُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ: رَأَيْتَ إِبْرَاهِيمَ ابْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَاتَ وَهُوَ صَغِيرٌ، وَلَوْ قُضِيَ أَنْ يَكُونَ بَعْدَ مُحَمَّدٍ ﷺ نَبِيٌّ، لَعَاشَ ابْنُهُ، وَلَكِنْ لَا نَبِيَّ بَعْدَهُ»[٣].

واته: ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالید دەڵێ: بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفام ﷺ گوت: ئایا ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە؟ گوتی: بە منداڵی مرد، خۆ ئەگەر بڕیار بووایە لە دوای موحەممەد ﷺ پێغەمبەرێکی دیکە ببووایە، ئەوە کوڕەکەی دەژیا، بەڵام لە دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نیە.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ١٠٣٢.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٩٤.

١٥١١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا مَاتَ إِبْرَاهِيمُ ابْنُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ: «إِنَّ لَهُ مُرْضِعًا فِي الْجَنَّةِ، وَلَوْ عَاشَ لَكَانَ صِدِّيقًا نَبِيًّا، وَلَوْ عَاشَ لَعَتَقَتْ أَخْوَالُهُ الْقِبْطُ، وَمَا اسْتُرِقَّ قِبْطِيٌّ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێک کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کردو، فەرمووی: بێگومان لە بەهەشتدا دایەن (یان شیردەری هەیە) خۆ ئەگەر ژیابووایە، ئەوە دەبوو بە ڕاستگۆ و پێغەمبەر، وە ئەگەر ژیابووایە، ئەوە خاڵەکانی کە قیبتی بوون ئازاد دەبوون، وە هیچ قیبتییەک نەدەبوو بە کۆیلە.

١٥١٢- عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْحُسَيْنِ ﷺ، عَنْ أَبِيهَا الْحُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ الْقَاسِمُ ابْنُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ خَدِيجَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دَرَّتْ لُبَيْنَةُ الْقَاسِمِ، فَلَوْ كَانَ اللَّهُ أَبْقَاهُ حَتَّى يَسْتَكْمِلَ رَضَاعَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ تَمَامَ رَضَاعِهِ فِي الْجَنَّةِ» قَالَتْ: لَوْ أَعْلَمُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَهَوَّنَ عَلَيَّ أَمْرَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ تَعَالَى فَأَسْمَعَكِ صَوْتَهُ» قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بَلْ أُصَدِّقُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ»(٢).

واتە: فاتیمەی کچی حوسەین ﷺ لە باوکییەوە حوسەینی کوڕی عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کاتێک قاسمی کوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، دایکی بڕواداران خەدیجە گوتی: شیری قاسم زۆر بوو (یان زۆر بووە)، خۆزگە مابووایە، تاکو خواردنی شیرەکەی تەواو دەکرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تەواوکردنی شیر خواردنەکە لە بەهەشتدایە، (خەدیجە) گوتی: ئەگەر بزانم وایە، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناخۆشیەکەم بەلاوە ئاسانترە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەگەر پێت خۆشە داوا لە خوا دەکەم تاکو گوێ بیستی دەنگی ببیت، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵکو خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاست دەزانم. (واتە: تەواو بڕوام هەیە بۆیە پێویست ناکات گوێم لە دەنگی بێ).

---

(١) صحيح دون جملة العتق.

(٢) ضعيف جداً.




## بابەت: نوێژکردن لەسەر شەهیدان و کفن کردنیان

**١٥١٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: أُتِيَ بِهِمْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ، فَجَعَلَ «يُصَلِّي عَلَى عَشَرَةٍ عَشَرَةٍ، وَحَمْزَةُ هُوَ كَمَا هُوَ، يُرْفَعُونَ وَهُوَ كَمَا هُوَ مَوْضُوعٌ»[١].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژی (غەزای) ئوحوددا شەهیدەکانیان هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا دە کەس دە کەس نوێژی لەسەر دەکردن، حەمزە (مامی پێغەمبەر ﷺ) چۆن دانرابوو هەروا مایەوە، ئەوانیتر هەڵدەگیران و لادەبران، وە ئەو (حەمزە) چۆن دانرابوو هەروا مایەوە و لانەبرا.

**١٥١٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ، وَالثَّلَاثَةِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ ثُمَّ يَقُولُ: «أَيُّهُمْ أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ؟» فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمْ قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ وَقَالَ: «أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلَاءِ، وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا»[٢].**

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ شەهیدەکانی ئوحودی دوو دانە بەیەکەوە، یان سێ دانە بەیەکەوە، لە ناو یەک پۆشاک و کفندا کۆدەکردەوە، پاشان دەیفەرموو: کامەیان زیاتر قوڕئانی لەبەرە؟ جا ئەگەر ئاماژەیان بە یەکێک کردبایە، ئەوی پێش دەخست لە کاتی ناشتندا، وە دەیفەرموو: من گەواهی بۆ ئەوانە دەدەم (کە لە ڕێگای خوا شەهید بوون)، وە فەرمانی کرد کە بە خوێنەکانیانەوە بنێژرێن، وە نوێژی لەسەر نەکردن، وە نەشۆردران.

**١٥١٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَمَرَ بِقَتْلَى أُحُدٍ أَنْ يُنْزَعَ عَنْهُمُ الْحَدِيدُ وَالْجُلُودُ، وَأَنْ يُدْفَنُوا فِي ثِيَابِهِمْ بِدِمَائِهِمْ»[٣].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە شەهیدەکانی ئوحود چەکەکانیان لێ بکرێتەوە، هەروەها ئەوەی کە لەبەریان کردوە بۆ جەنگ ئەویشیان لێ دابنرێ، وە بە پۆشاکی خۆیانەوە بە خوێنەکانیانەوە بنێژرێن.

---

(١) منكر.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٤٣، وأبو داود: ٣١٣٨، والترمذي: ١٠٣٦، والنسائي: ١٩٥٥.

(٣) حسن لغيره.

**١٥١٦-** عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، سَمِعَ نُبَيْحًا الْعَنْزِيَّ، يَقُولُ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، يَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَمَرَ بِقَتْلَى أُحُدٍ أَنْ يُرَدُّوا إِلَى مَصَارِعِهِمْ، وَكَانُوا نُقِلُوا إِلَى الْمَدِينَةِ»[1].

**واتە:** ئەسوەدی کوڕی قەیس دەگێڕێتەوە، گوێی لە نوبەیحی عەنزیی بووە، گوتوویەتی: گوێم لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە شەهیدەکانی ئوحود بگەڕێنرێنەوە بۆ شوێنی جەنگەکەیان (ئەو شوێنەی کە لێی شەهید کراون)، لە کاتێکدا کە شەهیدەکان گوازرابوونەوە بۆ مەدینە.

## بابەت: نوێژی مردوو لە ناو مزگەوتدا

**١٥١٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى عَلَى جِنَازَةٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَلَيْسَ لَهُ شَيْءٌ»[2].

**واتە:** ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە ناو مزگەوتدا نوێژ لەسەر مردوو بکات، هیچی (پاداشت)ی بۆ نیە.

**١٥١٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «وَاللَّهِ مَا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى سُهَيْلِ ابْنِ بَيْضَاءَ إِلَّا فِي الْمَسْجِدِ» قَالَ ابْنُ مَاجَةَ: حَدِيثُ عَائِشَةَ ﵂ أَقْوَى[3].

**واتە:** عائیشە ﵂ دەڵێ: سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر سوهەیلی کوڕی بەیزا نەکرد، تەنها لە ناو مزگەوت دانەبێ (واتە: ئاساییە نوێژ لەسەر مردوو بکرێ لە ناو مزگەوت)، جا ئیبنو ماجە دەڵێ: فەرموودەکەی عائیشە ﵂ بە هێزترە لە فەرموودەکەی ئەبو هوڕەیرە ﵁.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١٦٥، والترمذي: ١٧١٧، والنسائي: ٢٠٠٤.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣١٩١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٣، وأبو داود: ٣١٨٩ و ٣١٩٠، والترمذي: ١٠٣٣، والنسائي: ١٩٦٧ و ١٩٦٨.

## بابەت: ئەو کاتانەی کە مردوو نوێژی لەسەر ناکرێ و تێیدا نانێژرێ

**١٥١٩- عَنْ مُوسَى بْنِ عَلِيِّ بْنِ رَبَاحٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ الْجُهَنِيَّ، يَقُولُ: «ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ نَقْبِرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَضَيَّفُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ»[١].**

واتە: موسای کوڕی عەلی کوڕی ڕەباح ﷺ دەڵێ: گوێم لە باوکم بوو، دەیگوت: گوێم لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ﷺ بوو دەیگوت: سێ کات هەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە نوێژی تێدا بکەین، یان مردووەکانمانی تێدا بنێژین: ئەو کاتەی کە خۆر هەڵدێ بە تەواوی، وە ئەو کاتەی کە خۆر دەگاتە کاتی نیوەڕۆ، تاکو (لە ناوەڕاستی ئاسمان) لادەدات، وە ئەو کاتەی لار دەبێتەوە بەرەو ئاوابوون تاکو ئاوا دەبێ.

**١٥٢٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَدْخَلَ رَجُلًا قَبْرَهُ لَيْلًا، وَأَسْرَجَ فِي قَبْرِهِ»[٢].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی خستە ناو گۆڕەوە بە شەو، چرای داگیرساند لە ناو گۆڕەکەیدا.

**١٥٢١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَدْفِنُوا مَوْتَاكُمْ بِاللَّيْلِ، إِلَّا أَنْ تُضْطَرُّوا»[٣].**

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مردووەکانتان بە شەو مەنێژن مەگەر ناچاربن.

**١٥٢٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «صَلُّوا عَلَى مَوْتَاكُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ»[٤].**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٣١، وأبو داود: ٣١٩٢، والترمذي: ١٠٣٠، والنسائي: ٥٦٠ و ٥٦٥ و ٢٠١٣.

(٢) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١٠٥٧ بزيادات ضعيفة.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه مسلم: ٩٤٣.

(٤) ضعيف.




واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژ لەسەر مردووەکانتان بکەن بە شەو بێ، یان بە ڕۆژ.

## بابەت: نوێژکردن لەسەر ئەهلی قیبلە

**١٥٢٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ جَاءَ ابْنُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعْطِنِي قَمِيصَكَ أُكَفِّنْهُ فِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «آذِنُونِي بِهِ» فَلَمَّا أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ، قَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: مَا ذَاكَ لَكَ، فَصَلَّى عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أَنَا بَيْنَ خِيَرَتَيْنِ: اسْتَغْفِرْ لَهُمْ، أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ» فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: کاتێک عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی (سەرۆکی دووڕووەکان) مرد، کوڕەکەی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کراسەکەتم پێ بدە، بۆ ئەوەی باوکمی تێدا کفن بکەم، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکات ئامادەتان کرد ئاگادارم بکەنەوە، جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ ویستی نوێژی لەسەر بکات، عومەر کوڕی خەتتاب ﷺ پێی گوت: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) ڕێگەی ئەوەی پێنەداوی، ئنجا پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کرد و بە عومەری ﷺ فەرموو: من لە نێوان دوو هەڵبژاردەم: «أَسْتَغْفِرْ لَهُمْ، أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ»، واتە: داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکەی، یان داوای لێخۆش بوونیان بۆ نەکەی، ئنجا خوای خاوەن دەسەڵات ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة، واتە: وە (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆ نوێژ مەکە لەسەر هیچ کەسێک لەوانە کە مرد هەرگیز، وە ڕامەوەستە لەسەر گۆڕەکەی.

**١٥٢٤-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: مَاتَ رَأْسُ الْمُنَافِقِينَ بِالْمَدِينَةِ، وَأَوْصَى أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ، وَأَنْ يُكَفِّنَهُ فِي قَمِيصِهِ، فَصَلَّى عَلَيْهِ، وَكَفَّنَهُ فِي قَمِيصِهِ، وَقَامَ عَلَى قَبْرِهِ، «فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٦٩، ومسلم: ٢٤٠٠ و ٢٧٧٤، والترمذي: ٣٠٩٨، والنسائي: ١٩٠٠.

(٢) منكر بذكر الوصية.




واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: سەرۆكی دووڕووەكان مرد لە مەدینە، وە وەسیەتی كردبوو كە پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر بكات، وە (پێغەمبەر ﷺ) لە كراسەكەی خۆیدا كفنی بكات، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) نوێژی لەسەر كرد و لە كراسەكەی خۆیدا كفنی كرد و چوو بۆ سەر گۆڕەكەی (ئامادەی ناشتنی بوو)، جا خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة، واتە: وە (ئەی موحەممەد ﷺ) تۆ نوێژ مەكە لەسەر هیچ كەسێك لەوانە كە مرد هەرگیز، وە ڕامەوەستە لەسەر گۆڕەكەی.

١٥٢٥- عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلُّوا عَلَى كُلِّ مَيِّتٍ، وَجَاهِدُوا مَعَ كُلِّ أَمِيرٍ»[١].

واتە: واسیلەی كوڕی ئەسقەع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەسەر هەموو مردوویەك نوێژ بكەن (مردووی مسوڵمانان)، لەگەڵ هەموو پێشەوایەك جیهادو تێكۆشان بكەن.

١٥٢٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ جُرِحَ، فَآذَتْهُ الْجِرَاحَةُ، فَدَبَّ إِلَى مَشَاقِصَ، فَذَبَحَ بِهَا نَفْسَهُ «فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ» قَالَ: وَكَانَ ذَلِكَ مِنْهُ أَدَبًا[٢].

واتە: جابیری كوڕی سەموڕە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بریندار كرابوو، برینەكەش زۆری بۆ هێنابوو ناڕەحەتی كردبوو، بۆیە بە هێواشی بەرەو سەرە تیرێك ڕۆیشت و خۆی پێكوشت، ئنجا پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر نەكرد تاكو ببێتە پەندێك كە كەس ئەو كارە نەكات.

## بابەت: نوێژ كردن لەسەر گۆڕ

١٥٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ كَانَتْ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ، فَفَقَدَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلَ عَنْهَا بَعْدَ أَيَّامٍ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهَا مَاتَتْ، قَالَ: «فَهَلَّا آذَنْتُمُونِي، فَأَتَى قَبْرَهَا، فَصَلَّى عَلَيْهَا»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٨، وأبو داود: ٣١٨٥، والترمذي: ١٠٦٨، والنسائي: ١٩٦٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٨، ومسلم: ٩٥٦، وأبو داود: ٣٢٠٣.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئافرەتێکی ڕەشپێست هەبوو مزگەوتی خاوێن دەکردەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەک بوو نەیدەبینی، ئەویش دوای چەند ڕۆژێک پرسیاری دەربارەی کرد، پێیان گوت: ئەو ئافرەتە مردووە، فەرمووی: ئەی نەدەبوو هەواڵم پێبدەن؟ ئنجا هات بۆ سەر گۆڕەکەی و نوێژی لەسەر کرد.

**١٥٢٨- عَنْ يَزِيدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، وَكَانَ أَكْبَرَ مِنْ زَيْدٍ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا وَرَدَ الْبَقِيعَ فَإِذَا هُوَ بِقَبْرٍ جَدِيدٍ، فَسَأَلَ عَنْهُ، فَقَالُوا: فُلَانَةُ، قَالَ: فَعَرَفَهَا وَقَالَ «أَلَا آذَنْتُمُونِي بِهَا» قَالُوا: كُنْتَ قَائِلًا صَائِمًا، فَكَرِهْنَا أَنْ نُؤْذِيَكَ، قَالَ: «فَلَا تَفْعَلُوا، لَا أَعْرِفَنَّ مَا مَاتَ مِنْكُمْ مَيِّتٌ مَا كُنْتُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ إِلَّا آذَنْتُمُونِي بِهِ؛ فَإِنَّ صَلَاتِي عَلَيْهِ لَهُ رَحْمَةٌ» ثُمَّ أَتَى الْقَبْرَ، فَصَفَفْنَا خَلْفَهُ، فَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعًا**[1].

واتە: یەزیدی کوڕی سابت ﷺ کە لە زەیدی برای گەورەترە، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووین جا کاتێک گەیشتینە بەقیع گۆڕێکی تازەی لێبوو، پرسیاری کرد دەربارەی (کە هی کێیە)، گوتیان: فڵان ئافرەتەیە، دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ) ناسیەوە و فەرمووی: ئەی بۆ هەواڵتان پێنەداوم؟ گوتیان: جەنابت بە ڕۆژوو بوویت و خەوتبووی، پێمان ناخۆش بوو ئەزیەتت بدەین، فەرمووی: ئەو کارە مەکەن، ئەوەتان لێ نەبینم کە یەکێکتان لێ بمرێ و منیش لە ناوتاندابم و هەواڵم پێنەدەن (واتە: هەواڵم پێبدەن و ئاگادارم بکەن)، چونکە بێگومان نوێژکردنی من لەسەر ئەو کەسە دەبێتە ڕەحمەت بۆی، پاشان هاتە لای گۆڕەکە و ئێمەش لە پشتییەوە ڕیز بووین و چوار «الله أکبر»ـی کرد (نوێژی لەسەر کرد).

**١٥٢٩- عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ مَاتَتْ، لَمْ يُؤْذَنْ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ، فَأُخْبِرَ بِذَلِكَ، فَقَالَ: «هَلَّا آذَنْتُمُونِي بِهَا» ثُمَّ قَالَ لِأَصْحَابِهِ «صُفُّوا عَلَيْهَا، فَصَلَّى عَلَيْهَا»**[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیع لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێکی ڕەش پێست مرد، وە پێغەمبەری ﷺ بۆ ئاگادار نەکراوە (نوێژی لەسەر بکات)، ئنجا هەواڵی ئەوەی پێدرا، ئەویش فەرمووی: ئەوە نەدەبوو ئاگادارم بکەن؟ پاشان فەرمووی بە هاوەڵەکانی: ڕیز ببن لەسەر گۆڕەکەی، ئنجا نوێژی لەسەر کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٠٢٢.

(٢) حسن صحيح.




١٥٣٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ، قَالَ: مَاتَ رَجُلٌ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُهُ، فَدَفَنُوهُ بِاللَّيْلِ، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَعْلَمُوهُ، فَقَالَ: «مَا مَنَعَكُمْ أَنْ تُعْلِمُونِي؟» قَالُوا: كَانَ اللَّيْلُ، وَكَانَتِ الظُّلْمَةُ، فَكَرِهْنَا أَنْ نَشُقَّ عَلَيْكَ، «فَأَتَى قَبْرَهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﭭ دەڵێ: پیاوێک مرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی دەکرد، هەر بە شەو ناشتیان، جا کاتێک ڕۆژ بووە پێغەمبەریان ﷺ ئاگادار کردەوە، ئەویش فەرمووی: چی ڕێگر بوو کە ئاگادارم بکەن؟ گوتیان: شەو بوو، تاریک بوو، حەزمان نەکرد نارەحەتت بکەین، ئنجا هات بۆ لای گۆڕەکەی و نوێژی لەسەر کرد.

١٥٣١- عَنْ أَنَسٍ ﭬ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «صَلَّى عَلَى قَبْرٍ بَعْدَ مَا قُبِرَ»[2].

واتە: ئەنەس ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر گۆڕێک کرد، دوای ئەوەی (کەسەکە) خرابووە ناو گۆڕ.

١٥٣٢- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «صَلَّى عَلَى مَيِّتٍ بَعْدَ مَا دُفِنَ»[3].

واتە: ئیبنو بورەیدە لە باوکییەوە ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر مردوویەک کرد، دوای ئەوەی کە نێژرابوو.

١٥٣٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﭬ، قَالَ: كَانَتْ سَوْدَاءُ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ، فَتُوُفِّيَتْ لَيْلًا، فَلَمَّا أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أُخْبِرَ بِمَوْتِهَا، فَقَالَ: «أَلَا آذَنْتُمُونِي بِهَا؟» فَخَرَجَ بِأَصْحَابِهِ، «فَوَقَفَ عَلَى قَبْرِهَا، فَكَبَّرَ عَلَيْهَا، وَالنَّاسُ مِنْ خَلْفِهِ، وَدَعَا لَهَا، ثُمَّ انْصَرَفَ»[4].

واتە: ئەبو سەعید ﭬ دەڵێ: ئافرەتێکی ڕەش پێست خزمەتی مزگەوتی دەکرد، ئنجا ئەو ئافرەتە بە شەو مرد، جا کاتێک ڕۆژ بووەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مردنەکەی ئاگادار کرایەوە، ئەویش فەرمووی: نەدەبوو ئاگادارم بکەنەوە لە مردنەکەی؟ ئنجا لەگەڵ هاوەڵەکانی دەرچوو، لەسەر گۆڕەکەی وەستا و «الله أكبر»ی لەسەر کرد، خەڵکیش لە پشتیەوە بوون، وە دوعا و نزای بۆ کرد، پاشان ڕۆیشت و جێی هێشت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٨٥٧، ومسلم: ٩٥٤، وأبو داود: ٣١٩٦، والترمذي: ١٠٣٧، والنسائي: ٣٠٢٣ و ٣٠٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٥٥.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح لغيره.





## بابەت: نوێژ کردن لەسەر نەجاشی

١٥٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ النَّجَاشِيَّ قَدْ مَاتَ» فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ إِلَى الْبَقِيعِ، فَصَفَّنَا خَلْفَهُ، وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە دڵنیایی نەجاشی مردوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی دەرچوون بۆ بەقیع، ئنجا لە پشتییەوە ڕیز بووین، وە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشکەوت، ئنجا چوار «الله أكبر»ی کرد (واتە: نوێژی جەنازەی کرد).

١٥٣٥- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَخَاكُمُ النَّجَاشِيَّ قَدْ مَاتَ، فَصَلُّوا عَلَيْهِ» قَالَ: فَقَامَ فَصَلَّيْنَا خَلْفَهُ، وَإِنِّي لَفِي الصَّفِّ الثَّانِي، فَصَلَّى عَلَيْهِ صَفَّيْنِ(٢).

واتە: عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان نەجاشی براتان مردووە و نوێژی لەسەر بکەن، گوتی: ئنجا هەڵسا و نوێژمان لە پشتییەوە کرد، وە من لە ڕیزی دووەم بووم، دوو ڕیز (نوێژ خوێن) نوێژیان لەسەر کرد.

١٥٣٦- عَنْ مُجَمِّعِ بْنِ جَارِيَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ أَخَاكُمُ النَّجَاشِيَّ قَدْ مَاتَ، فَقُومُوا فَصَلُّوا عَلَيْهِ» فَصَفَّنَا خَلْفَهُ صَفَّيْنِ(٣).

واتە: موجەمیعی کوڕی جاریەی ئەنصاریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان نەجاشی براتان مردووە، جا هەڵسن نوێژی لەسەر بکەن، ئێمەش لە پشتی (پێغەمبەر ﷺ) بووین بە دوو ڕیز.

١٥٣٧- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ بِهِمْ فَقَالَ: «صَلُّوا عَلَى أَخٍ لَكُمْ مَاتَ بِغَيْرِ أَرْضِكُمْ» قَالُوا: مَنْ هُوَ؟ قَالَ: «النَّجَاشِيُّ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٤٥، ومسلم: ٩٥١، وأبو داود: ٣٢٠٤، والترمذي: ١٠٢٢، والنسائي: ١٩٧١ و ١٩٧٢ و ١٩٨٠ و ٢٠٤٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٥٣، والترمذي: ١٠٣٩، والنسائي: ١٩٧٥.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح.

واتە: حوزەیفەی کوڕی ئەسید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیان دەرچوو، فەرمووی: نوێژ لەسەر ئەو برایەتان بکەن کە لە خاکی ئێوەدا نەمردووە، گوتیان: کێیە ئەو کەسە؟ فەرمووی: نەجاشی.

**١٥٣٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «صَلَّى عَلَى النَّجَاشِيِّ، فَكَبَّرَ أَرْبَعًا»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر نەجاشی کردو، چوار «الله أكبر»ـی کرد.

## بابەت: پاداشتی ئەو کەسەی نوێژی جەنازە دەکات و چاوەڕێی ناشتنی دەکات

**١٥٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى عَلَى جِنَازَةٍ فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنِ انْتَظَرَ حَتَّى يُفْرَغَ مِنْهَا فَلَهُ قِيرَاطَانِ» قَالُوا: وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: «مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژ لەسەر تەرمێک بکات، ئەوە پاداشتی دەدرێتەوە بە ئەندازەی قیراتێک، وە هەر کەسێک چاوەڕێ بکات تاکو دەنێژرێت، پاداشتی دەدرێتەوە بە ئەندازەی دوو قیرات، گوتیان: قیرات چییە؟ فەرمووی: بە ئەندازەی دوو کێوە.

**١٥٤٠-** عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى عَلَى جِنَازَةٍ فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَ دَفْنَهَا فَلَهُ قِيرَاطَانِ» قَالَ: فَسُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْقِيرَاطِ؟ فَقَالَ: «مِثْلُ أُحُدٍ»[٣].

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لەسەر جەنازە نوێژ بکات پاداشتەکەی قیراتێکە، وە هەر کەسێک ئامادەی ناشتنی بێت پاداشتەکەی دوو قیراتە، ئنجا پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی قیرات، ئەویش فەرمووی: بە ئەندازەی ئوحودە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧، ومسلم: ٩٤٥، وأبو داود: ٣١٦٨، والترمذي: ١٠٤٠، والنسائي: ١٩٩٤_١٩٩٧ و ٥٠٣٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٤٦.



**١٥٤١-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى عَلَى جِنَازَةٍ فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ الْقِيرَاطُ أَعْظَمُ مِنْ أُحُدٍ هَذَا»[١].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژ بکات لەسەر جەنازە، پاداشتەکەی قیراتێکە، وە هەر کەسێک ئامادەبێ تاکو دەنێژرێ پاداشتەکەی دوو قیڕاتە، سوێند بەو زاتەی کە گیانی موحەممەدی بە دەستە، قیرات لەو کێوەی ئوحود گەورەترە.

## بابەت: هەڵسان لەبەر جەنازە

**١٥٤٢-** عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الْجِنَازَةَ فَقُومُوا لَهَا حَتَّى تُخَلِّفَكُمْ أَوْ تُوضَعَ»[٢].

واتە: عامیری کوڕی ڕەبیعە ﵁، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: هەرکات جەنازەتان بینی لەبەری هەڵسنەوە، تاکو تێدەپەڕێ، یان تاکو دادەنرێ.

**١٥٤٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ مُرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِجِنَازَةٍ، فَقَامَ وَقَالَ: «قُومُوا؛ فَإِنَّ لِلْمَوْتِ فَزَعًا»[٣].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێ: جەنازەیەک بە لای پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕی ئەویش هەڵسایەوەو، فەرمووی: هەڵسن، بەڕاستی مردن ڕاچڵەکینی دەوێ.

**١٥٤٤-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁، قَالَ: «قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِجِنَازَةٍ فَقُمْنَا، حَتَّى جَلَسَ فَجَلَسْنَا»[٤].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر جەنازەیەک هەڵسایەوە، ئێمەش لەبەری هەڵساین، تاکو دانیشتەوە، ئنجا دانیشتینەوە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٠٧ و ١٣٠٨، ومسلم: ٩٥٨، وأبو داود: ٣١٧٢، والترمذي: ١٠٤٢، والنسائي: ١٩١٥ و ١٩١٦.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح بغير هذا السياق. أخرجه مسلم: ٩٦٢، وأبو داود: ٣١٧٥، والترمذي: ١٠٤٤، والنسائي: ١٩٩٩ و ٢٠٠٠.




**١٥٤٥- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اتَّبَعَ جِنَازَةً لَمْ يَقْعُدْ حَتَّى تُوضَعَ فِي اللَّحْدِ» فَعَرَضَ لَهُ حَبْرٌ، فَقَالَ: هَكَذَا نَصْنَعُ يَا مُحَمَّدُ فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: «خَالِفُوهُمْ»[(١)].**

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە شوێن جەنازەیەک دەکەوت دانەدەنیشت تاکو نەخرابایە ناو گۆڕ، لەو کاتەدا زانایەکی جوولەکە لەوێ بوو، گوتی: ئەی موحەممەد ئێمەش ئاوا دەکەین (بە پێوە دەبین)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت و فەرمووی: پێچەوانەی ئەوان بکەن.

## بابەت: ئەوەی دەگوترێ لە کاتی چوونە ناو گۆڕستان

**١٥٤٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: فَقَدْتُهُ، تَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ، فَإِذَا هُوَ بِالْبَقِيعِ، فَقَالَ: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، أَنْتُمْ لَنَا فَرَطٌ، وَإِنَّا بِكُمْ لَاحِقُونَ، اللَّهُمَّ لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُمْ، وَلَا تَفْتِنَّا بَعْدَهُمْ»[(٢)].**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەرم ﷺ لە چاو ون بوو، دواتر بینیم لە بەقیعە، ئنجا فەرمووی: سەلام و ئارامی خواتان لەسەر بێ ئەی ئارامگای بڕواداران ئێوە پێش ئێمە کەوتن، وە ئێمەش بە دواتاندا دێین و پێتان دەگەین، سا خوایە لە پاداشتی ئەوان بێ بەشمان مەکە و لە دوای ئەوان تووشی ئاشوبمان مەکە.

**١٥٤٧- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُهُمْ إِذَا خَرَجُوا إِلَى الْمَقَابِرِ، كَانَ قَائِلُهُمْ يَقُولُ: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ، نَسْأَلُ اللَّهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ»[(٣)].**

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری دەکردن کە چوونە گۆڕستان بڵێن: سەلامی خواتان لێ بێ، ئەی خەڵکی مەنزڵگا لە بڕواداران و مسوڵمانان، وە ئێمەش بە ویستی خوا بە ئێوە دەگەین، داوای لێخۆش بوون بۆ خۆمان و بۆ ئێوەش لە خوا دەکەین.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣١٧٦، والترمذي: ١٠٢٠.

(٢) صحيح دون: «اللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُمْ، وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُمْ». أخرجه مسلم: ٩٧٤ بنحوه، والنسائي: ٢٠٣٧ و ٢٠٣٩ و ٣٩٦٣ و ٣٩٦٤ مطولاً.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٥، والنسائي: ٢٠٤٠.




## بابەت: چۆنیەتی دانیشتن لە ناو گۆڕستان

١٥٤٨- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي جِنَازَةٍ، «فَقَعَدَ حِيَالَ الْقِبْلَةِ»[١].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین لەگەڵ جەنازەیەک تا گەیشتینە لای گۆڕەکەی، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) دانیشت ڕووە و قیبلە.

١٥٤٩- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي جِنَازَةٍ، فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ «فَجَلَسَ، وَجَلَسْنَا، كَأَنَّ عَلَى رُءُوسِنَا الطَّيْرَ»[٢].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ جەنازەیەک دەرچووین تاکو گەیشتینە سەر گۆڕەکە ئنجا دانیشت، وە ئێمەش دانیشتین، بە جۆرێک وەکو ئەوەی کە باڵندە لەسەر سەرمان بێ (واتە: زۆر بە ئارامی دانیشتین).

## بابەت: مردوو خستنە ناو گۆڕ

١٥٥٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أُدْخِلَ الْمَيِّتُ الْقَبْرَ، قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ، وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللَّهِ» وَقَالَ أَبُو خَالِدٍ مَرَّةً: إِذَا وُضِعَ الْمَيِّتُ فِي لَحْدِهِ قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ، وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ» وَقَالَ هِشَامٌ فِي حَدِيثِهِ: «بِسْمِ اللَّهِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللَّهِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: کاتێک کە مردوو دەخرایە ناو گۆڕ پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: بە ناوی خوا، وە لەسەر دینی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ئەبو خالید جارێک گوتی: کاتێک مردوو خرایە ناو گۆڕەکەی فەرمووی: بە ناوی خوا، وە لەسەر سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا، وە هیشام لە گێڕانەوەکەیدا گوتی: بە ناوی خوا، وە لە پێناو خوا، وە لەسەر دین و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: لە کاتی ناشتنی مردووەکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی دەفەرموو).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢١٢، والنسائي: دون قوله: «حِيَالَ الْقِبْلَةِ» ٢٠٠١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٧٥٣ مطولًا، والنسائي: ٢٠٠١.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢١٣، والترمذي: ١٠٤٦.




**١٥٥١-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، قَالَ: «سَلَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَعْدًا، وَرَشَّ عَلَى قَبْرِهِ مَاءً»[١].

واتە: ئەبو ڕافیع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە هێواشی و بە هێمنی سەعدی خستە ناو گۆڕەکەی، وە ئاوی بەسەر گۆڕەکەیدا ڕژاند.

**١٥٥٢-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «أُخِذَ مِنْ قِبَلِ الْقِبْلَةِ، وَاسْتُقْبِلَ اسْتِقْبَالًا»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای قیبلەوە وەرگیرا بۆ ناو گۆڕ، ئنجا ڕووەو قیبلە خرایە ناو گۆڕەوە.

**١٥٥٣-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ ﷺ، قَالَ: حَضَرْتُ ابْنَ عُمَرَ فِي جِنَازَةٍ، فَلَمَّا وَضَعَهَا فِي اللَّحْدِ، قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللَّهِ» فَلَمَّا أُخِذَ فِي تَسْوِيَةِ اللَّبِنِ عَلَى اللَّحْدِ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَجِرْهَا مِنَ الشَّيْطَانِ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، اللَّهُمَّ جَافِ الْأَرْضَ عَنْ جَنْبَيْهَا، وَصَعِّدْ رُوحَهَا، وَلَقِّهَا مِنْكَ رِضْوَانًا» قُلْتُ: يَا ابْنَ عُمَرَ أَشَيْءٌ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَمْ قُلْتَهُ بِرَأْيِكَ؟ قَالَ: «إِنِّي إِذًا لَقَادِرٌ عَلَى الْقَوْلِ، بَلْ شَيْءٌ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٣].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەیب ﷺ دەڵێ: لەگەڵ ئیبنو عومەر ﷺ بۆ ناشتنی جەنازەیەک ئامادە بووم، جا کاتێک لە ناو گۆڕەکەیدا داینا، گوتی: بە ناوی خوا، وە لە پێناو خوا، وە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا کاتێک دەستی کرد بە ڕێکخستنی خشتەکانی سەر گۆڕەکەی گوتی: خودایە لە شەڕی شەیتان بیپارێزە، لە سزای گۆڕ بیپارێزە، خودایە زەوی لە تەنیشتەکانی جیا بکەوە (گۆڕی بۆ فراوان بکە)، گیانی بەرز بکەوە، وە ڕەزامەندی خۆتی بۆ بنێرە، گوتم: ئەی ئیبنو عومەر ﷺ ئایا شتێکت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە لەوەی کە دەیڵێی، یان لە خۆتەوە ئەم پاڕانەوەیە دەکەی؟ گوتی: بۆ مەگەر من دەتوانم قسەی خۆم بکەم، (نەخێر) بەڵکو لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.

## بابەت: سوننەتی لاگۆڕ

**١٥٥٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّحْدُ لَنَا، وَالشَّقُّ لِغَيْرِنَا»(١).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ناشتن بە لاگۆڕ بۆ ئێمەیە (بۆ مسوڵمانان) وە چاڵ کردنی گۆڕ بۆ غەیری ئێمەیە.

**١٥٥٥-** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّحْدُ لَنَا، وَالشَّقُّ لِغَيْرِنَا»(٢).

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ناشتن بە شێوەی لاگۆڕ بۆ ئێمەیە، وە چاڵ کردنی گۆڕ بۆ غەیری ئێمەیە.

**١٥٥٦-** عَنْ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «أَلْحِدُوا لِي لَحْدًا، وَانْصِبُوا عَلَيَّ اللَّبِنَ نَصْبًا، كَمَا فُعِلَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ»(٣).

واتە: سەعد ﷺ دەڵێ: بە شێوەی لاگۆڕ گۆڕم بۆ هەڵکەنن وە بمنێژن، وە بە خشتیش گۆڕەکەم هەڵچنن، هەروەکو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە کراوە.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی چاڵکردن

**١٥٥٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ كَانَ بِالْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَلْحَدُ، وَآخَرُ يَضْرَحُ، فَقَالُوا: نَسْتَخِيرُ رَبَّنَا، وَنَبْعَثُ إِلَيْهِمَا، فَأَيُّهُمَا سُبِقَ تَرَكْنَاهُ، فَأُرْسِلَ إِلَيْهِمَا، فَسَبَقَ صَاحِبُ اللَّحْدِ «فَلَحَدُوا لِلنَّبِيِّ ﷺ»(٤).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، لە مەدینە دوو پیاو هەبوون گۆڕیان هەڵدەکەند، یەکێکیان بە لاگۆڕ و، ئەویتر بە چاڵکردن، گوتیان: ئیستیخارە بە پەروەردگارمان دەکەین بە دوایاندا دەنێرین کامیان زووتر هات ئەو گۆڕەکە هەڵکەنێ، ئنجا ئەوەی کە بە لاگۆڕ گۆڕی هەڵدەکەند پێشتر هات، ئنجا لاگۆڕیان بۆ پێغەمبەر ﷺ ئامادە کرد.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٢٠٨، والترمذي: ١٠٤٥، والنسائي: ٢٠٠٩.

(٢) حسن بطرقه.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٦٦، والنسائي: ٢٠٠٧ و ٢٠٠٨.

(٤) حسن صحيح.




١٥٥٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: لَمَّا مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ اخْتَلَفُوا فِي اللَّحْدِ وَالشَّقِّ، حَتَّى تَكَلَّمُوا فِي ذَلِكَ، وَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمْ، فَقَالَ عُمَرُ: لَا تَصْخَبُوا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَيًّا وَلَا مَيِّتًا، أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا، فَأَرْسَلُوا إِلَى الشَّقَّاقِ، وَاللَّاحِدِ جَمِيعًا، فَجَاءَ اللَّاحِدُ، «فَلَحَدَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ دُفِنَ ﷺ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، هاوەڵان ڕاجیاییان تێکەوت لە بارەی گۆڕەکەی کە لاگۆڕ بێت یان چاڵ، تا وای لێهات قسەیان لەسەر کردوو دەنگیان بەرز بۆوە، ئنجا عومەر ﵁ گوتی: لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ هات و هاوار مەکەن چ بە زیندوویی چ بە مردووی، یان شتێک لەو بابەتەی گوت، (عومەر ﵁ گوتی:) ئەوانەی کە لاگۆڕ لێدەدەن و ئەوانەشی گۆڕ بە چاڵ هەڵدکەنن بە دوای هەموویاندا بنێرن، ئنجا ئەوەیان هات کە بە لاگۆڕ گۆڕی ئامادە دەکرد، ئنجا گۆڕی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە کرد، پاشان ناشتیان.

## بابەت: چاڵی گۆڕ
## (واتە: چاڵکردنی ناوەڕاستی گۆڕەکە بە ئەندازەی مردووەکە)

١٥٥٩- عَنِ الْأَدْرَعِ السُّلَمِيِّ ﵁، قَالَ: جِئْتُ لَيْلَةً أَحْرُسُ النَّبِيَّ ﷺ، فَإِذَا رَجُلٌ قِرَاءَتُهُ عَالِيَةٌ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا مُرَاءٍ، قَالَ: فَمَاتَ بِالْمَدِينَةِ، فَفَرَغُوا مِنْ جِهَازِهِ، فَحَمَلُوا نَعْشَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْفُقُوا بِهِ، رَفَقَ اللَّهُ بِهِ، إِنَّهُ كَانَ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ» قَالَ: وَحَفَرَ حُفْرَتَهُ فَقَالَ: «أَوْسِعُوا لَهُ، أَوْسَعَ اللَّهُ عَلَيْهِ» فَقَالَ بَعْضُ أَصْحَابِهِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَقَدْ حَزِنْتَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «أَجَلْ، إِنَّهُ كَانَ يُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ»[٢].

واتە: ئەدرەعی سولەمیی ﵁ دەڵێ: شەوێک بۆ پاسەوانی پێغەمبەر ﷺ هاتم، لەو کاتەدا پیاوێک قورئانی بە دەنگی بەرز دەخوێند، ئنجا پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پیاوە ڕیابازە، گوتی: جا ئەو پیاوە لە مەدینە مرد، لە ئامادە کردنی بوونەوە بۆ ناشتن، تەرمەکەیان هەڵگرت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەگەڵی نەرم و نیان بن خوا نەرمی لەگەڵ بنوێنێ (واتە: پەلە مەکەن لە ڕۆیشتن) بەڕاستی ئەو پیاوە خوا و پێغەمبەری خوای ﷺ خۆش ویستووە، گوتی:

(١) صحيح دون ذكر عمر وقوله.

(٢) ضعيف.




ئنجا گۆڕەکەیان بۆ هەڵکەند جا فەرمووی: بۆی فراوان بکەن خوا سۆزی فراوانی بەسەردا برێژێ، هەندێ لە هاوەڵانی گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی بۆی دڵگران بووی، فەرمووی بەڵێ، بەڕاستی ئەو خوا و پێغەمبەری خوای ﷺ خۆش دەویست.

**١٥٦٠-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «احْفِرُوا، وَأَوْسِعُوا، وَأَحْسِنُوا»[١].

واتە: هیشامی کوڕی عامیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (دەربارەی گۆڕ) هەڵیکەنن و چاڵی بکەن و، فراوانی بکەن و، چاکی بکەن.

## بابەت: نیشانە کردنی گۆڕ

**١٥٦١-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَعْلَمَ قَبْرَ عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ بِصَخْرَةٍ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕی عوسمانی کوڕی مەزعونی بە بەردێک نیشانە کرد (بۆ ئەوەی دواتر بناسرێتەوە).

## بابەت: قەدەغە کردنی دروست کردنی خانو لەسەر گۆڕ و گەچکاری و لەسەر نووسینی

**١٥٦٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَجْصِيصِ الْقُبُورِ»[٣].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گەچکاریکردنی گۆڕی (یان دروست کردنی گۆڕ بە گەچی) قەدەغە کردوە.

**١٥٦٣-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُكْتَبَ عَلَى الْقَبْرِ شَيْءٌ»[٤].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە هیچ شتێک لەسەر گۆڕ بنووسرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢١٥، والترمذي: ١٧١٣، والنسائي: ٢٠١١ و ٢٠١٧.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٠، وأبو داود: ٣٢٢٥، والترمذي: ١٠٥٢، والنسائي: ٢٠٢٩.

(٤) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٢٢٦، والنسائي: ٢٠٢٧.




**١٥٦٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «نَهَى أَنْ يُبْنَى عَلَى الْقَبْرِ»(١).**

واتە: ئەبو سەعيد ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە کە خانوو لەسەر گۆڕ دروست بکرێ.

## بابەت: پڕژاندنی گڵ (خۆڵ) بەسەر گۆڕدا

**١٥٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «صَلَّى عَلَى جِنَازَةٍ، ثُمَّ أَتَى قَبْرَ الْمَيِّتِ، فَحَثَى عَلَيْهِ مِنْ قِبَلِ رَأْسِهِ ثَلَاثًا»(٢).**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر جەنازەیەک کردو و هاتە سەر گۆڕەکەی و سێ جار گڵی پڕژاندە سەری لەلای سەرییەوە.

## بابەت: قەدەغە کردنی ڕۆیشتن بەسەر گۆڕ و دانیشتن لەسەری

**١٥٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ تُحْرِقُهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ»(٣).**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە ئەگەر لەسەر پۆلویەکی ئاگر دانیشێ و بیسوتێنێ، باشترە لەوەی کە لەسەر گۆڕێک دانیشێ.

**١٥٦٧- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَأَنْ أَمْشِيَ عَلَى جَمْرَةٍ، أَوْ سَيْفٍ، أَوْ أَخْصِفَ نَعْلِي بِرِجْلِي، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَمْشِيَ عَلَى قَبْرِ مُسْلِمٍ، وَمَا أُبَالِي أَوَسْطَ الْقُبُورِ قَضَيْتُ حَاجَتِي، أَوْ وَسْطَ السُّوقِ»(٤).**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧١، وأبو داود: ٣٢٢٨، والنسائي: ٢٠٤٤.

(٤) صحيح.

واتە: عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بەسەر پۆلویەکی ئاگردا، یان شمشێرێکدا بڕۆم، یان نەعلەکانم بە ناو قاچمدا بچن، زۆر پێم خۆشترە لەوەی کە بەسەر گۆڕی مسوڵمانێکدا بڕۆم، وە گوێی پێنادەم و وەکو یەکە لە ناوەڕاستی گۆڕستان سەرئاو بکەم، یان لە ناوەڕاستی بازاڕدا (واتە: هەردووکیان کارێکی ناشیرین و نەخوازراون).

## بابەت: دانانی پێڵاو لەسەر گۆڕستان

**١٥٦٨-** عَنْ بَشِيرِ ابْنِ الْخَصَاصِيَةِ ﷺ، قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «يَا ابْنَ الْخَصَاصِيَّةِ مَا تَنْقِمُ عَلَى اللَّهِ؟ أَصْبَحْتَ تُمَاشِي رَسُولَ اللَّهِ» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَا أَنْقِمُ عَلَى اللَّهِ شَيْئًا، كُلُّ خَيْرٍ قَدْ آتَانِيهِ اللَّهُ، «فَمَرَّ عَلَى مَقَابِرِ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ: «أَدْرَكَ هَؤُلَاءِ خَيْرًا كَثِيرًا» ثُمَّ مَرَّ عَلَى مَقَابِرِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ: «سَبَقَ هَؤُلَاءِ خَيْرًا كَثِيرًا» قَالَ: فَالْتَفَتَ، فَرَأَى رَجُلًا يَمْشِي بَيْنَ الْمَقَابِرِ فِي نَعْلَيْهِ، فَقَالَ: «يَا صَاحِبَ السِّبْتِيَّتَيْنِ أَلْقِهِمَا»[1].

واتە: بەشیری کوڕی خەصاصیە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا کە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆیشتم فەرمووی: ئەی ئیبنو خەصاصیە چ شتێکت پێناخۆشە لەلایەن خوداوە؟ لە کاتێکدا کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا دەڕۆیت، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا هیچ شتێکم لەلایەن خواوە پێناخۆش نیە، هەرچی چاکەیە خوا پێی داوم، ئنجا بەلای گۆڕستانی مسوڵماناندا تێپەڕی و فەرمووی: ئا ئەوانە چاکە و خێری زۆریان هاتە ڕێگا و بینیان، پاشان بە لای گۆڕستانی موشریکەکاندا تێپەڕی و فەرمووی: ئا ئەوانە چاکەیەکی زۆریان بەسەردا تێپەڕی و نەیانبینی و خۆیان لێ لادا، گوتی: پاشان ئاوڕی داوە و پیاوێکی بینی کە بە نەعلەوە بە ناو گۆڕەکاندا دەڕوات، ئنجا فەرمووی: ئەی خاوەنی دوو نەعلەکە نەعلەکانت دابنێ.

**السبت:** جۆرە نەعلێکە لە پێستی دەباغ کراوی مانگا دروست دەکرێ.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٢٣٠، والنسائي: ٢٠٤٨.

**١٥٦٨م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُثْمَانَ يَقُولُ: حَدِيثٌ جَيِّدٌ وَرَجُلٌ ثِقَةٌ[١].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: سەردانی کردنی گۆڕستان

**١٥٦٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «زُورُوا الْقُبُورَ؛ فَإِنَّهَا تُذَكِّرُكُمُ الْآخِرَةَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەردانی گۆڕستان بکەن، چونکە ئەو سەردانیکردنە ڕۆژی دواییتان بیر دەخاتەوە.

**١٥٧٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «رَخَّصَ فِي زِيَارَةِ الْقُبُورِ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بۆ سەردانی کردنی گۆڕستان.

**١٥٧١-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ، فَزُورُوهَا؛ فَإِنَّهَا تُزَهِّدُ فِي الدُّنْيَا، وَتُذَكِّرُ الْآخِرَةَ»[٤].

واتە: ئیبنو مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە سەردانی کردنی گۆڕستان قەدەغەم کردبوون، بەڵام ئێستا سەردانی بکەن، چونکە دونیاتان لەلا کەم دەکاتەوە و دوارِۆژتان بیر دەخاتەوە.

## بابەت: سەردانی کردنی گۆڕستانی هاوبەشدانەران

**١٥٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: زَارَ النَّبِيُّ ﷺ قَبْرَ أُمِّهِ، فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ، فَقَالَ: «اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا، فَلَمْ يَأْذَنْ لِي، وَاسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأَذِنَ لِي، فَزُورُوا الْقُبُورَ، فَإِنَّهَا تُذَكِّرُكُمُ الْمَوْتَ»[٥].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٢٣٠، والنسائي: ٢٠٤٨.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٦/١٠٦، وأبو داود: ٣٢٣٤، والنسائي: ٢٠٣٤.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح لغيره.

(٥) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٧٦/١٠٦، وأبو داود: ٣٢٣٤، والنسائي: ٢٠٣٤.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەردانی گۆڕی دایكی كردو، گریا، ئەوانەشی كە لە دەوری بوون گریاندنی، ئنجا فەرمووی: داوای مۆڵەتم لە خوا كرد بۆ ئەوەی داوای لیخۆشبون بۆ دایكم بكەم، بەڵام مۆڵەتی نەدام، وە داوای مۆڵەتم لە خوا كرد بۆ ئەوەی سەردانی گۆڕەكەی بكەم، مۆڵەتی پێدام، ئێوەش سەردانی گۆڕستان بكەن، چونكە ئەو سەردانییە مردنتان بیر دەخاتەوە.

**١٥٧٣-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبِي كَانَ يَصِلُ الرَّحِمَ، وَكَانَ وَكَانَ، فَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ «فِي النَّارِ» قَالَ: فَكَأَنَّهُ وَجَدَ مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَأَيْنَ أَبُوكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حَيْثُمَا مَرَرْتَ بِقَبْرِ مُشْرِكٍ فَبَشِّرْهُ بِالنَّارِ» قَالَ: فَأَسْلَمَ الْأَعْرَابِيُّ بَعْدُ، وَقَالَ: لَقَدْ كَلَّفَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَعَبًا، مَا مَرَرْتُ بِقَبْرِ كَافِرٍ إِلَّا بَشَّرْتُهُ بِالنَّارِ[1].

واتە: سالیم لە باوكییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: دەشتەكییەك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوكم (هاوبەشدارنەر بوو) پەیوەندی خزمایەتی بەجێ دەگەیاندو، ئاوا و ئاوا بوو، ئایا لە كوێیە؟ فەرمووی: لە ئاگردایە، (ڕاوی) دەڵێ: كابرا دڵتەنگ بوو، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوكی تۆ لە كوێیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر كاتێك لە هەر شوێنێك بە لای گۆڕی هاوبەشدانەرێك تێپەڕی مژدەی ئاگری پێبدە، گوتی: جا لەمەودوا دەشتەكییەكە مسوڵمان بوو، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە كارێكی قورس فەرمانی پێكردووم، بەلای گۆڕی هیچ كافرێك تێپەڕ نەبووم مەگەر مژدەی ئاگرم پێداوە.

## بابەت: قەدەغە كردنی ئافرەتان لە سەردانی كردنی گۆڕستان

**١٥٧٤-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: «لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زُوَّارَاتِ الْقُبُورِ»[2].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی حەسانی كوڕی سابیت لە باوكییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی كردوە لەو ئافرەتانەی كە سەردانی گۆڕستان دەكەن.

---

(١) صحيح.

(٢) حسن لغيره.




**١٥٧٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زُوَّارَاتِ الْقُبُورِ[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەو ئافرەتانەی کە سەردانی گۆڕستان دەکەن.

**١٥٧٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: «لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زُوَّارَاتِ الْقُبُورِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەو ئافرەتانەی کە سەردانی گۆڕستان دەکەن.

**تێبینی:** ئەو نەفرین کردنانە کە لەم فەرموودانەدا هاتوون، پێش ڕێ پێدرانەکە بوون، کە بە شێوەیەکی ناشەرعی و نەگونجاو دەچوون بۆ سەر گۆڕستان.

## بابەت: شوێنکەوتنی جەنازە بۆ ئافرەتان

**١٥٧٧-** عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂، قَالَتْ: «نُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا»[٣].

واتە: ئوممو عەتییە ﵂ دەڵێ: (ئێمەی ئافرەتان) شوێنکەوتنی جەنازەمان لێ قەدەغە کراوە، بەڵام قەدەغەکردنی حەتمی نا (واتە: بەپێی ئەم فەرموودەیە حەڕام نیە، بەڵکو ناپەسندە).

**١٥٧٨-** عَنْ عَلِيٍّ ﵁، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَإِذَا نِسْوَةٌ جُلُوسٌ، فَقَالَ: «مَا يُجْلِسُكُنَّ» قُلْنَ: نَنْتَظِرُ الْجِنَازَةَ، قَالَ: «هَلْ تَغْسِلْنَ» قُلْنَ: لَا، قَالَ: «هَلْ تَحْمِلْنَ» قُلْنَ: لَا، قَالَ: «هَلْ تُدْلِينَ فِيمَنْ يُدْلِي» قُلْنَ: لَا، قَالَ: «فَارْجِعْنَ مَأْزُورَاتٍ غَيْرَ مَأْجُورَاتٍ»[٤].

واتە: عەلی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو لەو کاتەدا هەندێ لە ئافرەتان دانیشتبوون، ئەویش فەرمووی: چی ئێوەی لێرە دانیشاندووە؟ گوتیان: چاوەڕێی جەنازەکە دەکەین، فەرمووی: ئایا ئێوە دەیشۆن؟ گوتیان: نەخێر، فەرمووی: ئایا

---

(١) حسن لغيره دون ذكر «السُّرُجَ» فضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٢٣٦، والترمذي: ٣٢٠، والنسائي: ٢٠٤٣.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ١٠٥٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٣، ومسلم: ٩٣٨، وأبو داود: ٣١٦٧.

(٤) ضعيف.

هەڵیدەگرن (بۆ گۆڕستان)؟ گوتیان نەخێر، فەرمووی: ئایا ئێوە دەینێژن و دەیخەنە گۆڕەوە؟ گوتیان: نەخێر، فەرمووی: کەواتە بگەڕێنەوە گوناهبار دەبن و پاداشت وەرناگرن (واتە: بەپێی ئەو فەرموودەیە ئەگەر نەگەڕێنەوە، گوناهبار دەبن و لێیان قەدەغە کراوە شوێن جەنازە بکەون).

## بابەت: قەدەغەکردنی شین و ڕۆ ڕۆکردن بۆ مردوو

**١٥٧٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ ۙ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة، قَالَ: «النَّوْحُ»[١].**

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ ۙ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة، واتە: وە بێ فەرمانیت نەکەن لەهیچ کارێکی چاکەدا، فەرموویەتی: (بە مانای) گریان و ڕۆ ڕۆیە (ئەو گریانەی قەدەغە کراوە).

**١٥٨٠- عَنْ حَرِيزٌ مَوْلَى مُعَاوِيَةَ ﵁ قَالَ: خَطَبَ مُعَاوِيَةُ بِحِمْصَ فَذَكَرَ فِي خُطْبَتِهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «نَهَى عَنِ النَّوْحِ»[٢].**

واتە: حەریز کە خزمەتکاری موعاویە ﵁ بوو، دەڵێ: موعاویە لە حیمص وتاریدا، جا لە وتارەکەیدا باسی ئەوەی کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ گریان و ڕۆ ڕۆی قەدەغە کردوە (بۆ مردوو).

**١٥٨١- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «النِّيَاحَةُ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ، وَإِنَّ النَّائِحَةَ إِذَا مَاتَتْ، وَلَمْ تَتُبْ، قَطَعَ اللَّهُ لَهَا ثِيَابًا مِنْ قَطِرَانٍ، وَدِرْعًا مِنْ لَهَبِ النَّارِ»[٣].**

واتە: ئەبو مالیکی ئەشعەریی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شین و ڕۆ ڕۆکردن لە کردەوەی سەردەمی جاهیلییە، وە ئەو ئافرەتەی کە ئەو کارە دەکات ئەگەر مرد و تەوبەی نەکرد پۆشاکێکی بۆ لە قەتران دروست دەکرێ و، زرێیەکیش لە کڵپە و بڵیسەی ئاگر.

---

(١) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٣٠٧.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٣٤.

**١٥٨٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «النِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ، مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ، فَإِنَّ النَّائِحَةَ إِنْ لَمْ تَتُبْ قَبْلَ أَنْ تَمُوتَ، فَإِنَّهَا تُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهَا سَرَابِيلُ مِنْ قَطِرَانٍ، ثُمَّ يُعْلَى عَلَيْهَا، بِدِرْعٍ مِنْ لَهَبِ النَّارِ»[١].

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شین و ڕۆ ڕۆکردن لەسەر مردوو لەو کارانەی سەردەمی نەفامییە، ئەو کەسەی ئەو کارە دەکات ئەگەر پێش مردن تەوبە نەکات، لە ڕۆژی دواییدا بە جۆرێک زیندوو دەکرێتەوە کە پۆشاکێکی لەبەردایە لە قەتڕان، پاشان لەسەر ئەو پۆشاکە زرێیەکی لەبەر دەکرێ لە کڵپە و بڵێسەی ئاگر.

**١٥٨٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُتْبَعَ جِنَازَةٌ مَعَهَا رَانَّةٌ»[٢].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنکەوتنی جەنازەیەکی قەدەغە کردوە کە شین و هات و هاواری لەگەڵدا بێ.

## بابەت: قەدەغە کردنی لە دەم و چاوی خۆدان و یەخە دادڕین

**١٥٨٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ شَقَّ الْجُيُوبَ، وَضَرَبَ الْخُدُودَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ»[٣].

**واتە:** عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک یەخەی دادڕێ (لە کاتی بەڵاو گرفتارییدا) وە لە ڕووخساری خۆی بدات، یان هاوار بکات بە هاوارکردنی سەردەمی جاهیلی، لە ئێمە نیە.

**١٥٨٥-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «لَعَنَ الْخَامِشَةَ وَجْهَهَا، وَالشَّاقَّةَ جَيْبَهَا، وَالدَّاعِيَةَ بِالْوَيْلِ وَالثُّبُورِ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) حسن بطرقه وشواهده.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٩٤، ومسلم: ١٠٣، والترمذي: ٩٩٩، والنسائي: ١٨٦٠ و ١٨٦٢ و ١٨٦٤.

(٤) صحيح.

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەعنەتی کردوە لەو کەسەی کە ڕووخساری خۆی دەڕنێ و، ئەو کەسەی یەخەی دادەدڕێ و، ئەو کەسەی کە هات و هاوار دەکات بە هات و هاواری ڕۆ ڕۆ و بە هیلاک چوون.

**١٥٨٦**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ، وَأَبِي بُرْدَةَ ﷺ، قَالَا: لَمَّا ثَقُلَ أَبُو مُوسَى أَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ أُمُّ عَبْدِ اللَّهِ تَصِيحُ بِرَنَّةٍ، فَأَفَاقَ، فَقَالَ لَهَا: أَوَمَا عَلِمْتِ أَنِّي بَرِيءٌ مِمَّنْ بَرِئَ مِنْهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ وَكَانَ يُحَدِّثُهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «أَنَا بَرِيءٌ مِمَّنْ حَلَقَ، وَسَلَقَ، وَخَرَقَ»[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید و ئەبو بوڕدە ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویانە: کاتێ ئەبو موسا نەخۆشییەکەی لەسەر قورس بوو، خێزانەکەی کە دایکی عەبدوڵڵا بوو هات و هاواری دەکرد، (ئەبو موسا) بە ئاگاهاتەوە، پێی گوت: ئایا نازانی من بەریم لەو کەسەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی بەرییە؟ جا لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆی دەگێڕایەوە کە فەرموویەتی: من بەریم لەو کەسەی کە (لە کاتی ناخۆشیدا) سەری دەتاشێ و، قژی دەڕنێ و، دەنگ بەرز دەکاتەوە (یان کە ئافرەت لە ڕوخساری خۆی دەدات) و ئەوەش کە پۆشاکی لەبەر خۆی دادەڕنێ.

## بابەت: گریان لەسەر مردوو

**١٥٨٧**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي جِنَازَةٍ، فَرَأَى عُمَرُ امْرَأَةً، فَصَاحَ بِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: دَعْهَا يَا عُمَرُ، «فَإِنَّ الْعَيْنَ دَامِعَةٌ، وَالنَّفْسَ مُصَابَةٌ، وَالْعَهْدَ قَرِيبٌ»[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جەنازەیەک بوو، جا عومەر ﷺ ئافرەتێکی بینی دەگریا، تێیەوە خوڕی (بۆ ئەوەی بێدەنگ بێ)، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عومەر ﷺ وازی لێبێنە، چاوەکان فرمێسک دەڕێژن و، نەفس و دەروون و دڵ پەرێشانە (بە هۆی بەڵاکەوە)، ڕووداوەکەش نزیکەو تازەیە.

**١٥٨٧م**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي جِنَازَةٍ، فَرَأَى عُمَرُ امْرَأَةً، فَصَاحَ بِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: دَعْهَا يَا عُمَرُ، «فَإِنَّ الْعَيْنَ دَامِعَةٌ، وَالنَّفْسَ مُصَابَةٌ، وَالْعَهْدَ قَرِيبٌ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٤، والنسائي: ١٨٦٣.

(٢) ضعيف. أخرجه النسائي: ١٨٥٩.

(٣) ضعيف. أخرجه النسائي: ١٨٥٩.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جەنازەیەک بوو، جا عومەر ﷺ ئافرەتێکی بینی دەگریا، تێیەوە خوڕی (بۆ ئەوەی بێدەنگ بێ)، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عومەر ﷺ وازی لێبێنە چاوەکان فرمێسک دەڕێژن و، نەفس و دەروون و دڵ پەرێشانە (بە هۆی بەڵاکەوە)، ڕووداوەکەش نزیکەو تازەیە.

١٥٨٨- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ ابْنٌ لِبَعْضِ بَنَاتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقْضِي، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ أَنْ يَأْتِيَهَا، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا أَنَّ «لِلَّهِ مَا أَخَذَ، وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ». فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ، فَأَقْسَمَتْ عَلَيْهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقُمْتُ مَعَهُ، وَمَعَهُ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَعُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، فَلَمَّا دَخَلْنَا نَاوَلُوا الصَّبِيَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَرُوحُهُ تَقَلْقَلُ فِي صَدْرِهِ، قَالَ: حَسِبْتُهُ قَالَ: كَأَنَّهَا شَنَّةٌ، قَالَ: فَبَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ: مَا هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الرَّحْمَةُ الَّتِي جَعَلَهَا اللَّهُ فِي بَنِي آدَمَ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ»[1].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: یەکێک لە کچەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کوڕێکی هەبوو، لە کاتی گیان کێشاندا بوو، ناردی بە شوێن پێغەمبەردا ﷺ بۆ ئەوەی بچێتە لای لەوکاتەدا، (پێغەمبەریش ﷺ) بۆ کچەکەی ناردەوە کە خوا مافی ئەوەی هەیە کە وەریبگرێتەوە، ئەوەی بەخشیویشیەتی، هەر موڵکی خۆیەتی، وە هەموو شتێک لەلای خوا کاتی بۆ دیاری کراوە، کەواتە: ئارام بگرە و لەبەر خوا خۆڕاگربە (بۆ ئەو کۆسپە)، دیسان بە دوایدا ناردەوەو، سوێندی لەسەر خوارد (کە دەبێ بچێ)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و منیش لەگەڵیدا هەڵسام وە موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و عوبادەی کوڕی صامیتی لەگەڵ دابوو، جا کاتێک چووین منداڵەکەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، لەوکاتەدا هەناسەی سوار بوو، دەڵێ: پێم وابێ گوتی: وەکو کوندەیەک وابوو کە دەیهەژێنی، گوتی: ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ گریا، عوبادەی کوڕی صامیتیش گوتی: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەو گریانە)؟ فەرمووی: ئەو سۆز و بەزەییە کە خوا دایناوە لە ناو هەموو ئادەمیزادێکدا، وە خوا تەنها لەگەڵ ئەوانە بە سۆز و میهرەبانە کە سۆز و میهرەبانیان هەیە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٨٤، ومسلم: ٩٢٣، وأبو داود: ٣١٢٥، والنسائي: ١٨٦٨.

١٥٨٩- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ ﵂، قَالَتْ: لَمَّا تُوُفِّيَ ابْنُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِبْرَاهِيمُ بَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ الْمُعَزِّي: إِمَّا أَبُو بَكْرٍ، وَإِمَّا عُمَرُ: أَنْتَ أَحَقُّ مَنْ عَظَّمَ اللَّهُ حَقَّهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَدْمَعُ الْعَيْنُ، وَيَحْزَنُ الْقَلْبُ، وَلَا نَقُولُ مَا يُسْخِطُ الرَّبَّ، لَوْلَا أَنَّهُ وَعْدٌ صَادِقٌ، وَمَوْعُودٌ جَامِعٌ، وَأَنَّ الْآخِرَ تَابِعٌ لِلْأَوَّلِ، لَوَجَدْنَا عَلَيْكَ يَا إِبْرَاهِيمُ أَفْضَلَ مِمَّا وَجَدْنَا، وَإِنَّا بِكَ لَمَحْزُونُونَ»(١).

واتە: ئەسمائی کچی یەزید ﵂ دەڵێ: کاتێک کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ گریا، ئنجا یەکێک لەوانەی دڵیان دەدایەوە -یان ئەبو بەکر یان عومەر- پێی گوت: تۆ شیاوترینی ئەوانەی کە هەق و مافی خوا بە گەورە دادەنێن (مەبەستیان لەوەبوو کە پێیان وابووە ئەو گریانە ناهەقە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چاوەکان فرمێسک دەڕێژن و دڵیش غەمبار دەبێ، وە شتێک ناڵێین کە خوا توڕە بکات، خۆ ئەگەر بەڵێنی ڕاست و کۆبوونەوەی دیاریکراومان (لە قیامەتدا) نەبووایەو، ئەوە نەبووایە کە ئەوانەی دواتر بە شوێن ئەوانەی پێشتر دەکەون (واتە مردن هەموومان کۆدەکاتەوە ئەگەر ئەوە نەبووایە)، ئەوە زیاتر لە ئێستا بۆت غەمبار دەبووین ئەی ئیبراهیم، وە ئێمە بە دڵنیایی بۆت دڵتەنگین.

١٥٩٠- عَنْ حَمْنَةَ بِنْتِ جَحْشٍ ﵂، أَنَّهُ قِيلَ لَهَا: قُتِلَ أَخُوكِ، فَقَالَتْ: رَحِمَهُ اللَّهُ، وَإِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، قَالُوا: قُتِلَ زَوْجُكِ، قَالَتْ: وَاحُزْنَاهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلزَّوْجِ مِنَ الْمَرْأَةِ لَشُعْبَةً، مَا هِيَ لِشَيْءٍ»(٢).

واتە: حەمنەی کچی جەحش ﵂ دەگێڕێتەوە، کە پێیان گوت: براکەت کوژرا، ئەویش گوتی: خوا لەگەڵیدا بە بەزەیی بێت، وە ئێمە هەموومان موڵکی خواین و، هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، گوتیان: مێردەکەت مردووە، ئەویش گوتی: ئای بۆی دڵتەنگم، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ژن بۆ مێردەکەی پەیوەندییەکی وای هەیە کە بۆ هیچ شتێکی تر نیەتی (واتە: ئاساییە کە بۆ مێردەکەی زیاتر لە هەر کەسێ دڵتەنگ دەبێ).

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف.





**١٥٩١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِنِسَاءِ عَبْدِ الْأَشْهَلِ، يَبْكِينَ هَلْكَاهُنَّ يَوْمَ أُحُدٍ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَكِنَّ حَمْزَةَ لَا بَوَاكِيَ لَهُ» فَجَاءَ نِسَاءُ الْأَنْصَارِ يَبْكِينَ حَمْزَةَ، فَاسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «وَيْحَهُنَّ مَا انْقَلَبْنَ بَعْدُ؟ مُرُوهُنَّ فَلْيَنْقَلِبْنَ، وَلَا يَبْكِينَ عَلَى هَالِكٍ بَعْدَ الْيَوْمِ»(١).**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ئافرەتانی هۆزی عەبدولئەشهەلدا تێپەڕی لە کاتێکدا کە بۆ شەهیدەکانی ڕۆژی ئوحود دەگریان، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵام حەمزە کەسی لەسەر ناگریەت، ئنجا ئافرەتانی ئەنصارِ هاتن و لەسەر حەمزە (مامی پێغەمبەر ﷺ) گریان، پێغەمبەری خوا ﷺ بە خەبەر هات و فەرمووی: هاوار بۆیان کە تا ئێستا نەگەڕاونەوە؟ فەرمانیان پێبکەن بگەڕێنەوەو، لەم ڕۆژە بە دواوە لەسەر هیچ مردوویەک نەگریەن. (ئەو ڕووداوە پێش قەدەغە کردنی گریان بووە لەسەر مردوو هەروەکو ڕوونە لە سیاقەکەدا).

**١٥٩٢- عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى ﵄، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمَرَاثِي»(٢).**

واتە: ئیبنو ئەبو ئەوفا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاهەڵدانی بەسەر مردوودا قەدەغە کردوە.

## بابەت: سزای مردوو بەهۆی گریان و ڕۆ ڕۆیی نزیکەکانی

**١٥٩٣- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ»(٣).**

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﵁، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مردوو سزا دەچێژێ بە هۆی ئەوانەی کە گریان و ڕۆ ڕۆیی لەسەر دەکەن (ئەگەر کەسەکە خۆی وەسیەتی کردبێ ڕۆڕۆی بۆی بکەن).

**١٥٩٤- عَنْ مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﵁، عَنْ أَبِيهِ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الْحَيِّ، إِذَا قَالُوا: وَاعَضُدَاهُ، وَاكَاسِيَاهُ، وَانَاصِرَاهُ، وَاجَبَلَاهُ، وَنَحْوَ هَذَا، يُتَعْتَعُ»، وَيُقَالُ: «أَنْتَ كَذَلِكَ؟ أَنْتَ كَذَلِكَ؟» قَالَ أَسِيدٌ: فَقُلْتُ سُبْحَانَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ١٦٤﴾**

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٨٧، ومسلم: ٩٢٧، والترمذي: ١٠٠٢، والنسائي: ١٨٥٣ و ١٨٥٥.




الأنعام، قَالَ: وَيْحَكَ أُحَدِّثُكَ أَنَّ أَبَا مُوسَى حَدَّثَنِي عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَتَرَى أَنَّ أَبَا مُوسَى كَذَبَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ؟ أَوْ تَرَى أَنِّي كَذَبْتُ عَلَى أَبِي مُوسَى[1].

واتە: موسای ئەشعەریی لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مردوو سزا دەچێژێ بە هۆی گریانی زیندووەکان لەسەری، کاتێک دەڵێن: پشتیوان و سەرۆکمان ڕۆ، ئەو کەسەمان ڕۆ، کە بەرگی دەکردین یارمەتیدەرمان ڕۆ، پشتیوانی وەکو کێومان ڕۆ، یان شتێک لەو بابەتەیان گوت، بە توندی لە ئەوە دەگیرێ و پێی دەگوترێ: تۆ ئاوای (بە توانجەوە)؟ ئەسید (ڕاوی) دەڵێ: گوتم: پاک و بێگەردی بۆ خوا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٦٤﴾﴾ الأنعام، واتە: وە هیچ کەسێکی گوناهکار گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێت. موسا گوتی: هاوار بۆ تۆ من لە ئەبو موسا بۆت دەگێڕمەوە، کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاویەتەوە، جا تۆ پێتوایە کە ئەبو موسا درۆی بە زمانی پێغەمبەرەوە ﷺ کردوە، یان پێت وایە کە من درۆ بە زمانی ئەبو موساوە دەکەم.

١٥٩٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: إِنَّمَا كَانَتْ يَهُودِيَّةٌ مَاتَتْ، فَسَمِعَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ يَبْكُونَ عَلَيْهَا، قَالَ: «فَإِنَّ أَهْلَهَا يَبْكُونَ عَلَيْهَا، وَإِنَّهَا تُعَذَّبُ فِي قَبْرِهَا»[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئافرەتێکی جوولەکە مردبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێبوو کە بۆی دەگریان، فەرمووی: بێگومان خزمەکانی بۆی دەگریەن و، ئەویش لە ناو گۆڕەکەیدا پێی سزا دەدرێ.

## بابەت: ئارامگرتن لەسەر کۆست و ناخۆشی

١٥٩٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى»[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئارامی و خۆڕاگری ئەوەیە کە لە سەرتای کۆستەکەوە بێ.

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ١٠٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٨٩، ومسلم: ٩٣٢، والترمذي: ١٠٠٤ و ١٠٠٦، والنسائي: ١٨٥٥_١٨٥٦ بنحوه.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٨٣ و ١٣٠٢ و ٧١٥٤، ومسلم: ٩٢٦، وأبو داود: ٣١٢٤، والترمذي: ٩٨٧، والنسائي: ١٨٦٩.

١٥٩٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: يَقُولُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: «ابْنَ آدَمَ إِنْ صَبَرْتَ، وَاحْتَسَبْتَ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى، لَمْ أَرْضَ لَكَ ثَوَابًا دُونَ الْجَنَّةِ»[١].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای پاک و بێگەرد دەفەرمووێ: ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر ئارامت گرت و بە هیوای پاداشتی من ئارامگر و خۆڕاگر بوویت (بۆ کۆست بەڵا) لە سەرەتای کۆستەکە، ئەوە بە هیچ پاداشتێ ڕازی نابم لە بەرانبەردا بۆ تۆ جگە لە بەهەشت.

١٥٩٨- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ، حَدَّثَهَا أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصَابُ بِمُصِيبَةٍ، فَيَفْزَعُ إِلَى مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ مِنْ قَوْلِهِ: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾ البقرة، اللَّهُمَّ عِنْدَكَ احْتَسَبْتُ مُصِيبَتِي، فَأْجُرْنِي فِيهَا، وَعَوِّضْنِي مِنْهَا، إِلَّا آجَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهَا، وَعَاضَهُ خَيْرًا مِنْهَا»، قَالَتْ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَةَ ذَكَرْتُ الَّذِي حَدَّثَنِي عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾، اللَّهُمَّ عِنْدَكَ احْتَسَبْتُ مُصِيبَتِي هَذِهِ، فَأْجُرْنِي عَلَيْهَا، فَإِذَا أَرَدْتُ أَنْ أَقُولَ: وَعِضْنِي خَيْرًا مِنْهَا، قُلْتُ فِي نَفْسِي: أُعَاضُ خَيْرًا مِنْ أَبِي سَلَمَةَ؟ ثُمَّ قُلْتُهَا، فَعَاضَنِي اللَّهُ مُحَمَّدًا ﷺ، وَآجَرَنِي فِي مُصِيبَتِي[٢].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، لە ئەبو سەلەمە ﷺ گێڕاویەتەوە، لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوویەتی کە فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێک کە بەڵایەکی بەسەر دادێت و پەنا دەباتە بەر ئەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوە بە گوتنی: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾ البقرة، واتە: ئێمە هەر هی خواین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، وە بڵێین: خوایە لە پێناو تۆدا ئارام دەگرم لەسەر ئەو بەڵایەی بەسەرمدا هاتوە، جا پاداشتم بدەوە وە قەرەبووم بۆ بکەوە (کە ئەوەی گوت) ئەوە خوا پاداشتی دەداتەوە لەسەر ئەو بەڵایەو، بە باشترین شێوە قەرەبووی دەکاتەوە، (ئوممو سەلەمە ﷺ) گوتی: کاتێک کە ئەبو سەلەمە مرد منیش ئەوەم بیرهاتەوە کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گێڕامەوە: منیش گوتم: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾ خودایە ئەو بەڵایە بە تاقیکردنەوەی تۆ دەزانم، سا تۆش پاداشتم بدەوە لەسەری، جا کاتێ ویستم بڵێم: بە

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٥١١.




باشتر لەو قەرەبووم بۆ بکەوە، بە خۆمم گوت: ئایا بە باشتر لە ئەبو سەلەمە قەرەبوو دەکرێمەوە؟ پاشان ئەویشم گوت، ئنجا خوا بە موحەممەد ﷺ قەرەبووی کردمەوەو، لەسەر بەڵایەکەم کە بەسەرم هاتبوو پاداشتی دامەوە.

**١٥٩٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: فَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَابًا بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّاسِ، أَوْ كَشَفَ سِتْرًا، فَإِذَا النَّاسُ يُصَلُّونَ وَرَاءَ أَبِي بَكْرٍ، فَحَمِدَ اللَّهَ عَلَى مَا رَأَى مِنْ حُسْنِ حَالِهِمْ، وَرَجَاءَ أَنْ يَخْلُفَهُ اللَّهُ فِيهِمْ بِالَّذِي رَآهُمْ، فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَيُّمَا أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ، أَوْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أُصِيبَ بِمُصِيبَةٍ، فَلْيَتَعَزَّ بِمُصِيبَتِهِ بِي عَنِ الْمُصِيبَةِ الَّتِي تُصِيبُهُ بِغَيْرِي، فَإِنَّ أَحَدًا مِنْ أُمَّتِي لَنْ يُصَابَ بِمُصِيبَةٍ بَعْدِي أَشَدَّ عَلَيْهِ مِنْ مُصِيبَتِي»[(١)].**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دەرگایەی نێوان خۆی و خەڵکەکەی کردەوە، یان پەردەکەی لادا، لەو کاتەدا خەڵکی لە دوای ئەبو بەکر نوێژیان دەکرد، ئنجا سوپاسی خوای کرد لەسەر ئەوەی کە بینی حاڵیان باشە، وە ئومێدی خواست بەوەی کە کە خوا جێنشینیان بۆ دیاری بکات بەوەی کە لێیانی بینی، ئنجا فەرمووی: ئەی خەڵکینە هەر یەکێک لەو خەڵکە یان هەر یەکێک لە بڕواداران کە تووشی بەڵایەک بوو، با بۆ بەڵایەکەی دڵنەوایی خۆی بکات بەوەی کە مردنی من گەورەترە لە بەڵای ئەو، چونکە هیچ یەکێک لە ئوممەتی من تووشی بەڵایەک نابێت کە توندتر و قورستر بێت لەو موسیبەتەی من (کە وەفات کردنەکەیەتی).

**١٦٠٠- عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْحُسَيْنِ، عَنْ أَبِيهَا ﵄، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ أُصِيبَ بِمُصِيبَةٍ، فَذَكَرَ مُصِيبَتَهُ، فَأَحْدَثَ اسْتِرْجَاعًا، وَإِنْ تَقَادَمَ عَهْدُهَا، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلَهُ يَوْمَ أُصِيبَ»[(٢)].**

واتە: فاتیمەی کچی حوسەین لە باوکییەوە ﵄ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس تووشی بەڵایەک بوو، ئنجا بەڵایەکەی بیرهاتەوەو گوتنی: «إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ»ـی نوێکردەوە ئەگەر کاتێکی زۆریشی بەسەردا ڕۆیشتبێ، ئەوە خوا پاداشتی بۆ دەنوسێ، وەکو ئەو ڕۆژەی کە تێیدا تووشی ئەو بەڵایە بووە.

---

(١) حسن بشواهده.

(٢) ضعيف جداً.




## بابەت: پاداشتی ئەو کەسەی
## کە دڵنەوایی خاوەن موسیبەت دەکات

١٦٠١- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَا مِنْ مُؤْمِنٍ يُعَزِّي أَخَاهُ بِمُصِيبَةٍ، إِلَّا كَسَاهُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ مِنْ حُلَلِ الْكَرَامَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ، دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ بڕوادارێک نیە کە دڵنەوایی براکەی بکات لەسەر کۆستێک ئیلا خوای پاک و بێگەرد لە ڕۆژی دوایدا دەیڕازێنێتەوە بە پۆشاکی ڕێز و شکۆ.

١٦٠٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ عَزَّى مُصَابًا فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس دڵنەوایی کۆست کەوتویەک بکات بە ئەندازەی ئەو پاداشتی هەیە.

## بابەت: پاداشتی ئەو کەسەی کە منداڵی دەمرێ

١٦٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَمُوتُ لِرَجُلٍ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ فَيَلِجَ النَّارَ، إِلَّا تَحِلَّةَ الْقَسَمِ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ پیاوێک نیە کە سێ منداڵی بمرێ و، بچێتە دوزەخ مەگەر کەمێکی زۆر کەم نەبێ (وەکو دەڵێ: تەنها لەبەر خاتری سوێند نەبێ).

**إِلَّا تَحِلَّةَ الْقَسَمِ:** بەکاردەهێنرێ بۆ شتێک کە زۆر کەم بێ، وەکو لە کوردەواریی دەڵێ: ئەو شتە ناکەم تەنها لەبەر سوێندەکە نەبێ، واتە: بەشی ئەوەندە کارەکە دەکەم کە سوێندەکە نەکەوێ و هیچی تر.

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٠٧٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٥١، ومسلم: ٢٦٣٢، والترمذي: ١٠٦٠، والنسائي: ١٨٧٥.

**١٦٠٤- عَنْ شُرَحْبِيل بْنِ شُفْعَةَ، قَالَ: لَقِيَنِي عُتْبَةُ بْنُ عَبْدٍ السُّلَمِيُّ ﷺ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ لَهُ ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ، إِلَّا تَلَقَّوْهُ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ، مِنْ أَيِّهَا شَاءَ دَخَلَ»[١].**

**واتە: شورەحبیلی کوڕی شوفعە دەڵێ: عوتبەی کوڕی عەبدی سولەمی ﷺ پێمگەیشت و گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: هیچ مسوڵمانێک نیە کەوا سێ منداڵی بمرێ و نەگەشتبنە قۆناغی باڵغ بوون ئیلا لە ڕۆژی دواییدا لە هەر هەشت دەرگای بەهەشت پێی دەگەن، جا لە کام دەرگاوە حەز بکات دەچێتە ناو بەهەشت.**

**١٦٠٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يُتَوَفَّى لَهُمَا ثَلَاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ، إِلَّا أَدْخَلَهُمُ اللَّهُ الْجَنَّةَ، بِفَضْلِ رَحْمَةِ اللَّهِ إِيَّاهُمْ»[٢].**

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، ﷺ فەرموویەتی: هەر دوو مسوڵمانێک کەوا سێ منداڵیان دەمرن و نەگەیشتوونە قۆناغی باڵغ بوون، ئەوە حەتمەن خوای میهرەبان بە فەزڵ و چاکە بۆیان دەیان خاتە ناو بەهەشتەوە.**

**١٦٠٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَدَّمَ ثَلَاثَةً مِنَ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ، كَانُوا لَهُ حِصْنًا حَصِينًا مِنَ النَّارِ» فَقَالَ أَبُو ذَرٍّ: قَدَّمْتُ اثْنَيْنِ، قَالَ: «وَاثْنَيْنِ» فَقَالَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ سَيِّدُ الْقُرَّاءِ: قَدَّمْتُ وَاحِدًا، قَالَ: «وَوَاحِدًا»[٣].**

**واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سێ منداڵ پێش خۆی بخات (بمرن) کە نەگەیشتبنە قۆناغی باڵغ بوون، بۆی دەبنە قەڵایەکی بەهێز بۆ پاراستنی لە ئاگر، ئنجا ئەبو زەڕ ﷺ گوتی: من دوو دانەم پێش خۆم خستوون، فەرمووی: دوو دانەش، ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ گەورەی قورئان خوێنان گوتی: من دانەیەکم پێش خۆم خستووە، فەرمووی: دانەیەکیش.**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٤٨ و ١٣٨١، والنسائي: ١٨٧٣.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٠٦١.




## بابەت: منالێ کە پێش تەواوبوون و کامڵ بوون لە دایک دەبێ و لەبار دەچێ

١٦٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَسِقْطٌ أُقَدِّمُهُ بَيْنَ يَدَيَّ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ فَارِسٍ أُخَلِّفُهُ خَلْفِي»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منالێ کە بەر لە کامڵ بوون لە دایک دەبێ کە پێش خۆمی بخەم (بۆ قیامەت) لەلام خۆشترە لەوەی کە سوارچاکێک لەدوای خۆم بەجێ بێڵم.

١٦٠٨- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ السِّقْطَ لَيُرَاغِمُ رَبَّهُ، إِذَا أَدْخَلَ أَبَوَيْهِ النَّارَ، فَيُقَالُ: أَيُّهَا السِّقْطُ الْمُرَاغِمُ رَبَّهُ أَدْخِلْ أَبَوَيْكَ الْجَنَّةَ، فَيَجُرُّهُمَا بِسَرَرِهِ، حَتَّى يُدْخِلَهُمَا الْجَنَّةَ»، قَالَ أَبُو عَلِيٍّ: يُرَاغِمُ رَبَّهُ، يُغَاضِبُ(٢).

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مندالی لەبارچوو زۆر زێدەڕۆیی دەکات لە تکاکردن لە خوای پەروەردگار کاتێک کە دایک و باوکی دەچنە ناو ئاگر، ئنجا پێی دەگوترێ: ئەی ئەو منداڵەی کە زۆر زێدەڕۆیی دەکەی لە تکاکردن لە پەروەردگار دایک و باوکت ببە بۆ بەهەشت، ئنجا بە ناوکە پەتکی ڕایان دەکێشێتە دەرەوە تاکو دەیانباتە ناو بەهەشت. ئەبو عەلی دەڵێ: «يُـرَاغِمُ رَبَّهُ»، واتە: منداڵەکە تووڕە دەبێ.

١٦٠٩- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ السِّقْطَ، لَيَجُرُّ أُمَّهُ بِسَرَرِهِ إِلَى الْجَنَّةِ إِذَا احْتَسَبَتْهُ»(٣).

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە منداڵی لەبارچوو دایکی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشێ بە ناوکە پەتک بۆ ناو بەهەشت، ئەگەر (ئەو دایکە) چاوەڕێی پاداشت بێ لە خواو ئارام بگرێ.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح لغيره.

## بابەت: ناردنی خواردن بۆ خاوەن مردوو

**١٦١٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﭬ، قَالَ: لَمَّا جَاءَ نَعْيُ جَعْفَرٍ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اصْنَعُوا لِآلِ جَعْفَرٍ طَعَامًا، فَقَدْ أَتَاهُمْ مَا يَشْغَلُهُمْ، أَوْ أَمْرٌ يَشْغَلُهُمْ»[١].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر ﭬ دەڵێ: کاتێ هەواڵی شەهیدبوونی جەعفەر هات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆ خێزان و ماڵ و منداڵی جەعفەر خواردن ساز بکەن، چونکە بەڕاستی تووشی کۆستێ هاتوون سەرقاڵی کردوون، یان کارێک کە سەرقاڵیان دەکات.

**١٦١١-** عَنْ أُمِّ عَوْنٍ ابْنَةُ مُحَمَّدِ بْنِ جَعْفَرٍ ﭬ، عَنْ جَدَّتِهَا أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ ﭭ، قَالَتْ: لَمَّا أُصِيبَ جَعْفَرٌ رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى أَهْلِهِ فَقَالَ: «إِنَّ آلَ جَعْفَرٍ قَدْ شُغِلُوا بِشَأْنِ مَيِّتِهِمْ، فَاصْنَعُوا لَهُمْ طَعَامًا» قَالَ عَبْدُ اللَّهِ، فَمَا زَالَتْ سُنَّةً حَتَّى كَانَ حَدِيثًا، فَتُرِكَ[٢].

واتە: ئوممو عەونی کچی موحەممەدی کوڕی جەعفەر ﭬ لە ئەسمائی کچی عومەیسی داپیرەیەوە ﭭ دەگێڕێتەوە: کە گوتوویەتی: کاتێ کە جەعفەر شەهید بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆلای ماڵ و منداڵەکەی و فەرمووی: خێزانی جەعفەر سەرقاڵ بوون بە کار وباری مردووەکەیان بۆیە ئێوە خواردنیان بۆ ساز بکەن. عەبدوڵلا گوتی: ئەم شێوازە مامەڵەکردنە لەگەڵ خاوەنی پرسە سوننەتێکی بەردەوام بوو تا ئەم سەردەمە، ئیتر وازی لێ هێنرا.

## بابەت: قەدەغەکردنی کۆبونەوە لە ماڵی خاوەن مردوو وە خواردن پێ سازکردنیان

**١٦١٢-** عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ ﭬ، قَالَ: «كُنَّا نَرَى الِاجْتِمَاعَ إِلَى أَهْلِ الْمَيِّتِ وَصَنْعَةَ الطَّعَامِ مِنَ النِّيَاحَةِ»[٣].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣١٣٢، والترمذي: ٩٩٨.

(٢) حسن لغيره.

(٣) صحيح.

واتە: جەریری كوڕی عەبدوڵڵای بەجەلیی ﷛ دەڵێ: ئێمە كۆبوونەوە لەماڵی خاوەن مردوو، سازكردنی خواردن پێیان بە بەشێك لە شین و ڕۆڕۆی قەدەغەكراو دەزانین.

## بابەت: كەسێك كە لە ئاوارەیی دەمرێ

١٦١٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَوْتُ غُرْبَةٍ شَهَادَةٌ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مردنی كەسێك لە غەریبایەتی پلەی شەهادەتی هەیە (واتە: كەسێ كە لە دەرەوەی ماڵی خۆی، یان لە دەرەوەی وڵاتی خۆی دەمرێ بەبێ كەسی).

١٦١٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄، قَالَ: تُوُفِّيَ رَجُلٌ بِالْمَدِينَةِ مِمَّنْ وُلِدَ بِالْمَدِينَةِ، فَصَلَّى عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «يَا لَيْتَهُ مَاتَ فِي غَيْرِ مَوْلِدِهِ» فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ النَّاسِ: وَلِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا مَاتَ فِي غَيْرِ مَوْلِدِهِ، قِيسَ لَهُ مِنْ مَوْلِدِهِ إِلَى مُنْقَطَعِ أَثَرِهِ فِي الْجَنَّةِ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرٍ ﵄ دەڵێ: پیاوێك كە لە مەدینە لە دایك ببوو لە مەدینەش مرد، ئنجا پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر كردو و، فەرمووی: خۆزگە لە شوێنێك مردبایە كە زێدی خۆی نیە، پیاوێك لە ناو خەڵكەكە گوتی: لەبەر چی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەگەر مرۆڤ لە شوێنێك مرد كە زێدی خۆی نەبوو، ئەوە بە ئەندازەی نێوان زێدی خۆی تاكو ئەو شوێنەی كە لێی مردووە لە بەهەشت پێی دەدرێ، (یان بەو ئەندازەیە گۆڕی بۆ فراوان دەكرێ).

## بابەت: مردن بە نەخۆشی

١٦١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ مَاتَ مَرِيضًا مَاتَ شَهِيداً، وَوُقِيَ فِتْنَةَ الْقَبْرِ، وَغُدِيَ وَرِيحَ عَلَيْهِ بِرِزْقِهِ مِنَ الْجَنَّةِ»[٣].

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن. أخرجه النسائي: ١٨٣٢.

(٣) ضعيف جداً.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە هۆی نەخۆشی بمرێ پلەی شەهیدی هەیە، وە لە سزای گۆڕ دەپارێزرێ، وە بەروبوم و ڕزقی بەهەشتی بەسەردا دێ بەیانی و ئێواران.

## بابەت: قەدەغەکردنی شکاندنی ئێسکی مردوو

١٦١٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيًّا»[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گوناهی شکاندنی ئێسکی مردوو وەک شکاندنیەتی بە زیندوویی.

١٦١٧- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِ عَظْمِ الْحَيِّ فِي الْإِثْمِ»[٢].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شکاندنی ئێسکی مردوو گوناهەکەی وەک شکاندی ئێسکی زیندوو وایە.

## بابەت: نەخۆشکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ

١٦١٨- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ فَقُلْتُ: أَيْ أُمَّهْ، أَخْبِرِينِي عَنْ مَرَضِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: «اشْتَكَى، فَعَلَقَ يَنْفُثُ، فَجَعَلْنَا نُشَبِّهُ نَفْثَهُ بِنَفْثَةِ آكِلِ الزَّبِيبِ، وَكَانَ يَدُورُ عَلَى نِسَائِهِ، فَلَمَّا ثَقُلَ اسْتَأْذَنَهُنَّ أَنْ يَكُونَ فِي بَيْتِ عَائِشَةَ وَأَنْ يَدُرْنَ عَلَيْهِ، قَالَتْ: فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ، وَرِجْلَاهُ تَخُطَّانِ بِالْأَرْضِ، أَحَدُهُمَا الْعَبَّاسُ» فَحَدَّثْتُ بِهِ ابْنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ: أَتَدْرِي مَنِ الرَّجُلُ الَّذِي لَمْ تُسَمِّهِ عَائِشَةُ؟ هُوَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ[٣].

واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﷺ، گوتم: ئەی دایکە دەربارەی نەخۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم پێبدە (بۆم بگێڕەوە)، گوتی: (پێغەمبەر ﷺ) نەخۆش کەوت و بە جۆرێک هەناسەی دەدا وەکو کەسێک کە مێوژ دەخوات و دەنکەکەی دەتفێنێتەوە، وە بەسەر خێزانەکانیدا دەگەڕا و بەسەری

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٠٧.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٥، ومسلم: ٤١٨، والنسائي: ٨٣٤.

دەکردنەوە، جا کاتێک نەخۆشیەکەی قورس بوو، مۆڵەتی لە خێزانەکانی خواست کە لە ماڵی عائیشە ﵂ بمێنێتەوەو، ئەوان سەردانی بکەن، گوتی: جا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای من ئەویش لەوکاتەدا لە نێوانی دوو پیاو دابوو، پێیەکانی لە زەوی دەخشاند (واتە: خۆی دابووە سەر شانی ئەو دوو پیاوە) کە یەکێکیان عەبباس بوو، (ڕاوی دەڵێ:) بۆ ئیبنو عەبباسم دەگێڕاوە ئەویش گوتی: دەزانی ئەو پیاوەی کە عائیشە ﵂ ناوی نەهێنا کێ بوو؟ ئەوە عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ بوو.

**١٦١٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَعَوَّذُ بِهَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ «أَذْهِبِ الْبَاسَ، رَبَّ النَّاسِ، وَاشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لَا شِفَاءَ إِلَّا شِفَاؤُكَ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا» فَلَمَّا ثَقُلَ النَّبِيُّ ﷺ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، أَخَذْتُ بِيَدِهِ، فَجَعَلْتُ أَمْسَحُهُ وَأَقُولُهَا، فَنَزَعَ يَدَهُ مِنْ يَدِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ الْأَعْلَى» قَالَتْ: فَكَانَ هَذَا آخِرَ مَا سَمِعْتُ مِنْ كَلَامِهِ ﷺ[١].**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەو چەند وشەگەلە پەنای بە خوا دەگرت: ئەی پەروەردگار نارەحەتی و نەخۆشییەکەم لابەە، وە شیفا و چارەسەر بنێرە هەر تۆ شیفا بەخشی، هیچ چارەسەرێک نیە جگە لەو چارەسەرەی کە لەلایەن تۆوەیە، شیفا و چارەسەرێکە کە نەخۆشی و ئازار بەجێ ناهێڵێ، جا (عائیشە ﵂ دەڵێ:) کاتێک نەخۆشی پێغەمبەر ﷺ گران بوو، لەو نەخۆشیەی کە تێیدا وەفاتی کرد، دەستیم گرت و بە لاشەیم دادەهێنا و ئەو وشانەشم دەگوت، دەستی لە ناو دەستم دەرهێنا و پاشان فەرمووی: خوایە لێم خۆش ببە و بمگەیەنە بە ڕەفیق و ئەعلا (ئەوانەی کە لەلای خوا پلەیان بەرزە)، دەڵێ: ئەوە کۆتا قسەیەک بوو کە لە پێغەمبەر ﷺ بیستم.

**١٦٢٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَا مِنْ نَبِيٍّ يَمْرَضُ إِلَّا خُيِّرَ بَيْنَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ» قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ مَرَضُهُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ، أَخَذَتْهُ بُحَّةٌ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ النساء، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ خُيِّرَ[٢].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٧٥، ومسلم: ٢١٩١، والترمذي: ٣٤٩٦ ذكر آخر الحديث.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٣٥، ومسلم: ٢٤٤٤.

واته: عائیشه ﵂ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ پێغەمبەرێک نیە کە کاتێک نەخۆش دەکەوێ ئیلا خوا هەڵبژاردنی دەداتێ لە نێوان دونیا و قیامەتدا، گوتی: جا کاتێ نەخۆش کەوت بەو نەخۆشیەی کە تێیدا وەفاتی کرد دەنگی گۆڕا و گوێشم لێبوو دەیفەرموو: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ ﴿٦٩﴾ ﴾ النساء، (واتە: وە هەر کەسێک گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر بکات جا ئەوانە لەگەڵ کەسانێکن کە خوا فەزڵ و بەهرەی (خۆی) ڕشتووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان)، جا زانیم کە خوا هەڵبژاردنی دراوەتێ.

**١٦٢١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: اجْتَمَعْنَ نِسَاءُ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمْ تُغَادِرْ مِنْهُنَّ امْرَأَةٌ، فَجَاءَتْ فَاطِمَةُ كَأَنَّ مِشْيَتَهَا مِشْيَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مَرْحَبًا بِابْنَتِي» ثُمَّ أَجْلَسَهَا عَنْ شِمَالِهِ، ثُمَّ إِنَّهُ أَسَرَّ إِلَيْهَا حَدِيثًا، فَبَكَتْ فَاطِمَةُ، ثُمَّ إِنَّهُ سَارَّهَا، فَضَحِكَتْ أَيْضًا، فَقُلْتُ لَهَا: مَا يُبْكِيكِ؟ قَالَتْ: مَا كُنْتُ لِأُفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ فَرَحًا أَقْرَبَ مِنْ حُزْنٍ، فَقُلْتُ لَهَا حِينَ بَكَتْ: أَخَصَّكِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِحَدِيثٍ دُونَنَا، ثُمَّ تَبْكِينَ؟ وَسَأَلْتُهَا عَمَّا قَالَ، فَقَالَتْ: مَا كُنْتُ لِأُفْشِيَ سِرَّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، حَتَّى إِذَا قُبِضَ سَأَلْتُهَا عَمَّا قَالَ، فَقَالَتْ: إِنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُنِي، «أَنَّ جِبْرَائِيلَ كَانَ يُعَارِضُهُ بِالْقُرْآنِ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً، وَأَنَّهُ عَارَضَهُ بِهِ الْعَامَ مَرَّتَيْنِ، وَلَا أُرَانِي إِلَّا قَدْ حَضَرَ أَجَلِي، وَأَنَّكِ أَوَّلُ أَهْلِي لُحُوقًا بِي، وَنِعْمَ السَّلَفُ أَنَا لَكِ» فَبَكَيْتُ، ثُمَّ إِنَّهُ سَارَّنِي فَقَالَ: «أَلَا تَرْضَيْنَ أَنْ تَكُونِي سَيِّدَةَ نِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ، أَوْ نِسَاءِ هَذِهِ الْأُمَّةِ؟» فَضَحِكْتُ لِذَلِكَ**[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هەموو هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ کۆببوونەوەو هەموویان ئامادەبوون، ئنجا فاتیمە ﵂ هات، ڕۆیشتنەکەی هەر وەکو ڕۆیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ وا بوو، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کچەکەم بەخێر بێی، پاشان لەلای چەپی خۆی داینیشاند، پاشان بە چرپە قسەیەکی پێگوت، ئنجا فاتیمە گریا، پاشان چرپەیەکی تری پێگوت، فاتیمەش ﵂ پێکەنی، منیش گوتم: چی تۆی گریاند؟ گوتی: بۆم نەهاتووە نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بدرێکنم و بڵاوی بکەمەوە، گوتم: هەرگیز نەمبینیوە وەکو ئەو ڕۆژە کە دڵخۆش بوون هێندە نزیک بێت لە دڵتەنگی، جا کاتێ گریا پێم گوت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ تۆی تایبەت کرد بەوەی کە قسەیەکت پێبڵێ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢٨٥ و ٦٢٨٦، ومسلم: ٩٨/٢٤٥٠.




جگە لە ئێمە کەچی دەگریەی؟ وە پرسیارم کرد لەوەی کە پێی فەرموو، گوتی: بۆم نیە نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بڵاوبکەمەوە، تاکو پێغەمبەر ﷺ وەفاتی فەرموو، ئەوجار لێم پرسی لەو شتەی کە پێی فەرموو، گوتی: پێی ڕاگەیاندم هەموو ساڵێک جیبریل یەک جار قورئانی هەموو پێ دەخوێندمەوە، بەڵام ئەو ساڵ دوو جار بۆی ڕانواندم، وە پێم وایە کە کاتی مردنم نزیک بۆتەوە، وە تۆ یەکەم کەسی کە لە دوای خۆم بە من دەگەی، وە باشترین پێشڕەوم بۆ تۆ، منیش گریام، پاشان پێی فەرمووم: ئایا ڕازی نیت بەوەی کە گەورەی هەموو ئافرەتانی بەهەشت بیت، یان (گوتی:) ئافرەتانی ئەو ئوممەتە، منیش بەو هەواڵە (دڵخۆش بووم) پێکەنیم.

١٦٢٢- عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: «مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَشَدَّ عَلَيْهِ الْوَجَعُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»(١).

واتە: مەسروق، دەڵێ: عائیشە ﷺ گوتوویەتی: هیچ کەسێکم نەبینیوە کە ئازاری نەخۆشییەکەی توندتر بێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

١٦٢٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَمُوتُ وَعِنْدَهُ قَدَحٌ فِيهِ مَاءٌ، فَيُدْخِلُ يَدَهُ فِي الْقَدَحِ، ثُمَّ يَمْسَحُ وَجْهَهُ بِالْمَاءِ ثُمَّ يَقُولُ «اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى سَكَرَاتِ الْمَوْتِ»(٢).

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ لە کاتی سەرەمەرگدا بینی، تاسێک ئاوی لەلابوو، جا دەستی دەخستە ناو تاسە ئاوەکە، پاشان دەم و چاوی پێ مەسح دەکرد (دەستی بە دەم و چاویدا دەهێنا) پاشان دەیفەرموو: خوایە تۆ یارمەتیم بدەی لەسەر ئازار و ناڕەحەتییەکانی مردن.

١٦٢٤- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: آخِرُ نَظْرَةٍ نَظَرْتُهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، «كَشْفُ السِّتَارَةِ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ فَنَظَرْتُ إِلَى وَجْهِهِ، كَأَنَّهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ، وَالنَّاسُ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ فِي الصَّلَاةِ، فَأَرَادَ أَنْ يَتَحَرَّكَ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ أَنِ اثْبُتْ، وَأَلْقَى السِّجْفَ، وَمَاتَ فِي آخِرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٦٤٦، ومسلم: ٢٥٧٠، والترمذي: ٢٣٩٧.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٩٧٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٠، ومسلم: ٤١٩، والنسائي: ١٨٣١.




واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کۆتا جار کە تەماشای پێغەمبەری خوام ﷺ کرد (ئەوکاتە بوو کە) پەردەکەی لادابوو ڕۆژی دوو شەممە، منیش تەماشای ڕوخساریم کرد هەروەکو پەڕەی قوڕئان وابوو (لە جوانی و درەوشاوەییدا)، خەڵکیش لە دوای ئەبو بەکر نوێژیان دەکرد، (ئەبو بەکر ﷺ) ویستی بجوڵێ (جێگا چۆڵ بکات بۆ پێغەمبەر ﷺ) ئەویش ئاماژەی بۆ کرد، کە لە شوێنی خۆت بە، ئنجا پەردەکەی دادایەوە، وە لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا وەفاتی کرد.

**١٦٢٥- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي مَرَضِهِ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ: «الصَّلَاةَ، وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ» فَمَا زَالَ يَقُولُهَا، حَتَّى مَا يَفِيضُ بِهَا لِسَانُهُ[1].**

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشی وەفات کردنەکەیدا فەرمووی: ئاگاتان لە نوێژەکانتان بێ و بەزایەیان مەدەن، وە ئاگاتان لە سەروەت و سامانتان بێ و زەکاتی لێبدەن، (بەو شێوە ئەم فەرموودەیە شەرح کراوە، تاکو هاوتەریب بێت لەگەڵ دواندنی قوڕئان کە هەمیشە نوێژ و زەکات بە دوای یەکدان، وە هەندێکیتر دەڵێن: مەبەستی پێ لە بەندە و کەنیزەکە، کە فەرمانی کردوە بە چاودێری کردنیان)، هەتاکو زمانی گەڕ بەردەوام ئەوەی دووبارە کردەوە.

**١٦٢٦- عَنِ الْأَسْوَدِ ﷺ، قَالَ: ذَكَرُوا عِنْدَ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ عَلِيًّا كَانَ وَصِيًّا، فَقَالَتْ: «مَتَى أَوْصَى إِلَيْهِ؟ فَلَقَدْ كُنْتُ مُسْنِدَتَهُ إِلَى صَدْرِي، أَوْ إِلَى حَجْرِي، فَدَعَا بِطَسْتٍ، فَلَقَدِ انْخَنَثَ فِي حِجْرِي، فَمَاتَ، وَمَا شَعَرْتُ بِهِ، فَمَتَى أَوْصَى ﷺ؟»[2].**

واتە: ئەسوەد ﷺ دەڵێ: لە لای عائیشە ﷺ باسی ئەوە کرا کە عەلی وەسیەتی بۆ کراوە، ئەویش گوتی: چ کاتێک وەسیەتی بۆ کراوە؟ ئێ خۆ (پێغەمبەر ﷺ) پاڵی بە سنگی منەوە دابوو، یان سەری لەسەر کۆشی من بوو، ئنجا داوای تاسێکی کرد، لەڕاستیدا لە کۆشی مندا سارد بۆوە و شل بوو، ئنجا وەفاتی کرد، وە من هەستم پێنەکردوە و نەمزانیوە، کەواتە کەی وەسیەتی کردوە؟

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٤١، ومسلم: ١٦٣٦، والنسائي: ٣٣ و ٣٦٢٤..

## بابەت: مردن و ناشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ

**١٦٢٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: لَمَّا قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ عِنْدَ امْرَأَتِهِ، ابْنَةِ خَارِجَةَ بِالْعَوَالِي، فَجَعَلُوا يَقُولُونَ، لَمْ يَمُتِ النَّبِيُّ ﷺ، إِنَّمَا هُوَ بَعْضُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ عِنْدَ الْوَحْيِ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ، فَكَشَفَ عَنْ وَجْهِهِ وَقَبَّلَ بَيْنَ عَيْنَيْهِ وَقَالَ: «أَنْتَ أَكْرَمُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُمِيتَكَ مَرَّتَيْنِ، قَدْ وَاللَّهِ مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ» وَعُمَرُ فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ يَقُولُ: وَاللَّهِ مَا مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَا يَمُوتُ حَتَّى يَقْطَعَ أَيْدِيَ أُنَاسٍ مِنَ الْمُنَافِقِينَ كَثِيرٍ وَأَرْجُلَهُمْ، فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ، فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَقَالَ: مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ حَيٌّ لَمْ يَمُتْ، وَمَنْ كَانَ يَعْبُدُ مُحَمَّدًا فَإِنَّ مُحَمَّدًا قَدْ مَاتَ: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾﴾ آل عمران، قَالَ عُمَرُ: فَلَكَأَنِّي لَمْ أَقْرَأْهَا إِلَّا يَوْمَئِذٍ[1].

واته: عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی کێشرا، ئەبو بەکر ﷺ لای ژنەکەی بوو کە کچی خاریجە بوو لە دەرەوەی مەدینە، جا هاوەڵان دەیانگوت: پێغەمبەر ﷺ نەمردووە، بەڵکو ئەوە ئەو حاڵەتەی بەسەردا هاتووە کە لە کاتی دابەزینی وەحیدا بەسەریدا دەهات، ئنجا ئەبو بەکر ﷺ هات و ڕوخساری پێغەمبەری ﷺ بەدەر خست و نێوانی چاوەکانی ماچ کرد و گوتی: تۆ زۆر لەوە بەڕێزتری لەلای خوا کە دوو جار بتمرێنێ (مەبەستی قسەی هاوەڵان بوو)، بێگومان سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردوە، وە عومەر ﷺ لە گۆشەیەکی مزگەوت دەیگوت: سوێند بە خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ نەمردووە، وە ناشمرێ تاکو دەست و پێی خەڵکێکی زۆر لە دووڕووەکان نەبڕێ، (مەبەستی ئەوە بوو کە هەق و بەتاڵ بە تەواوی لە یەک جیادەکاتەوە جا وەفات دەکات)، ئنجا ئەبو بەکر ڕۆیشتە سەر مینبەر و گوتی: هەر کەسێک خوا دەپەرستێ، خوا هەمیشە زیندووە و نامرێ، وە ئەوەی کە موحەممەد ﷺ دەپەرستێ، بێگومان موحەممەد ﷺ وەفاتی کرد (ئنجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە) : ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾﴾ آل عمران،

---

(١) صحيح دون جملة الوحي. أخرجه البخاري: ١٢٤١ و ١٢٤٢.

واتە: (موحەممەد ﷺ) تەنها پێغەمبەرێکە (نەمر نیە) بێگومان لەپێش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردون جا ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان (پاشگەز دەبنەوە) هەر کەس هەڵگەڕێتەوە بۆ دواوەی خۆی (بۆ بت پەرستی) ئەوە هەرگیز (ئەو کەسە) هیچ زیانێک ناگەیەنێت بەخوا وە بەزوویی خوا پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە، عومەر گوتی: پێم ابوو تا تاکو ئەو ڕۆژە ئەم ئایەتەم نەخوێندبوویەوە.

**١٦٢٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: لَمَّا أَرَادُوا أَنْ يَحْفِرُوا لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، بَعَثُوا إِلَى أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الْجَرَّاحِ، وَكَانَ يَضْرَحُ كَضَرِيحِ أَهْلِ مَكَّةَ، وَبَعَثُوا إِلَى أَبِي طَلْحَةَ وَكَانَ هُوَ الَّذِي يَحْفِرُ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ، وَكَانَ يَلْحَدُ، فَبَعَثُوا إِلَيْهِمَا رَسُولَيْنِ، فَقَالُوا: اللَّهُمَّ خِرْ لِرَسُولِكَ، فَوَجَدُوا أَبَا طَلْحَةَ، فَجِيءَ بِهِ، وَلَمْ يُوجَدْ أَبُو عُبَيْدَةَ، فَلَحَدَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَلَمَّا فَرَغُوا مِنْ جِهَازِهِ يَوْمَ الثُّلَاثَاءِ، وُضِعَ عَلَى سَرِيرِهِ فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ دَخَلَ النَّاسُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَرْسَالًا يُصَلُّونَ عَلَيْهِ، حَتَّى إِذَا فَرَغُوا أَدْخَلُوا النِّسَاءَ، حَتَّى إِذَا فَرَغُوا أَدْخَلُوا الصِّبْيَانَ، وَلَمْ يَؤُمَّ النَّاسَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَحَدٌ، لَقَدِ اخْتَلَفَ الْمُسْلِمُونَ فِي الْمَكَانِ الَّذِي يُحْفَرُ لَهُ، فَقَالَ قَائِلُونَ: يُدْفَنُ فِي مَسْجِدِهِ، وَقَالَ قَائِلُونَ: يُدْفَنُ مَعَ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا قُبِضَ نَبِيٌّ إِلَّا دُفِنَ حَيْثُ يُقْبَضُ» قَالَ: فَرَفَعُوا فِرَاشَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي تُوُفِّيَ عَلَيْهِ، فَحَفَرُوا لَهُ، ثُمَّ دُفِنَ ﷺ، وَسَطَ اللَّيْلِ مِنْ لَيْلَةِ الْأَرْبِعَاءِ، وَنَزَلَ فِي حُفْرَتِهِ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ، وَالْفَضْلُ بْنُ الْعَبَّاسِ، وَقُثَمُ أَخُوهُ وَشُقْرَانُ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ: أَوْسُ بْنُ خَوْلِيٍّ وَهُوَ أَبُو لَيْلَى، لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: أَنْشُدُكَ اللَّهَ وَحَظَّنَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ لَهُ عَلِيٌّ: انْزِلْ، وَكَانَ شُقْرَانُ مَوْلَاهُ، أَخَذَ قَطِيفَةً كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَلْبَسُهَا، فَدَفَنَهَا فِي الْقَبْرِ وَقَالَ: وَاللَّهِ لَا يَلْبَسُهَا أَحَدٌ بَعْدَكَ أَبَدًا، فَدُفِنَتْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: کاتێک کە ویستیان گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵکەنن بە دوای ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحیاندا نارد، کە لەسەر شێوازی خەڵکی مەککە گۆڕی هەڵدەکەند، هەروەها بە دوای ئەبو تەڵحەشیاندا نارد، کە ئەو بۆ خەڵکی مەدینە بە لاگۆڕ گۆڕی هەڵدەکەند، جا دوو نێردراویان بۆ لایان نارد، ئنجا گوتیان: خوایە بۆ خۆت (یەکێک لەو دووانە) بۆ پێغەمبەرەکەت هەڵبژێرە، جا ئەبو تەڵحەیان دەستکەوت و هێنایان، ئەبو عوبەیدەیان دەست نەکەوت، بۆیە بە لاگۆڕ

---

(١) ضعيف، لكن قصة الشقاق واللحد ثابتة.

گۆری پێغەمبەری خوایان ﷺ هەڵکەند، ڕاوی دەڵێ: کاتێک لە ڕۆژی سێ شەممە لە ئامادەکردنی بوونەوە، لە ماڵەکەی خۆی لەسەر جێگاکەی خۆیان دانا، پاشان پۆل پۆل خەڵک دەهاتن و نوێژیان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، هەتا پیاوەکان تەواو بوون، ئەوجار ئافرەتان هاتن، کە ئەوانیش تەواو بوون ئەوجار منداڵان هاتن، وە کەس پێشنوێژی بۆ نوێژکردن لەسەر پێغەمبەر ﷺ نەکرد، جا مسوڵمانان لەسەر شوێنی ناشتنی پێغەمبەر ﷺ کەوتنە ڕاجیایی، هەندێک گوتیان: لە ناو مزگەوتەکەی بنێژرێ، هەندێکیش گوتیان: لەگەڵ هاوەڵەکانی بنێژرێت، ئنجا ئەبو بەکر گوتی: بێگومان من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر پێغەمبەرێک وەفاتی کردبێت بێگومان هەر لەو شوێنە نێژراوە کە وەفاتی تێدا کردوە، ڕاوی گوتی: جا ئەو پێخەفەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی تێدا کردبوو هەڵیانگرت و هەر لەو شوێنە گۆڕیان بۆ هەڵکەند، پاشان لە ناوەڕاستی شەوی چوار شەممە ناشتیان، کاتی ناشتنەکە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و فەزڵی کوڕی عەبباس و قوسەمی برای فەزڵ و شوقڕانی خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزینە ناو گۆڕەکەی، وە ئەوسی کوڕی خەول کە ئەبو لەیلایە بە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی گوت: سوێندت دەدەم بە خوا، ئێمەش لە بەرەکەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بێبەش مەکە، عەلی پێی گوت: دابەزە (بۆ ناو گۆڕەکە)، جا شوقڕان کە خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ بوو، پارچە پۆشاکێکی هێنا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەری دەکرد لە ناو گۆڕەکەدا ئەویشی ناشت و گوتی: سوێند بە خوا هەرگیز دوای تۆ کەسی تر لەبەری ناکات، بۆیە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ناشتی.

**١٦٢٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا وَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ كَرْبِ الْمَوْتِ مَا وَجَدَ، قَالَتْ: فَاطِمَةُ وَا كَرْبَ أَبَتَاهُ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لَا كَرْبَ عَلَى أَبِيكِ بَعْدَ الْيَوْمِ، إِنَّهُ قَدْ حَضَرَ مِنْ أَبِيكِ مَا لَيْسَ بِتَارِكٍ مِنْهُ أَحَدًا، الْمُوَافَاةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].**

---

(١) حسن صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٦٢.

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: كاتێ كە پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی ناخۆشی و ئازاری مردن بوو لەوەی كە تووشی بوو، فاتیمە گوتی: وای بۆ ئەو ناڕەحەتیەی كە تووشی باوكم بووە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەمڕۆ بەولاوە ئازار و ناڕەحەتی لەسەر باوكت نامێنێ، لەڕاستیدا ئەو شتە ئامادەی بەردەمی باوكتە كە هیچ كەس بەجێ ناهێڵێ كە گەیشتنە بە ڕۆژی قیامەت.

**١٦٣٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «قَالَتْ لِي فَاطِمَةُ ﷺ: يَا أَنَسُ، كَيْفَ سَخَتْ أَنْفُسُكُمْ أَنْ تَحْثُوا التُّرَابَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟»[1].**

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: فاتیمە ﷺ پێی گوتم: ئەی ئەنەس، چۆن توانیتان و دەستان ڕۆیشت كە خۆڵ بكەن بەسەر (لاشەی) پێغەمبەری خوادا ﷺ (لە كاتی ناشتنیدا)؟

**١٦٣٠م- وحَدَّثَنَا ثَابِتٌ ﷺ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ فَاطِمَةَ، قَالَتْ: حِينَ قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «وَا أَبَتَاهُ، إِلَى جِبْرَائِيلَ أَنْعَاهُ، وَا أَبَتَاهُ، مِنْ رَبِّهِ مَا أَدْنَاهُ، وَا أَبَتَاهُ، جَنَّةُ الْفِرْدَوْسِ مَأْوَاهُ، وَا أَبَتَاهُ أَجَابَ رَبًّا دَعَاهُ» قَالَ حَمَّادٌ فَرَأَيْتُ ثَابِتًا حِينَ حَدَّثَ بِهَذَا الْحَدِيثِ بَكَى حَتَّى رَأَيْتُ أَضْلَاعَهُ تَخْتَلِفُ[2].**

واتە: هەروەها سابیت ﷺ لە ئەنەسەوە ﷺ بۆی گێڕاینەوە، كە كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی كرد، فاتیمە ﷺ (بە هێواشی و ئارامی) هاواری كرد ئای باوكە هەواڵی مردنت بە جیبریل دەگەیەنین، ئای باوكە چەند لە پەروەردگاری نزیك بوویەوە، وای باوكە بەهەشتی فیردەوس شوێنی تۆیە، وای باوكە وەڵامی پەروەردگاری داوە كاتێ بانگی كرد. حەماد دەڵێ: بینیم سابیت كە ئەو هەواڵەی گێڕایەوە بە جۆرێك گریا تاكو پەراسوەكانی لە یەك جیاواز بوون.

**١٦٣١- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: «لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، وَمَا نَفَضْنَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ الْأَيْدِيَ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا»[3].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٦٢.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٦١٨.

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: لەو ڕۆژەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هاتە ناو مەدینە هەموو شتێک بە هاتنی ڕووناک بوو درەوشایەوە، ئنجا لەو ڕۆژەوە کە تێیدا وەفاتی کرد هەموو شتێک تاریک بوو، وە لە ناشتنی پێغەمبەر ﷺ نەبووینەوە کە دڵەکان گۆڕان و وەک پێشوو نەمان.

**١٦٣٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نَتَّقِي الْكَلَامَ وَالِانْبِسَاطَ إِلَى نِسَائِنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؛ مَخَافَةَ أَنْ يُنْزَلَ فِينَا الْقُرْآنُ، فَلَمَّا مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَكَلَّمْنَا»[١].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆمان دەپاراست هەتا لە زۆر قسەکردن لەگەڵ خێزانەکانمان، لە ترسی ئەوەی نەبادا قورئان دەربارەمان دابەزێ، جا کاتێک کە وەفاتی کرد قسەمان کرد.

**١٦٣٣- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَإِنَّمَا وَجْهُنَا وَاحِدٌ، فَلَمَّا قُبِضَ نَظَرْنَا هَكَذَا وَهَكَذَا»[٢].**

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: ئێمە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین هەموومان ڕوومان لە یەک مەبەست بوو، جا کاتێک کە وەفاتی کرد ڕوومان کردە ئەوە و ئەوە (واتە: هەبوو ڕووی کردە ئاخیرەت و هەبوو ڕووی دەکردە دنیا و .... بەم شێوە).

**١٦٣٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ بِنْتِ أَبِي أُمَيَّةَ ا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ النَّاسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، «إِذَا قَامَ الْمُصَلِّي يُصَلِّي، لَمْ يَعْدُ بَصَرُ أَحَدِهِمْ مَوْضِعَ قَدَمَيْهِ، فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَانَ النَّاسُ إِذَا قَامَ أَحَدُهُمْ يُصَلِّي، لَمْ يَعْدُ بَصَرُ أَحَدِهِمْ مَوْضِعَ جَبِينِهِ، فَتُوُفِّيَ أَبُو بَكْرٍ وَكَانَ عُمَرُ، فَكَانَ النَّاسُ إِذَا قَامَ أَحَدُهُمْ يُصَلِّي، لَمْ يَعْدُ بَصَرُ أَحَدِهِمْ مَوْضِعَ الْقِبْلَةِ، وَكَانَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، فَكَانَتِ الْفِتْنَةُ، فَتَلَفَّتَ النَّاسُ يَمِينًا وَشِمَالًا»[٣].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٨٧.

(٢) صحيح إن كان الحسن سمعه من أبي أو ممن حدث عنه.

(٣) ضعيف.

واتە: ئوممو سەلەمەی کچی ئەبو ئومەییە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: خەڵکی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کاتێ نوێژخوێن نوێژی دەکرد، تەنها تەماشای جێگا پێیەکانی خۆیان دەکرد و زیاترنا، کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد خەڵکی کاتێ یەکێکیان نوێژی دەکرد تەماشاکردنەکەی سنووری شوێنی ناوچەوانی (جێی سوجدەی) نەدەبەزاند، ئنجا ئەبو بەکر وەفاتی کرد، وە عومەر هات، ئنجا خەڵکی ئەگەر یەکێک نوێژی بکردبایە تەماشاکردنەکەی لە سنوری قیبلە دەرنەدەچوو، وە کاتێ عوسمانی کوڕی عەففان هات ئیتر فیتنەش ڕوویدا و خەڵکی بەڕاست و چەپدا ئاوڕی دەدایەوە (مەبەستی ئەوەیە کە خشوع و ئیخلاس وردە وردە نەما و کەمی کرد).

**١٦٣٥-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لِعُمَرَ: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى أُمِّ أَيْمَنَ نَزُورُهَا، كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَزُورُهَا، قَالَ: فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَيْهَا بَكَتْ، فَقَالَا لَهَا: مَا يُبْكِيكِ؟ فَمَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ، قَالَتْ: «إِنِّي لَأَعْلَمُ أَنَّ مَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ لِرَسُولِهِ، وَلَكِنْ أَبْكِي لِأَنَّ الْوَحْيَ قَدِ انْقَطَعَ مِنَ السَّمَاءِ» قَالَ: فَهَيَّجَتْهُمَا عَلَى الْبُكَاءِ، فَجَعَلَا يَبْكِيَانِ مَعَهَا[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکر بە عومەری گوت: بڕۆ با بچین سەردانی ئوممو ئەیمەن بکەین، هەر وەکو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی دەکرد، دەڵێ: کاتێک گەیشتینە لای گریا، گوتیان: بۆ دەگری؟ خۆ ئەوەی کە لەلای خوایە باشترە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: منیش دەزانم ئەوەی کە لەلای خوایە باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، بەڵام بۆ پچڕانی وەحی لە ئاسمانەوە دەگریم، گوتی: بە هۆی ئەوەوە هەردووکیانی گریاند، ئیتر وایان کرد کە هەردووکیان لەگەڵیدا گریان.

**١٦٣٦-** عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ» فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ تُعْرَضُ صَلَاتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرِمْتَ - يَعْنِي - بَلِيتَ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٤٥٤.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٠٤٧ و ١٥٣١، والنسائي: ١٣٧٤.

واتە: ئەوسی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە باشترین ڕۆژەکانتان ڕۆژی جومعەیە، لەو ڕۆژەدا تیایدا ئادەم دروستکرا، وە لەو ڕۆژەدا بەڕاستی کۆتایی دونیا دەبێت، وە لەو ڕۆژەدا دەمرن، کەواتە زۆرترین صەڵاوات لەسەر من لێبدەن لەو ڕۆژەدا، چونکە بێگومان صەڵاواتەکانتانم پیشاندەدرێ، ئنجا پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن چۆنی صەڵاواتەکانمان بە تۆ دەگات کاتێک کە لاشە نامێنێ و شی دەبێتەوە؟ -واتە: دەبێتە خۆڵ- فەرمووی: بێگومان خوا قەدەغەی کردوە لەسەر زەوی کە لاشەی پێغەمبەران بخوات.

**١٦٣٧-** عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكْثِرُوا الصَّلَاةَ عَلَيَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ؛ فَإِنَّهُ مَشْهُودٌ، تَشْهَدُهُ الْمَلَائِكَةُ، وَإِنَّ أَحَدًا لَنْ يُصَلِّيَ عَلَيَّ، إِلَّا عُرِضَتْ عَلَيَّ صَلَاتُهُ، حَتَّى يَفْرُغَ مِنْهَا» قَالَ: قُلْتُ: وَبَعْدَ الْمَوْتِ؟ قَالَ: «وَبَعْدَ الْمَوْتِ، إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ، فَنَبِيُّ اللَّهِ حَيٌّ يُرْزَقُ»[1].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: زۆرترین صەڵاواتم لەسەر بدەن لە ڕۆژی جومعەدا، چونکە فریشتەکان ئاگاداری دەبن و دەیزانن، هیچ یەکێکتان نیە کە صەڵاوتم لەسەر بدات مسۆگەر بۆم ڕادەنوینرێ و پێمدەگات هەتا لە صەڵاواتەکە دەبێتەوە، گوتم: دوای مردنیش؟ فەرمووی: دوای مردنیش، بێگومان خوا قەدەغەی کردوە کە زەوی جەستە و لاشەی پێغەمبەران بـخوات، پێغەمبەری خوا ﷺ زیندووە و (لەلایەن خواوە) ڕۆزی پێدەدرێ.



---

(١) ضعيف، لكن غالبه فيما قبله.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی گەورەیی ڕۆژوو

**١٦٣٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ، الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى مَا شَاءَ اللَّهُ، يَقُولُ اللَّهُ: إِلَّا الصَّوْمَ؛ فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، يَدَعُ شَهْوَتَهُ وَطَعَامَهُ مِنْ أَجْلِي، لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِهِ، وَفَرْحَةٌ عِنْدَ لِقَاءِ رَبِّهِ. وَلَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو کردەوە (چاکەکانی) ئادەمیزاد پاداشتیان بە بەرانبەر دەدرێتەوە، یەک بە دە هەتا یەک بە حەوت سەد بەرانبەر، ئەوەندەی خوا ویستی لەسەر بێ، خوا دەفەرموێ: جگە لە ڕۆژوو، چونکە ڕۆژوو بۆ منە و هەر خۆشم پاداشتی (ڕۆژووەوان) دەدەمەوە، لەبەر مندا واز لە خواردن و خواردنەوە و ئارەزووی دێنێ، ڕۆژووان دوو جار دڵی خۆش دەبێ: یەکەمیان: کاتێ ڕۆژووەکەی دەشکێنێ، دووەمیان: کاتێ دەگات بە دیداری پەروەردگاری (چونکە بە ڕۆژووەکەی فەرمانی خوای بەجێهێناوە)، وە سوێند بە خوا بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خوا لە بۆنی میسک خۆشترە.

**١٦٣٩-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ ﷺ، أَنَّ مُطَرِّفًا، مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ صَعْصَعَةَ، حَدَّثَهُ أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ أَبِي الْعَاصِ الثَّقَفِيَّ دَعَا لَهُ بِلَبَنٍ يَسْقِيهِ، فَقَالَ: مُطَرِّفٌ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الصِّيَامُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ، كَجُنَّةِ أَحَدِكُمْ مِنَ الْقِتَالِ»[2].

واتە: سەعیدی کوڕی ئەبو هیند ﷺ دەگێڕێتەوە، موتەڕڕیف لە بەنو عامیری کوڕی صەعصەعەوە بۆی گێراوەتەوە، عوسمانی کوڕی ئەبو عاص داوای کرد شیر بۆ موتەڕڕیف بێنن بۆ ئەوەی بیخواتەوە، موتەڕڕیفیش گوتی: من بەڕۆژووم، جا عوسمان گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕۆژوو قەڵغانە لە ئاگر، هەروەکو قەڵغان و پەناگەی یەکێکتانە لە جەنگدا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٩٤، ومسلم: ١١٥١، والترمذي: ٧٦٤، والنسائي: ٢٢١٤_٢٢١٩.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٢٣٠ و ٢٢٣١ و ٢٢٣٢ مرسلًا.

١٦٤٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَابًا يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُ، يُدْعَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُقَالُ: أَيْنَ الصَّائِمُونَ؟ فَمَنْ كَانَ مِنَ الصَّائِمِينَ دَخَلَهُ، وَمَنْ دَخَلَهُ لَمْ يَظْمَأْ أَبَدًا»[١].

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بەهەشت دەرگایەکی هەیە پێی دەگوترێ: ڕەییان، لە ڕۆژی دواییدا بانگەواز دەکرێ و دەگوترێ: کوان ڕۆژووەوانان؟ جا ئەوەی کە لە ڕۆژووەوانان بێ، لەو دەرگایەوە دەچێتە ناو بەهەشت، وە هەر کەسێک لەو دەرگایەوە بچێتە ناو بەهەشت هەرگیز هەست بە تینوەتی ناکاتەوە.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی گەورەیی مانگی ڕەمەزان

١٦٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت، بە جۆرێک بڕوای پێ بێت و چاوەڕوانی پاداشت بێت، لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبوردرێ.

١٦٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَتْ أَوَّلُ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ، صُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ، وَمَرَدَةُ الْجِنِّ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، فَلَمْ يُفْتَحْ مِنْهَا بَابٌ، وَفُتِحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، فَلَمْ يُغْلَقْ مِنْهَا بَابٌ، وَنَادَى مُنَادٍ: يَا بَاغِيَ الْخَيْرِ أَقْبِلْ، وَيَا بَاغِيَ الشَّرِّ أَقْصِرْ، وَلِلَّهِ عُتَقَاءُ مِنَ النَّارِ، وَذَلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکەم شەوی ڕەمەزان دێ، شەیتانەکان و جنۆکە زیانبەخشەکان زنجیر دەکرێن و دووردەخرێنەوە، وە دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و هیچ دەرگایەکیان ناکرێنەوە، وە هەروەها دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو هیچ دەرگایەکیان داناخرێنەوە، وە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٩٦، ومسلم: ١١٥٢، والترمذي: ٧٦٥، والنسائي: ٢٢٣٦_٢٢٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨، ومسلم: ٧٦٠.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٦٨٢ ودون قوله: «وَنَادَى مُنَادٍ...» البخاري: ١٨٩٨، ومسلم: ١٠٧٩، والنسائي: ٢٠٩٧_٢١٠٢ و ٢١٠٤_٢١٠٦.





بانگەوازکارێک بانگەواز دەکات: ئەی ئەو کەسەی بەدوای چاکەدا دەگەڕێی بەرەو پیلی ڕەمەزان وەرە، وە ئەی خراپەکاران وازبهێنن، وە خوا چەندان کەس لە ئاگر ڕزگار دەکات، وە ئەوەش لە هەموو شەوێکی ڕەمەزاندا دووبارە دەبێتەوە.

**١٦٤٣- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلَّهِ عِنْدَ كُلِّ فِطْرٍ عُتَقَاءَ، وَذَلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ»[1].**

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی لەکاتی هەر ڕۆژوو شکاندنێکدا خوای گەورە چەندان کەس ڕزگار دەکات (لە ئاگری دۆزەخ)، وە ئەوەش لە هەموو شەوێکدا دووبارە دەبێتەوە.

**١٦٤٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ دَخَلَ رَمَضَانُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ هَذَا الشَّهْرَ قَدْ حَضَرَكُمْ، وَفِيهِ لَيْلَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ، مَنْ حُرِمَهَا فَقَدْ حُرِمَ الْخَيْرَ كُلَّهُ، وَلَا يُحْرَمُ خَيْرَهَا إِلَّا مَحْرُومٌ»[2].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: چووینە ناو مانگی ڕەمەزان، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئەو مانگە پێتان گەیشتەوە، وە شەوێکی تێدایە کە خواپەرستی تێیدا لە خواپەرستی هەزار مانگ خێری زیاترە، هەر کەسێک لە خێری ئەو شەوە بێبەش بێ، لە هەموو خێرەکەی بێبەش بووە، وە تەنها ئەو کەسە لە خێر و چاکەی بێبەش دەکرێ کە هیچ حەزی لە خۆشبەختی نیە.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ڕۆژی گومان (يوم الشك)

**١٦٤٥- عَنْ صِلَةَ بْنِ زُفَرَ ﷺ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَمَّارٍ فِي الْيَوْمِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ، فَأُتِيَ بِشَاةٍ، فَتَنَحَّى بَعْضُ الْقَوْمِ، فَقَالَ عَمَّارٌ: «مَنْ صَامَ هَذَا الْيَوْمَ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ»[3].**

واتە: صیلەی کوڕی زوفەڕ ﷺ دەڵێ: لە خزمەت عەممار بووین، لەو ڕۆژەی گومانی تێدابوو، کە ئایا ڕەمەزانە، یاخود نا، ئنجا مەڕێکی برژاویان هێنا، وە هەندێک لە

---

(١) حسن صحيح.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٣٤، والترمذي: ٦٨٦، والنسائي: ٢١٨٨.

خەڵکەکە کشانەوە بۆ دواوەو نەیانـخوارد (لەبەر ئەوەی بەڕۆژوو بوون)، جا عەممار گوتی: هەر کەسێک لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو بێ سەرپێچی ئەبولقاسمی ﷺ کردوە.

**١٦٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَعْجِيلِ صَوْمِ يَوْمٍ قَبْلَ الرُّؤْيَةِ»[١].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە پەلە بکرێ لە بەڕۆژوو بوونی ڕۆژێک پێش ئەوەی مانگ ببینرێ.

**١٦٤٧- عَنِ الْقَاسِمِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّهُ سَمِعَ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ، قَبْلَ شَهْرِ رَمَضَانَ: «الصِّيَامُ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا، وَنَحْنُ مُتَقَدِّمُونَ، فَمَنْ شَاءَ فَلْيَتَقَدَّمْ، وَمَنْ شَاءَ فَلْيَتَأَخَّرْ»[٢].**

واتە: قاسمی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەگێڕێتەوە: کە گوێی لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ بووە کە لەسەر مینبەر دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر دەیفەرموو: ڕۆژووی ڕۆژی پێش مانگی ڕەمەزان ئاوا و ئاوایە، وە ئێمە لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبین، جا هەر کەس ویستی با بەڕۆژوو بێ، وە هەر کەس نەیویست با دوای بخات تاکو ڕەمەزان دێت.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی پەیوەستکردنی ڕۆژووی شەعبان بە ڕەمەزان

**١٦٤٨- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَصِلُ شَعْبَانَ بِرَمَضَانَ»[٣].**

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مانگی شەعبانی دەگەیاند بە مانگی ڕەمەزان (واتە: تەواوی هەردوو مانگەکە بەڕۆژوو دەبوو).

**١٦٤٩- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ الْغَازِ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﷺ عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: «كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ حَتَّى يَصِلَهُ بِرَمَضَانَ»[٤].**

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٣٦، والترمذي: ٧٣٦، والنسائي: ٢١٧٥ و ٢١٧٦ و ٢٣٥٢ و ٢٣٥٣.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٣١، والترمذي: ٧٣٧، والنسائي: ٢٣٥٠، وانظر البخاري: ١٩٦٩، ومسلم: ١١٥٦.




واتە: ڕەبیعەی کوڕی غاز دەگێڕێتەوە: کە پرسیاری کردوە لە عائیشە ﵂ دەربارەی ڕۆژووی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش گوتوویەتی: هەموو (مانگی) شەعبان بەڕۆژوو دەبوو، تاوەکو دەیگەیاندەوە بە ڕەمەزان.

## بابەت: نەهی کردن لە ڕۆژووگرتنی پێش ڕەمەزان، مەگەر کەسێک پێشتر لەو ڕۆژە ڕۆژووی گرتبێ

١٦٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقَدَّمُوا صِيَامَ رَمَضَانَ بِيَوْمٍ وَلَا يَوْمَيْنِ، إِلَّا رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمًا فَيَصُومُهُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەک ڕۆژ، یان دوو ڕۆژ پێش ڕەمەزان بەڕۆژوو مەبن، مەگەر کەسێک کە عادەتی وایە لە ڕۆژە سوننەتەکاندا بەڕۆژوو بووەو، ئەو ڕۆژەی پێش ڕەمەزانیش بەر ڕۆژووە سوننەتەکە کەوتووە.

١٦٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَ النِّصْفُ مِنْ شَعْبَانَ فَلَا صَوْمَ حَتَّى يَجِيءَ رَمَضَانُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شەعبان گەیشتە نیوەی، ئیتر ڕۆژوو گرتن نیە (بەڕۆژوو مەبن) تاوەکو ڕەمەزان دێ.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی شایەدی دان لەسەر بینینی مانگی نوێ (هیلالی ڕەمەزان)

١٦٥٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَبْصَرْتُ الْهِلَالَ اللَّيْلَةَ، فَقَالَ: «أَتَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ؟» قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «قُمْ يَا بِلَالُ فَأَذِّنْ فِي النَّاسِ أَنْ يَصُومُوا غَدًا» قَالَ أَبُو عَلِيٍّ هَكَذَا رِوَايَةُ الْوَلِيدِ بْنِ أَبِي ثَوْرٍ، وَالْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ، وَرَوَاهُ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، فَلَمْ يَذْكُرِ ابْنَ عَبَّاسٍ، وَقَالَ: فَنَادَى أَنْ يَقُومُوا، وَأَنْ يَصُومُوا[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩١٤، ومسلم: ١٠٨٢، وأبو داود: ٢٣٣٥، والترمذي: ٦٨٤ و ٦٨٥، والنسائي: ٢١٧٢_٢١٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٣٧، والترمذي: ٧٣٨.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٣٤٠، والترمذي: ٦٩١، والنسائي: ٢١١٢ و ٢١١٣.




واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: دەشتەکییەک هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئنجا گوتی: ئەم شەو بە چاوی خۆم مانگم بینی، فەرمووی: ئایا شایەدی دەدەی کە هیچ پەرستراوێک بە هەق نیە جگە لە خوا، وە موحەممەد نێردراوی خوایە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەی بیلال هەڵسە لە ناو خەڵکی بانگەواز بکە بەیانی بەڕۆژوو بن، ئەبو عەلی گوتی: ڕیوایەتی وەلیدی کوڕی ئەبو سەوریش بەو شێوەیەیە، وە هی حەسەنی کوڕی عەلیش، وە حەمادی کوڕی سەلەمەش گێڕاویەتەوە، وە باسی ئیبنو عەبباسی نەکردوە، وە گوتی: بانگەوازی کرد کە شەونوێژ بکەن و بەڕۆژوو بن.

١٦٥٣- عَنْ أَبِي عُمَيْرِ بْنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي عُمُومَتِي، مِنَ الْأَنْصَارِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالُوا: أُغْمِيَ عَلَيْنَا هِلَالُ شَوَّالٍ، فَأَصْبَحْنَا صِيَامًا، فَجَاءَ رَكْبٌ مِنْ آخِرِ النَّهَارِ، فَشَهِدُوا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُمْ رَأَوُا الْهِلَالَ بِالْأَمْسِ، «فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُفْطِرُوا، وَأَنْ يَخْرُجُوا إِلَى عِيدِهِمْ مِنَ الْغَدِ»[١].

واتە: ئەبو عومەیری کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیک، دەڵێ: مامەکانم لە ئەنصاڕ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆیان گێڕامەوە کە گوتوویانە: نەمانتوانی مانگی شەوال ببینین لەبەر ئەوەی ئاسمان هەور بوو، بۆیە بەیانیەکەی بەڕۆژوو بووین، جا لە کۆتایی ڕۆژەکەدا کۆمەڵە سوارێک هاتن و لای پێغەمبەر ﷺ شایەتییان دا کە دوێنێ مانگیان بینیوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە ئەو ڕۆژە ڕۆژووەکەیان بشکێنن و لە بەیانییەوە دەربچن بۆ جەژن.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی
## کە مانگتان بینی بەڕۆژوو بن و، مانگتان بینی بیشکێنن

١٦٥٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ» وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَصُومُ قَبْلَ الْهِلَالِ بِيَوْمٍ[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١١٥٧، والنسائي: ١٥٥٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٠٠، ومسلم: ٨/١٠٨٠، والنسائي: ٢١٢٠.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مانگتان بینی بە ڕۆژووبن، وە ئەگەر دووبارە مانگتان (لە مانگی شەوال) بینی دەست هەڵگرن لە ڕۆژوو گرتن، وە ئەگەر هەور بوو نەتانبینی، مانگەکە تەواو بکەن (واتە: سی ڕۆژ بۆ مانگی شەعبان هەژمار بکەن). وە ئیبنو عومەر ڕۆژێک پێش بینینی مانگ بەڕۆژوو دەبوو.

**١٦٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَصُومُوا ثَلَاثِينَ يَوْمًا»[١].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مانگتان بینی بە ڕۆژووبن، وە ئەگەر دووبارە مانگتان (لە مانگی شەوال) بینی دەست هەڵگرن لە ڕۆژوو گرتن، وە ئەگەر هەور بوو نەتانبینی، ئەوە سی ڕۆژ بەڕۆژوو بن.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی مانگ بیست و نۆ ڕۆژە

**١٦٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَمْ مَضَى مِنَ الشَّهْرِ؟» قَالَ: قُلْنَا: اثْنَانِ وَعِشْرُونَ، وَبَقِيَتْ ثَمَانٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشَّهْرُ هَكَذَا، وَالشَّهْرُ هَكَذَا، وَالشَّهْرُ هَكَذَا، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَأَمْسَكَ وَاحِدَةً»[٢].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مانگی ڕەمەزان چەندی ڕۆیشتووە؟ گوتمان: بیست و دوو ڕۆژ، وە هەشت ڕۆژی ماوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو مانگە ئەوەندە و ئەوەندە و ئەوەندەیە سێ جار پەنجەی هەردوو دەستەکانی بەرزکردەوە، وە لە جاری سێیەمدا پەنجەیەکی نوشتاندەوە (واتە: مانگەکە بیست و نۆ ڕۆژییە).

**١٦٥٧- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشَّهْرُ هَكَذَا، وَهَكَذَا، وَهَكَذَا» وَعَقَدَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ فِي الثَّالِثَةِ[٣].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٠٩، ومسلم: ١٠٨١، والنسائي: ٢١١٧_٢١١٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٨٦، والنسائي: ٢١٣٥.




واتە: موحەممەدی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو مانگە ئەوەندە و ئەوەندە و ئەوەندەیە بە پەنجەی دەستەکانی ئاماژەی دەکرد، کە لە جاری سێیەمدا هەمووی کردیە بیست و نۆ.

**١٦٥٨**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «مَا صُمْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تِسْعًا وَعِشْرِينَ، أَكْثَرُ مِمَّا صُمْنَا ثَلَاثِينَ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەوەندەی مانگی ڕەمەزان بیست و نۆ ڕۆژ بەڕۆژوو بووین، ئەوەندە سی ڕۆژ بەڕۆژوو نەبووین (واتە: مانگی بیست و نۆ ڕۆژی زیاتر بووە).

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ئەو دوو مانگەی جەژنیان تێدایە

**١٦٥٩**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «شَهْرَا عِيدٍ لَا يَنْقُصَانِ: رَمَضَانُ، وَذُو الْحِجَّةِ»(٢).

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مانگەکانی دوو جەژنەکە (ڕەمەزان و قوربان) کەم ناکەن، (زۆر بە دەگمەن ڕێدەکەوێ کە لە یەک ساڵدا هەردوو مانگەکە لە سی ڕۆژ کەمتر بن، یان هەردووکیان سی تەواون، یان یەکێکیان سییە و، ئەویتریان بیست و نۆیە).

**١٦٦٠**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْفِطْرُ يَوْمَ تُفْطِرُونَ، وَالْأَضْحَى يَوْمَ تُضَحُّونَ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جەژنی ڕەمەزان لەو ڕۆژەدایە کە مانگی تازەی تێدا دەبینن و بەڕۆژوو نابن، وە جەژنی قوربان ئەو ڕۆژەیە کە قوربانی تێدا دەکەن.

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩١٢، ومسلم: ١٠٨٩، وأبو داود: ٢٣٢٣، والترمذي: ٦٩٢.

(٣) صحيح بطرقه. أخرجه أبو داود: ٢٣٢٤، والترمذي: ٦٩٧.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی بەڕۆژوو بوون لە گەشتدا

**١٦٦١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: «صَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي السَّفَرِ، وَأَفْطَرَ»[١].**

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتدا بەڕۆژوو بوو، وە بەڕۆژووش نەبووە.

**١٦٦٢- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: سَأَلَ حَمْزَةُ الْأَسْلَمِيُّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أَصُومُ، أَفَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ فَقَالَ ﷺ: «إِنْ شِئْتَ فَصُمْ، وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ»[٢].**

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: حەمزەی ئەسلەمی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، گوتی: من ڕۆژوو دەگرم، ئایا لە گەشتیشدا بەڕۆژوو بم؟ فەرمووی: ئەگەر ویستت بەڕۆژوو بە، وە ئەگەر ویستت بیشکێنە (بەڕۆژوو مەبە).

**١٦٦٣- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رضي الله عنه، أَنَّهُ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ فِي الْيَوْمِ الْحَارِّ الشَّدِيدِ الْحَرِّ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ، «وَمَا فِي الْقَوْمِ أَحَدٌ صَائِمٌ إِلَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ»[٣].**

واتە: ئەبو دەرداء رضي الله عنه دەڵێ: هەندێ جار (لە ڕەمەزاندا) لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووینە گەشت، لە ڕۆژێکدا کە ئەوندە گەرم بوو پیاو بە دەستی سێبەری بۆ سەری دەکرد (بۆ ئەوەی گەرمی خۆر ڕاستەوخۆ لە سەری نەدا)، وە هیچ یەکێک لە ئێمە لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو نەبوو جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ڕۆژوو شکاندن لە گەشتدا

**١٦٦٤- عَنْ كَعْبِ بْنِ عَاصِمٍ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ»[٤].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٤٤، ومسلم: ١١١٣، وأبو داود: ٢٤٠٤، والنسائي: ٢٢٩٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٤٣، ومسلم: ١١٢١، وأبو داود: ٢٤٠٢، والترمذي: ٧١١، والنسائي: ٢٣٠٥_٢٣٠٨ و ٢٣٨٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٤٥، ومسلم: ١١٢٢، وأبو داود: ٢٤٠٩.

(٤) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٢٥٥ و ٢٢٥٦ مرسلًا.

واتە: کەعبی کوڕی عاصیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو گرتن لە گەشتدا خواپەرستی و چاکەکاری نیە.

**١٦٦٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ»[1].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژووگرتن لە گەشتدا لە کردەوە چاکەکان نیە.

**١٦٦٦- عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَائِمُ رَمَضَانَ فِي السَّفَرِ، كَالْمُفْطِرِ فِي الْحَضَرِ»[2].**

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە گەشتدا ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرێ، وەکو ئەو کەسە وایە کە لەماڵەوە ڕۆژوو دەشکێنێ.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ڕۆژوونەگرتنی ئافرەتی دووگیان و شیردەر

**١٦٦٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ الْأَشْهَلِ - وَقَالَ: عَلِيُّ بْنُ مُحَمَّدٍ مِنْ بَنِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبٍ - قَالَ: أَغَارَتْ عَلَيْنَا خَيْلُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَتَغَدَّى فَقَالَ: «ادْنُ فَكُلْ» قُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ «اجْلِسْ أُحَدِّثْكَ عَنِ الصَّوْمِ أَوِ الصِّيَامِ، إِنَّ اللَّهَ ﷻ وَضَعَ عَنِ الْمُسَافِرِ شَطْرَ الصَّلَاةِ، وَعَنِ الْمُسَافِرِ وَالْحَامِلِ وَالْمُرْضِعِ الصَّوْمَ، أَوِ الصِّيَامَ» وَاللَّهِ لَقَدْ قَالَهُمَا النَّبِيُّ ﷺ، كِلْتَاهُمَا أَوْ إِحْدَاهُمَا، فَيَا لَهْفَ نَفْسِي، فَهَلَّا كُنْتُ طَعِمْتُ مِنْ طَعَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[3].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک لە بەنو عەبدولئەشهەل، بەڵام عەلی کوڕی موحەممەد گوتی: پیاوێک لە بەنو عەبدوڵڵای کوڕی کەعب گوتی: کۆمەڵێک ئەسپ سواری پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەریاندا داین، منیش چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە خەریک بوو نانی بەیانی دەخوارد، فەرمووی: نزیک بەرەوە و

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه النسائي: ٢٢٨٤ و ٢٢٨٥.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٠٨، والترمذي: ٧١٥، والنسائي: ٢٢٧٤ و ٢٢٧٦ و ٢٣١٥.




بخۆ، گوتم: بەڕۆژووم، فەرمووی: دانیشە با باسی ڕۆژوو، یان ڕۆژووگرتنت بۆ بکەم، خوا نوێژی بۆ کەسی گەشتیاری کردۆتە نیوە (واتە: دوو ڕکات)، وە هەروەها ڕۆژووی یان ڕۆژووگرتنی لەسەر گەشتیار و دووگیان و شیردەر هەڵگرتووە، (پیاوەکە) گوتی: سوێند بە خوا پێغەمبەر ﷺ هەردوو وشەکانی (ڕۆژوو یان ڕۆژووگرتنی) فەرموو یان یەکێکیانی فەرموو، (بەداخەوە بۆ خۆم) ئای خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نانم خواردبا. (دیارە پیاوەکە ڕۆژووەکەی نەشکاندووە).

**١٦٦٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْحُبْلَى الَّتِي تَخَافُ عَلَى نَفْسِهَا أَنْ تُفْطِرَ، وَلِلْمُرْضِعِ الَّتِي تَخَافُ عَلَى وَلَدِهَا»[1].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی داوە بە ئافرەتی دووگیان ئەگەر ترسی لە تەندروستی خۆی هەبوو ڕۆژووەکەی بشکێنێ، وە هەروەها ئافرەتی شیردەر ئەگەر لە تەندروستی منداڵەکەی ترسا ڕۆژووەکەی بشکێنێ.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی گێڕانەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان

**١٦٦٩- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ﷺ تَقُولُ: «إِنْ كَانَ لَيَكُونُ عَلَيَّ الصِّيَامُ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ، فَمَا أَقْضِيهِ حَتَّى يَجِيءَ شَعْبَانُ»[2].**

واتە: ئەبو سەلەمە ﷺ دەڵێ: گوێم لە عائیشە ﷺ بوو دەیگوت: ئەگەر ڕۆژووی ڕەمەزانم لەسەر بووایە، هەتا مانگی شەعبان دەهات نەمدەگرتەوە.

**١٦٧٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «كُنَّا نَحِيضُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَيَأْمُرُنَا بِقَضَاءِ الصَّوْمِ»[3].**

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: ئێمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی سووڕی مانگانە دەبووین، وە ئەویش فەرمانی پێدەکردین کە ڕۆژووەکە بگرینەوە (نوێژەکەمان نەدەگێڕایەوە).

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٥٠، ومسلم: ١١٤٦، وأبو داود: ٢٣٩٩، والترمذي: ٧٨٣، والنسائي: ٢١٧٨ و ٢٣١٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٣٣٥/٦٩، وأبو داود: ٢٦٣، والترمذي: ٧٨٧، والنسائي: ٢٣١٨ مطولًا.




## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی کەفارەتی ئەو کەسەی ڕۆژووەکی ڕەمەزانی شکاندوە

**١٦٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ فَقَالَ: هَلَكْتُ، قَالَ: «وَمَا أَهْلَكَكَ؟» قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَعْتِقْ رَقَبَةً» قَالَ: لَا أَجِدُ، قَالَ: «صُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ» قَالَ: لَا أُطِيقُ، قَالَ: «أَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا» قَالَ: لَا أَجِدُ، قَالَ: «اجْلِسْ» فَجَلَسَ، فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أُتِيَ بِمِكْتَلٍ، يُدْعَى الْعَرَقَ، فَقَالَ: «اذْهَبْ، فَتَصَدَّقْ بِهِ» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجُ إِلَيْهِ مِنَّا، قَالَ: «فَانْطَلِقْ فَأَطْعِمْهُ عِيَالَكَ»[1].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: لەناوچووم، فەرمووی: بە چی لەناوچووی؟ گوتی: لە (ڕەمەزان) لەگەڵ هاوسەرم جووتبووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەندەیەک ئازاد بکە، گوتی: لە دەستم نیە، فەرمووی: دوو مانگ بە دوای یەکدا بەڕۆژوو ببە، گوتی: ناتوانم، فەرمووی: خواردنی شەست هەژار بدە، گوتی: لە دەستم نیە، فەرمووی: دانیشە، ئەویش دانیشت، لەوکاتەدا کە بەو شێوەیە دانیشتبوو تاسێک (زەمبیلەیەک) خورمایان هێنا، فەرمووی: ئەوە ببە بیکە بە خێر، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەوەی کە تۆی بە هەق ناردووە لەمسەر بۆ ئەوسەری ئەم دوو چیایە لە من هەژارتری تێدانیە، فەرمووی: دەبڕۆ دەرخواردی ماڵ و منداڵەکەتی بدە.

**١٦٧١م- حَدَّثَنَا حَرْمَلَةُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْجَبَّارِ بْنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيِّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِذَلِكَ فَقَالَ: «وَصُمْ يَوْمًا مَكَانَهُ»[2].**

واتە: حەرمەلەی کوڕی یەحیا بۆی گێڕاینەوە، گوتی: عەبدوڵڵای کوڕی وەهب بۆی گێڕاینەوە، گوتی: عەبدولجەباری کوڕی عومەر بۆی گێڕاینەوە، گوتی: یەحیای کوڕی سەعید لە ئیبنو موسەیبەوە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بە هەمان شێوە بۆی گێڕامەوە، کە فەرموویەتی: وە لە بـری ئەو ڕۆژە (کە شکاندووتە)، ڕۆژوێکی دیکە بگرەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٣٦، ومسلم: ١١١١، وأبو داود: ٢٣٩٠_٢٣٩٢، والترمذي: ٧٢٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٣٦، ومسلم: ١١١١، وأبو داود: ٢٣٩٠_٢٣٩٢، والترمذي: ٧٢٤.

**١٦٧٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَفْطَرَ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ رُخْصَةٍ، لَمْ يُجْزِهِ صِيَامُ الدَّهْرِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەبێ پاساوی شەرعی ڕۆژووێکی ڕەمەزان بشکێنێ، ئەگەر هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بێ جێگای ئەو ڕۆژووەی بۆ ناگرێتەوە.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ئەو کەسەی بە لەبیرچوون ڕۆژی شکاندوە

**١٦٧٣**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَكَلَ نَاسِيًا وَهُوَ صَائِمٌ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لەبیری نەبوو کە بەڕۆژووە، وە شتێکی خوارد، با ڕۆژووەکەی تەواو بکات (نەیشکێنێ)، چونکە خوا ئەو خواردن و خواردنەوەی پێداوە.

**١٦٧٤**- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، قَالَتْ: «أَفْطَرْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي يَوْمِ غَيْمٍ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ» قُلْتُ لِهِشَامٍ: أُمِرُوا بِالْقَضَاءِ؟ قَالَ: فَلَا بُدَّ مِنْ ذَلِكَ[3].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﷺ دەڵێ: لە ڕۆژێکی هەوراویدا لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژوومان شکاند (وایان زانیوە کە خۆرئاوا بووە و کاتی بەربانگە)، پاشان خۆر دەرکەوت، بە هیشامم گوت: ئایا فەرمان بە خەڵک کرا ڕۆژووەکە بگرنەوە؟ گوتی: بێگومان فەرمانیان پێکراوە کە بیگرنەوە.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٣٩٦ و ٢٣٩٧، والترمذي: ٧٢٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٣٣، ومسلم: ١١٥٥، وأبو داود: ٢٣٩٨، والترمذي: ٧٢١ و ٧٢٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٥٩، وأبو داود: ٢٣٥٩.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ڕشانەوەی ڕۆژوەوان

**١٦٧٥-** عَنْ أَبِي مَرْزُوقٍ، قَالَ: سَمِعْتُ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ، يُحَدِّثُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ عَلَيْهِمْ فِي يَوْمٍ كَانَ يَصُومُهُ، فَدَعَا بِإِنَاءٍ، فَشَرِبَ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هَذَا يَوْمٌ كُنْتَ تَصُومُهُ، قَالَ: «أَجَلْ، وَلَكِنِّي قِئْتُ»(١).

واتە: ئەبو مەڕزوق دەڵێ: گوێم لە فەزاڵەی کوڕی عوبەیدی ئەنصاڕی بوو کە دەیگێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆلایان لە ڕۆژێکدا کە تێیدا بەڕۆژوو دەبوو، ئنجا داوای پەرداخێک ئاوی کرد و لێی خواردەوە، ئێمەش گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ڕۆژێکە کە تۆ تێیدا بەڕۆژوو دەبی!! فەرمووی: بەڵێ، بەڵام ڕشامەوە.

**١٦٧٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ ذَرَعَهُ الْقَيْءُ فَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِ، وَمَنِ اسْتَقَاءَ فَعَلَيْهِ الْقَضَاءُ»(٢).

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا، گرتنەوەی لەسەر نیە (واتە: ڕۆژووەکەی نەشکاوە)، هەر کەس بە ئەنقەست خۆی بڕشێنێتەوە، گرتنەوەی لەسەرە (واتە: ڕۆژووەکەی شکاوە).

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی سیواک کردن و چاوڕشتنی ڕۆژووەوان

**١٦٧٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِنْ خَيْرِ خِصَالِ الصَّائِمِ السِّوَاكُ»(٣).

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە باشترین شت کە ڕۆژووەوان بیکات سیواک کردنە.

**١٦٧٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «اكْتَحَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ صَائِمٌ»(٤).

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی دەڕشت بە کل و بەڕۆژووش بوو.

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٨٠، والترمذي: ٧٢٠.

(٣) ضعيف.

(٤) ضعيف.

## بابەت: کەڵەشاخ گرتنی ڕۆژوەوان

١٦٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەڵەشاخگرو کەڵەشاخ بۆکراو ڕۆژوویان دەشکێ (ئەگەر بەڕۆژوو بوون).

١٦٨٠- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ»(٢).

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: کەڵەشاخگرو کەڵەشاخ بۆکراو ڕۆژوویان دەشکێ (ئەگەر بەڕۆژوو بوون).

١٦٨١- عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ شَدَّادَ بْنَ أَوْسٍ ﷺ بَيْنَمَا هُوَ يَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِالْبَقِيعِ، فَمَرَّ عَلَى رَجُلٍ يَحْتَجِمُ بَعْدَ مَا مَضَى مِنَ الشَّهْرِ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ»(٣).

واتە: ئەبو قیلابە دەگێڕێتەوە: کە شەدادی کوڕی ئەوس ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە: کاتێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەقیعدا دەڕۆیشتن، بەلای پیاوێکدا ڕۆیشتن کە کەڵەشاخی دەگرت، پاش ئەوەی کە هەژدە شەو لە مانگەکە ڕۆیشت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەڵەشاخگرو کەڵەشاخ بۆکراو ڕۆژوویان دەشکێ (ئەگەر بەڕۆژوو بوون).

١٦٨٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ صَائِمٌ مُحْرِمٌ»(٤).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی گرت و بەڕۆژووش بوو، لە ئیحرامیشدا بوو.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٦٧ و ٢٣٧٠ و ٢٣٧١.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٣٦٨ و ٢٣٦٩.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٣٧٣، والترمذي: ٧٧٥ و ٧٧٧. وانظر: البخاري: ١٩٣٨، ومسلم: ١٢٠٢، وأبو داود: ١٨٣٥ و ١٨٣٦، والترمذي: ٨٣٩، والنسائي: ٢٨٤٥_٢٨٤٧.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ماچکردن بۆ ڕۆژووەوان

**١٦٨٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «يُقَبِّلُ فِي شَهْرِ الصَّوْمِ»[١].

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە مانگی ڕۆژووگرتندا خێزانەکانی ماچ دەکرد.**

**١٦٨٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَهُ، كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْلِكُ إِرْبَهُ»[٢].

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە زمانی بەڕۆژووەوە خێزانەکانی ماچ دەکرد، وە کامتان دەتوانێ جڵەوی ئارەزووی خۆی بگرێت، هەروەکو چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ جڵەوی ئارەزووی خۆی دەگرت.**

**١٦٨٥-** عَنْ حَفْصَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ»[٣].

**واتە: حەفصە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی ماچ دەکرد، لە کاتێکدا کە بەڕۆژوو بوو.**

**١٦٨٦-** عَنْ مَيْمُونَةَ ﵂، مَوْلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ رَجُلٍ قَبَّلَ امْرَأَتَهُ وَهُمَا صَائِمَانِ، قَالَ: «قَدْ أَفْطَرَا»[٤].

**واتە: مەیمونەی ﵂ خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پرسیارکرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی پیاوێک ژنەکەی ماچ کردوە و هەردووکیشیان بەڕۆژوون؟ فەرمووی: بە دڵنیایی ڕۆژووەکەیان شکاوە.**

## بابەت: دەستبازی کردنی کەسی ڕۆژووەوان لەگەڵ خێزانیدا

**١٦٨٧-** عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: دَخَلَ الْأَسْوَدُ، وَمَسْرُوقٌ، عَلَى عَائِشَةَ ﵂، فَقَالَا: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ؟ قَالَتْ: «كَانَ يَفْعَلُ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ»[٥].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٢٧ و ١٩٢٨، ومسلم: ١١٠٦، وأبو داود: ٢٣٨٢_٢٣٨٤، والترمذي: ٧٢٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٢٧ و ١٩٢٨، ومسلم: ١١٠٦، وأبو داود: ٢٣٨٢_٢٣٨٤، والترمذي: ٧٢٧.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٠٧.

(٤) ضعيف جداً.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٢٧، ومسلم: ١١٠٦، وأبو داود: ٢٣٨٢، والترمذي: ٧٢٩.

واتە: ئیبراهیم دەڵێ: ئەسوەد و مەسروق چوونە ماڵی عائیشە ﷺ گوتیان: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بە زمانی بەڕۆژووەوە یاری و دەستبازی دەکرد (لەگەڵ خێزانەکانی)؟ گوتی: ئەو وای دەکرد، وە ئەو لە هەمووتان زاڵتر بوو بەسەر ئارەزوویدا.

١٦٨٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «رُخِّصَ لِلْكَبِيرِ الصَّائِمِ فِي الْمُبَاشَرَةِ، وَكُرِهَ لِلشَّابِّ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: دەستبازی بۆ ڕۆژووەوان بە تەمەن مۆڵەتی پێدراوە، بەڵام بۆ گەنج مۆڵەت نەدراوەو ناپەسندە.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی غەیبەت و قسەی نەشیاو بۆ ڕۆژووەوان

١٦٨٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ، وَالْجَهْلَ، وَالْعَمَلَ بِهِ، فَلَا حَاجَةَ لِلَّهِ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو ڕۆژووەوانەی کە واز نەهێنێ لە قسەی درۆ و خراپ و ناڕەوا وە کاری نابەجێ، خوا هیچ پێویستی بەوە نیە کە واز بێنێ لە خواردن و خواردنەوە.

١٦٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رُبَّ صَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ صِيَامِهِ إِلَّا الْجُوعُ، وَرُبَّ قَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ قِيَامِهِ إِلَّا السَّهَرُ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژووەوانی وا هەیە کە لە ڕۆژووەکەی هیچی بۆ نامێنێتەوە، جگە لە برسییەتی، وە هەندێ شەونوێژکەر هەیە کە لەو شەونوێژەکەی هیچی بۆ نامێنێتەوە جگە لە شەونـخونی.

١٦٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ، فَلَا يَرْفُثْ، وَلَا يَجْهَلْ، وَإِنْ جَهِلَ عَلَيْهِ أَحَدٌ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ»[٤].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٠٣، وأبو داود: ٢٣٦٢، والترمذي: ٧٠٧.

(٣) حسن صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٩٤، ومسلم: ١١٥١/١٦٠، وأبو داود: ٢٣٦٣، والنسائي: ٢٢١٦ و ٢٢١٧.





واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە بەڕۆژوو بوو، قسەی ناشیرین نەکا و کاری نەزانانەش نەکات، وە ئەگەر کەسێک کارێکی نەشیاوی بەرانبەر کرد، با بڵێ: من کەسێکی بەڕۆژووم.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی پارشێو کردن

١٦٩٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «تَسَحَّرُوا؛ فَإِنَّ فِي السُّحُورِ بَرَكَةً»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن، چونکە بێگومان پارشێو بەرەکەتی تێدایە.

١٦٩٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اسْتَعِينُوا بِطَعَامِ السَّحَرِ عَلَى صِيَامِ النَّهَارِ، وَبِالْقَيْلُولَةِ عَلَى قِيَامِ اللَّيْلِ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بۆ ڕۆژووگرتن پشت بە خواردنی پارشێو ببەستن، وە بۆ شەونوێژ کردن پشت بە خەوۆچکەی نیوەڕۆیان ببەستن.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی دواخستنی پارشێو

١٦٩٤- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: «تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ» ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلَاةِ، قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: «قَدْرُ قِرَاءَةِ خَمْسِينَ آيَةً»[3].

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پارشێومان کرد، پاشان هەڵساین بۆ نوێژ کردن، گوتم: ماوەی نێوانیان چەند بوو (نێوانی پارشێو و نوێژی بەیانی)؟ فەرمووی: بە ئەندازەی خوێندنی پەنجا ئایەت.

١٦٩٥- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: «تَسَحَّرْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ هُوَ النَّهَارُ، إِلَّا أَنَّ الشَّمْسَ لَمْ تَطْلُعْ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٢٣، ومسلم: ١٠٩٥، والترمذي: ٧٠٨، والنسائي: ٢١٤٦.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٥، ومسلم: ١٠٩٧، والترمذي: ٧٠٣، والنسائي: ٢١٥٥ و ٢١٥٦.

(٤) شاذ مرفوعاً. أخرجه النسائي: ٢١٥٢ و ٢١٥٣.




واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پارشێوم کرد، لە کاتێکدا کە ڕۆژ بوو (یان نزیک بوو ڕۆژ بێتەوە)، تەنها ئەوە هەبوو کە هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو.

**١٦٩٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَمْنَعَنَّ أَحَدَكُمْ أَذَانُ بِلَالٍ مِنْ سُحُورِهِ، فَإِنَّهُ يُؤَذِّنُ لِيَنْتَبِهَ نَائِمُكُمْ، وَلِيَرْجِعَ قَائِمُكُمْ، وَلَيْسَ الْفَجْرُ أَنْ يَقُولَ هَكَذَا، وَلَكِنْ هَكَذَا، يَعْتَرِضُ فِي أُفُقِ السَّمَاءِ»(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بانگی بیلال ڕێگر نیە پارشێو بکەن، چونکە ئەو بانگ دەدات بۆ ئەوەی خەوتوو هەڵسێنێ، ئەوەی کە لە مزگەوت شەونوێژ دەکات بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، چونکە بەیانی هاتن بەو شێوەیە نیە (بە دەستی ئاماژەی کرد بۆ فەجری کازیب)، بەڵکو بەو جۆرەیە (بەدەستی ئاماژەی کرد بۆ فەجری صادیق) کاتێک ڕووناکییەکە لەبەری ئاسمان بڵاودەبێتەوە.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی پەلەکردن لە بەربانگ کردن

**١٦٩٧-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْإِفْطَارَ»(٢).

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام خەڵک لە خێرو چاکەدان هەتا زوو بەربانگ بکەنەوە.

**١٦٩٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ، عَجِّلُوا الْفِطْرَ؛ فَإِنَّ الْيَهُودَ يُؤَخِّرُونَ»(٣).

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام خەڵک لە خێرو چاکەدان هەتا زوو بەربانگ بکەنەوە، چونکە بەڕاستی جوولەکە بەربانگ کردنەوە دوا دەخەن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٢١، ومسلم: ١٠٩٣، وأبو داود: ٢٣٤٧، والنسائي: ٦٤١ و ٢١٧٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٥٧، ومسلم: ١٠٩٨، والترمذي: ٦٩٩.

(٣) صحيح لغيره.

## بابەت: سوننەتی ڕۆژوو شکاندن

١٦٩٩- عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى الْمَاءِ؛ فَإِنَّهُ طَهُورٌ»[1].

واتە: سەلمانی کوڕی عامیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان بەربانگی کردەوە با بە خورما بەربانگ بکاتەوە، ئەگەر دەستی نەکەوت با بە ئاو بەربانگ بکاتەوە، چونکە بەڕاستی ئاو پاکە.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی نیەتی ڕۆژوو سەرپشکبوون تێیدا

١٧٠٠- عَنْ حَفْصَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يَفْرِضْهُ مِنَ اللَّيْلِ»[2].

واتە: حەفصە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە شەوەوە نیەتی ڕۆژووگرتنی نەبێ، ئەوە ڕۆژووەکەی بەر ناکەوێ.

١٧٠١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟» فَنَقُولُ: لَا، فَيَقُولُ: «إِنِّي صَائِمٌ» فَيُقِيمُ عَلَى صَوْمِهِ، ثُمَّ يُهْدَى لَنَا شَيْءٌ، فَيُفْطِرُ، قَالَتْ: وَرُبَّمَا صَامَ وَأَفْطَرَ، قُلْتُ: كَيْفَ ذَا؟ قَالَتْ: إِنَّمَا مَثَلُ هَذَا مَثَلُ الَّذِي يَخْرُجُ بِصَدَقَةٍ، فَيُعْطِي بَعْضًا، وَيُمْسِكُ بَعْضًا[3].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتە ماڵی من و دەیفەرموو: ئایا هیچ شتێکتان لایە (بۆ خواردن)؟ دەمانگوت: نەخێر، دەیفەرموو: من بەڕۆژووم، لەسەر ڕۆژووەکەی بەردەوام دەبوو، پاشان شتێکمان بە دیاری بۆ دەهات، ئەویش ڕۆژووەکەی دەشکاند، (عائیشە ﷺ) دەڵێ: لەوانەیە بەڕۆژوو بووبێ و ڕۆژووەکەی شکاندبێ، (ڕاوی) گوتی: جا چۆن؟ (عائیشە ﷺ) گوتی: ئەوە وەکو ئەو کەسە وایە کە ماڵێک دەردەکات بۆ ئەوەی شتێک بکاتە خێر، جا هەندێکی لێدەبەخشێ و هەندێکیشی دەهێڵێتەوە (نایبەخشێ).

---

(١) ضعيف، والصحيح من فعله ﷺ. أخرجه أبو داود: ٢٣٥٥، والترمذي: ٦٥٨ و ٦٩٥.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٥٤، والترمذي: ٧٣٠، والنسائي: ٢٣٣١_٢٣٤١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٥٤/١٦٩، وأبو داود: ٢٤٥٥، والترمذي: ٧٣٣ و ٧٣٤، والنسائي: ٢٣٢٢_٢٣٢٤ و ٢٢٣٨ و ٢٣٣٠.





## بابەت: لەشگرانی بۆ کەسی ڕۆژووەوان کە دەیەوێ بەڕۆژوو بێ

**١٧٠٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو الْقَارِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: لَا وَرَبِّ الْكَعْبَةِ مَا أَنَا قُلْتُ مَنْ أَصْبَحَ وَهُوَ جُنُبٌ فَلْيُفْطِرْ، مُحَمَّدٌ ﷺ قَالَهُ[١].**

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری قاریی ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو دەیگوت: سوێند بە خوای کەعبە من نەمگوتوە هەر کەسێک بەیانی لە خەو هەستا و لەشگران بوو با ڕۆژووەکەی بشکێنێ، بەڵکو موحەممەد ﷺ وای فەرمووە.**

**١٧٠٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَبِيتُ جُنُبًا، فَيَأْتِيهِ بِلَالٌ، فَيُؤْذِنُهُ بِالصَّلَاةِ، فَيَقُومُ فَيَغْتَسِلُ، فَأَنْظُرُ إِلَى تَحَدُّرِ الْمَاءِ مِنْ رَأْسِهِ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَأَسْمَعُ صَوْتَهُ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ» قَالَ مُطَرِّفٌ: فَقُلْتُ لِعَامِرٍ: أَفِي رَمَضَانَ؟ قَالَ: «رَمَضَانُ وَغَيْرُهُ سَوَاءٌ»[٢].**

**واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەو بە لەشگرانی دەمایەوە، جا بیلال دەهات بۆئەوەی ئاگاداری بکاتەوە کە کاتی نوێژ هاتووە، ئنجا ئەویش هەڵدەستا و خۆی دەشۆرد، من سەیری ئەو دڵۆپە ئاوانەم دەکرد کە لە قژی دەهاتە خوارەوە، پاشان دەڕۆیشت (بۆناو مزگەوت) و منیش گوێم لە دەنگی دەبوو لە نوێژی بەیانیدا، موتەریف گوتی: بە عامیرم گوت: ئەوە لە ڕەمەزاندا؟ گوتی: لە ڕەمەزان و لە غەیری ڕەمەزانیشدا وەکو یەک.**

**١٧٠٤- عَنْ نَافِعٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ أُمَّ سَلَمَةَ، عَنِ الرَّجُلِ يُصْبِحُ وَهُوَ جُنُبٌ، يُرِيدُ الصَّوْمَ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُصْبِحُ جُنُبًا مِنَ الْوِقَاعِ، لَا مِنَ احْتِلَامٍ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ، وَيُتِمُّ صَوْمَهُ»[٣].**

**واتە: نافیع ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئومو سەلەمە دەربارەی پیاوێ کە بەیانی دەکاتەوە بە لەشگرانی وە دەشیهەوێ بەڕۆژوو بێ؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە لەشگرانی ڕۆژی دەکردەوە کە لە ڕێگەی جیماعەوە توش دەبو نەک بە خەو بینین، پاشان خۆی دەشۆرد و ڕۆژووەکەی تەواو دەکرد.**

---

(١) صحيح. انظر البخاري: ١٩٢٦، ومسلم: ١١٠٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٢٦ و ١٩٣٠ و ١٩٣١، ومسلم: ١١٠٩ و ١١١٠، والترمذي: ٧٧٩، والنسائي: ٢٣٨٨.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٠٩ وانظر الحديث السابق.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی بەڕۆژوو بوون بە درێژایی ساڵ

١٧٠٥- عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ صَامَ الْأَبَدَ، فَلَا صَامَ، وَلَا أَفْطَرَ»[1].

واتە: موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخخیر لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی ساڵ دوازدە مانگە بەڕۆژوو دەبێ ڕۆژووەکەی گیرا نەبێ و بەربانگ کردنەوەکەشی گیرا نەبێ (هیچ پاداشتی بۆ نییە).

١٧٠٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا صَامَ مَنْ صَامَ الْأَبَدَ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕۆژوو نەبووە ئەو کەسە کە ساڵ دوازدە مانگە بەڕۆژوو بێ (هیچ پاداشتی بۆ نییە).

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی بەڕۆژوو بوونی سێ ڕۆژ لە هەر مانگێکدا

١٧٠٧- عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ الْمِنْهَالِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ «يَأْمُرُ بِصِيَامِ الْبِيضِ، ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ، وَيَقُولُ: هُوَ كَصَوْمِ الدَّهْرِ، أَوْ كَهَيْئَةِ صَوْمِ الدَّهْرِ»[3].

واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی مینهال لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرمانی کردوە بە ڕۆژووگرتن لەو ڕۆژانەدا کە شەوەکەیان مانگە شەوی تەواوە، کە سێزدە و چواردە و پازدەی هەر مانگێکە، وە دەیفەرموو: ئەوە وەکو ئەوە وایە کە تەواوی ساڵەکە بەڕۆژوو ببی، یان وەکو شێوازی ئەوە وایە کە تەواوی ساڵەکە بەڕۆژوو ببی.

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٣٨٠ و ٢٣٨١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٧٧، ومسلم: ١١٥٩، والنسائي: ٢٣٧٧_٢٣٧٨ و ٢٣٩٧_٢٣٩٨.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٤٤٩، والنسائي: ٢٤٣٠ و ٢٤٣١.

**١٧٠٧م-** حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ قَالَ: أَنْبَأَنَا حَبَّانُ بْنُ هِلَالٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ، عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ قَتَادَةَ بْنِ مَلْحَانَ الْقَيْسِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ. قَالَ ابْنُ مَاجَةَ: أَخْطَأَ شُعْبَةُ وَأَصَابَ هَمَّامٌ[١].

**واتە:** بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە، ئیبنو ماجە گوتوویەتی: شوعبە هەڵەی کردوەو هەمام پێکاویەتی.

**١٧٠٨-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، فَذَلِكَ صَوْمُ الدَّهْرِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ تَصْدِيقَ ذَلِكَ فِي كِتَابِهِ: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ ١٦٠﴾ الأنعام، فَالْيَوْمُ بِعَشَرَةِ أَيَّامٍ»[٢].

**واتە:** ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ، ئەوە وەکو ڕۆژووگرتنی هەموو ساڵەکە وایە، ئنجا خوا ﷻ بەڕاست دانان بۆ قسەکەی لە قوڕئاندا ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ ١٦٠﴾ الأنعام، واتە: هەر کەسێک چاکە بکات ئەوە (لەڕۆژی دواییدا) دە هێندەی چاکەکەی پاداشتی بۆ هەیە. بۆیە هەر ڕۆژێک بە دە ڕۆژە.

**١٧٠٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يَصُومُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ» قُلْتُ: مِنْ أَيِّهِ؟ قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ يُبَالِي مِنْ أَيِّهِ كَانَ[٣].

**واتە:** عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو مانگێک سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، (ڕاوی) گوتم: لە کام بەشی مانگە (واتە: لە سەرەتای یان لە ناوەڕاستی یان لە کۆتایی مانگەکە)؟ گوتی: گوێی پێنەدەدا لە هەر بەشێکی مانگەکەدا بووبا.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٤٤٩، والنسائي: ٢٤٣٠ و ٢٤٣١.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٧٦٢، والنسائي: ٢٤٠٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٦٠، وأبو داود: ٢٤٥٣، والترمذي: ٧٦٣.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی بەڕۆژوو بوونی پێغەمبەر ﷺ

**١٧١٠-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ رضي الله عنه، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها عَنْ صَوْمِ النَّبِيِّ ﷺ؟ فَقَالَتْ: «كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ صَامَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ أَفْطَرَ، وَلَمْ أَرَهُ صَامَ مِنْ شَهْرٍ قَطُّ، أَكْثَرَ مِنْ صِيَامِهِ مِنْ شَعْبَانَ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ إِلَّا قَلِيلًا»[1].

واتە: ئەبو سەلەمە رضي الله عنه دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە رضي الله عنها دەربارەی ڕۆژووی پێغەمبەر ﷺ، گوتی: جار هەبوو ئەوەندە (بەردەوام بەدوای یەکدا) بەڕۆژوو دەبوو دەمانگوت: هەمیشە بەڕۆژوو دەبێ، وە جار هەبوو ئەوەندە ماوەیەکی زۆر بەڕۆژوو نەدەبوو دەمانگوت: هەرگیز بەڕۆژوو نابێ، وە هەرگیز نەمبینیوە لە هیچ مانگێکدا ئەوەندەی مانگی شەعبان بەڕۆژوو ببێ، مانگی شەعبان هەمووی بەڕۆژوو دەبوو، مانگی شەعبان کەمێکی نەبێ هەمووی بەڕۆژوو دەبوو (ڕستەی کۆتایی ڕوونکردنەوەیە بۆ ڕستەکەی پێش خۆی).

**١٧١١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ: لَا يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ: لَا يَصُومُ، وَمَا صَامَ شَهْرًا مُتَتَابِعًا إِلَّا رَمَضَانَ مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: جار هەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو دەمانگوت: هەرگیز واز لە ڕۆژووگرتن ناهێنێ، وە جار هەبوو ماوەیەکی ئەوەندە زۆر بەڕۆژوو نەدەبوو دەمانگوت: هەرگیز بەڕۆژوو نابێ، وە لەو کاتەوە کە هاتۆتە شاری مەدینە هیچ مانگێک هەمووی بەدوای یەکدا بەڕۆژوو نەبووە، تەنها مانگی ڕەمەزان نەبێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٦٩، ومسلم: ١١٥٦، وأبو داود: ٢٤٣٤، والترمذي: ٧٣٧ و ٧٦٨، والنسائي: ٢١٧٧_٢١٨١ و ٢٣٥٠ و ٢٣٥١ و ٢٣٥٤ و ٢٣٥٥ و ٢٣٥٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٧١، ومسلم: ١١٥٧، والنسائي: ٢٣٤٦.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی بەڕۆژوو بوونی پێغەمبەر داود ﷺ

**١٧١٢- عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ أَوْسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ، فَإِنَّهُ كَانَ يَصُومُ يَوْمًا، وَيُفْطِرُ يَوْمًا، وَأَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ، كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَيُصَلِّي ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ»(١).**

واتە: عەمری کوڕی دینار دەڵێ: گوێم لە عەمری کوڕی ئەوس بوو دەیگوت: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەسندترین ڕۆژوو لەلای خوا ڕۆژووی (پێغەمبەر) داودە ﷺ، بە جۆرێک ڕۆژێک نا ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبوو، وە پەسندترین نوێژ لەلای خوا نوێژی (پێغەمبەر) داودە ﷺ، نیوەی شەو دەخەوت، وە یەک لەسەر سێی شەو شەونوێژی دەکرد، وە یەک لەسەر شەشەکەی دیکەی دەخەوتەوە.

**١٧١٣- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْمَيْنِ وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: «وَيُطِيقُ ذَلِكَ أَحَدٌ؟» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: «ذَلِكَ صَوْمُ دَاوُدَ» قَالَ: كَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمَيْنِ؟ قَالَ: «وَدِدْتُ أَنِّي طُوِّقْتُ ذَلِكَ»(٢).**

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە کەسێک ڕۆژێک نا دوو ڕۆژ بەڕۆژوو بێ؟ فەرمووی: ئایا هیچ کەسێک توانای ئەوەی هەیە؟! گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە کەسێک ڕۆژێک نا ڕۆژێک بەڕۆژوو بێ؟ فەرمووی: ئەوە شێوازی ڕۆژووگرتنی (پێغەمبەر) داودە ﷺ، گوتی: ئەی چۆنە کەسێک دوو ڕۆژ نا ڕۆژێک بەڕۆژوو بێ؟ فەرمووی: حەزم دەکرد کە توانای ئەوەم هەبووایە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٧٧، ومسلم: ١١٥٩، وأبو داود: ٢٤٢٧، والترمذي: ٧٧٠، والنسائي: ١٦٣٠ و ٢٣٤٤ و ٢٣٨٨_٢٣٩٤ و ٢٣٩٧ و ٢٣٩٩_٢٤٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٦٢، وأبو داود: ٢٤٢٥، والترمذي: ٧٦٧، والنسائي: ٢٣٨٧.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی بەڕۆژوو بوونی نوح ﷺ

١٧١٤- عَنْ أَبِي فِرَاسٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «صَامَ نُوحٌ الدَّهْرَ، إِلَّا يَوْمَ الْفِطْرِ وَيَوْمَ الْأَضْحَى»[1].

واتە: ئەبو فیراس دەگێڕێتەوە، گوێی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ بووە، گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نووح ساڵ دوازدە مانگە بەڕۆژوو بووە، تەنها ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان نەبێ.

## بابەت: بەڕۆژوو بوونی شەش ڕۆژ لە مانگی شەوالدا

١٧١٥- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ صَامَ سِتَّةَ أَيَّامٍ بَعْدَ الْفِطْرِ كَانَ تَمَامَ السَّنَةِ، ﴿مَنْ جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ١٦٠﴾ الأنعام»[2].

واتە: سەوبان ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە، فەرموویەتی: هەر کەسێک شەش ڕۆژ لە دوای مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێ، وەکو ئەوە وایە تەواوی ساڵەکە بەڕۆژوو بووبێ، ﴿مَنْ جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ١٦٠﴾ الأنعام، واتە: هەر کەسێک چاکە بکات ئەوە (لە ڕۆژی دواییدا) دە هێندەی چاکەکەی پاداشتی بۆ هەیە.

١٧١٦- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ بِسِتٍّ مِنْ شَوَّالٍ، كَانَ كَصَوْمِ الدَّهْرِ»[3].

واتە: ئەبو ئەییوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێ، پاشان شەش ڕۆژی دیکەش لە مانگی شەوال بەڕۆژوو بێ، وەکو ئەوە وایە تەواوی ساڵەکە بەڕۆژوو بووبێ.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٦٤، وأبو داود: ٢٤٣٣، والترمذي: ٧٥٩.

## بابەت: بەڕۆژوو بوونی یەک ڕۆژ لەپێناوی خوادا

**١٧١٧-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ الْيَوْمِ النَّارَ مِنْ وَجْهِهِ سَبْعِينَ خَرِيفًا»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ڕۆژێک لە پێناوی خوا بەڕۆژوو بێ، خوا بە هۆی ئەو ڕۆژەوە حەفتا پایز ئاگر لە ڕووی دووردەخاتەوە.

**١٧١٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، زَحْزَحَ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ڕۆژێک لە پێناوی خوا بەڕۆژوو بێ، خوا بە هۆی ئەو ڕۆژەوە حەفتا پایز ئاگر لە ڕووی دووردەخاتەوە.

## بابەت: ڕێگری کردنی بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژانی جەژنی قورباندا (أيام التشريق)

**١٧١٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيَّامُ مِنًى أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژانی جەژنی قوربان ڕۆژی خواردن و خواردنەوەن (واتە: تێیاندا بەڕۆژوو مەبن).

**١٧٢٠-** عَنْ بِشْرِ بْنِ سُحَيْمٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ فَقَالَ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلَّا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ، وَإِنَّ هَذِهِ الْأَيَّامَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٤٠، ومسلم: ١١٥٣، والترمذي: ١٦٢٣، والنسائي: ٢٢٤٧_٢٢٥٣.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٢٢، والنسائي: ٢٢٤٤.

(٣) حسن صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٩٩٤.





واتە: بیشری کوڕی سوحەیم ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژانی جەژنی قورباندا وتاری داوە و فەرموویەتی: جگە لە مرۆڤی مسوڵمان کەس ناچێتە بەهەشتەوە، وە بەڕاستی ئەو ڕۆژانەی جەژن ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن.

## بابەت: ڕێگری کردن لە بەڕۆژوو بوونی ڕۆژانی جەژنی ڕەمەزان و قوربان

**١٧٢١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ «نَهَى عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْفِطْرِ، وَيَوْمِ الْأَضْحَى»[1].**

واتە: ئەبو سەعید ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە بەڕۆژوو بوونی لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قورباندا قەدەغە کردوە.

**١٧٢٢- عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ، قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «نَهَى عَنْ صِيَامِ هَذَيْنِ الْيَوْمَيْنِ، يَوْمِ الْفِطْرِ وَيَوْمِ الْأَضْحَى، أَمَّا يَوْمُ الْفِطْرِ، فَيَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَيَوْمُ الْأَضْحَى تَأْكُلُونَ فِيهِ مِنْ لَحْمِ نُسُكِكُمْ»[2].**

واتە: ئەبو عوبەید، دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژن بووم لە خزمەت عومەری کوڕی خەتتابدا ﷺ، جا سەرەتا نوێژی جەژنی کرد پێش ئەوەی وتار بخوێنێ، ئنجا گوتی: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە لەو دوو ڕۆژانەدا ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان ڕۆژوو بگیرێ، چونکە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان ڕۆژی ڕۆژوو شکاندنتانە، وە ڕۆژی جەژنی قوربان ئەو ڕۆژەیە کە تێیدا لەو گۆشتە دەخۆن کە کردووتانە قوربانی.

## بابەت: بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژی جومعەدا

**١٧٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ إِلَّا بِيَوْمٍ قَبْلَهُ، أَوْ يَوْمٍ بَعْدَهُ»[3].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٩٧، ومسلم بإثر: ١١٣٨، وأبو داود: ٢٤١٧، والترمذي: ٢٧٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٩٠، ومسلم: ١١٣٧ و ١٩٥٩، وأبو داود: ٢٤١٦، والترمذي: ٧٧٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٨٥، ومسلم: ١١٤٤، وأبو داود: ٢٤٢٠، والترمذي: ٧٤٣.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژووبوونی ڕۆژی هەینی قەدەغە کردوە، تەنها مەگەر ڕۆژێک پێش خۆی یان ڕۆژێک دوای خۆشی بگیرێ.

**١٧٢٤-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبَّادِ بْنِ جَعْفَرٍ، قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا أَطُوفُ بِالْبَيْتِ: «أَنَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ؟» قَالَ: «نَعَمْ، وَرَبِّ هَذَا الْبَيْتِ»[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی عەبادی کوڕی جەعفەر، دەڵێ: لە کاتێکدا کە تەوافی ماڵی خوام دەکرد لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵام ﷺ پرسی: ئایا پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژی هەینیدا قەدەغە کردوە؟ گوتی: بەڵێ سوێند بە پەروەردگاری ئەم ماڵە (کەعبە).

**١٧٢٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: «قَلَّمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُفْطِرُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: زۆر بە کەمی هەبووە ببینم پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی هەینیدا بەڕۆژوو نەبێ.

## بابەت: بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژی شەممەدا

**١٧٢٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ إِلَّا فِيمَا افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلَّا عُودَ عِنَبٍ، أَوْ لِحَاءَ شَجَرَةٍ فَلْيَمُصَّهُ»[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی شەممەدا بەڕۆژوو مەبن، مەگەر ئەو ڕۆژووانەی لەسەرتان واجبە بکەوێتە ئەو ڕۆژەوە (واتە: مانگی ڕەمەزان)، وە ئەگەر کەسێک هیچی دەست نەکەوت تەنیا لاسکە مێو یان توێکڵی دار نەبێ ئەوە با بیمژێ.

**١٧٢٦م-** حَدَّثَنَا حُمَيْدُ بْنُ مَسْعَدَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ حَبِيبٍ، عَنْ ثَوْرِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ، عَنْ أُخْتِهِ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ[4].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٨٤، ومسلم: ١١٤٣.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٤٥٠، والترمذي: ٧٤٢، والنسائي: ٢٣٦٨.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٢١، والترمذي: ٧٤٤.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٢١، والترمذي: ٧٤٤.

## بابەت: بەرۆژوو بوون لە دە ڕۆژی "ذي الحجة"ـدا

١٧٢٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ أَيَّامٍ، الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِيهَا أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ، مِنْ هَذِهِ الْأَيَّامِ» يَعْنِي الْعَشْرَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، إِلَّا رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَلَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ ڕۆژانێک نیە وەک ئەو دە ڕۆژەی مانگی قوربان کردەوەی باشیان تێدا خۆشەویست و پەسندبێ لەلای خوا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا خەبات و تێکۆشانیش لە ڕێگەی خوادا؟! فەرمووی: بەڵێ، هەتا خەبات و غەزاش لە ڕێگەی خوادا، مەگەر کەسێ کە بە سەرو ماڵەوە بڕوات بۆ غەزاو هیچیان نەهێنێتەوە.

١٧٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ أَيَّامِ الدُّنْيَا أَيَّامٌ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ سُبْحَانَهُ أَنْ يُتَعَبَّدَ لَهُ فِيهَا مِنْ أَيَّامِ الْعَشْرِ، وَإِنَّ صِيَامَ يَوْمٍ فِيهَا لَيَعْدِلُ صِيَامَ سَنَةٍ، وَلَيْلَةٍ فِيهَا بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دونیادا هیچ ڕۆژانێک نیە وەکو دە ڕۆژی سەرەتای مانگی قوربان خواپەرستی تێیاندا خۆشەویست و پەسندبێ لە لای خوا پاک و بێگەردی بۆ ئەو، وە بەڕاستی ڕۆژووگرتن لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا بە ئەندازەی ڕۆژوو گرتنی یەک ساڵە، وە شەوێک لەو شەوانە بە ئەندازەی شەوی قەدرە (لە خێر و پاداشتدا).

١٧٢٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَامَ الْعَشْرَ قَطُّ»[3].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: هەرگیز نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ دە ڕۆژی سەرەتای مانگی قوربان بەڕۆژوو بێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٦٩، وأبو داود: ٢٤٣٨، والترمذي: ٧٥٧.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٧٥٩.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٧٦، وأبو داود: ٢٤٣٩، والترمذي: ٧٥٦.




## بابەت: ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عەرەفە

**١٧٣٠-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ، وَالَّتِي بَعْدَهُ»(١).

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفە، من ئومێدەوارم کە خوا بەهۆیەوە لە گوناهی ساڵێک پێش خۆی و ساڵێک دوای خۆی خۆشبێ.

**١٧٣١-** عَنْ قَتَادَةَ بْنِ النُّعْمَانِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ صَامَ يَوْمَ عَرَفَةَ غُفِرَ لَهُ سَنَةٌ أَمَامَهُ، وَسَنَةٌ بَعْدَهُ»(٢).

واتە: قەتادەی کوڕی نوعمان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک ڕۆژی عەرەفە بەڕۆژوو بێ لە گوناهی ساڵێک پێش ئەوەو، ساڵێک دوای ئەوە دەبورێ.

**١٧٣٢-** عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ دَخَلْتُ عَلَى أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ فِي بَيْتِهِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ، بِعَرَفَاتٍ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ بِعَرَفَاتٍ»(٣).

واتە: عیکریمە دەڵێ: چوومە لای ئەبو هورەیرە ﷺ لە ماڵەکەی پرسیارم لێکرد دەربارەی بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عەرەفە بۆ ئەو کەسەی کە لە کێوی عەرەفەیە؟ ئەبو هورەیرەش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عەرەفەی قەدەغە کردوە لە کەسێک کە لە کێوی عەرەفاتە.

## بابەت: ڕۆژووگرتنی ڕۆژی عاشورا

**١٧٣٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «يَصُومُ عَاشُورَاءَ وَيَأْمُرُ بِصِيَامِهِ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٦٢، وأبو داود: ٢٤٢٥، والترمذي: ٧٤٩.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٤٤٠.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٩٢ و ١٥٩٣، ومسلم: ١١٢٥، وأبو داود: ٢٤٤٢، والترمذي: ٧٥٣.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی عاشوڕادا بەڕۆژوو دەبوو، وە هەروەها فەرمانیشی دەکرد بە بەڕۆژوو بوون لەو ڕۆژەدا.

**١٧٣٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ، فَوَجَدَ الْيَهُودَ صُيَّامًا، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» قَالُوا: هَذَا يَوْمٌ أَنْجَى اللَّهُ فِيهِ مُوسَى، وَأَغْرَقَ فِيهِ فِرْعَوْنَ، فَصَامَهُ مُوسَى شُكْرًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَحْنُ أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْكُمْ، فَصَامَهُ، وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ هات بۆ مەدینە تەماشای کرد، جوولەکەکان بەڕۆژوو بوون، جا فەرمووی: ئەم ڕۆژووە چییە؟ گوتیان: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە خوا موسای تێدا ڕزگار کرد، وە هەر لەو ڕۆژەشدا فیرعەونی نغرۆ کرد، جا موسا وەکو سوپاسگوزاری لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێمە لە ئێوە لە پێشترین بۆ موسا، جا هەم بۆ خۆی بەڕۆژوو بوو هەم فەرمانیشی کرد بە مسوڵمانان کە ئەم ڕۆژە بەڕۆژووبن.

**١٧٣٥-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ صَيْفِيٍّ ﵁، قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ عَاشُورَاءَ: «مِنْكُمْ أَحَدٌ طَعِمَ الْيَوْمَ؟» قُلْنَا: مِنَّا طَعِمَ، وَمِنَّا مَنْ لَمْ يَطْعَمْ، قَالَ: «فَأَتِمُّوا بَقِيَّةَ يَوْمِكُمْ، مَنْ كَانَ طَعِمَ، وَمَنْ لَمْ يَطْعَمْ، فَأَرْسِلُوا إِلَى أَهْلِ الْعَرُوضِ، فَلْيُتِمُّوا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمْ» قَالَ: يَعْنِي أَهْلَ الْعَرُوضِ حَوْلَ الْمَدِينَةِ[2].

واتە: موحەممەدی کوڕی صەیفیی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی عاشوڕادا پێیانی فەرموو: ئایا کەستان تێدایە کە ئەمڕۆ خواردنی خواردبێ؟ گوتمان: هەمانە خواردوویەتی و هەشمانە نەیخواردووە، فەرمووی: ئەوەی کە خواردوویەتی و ئەوەشی کە نەیخواردووە، با پاش ماوەی ڕۆژەکە بەڕۆژووبێ، وە هەروەها هەواڵیش بنێرن بۆ خەڵکی دەوروبەری مەدینە کە پاشماوەی ڕۆژەکە بەڕۆژووبن.

**١٧٣٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَئِنْ بَقِيتُ إِلَى قَابِلٍ، لَأَصُومَنَّ الْيَوْمَ التَّاسِعَ» قَالَ أَبُو عَلِيٍّ: رَوَاهُ أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، زَادَ فِيهِ: مَخَافَةَ أَنْ يَفُوتَهُ عَاشُورَاءُ[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٠٤، ومسلم: ١١٣٠، وأبو داود: ٢٤٤٤.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٣٢٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٣٤/١٣٤، وأبو داود: ٢٤٤٥ بنحوه.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ساڵێکی تر بمێنم (لە ژیاندا) ڕۆژی نۆیەمیش بەڕۆژوو دەبم، ئەبو عەلی گوتی: ئەحمەدی کوڕی یونس لە ئیبنو ئەبو زیئبەوە گێڕایەوە ئەوەی لێ زیادکرد: لە ترسی ئەوەی کە عاشوڕای لە دەست بچێ.

**١٧٣٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمُ عَاشُورَاءَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَانَ يَوْمًا يَصُومُهُ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَصُومَهُ فَلْيَصُمْهُ، وَمَنْ كَرِهَهُ فَلْيَدَعْهُ»(١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ڕۆژی عاشوڕا کرا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوە ڕۆژێک بوو کە خەڵکی لە سەردەمی نەفامیدا تێیدا بەڕۆژوو دەبوون، جا هەر کەسێک حەزی لێبوو بەڕۆژوو بێ با بەڕۆژوو بێ، وە هەر کەسێک حەزی لێنەبوو با بەڕۆژوو نەبێ.

**١٧٣٨-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ»(٢).

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عاشوڕا، ئومێدەوارم کە خوا بە هۆیەوە لە گوناهی ساڵێک پێش خۆی خۆش بێ.

## بابەت: بەڕۆژوو بوون
## لە ڕۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممەدا

**١٧٣٩-** عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ الْغَازِ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: كَانَ «يَتَحَرَّى صِيَامَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ»(٣).

واتە: ڕەبیعەی کوڕی غاز ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیاری کردوە لە عائیشە دەربارەی ڕۆژووی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش گوتوویەتی: هەمیشە دەگەڕا بە دوای دوو شەممە و پێنج شەممەدا بۆ ئەوەی تێیاندا بەڕۆژووبێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٠١، ومسلم: ١١٢٦، وأبو داود: ٢٤٤٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٦٢/١٩٦، وأبو داود: ٢٤٢٥، والترمذي: ٧٥٢.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٧٤٥، والنسائي: ٢٣٦١_٢٣٦٤.

**١٧٤٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَصُومُ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ تَصُومُ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ؟ فَقَالَ: «إِنَّ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسَ يَغْفِرُ اللَّهُ فِيهِمَا لِكُلِّ مُسْلِمٍ، إِلَّا مُتَهَاجِرَيْنِ، يَقُولُ: دَعْهُمَا حَتَّى يَصْطَلِحَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دوو شەممە و پێنج شەمان بەڕۆژوو دەبوو، جا گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ ڕۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبی؟! فەرمووی: بەڕاستی لە ڕۆژانی دوو شەممەو پێنج شەممەدا خوا لە هەموو مسوڵمانێک خۆش دەبێ، تەنیا ئەوانە نەبێ کە دەنگیان لە یەک بڕیوە، خوا دەفەرموێ: وازیان لێبێنن (کارو کردەوەیان ڕابگرن) تاوەکو ئاشت دەبنەوە.

## بابەت: بەڕۆژوو بوونی مانگە حەرامەکان

**١٧٤١-** عَنْ أَبِي مُجِيبَةَ الْبَاهِلِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، أَوْ عَنْ عَمِّهِ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَنَا الرَّجُلُ الَّذِي أَتَيْتُكَ عَامَ الْأَوَّلِ، قَالَ: «فَمَا لِي أَرَى جِسْمَكَ نَاحِلًا؟» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَكَلْتُ طَعَامًا بِالنَّهَارِ، مَا أَكَلْتُهُ إِلَّا بِاللَّيْلِ، قَالَ: «مَنْ أَمَرَكَ أَنْ تُعَذِّبَ نَفْسَكَ؟» قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَقْوَى، قَالَ: «صُمْ شَهْرَ الصَّبْرِ، وَيَوْمًا بَعْدَهُ» قُلْتُ: إِنِّي أَقْوَى، قَالَ: «صُمْ شَهْرَ الصَّبْرِ، وَيَوْمَيْنِ بَعْدَهُ» قُلْتُ: إِنِّي أَقْوَى، قَالَ: «صُمْ شَهْرَ الصَّبْرِ، وَثَلَاثَةَ أَيَّامٍ بَعْدَهُ، وَصُمْ أَشْهُرَ الْحُرُمِ»[٢].

واتە: ئەبو موجیبەی باهیلیی لە باوکییەوە یان لە مامیەوە ﷺ دەگێڕێتەوەدەڵێ: هاتم بۆلای پێغەمبەر ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئەو پیاوەم کە ساڵی پێشوتر هاتمە خزمەتت، فەرمووی: مەسەلە چییە جەستەت زۆر بە لاوازی دەبینم؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من (لەو ساڵەدا) هەرگیز بەڕۆژ نانم نەخواردووە، بە شەو نەبێ نانم نەخواردووە، فەرمووی: کێ فەرمانی پێکردووی کە بەو شێوەیە خۆت ئازار بدەی؟! گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من لەوە بە تواناترم، فەرمووی: مانگی ئارامگرتن (مانگی ڕەمەزان) و ڕۆژێکیش دوای ئەوە (واتە: ڕۆژێک لە مانگەکانی تردا) بەڕۆژووبە، گوتی: من توانای لەوە زیاترم هەیە، فەرمووی: مانگی ئارامگرتن و دوو ڕۆژ دوای ئەوە بەڕۆژووبە، گوتی: من توانای لەوە زیاترم هەیە، فەرمووی:

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٥٦٥، وأبو داود: ٤٩١٦، والترمذي: ٧٥٧.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٤٢٨.

مانگی ئارامگرتن و سێ ڕۆژیش دوای ئەوە بەڕۆژووبە، وە مانگە حەڕامەکانیش (ئەو مانگانەی کە لەلای عەرەب شەڕکردن تێیاندا حەڕام بووە) بەڕۆژووبە.

**١٧٤٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَيُّ الصِّيَامِ أَفْضَلُ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ؟ قَالَ: «شَهْرُ اللَّهِ الَّذِي تَدْعُونَهُ الْمُحَرَّمَ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، گوتی: لە دوای مانگی ڕەمەزان چ ڕۆژووێک باشترینە (خێرو پاداشتی زۆرترینە)؟ فەرمووی: مانگانی خوا کە ئێوە پێی دەڵێن: «المحرم».

**١٧٤٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «نَهَى عَنْ صِيَامِ رَجَبٍ»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆژوو بوونی مانگی ڕەجەبی قەدەغە کردوە.

**١٧٤٤-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ ﷺ، أَنَّ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ، كَانَ يَصُومُ أَشْهُرَ الْحُرُمِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صُمْ شَوَّالًا» فَتَرَكَ أَشْهُرَ الْحُرُمِ، ثُمَّ لَمْ يَزَلْ يَصُومُ شَوَّالًا حَتَّى مَاتَ(٣).

واتە: موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم ﷺ دەگێڕێتەوە، ئوسامەی کوڕی زەید لە مانگە حەڕامەکاندا بەڕۆژوو دەبوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: مانگی شەوال بەڕۆژووبە، ئەویش (ڕۆژووی) مانگە حەڕامەکانی واز لێهێنا، پاشان تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد بەردەوام مانگی شەوال بەڕۆژوو دەبوو.

## بابەت: ڕۆژوو زەکاتی (پاکبوونەوەی) جەستەیە

**١٧٤٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِكُلِّ شَيْءٍ زَكَاةٌ، وَزَكَاةُ الْجَسَدِ الصَّوْمُ» زَادَ مُحْرِزٌ فِي حَدِيثِهِ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «الصِّيَامُ نِصْفُ الصَّبْرِ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٦٣، وأبو داود: ٢٤٢٩، والترمذي: ٤٣٨ و ٧٤٠، والنسائي: ١٦١٣ و ١٦١٤.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) ضعيف.

(٤) ضعيف.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو شتێک زەکاتی تێدایە، وە زەکاتی لاشەش بەڕۆژوو بوونە، موحریز لە فەرموودەکەیدا ئەوەشی زیادکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕۆژوو نیوەی ئارامگرییە.

## بابەت: پاداشتی کەسێک
## کە ڕۆژەوانێک لەلای ڕۆژوو دەشکێنێ

**١٧٤٦-** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِمْ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا»[١].

واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خواردن و خۆراکی ڕۆژووانێک بدات، بە ئەندازەی ڕۆژووی ڕۆژووانەکە پاداشتی بۆ دەنووسرێ، بەبێ ئەوەی هیچ شتێک لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە.

**١٧٤٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، قَالَ: أَفْطَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ، فَقَالَ: «أَفْطَرَ عِنْدَكُمُ الصَّائِمُونَ، وَأَكَلَ طَعَامَكُمُ الْأَبْرَارُ، وَصَلَّتْ عَلَيْكُمُ الْمَلَائِكَةُ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای سەعدی کوڕی موعاز بەربانگی کردەوە، ئنجا فەرمووی: ڕۆژووانان لەلای ئێوە بەربانگیان بکەنەوە، وە چاکەکاران لە خواردنی ئێوە بخۆن و فریشتەکان دووعای چاکەتان بۆ بکەن.

## بابەت: ڕۆژەوان کاتێ خواردنی لەلا دەخورێ

**١٧٤٨-** عَنْ حَبِيبِ بْنِ زَيْدٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، عَنِ امْرَأَةٍ، يُقَالُ لَهَا لَيْلَى، عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ، قَالَتْ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَرَّبْنَا إِلَيْهِ طَعَامًا، فَكَانَ بَعْضُ مَنْ عِنْدَهُ صَائِمًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الصَّائِمُ إِذَا أُكِلَ عِنْدَهُ الطَّعَامُ صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلَائِكَةُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٨٠٧.

(٢) صحيح لغيره، دون قوله: «أَفْطَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ».

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٧٨٤ و ٧٨٥ و ٧٨٦.

واتە: حەبیبی کوڕی زەیدی ئەنصاڕیی ﷺ لە ئافرەتێکەوە کە پێی دەگوترا: لەیلا، لە ئومو عەممارەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان، جا خواردنمان بردە خزمەتی، وە هەندێ لەوانەی کە لەلای بوون بەڕۆژوو بوون، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ڕۆژووان ئەگەر خواردنی لەلا بخورێ، فریشتەکان دووعای بۆ دەکەن.

**١٧٤٩-** عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لِبِلَالٍ «الْغَدَاءُ يَا بِلَالُ» فَقَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَأْكُلُ أَرْزَاقَنَا، وَفَضْلُ رِزْقِ بِلَالٍ فِي الْجَنَّةِ، أَشَعَرْتَ يَا بِلَالُ أَنَّ الصَّائِمَ تُسَبِّحُ عِظَامُهُ، وَتَسْتَغْفِرُ لَهُ الْمَلَائِكَةُ مَا أُكِلَ عِنْدَهُ»[١].

واتە: سولەیمانی کوڕی بوڕەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە بیلالی فەرموو: ئەی بیلال کاتی نانی بەیانییە، گوتی: لە ڕاستیدا من بەڕۆژووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێمە خواردنی خۆمان دەخۆین، وە فەزڵ و گەورەیی ڕزق و توێشوی بیلال لە بەهەشتدایە، ئەی بیلال ئایا زانیوتە کە ڕۆژووان تا ئەو کاتەی خواردنی لەلا دەخورێ ئێسکەکانیشی تەسبیحات و زیکری خوا دەکەن، وە فریشتەکانیش لەلای خوا داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن.

## بابەت: ئەو کەسەی بانگهێشت دەکرێ بۆ خواردن و بەڕۆژووە

**١٧٥٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ وَهُوَ صَائِمٌ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان بانگ هێشت کرا بۆ خواردن و ئەویش بەڕۆژوو بوو، ئەوە با بڵێ: من بەڕۆژووم.

**١٧٥١-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ دُعِيَ إِلَى طَعَامٍ وَهُوَ صَائِمٌ، فَلْيُجِبْ، فَإِنْ شَاءَ طَعِمَ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ»[٣].

---

(١) موضوع.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٥٠، وأبو داود: ٢٤٦١، والترمذي: ٧٨١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٣٠، وأبو داود: ٣٧٤٠.




واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک بانگ هێشت کرا بۆ خواردن و بەڕۆژوو بوو، با بەدەم بانگ هێشت کردنەوەکەوە بچێ، ئەگەر ویستی با بخوا، وە ئەگەر نەیویست با نەیخوات.

## بابەت: ڕۆژووەوان نزاو پاڕانەوەی ڕەت ناکرێتەوە

**١٧٥٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا تُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ، الْإِمَامُ الْعَادِلُ، وَالصَّائِمُ، حَتَّى يُفْطِرَ، وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ، يَرْفَعُهَا اللَّهُ دُونَ الْغَمَامِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَتُفْتَحُ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَيَقُولُ: بِعِزَّتِي لَأَنْصُرَنَّكِ وَلَوْ بَعْدَ حِينٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس نزایان ڕەت ناکرێتەوە، پێشەوای دادپەروەر، وە ڕۆژووان تاوەکو بەربانگ دەکاتەوە، وە نزای ستەم لێکراویش خوا لە ڕۆژی دوایدا تاوەکو سەرووی هەورەکان بەرزی دەکاتەوە (واتە: تا شوێنی گیرابوون و وەڵام دانەوە)، وە هەروەها لە دونیادا دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە، وە خوا دەفەرموێ: سوێند بە عیزەتی خۆم سەرتدەخەم (بەسەر ستەمکاردا) ئەگەر پاش ماوەیەکیشی پێ بچێ.

**١٧٥٣**- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي مُلَيْكَةَ، يَقُولُ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلصَّائِمِ عِنْدَ فِطْرِهِ لَدَعْوَةً مَا تُرَدُّ» قَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو، يَقُولُ إِذَا أَفْطَرَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِرَحْمَتِكَ الَّتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ أَنْ تَغْفِرَ لِي»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو مولەیکە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص ﷺ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بابای ڕۆژووان لە کاتی بەربانگ کردنەوەیدا مۆڵەتی نزایەکی هەیە کە ئەو نزایە ڕەت ناکرێتەوە، ئیبنو ئەبو مولەیکە، گوتی: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ بوو کە بەربانگی دەکردەوە دەیگوت: خوایە من بەو سۆز و بەزەییەت کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە داوات لێدەکەم کە لێم خۆشبی.

---

(١) صحيح، بطرقه وشواهده. أخرجه الترمذي: ٣٥٩٨.

(٢) ضعيف.

## بابەت: خواردن لە ڕۆژی جەژندا پێش ڕۆیشتن بۆ نوێژی جەژن

١٧٥٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «لَا يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ تَمَرَاتٍ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا لە ماڵ دەرنەدەچوو تاوەکو چەند دەنکە خورمایەکی نەخواردبا.

١٧٥٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، «لَا يَغْدُو يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يُغَدِّيَ أَصْحَابَهُ مِنْ صَدَقَةِ الْفِطْرِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا بەیانی زوو لە ماڵ دەرنەدەچوو، تاوەکو بەیانی دەکردەوە بە هاوەڵاکانی لە زەکاتی سەرفیترە دەرخواردی دەدان.

١٧٥٦- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «كَانَ لَا يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَأْكُلَ، وَكَانَ لَا يَأْكُلُ يَوْمَ النَّحْرِ حَتَّى يَرْجِعَ»[٣].

واتە: ئیبنو بورەیدە ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا لە ماڵ دەرنەدەچوو تاوەکو خواردنی نەخواردبا، وە لە ڕۆژی قورباندا تاوەکو نەگەڕابایەوە ماڵەوە خواردنی نەدەخوارد.

## بابەت: کەسێک مردبێ و ڕۆژووی ڕەمەزانی قەرزار بێ، بە کەمتەرخەمی نەیگرتبێ

١٧٥٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامُ شَهْرٍ، فَلْيُطْعَمْ عَنْهُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينٌ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٥٣، والترمذي: ٥٤٣.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٥٤٢.

(٤) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٧١٨.



واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک وەفاتی کرد و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی لەسەر بوو با لەجیاتی هەر ڕۆژوویێک هەژارێک تێر بکرێ (واتە: کەس و کاری مردووەکە ئەوەی بۆ بکەن).

١٧٥٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُخْتِي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، قَالَ: «أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُخْتِكِ دَيْنٌ، أَكُنْتِ تَقْضِينَهُ؟» قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: «فَحَقُّ اللَّهِ أَحَقُّ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوشکەکەم مردووە و ڕۆژووی دوو مانگی لە دوای یەکی لەسەرە، فەرمووی: ئایا ئەگەر خوشکەکەت قەرزێکی لەسەربایە لە جیاتی ئەو دەتدایەوە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: جا هەقی خوا لە پێشترە بدرێتەوە.

١٧٥٩- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمٌ، أَفَأَصُومُ عَنْهَا؟، قَالَ: «نَعَمْ»(٢).

واتە: ئیبنو بوڕەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئافرەتێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا دایکم وەفاتی کردوەو ڕۆژووشی لەسەرە، ئایا لە جیاتی ئەو بیگرمەوە؟ فەرمووی: بەڵێ.

## بابەت: کەسێک کە لە مانگی ڕەمەزاندا مسوڵمان بووبێ

١٧٦٠- عَنْ عَطِيَّةَ بْنِ سُفْيَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَبِيعَةَ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنَا وَفْدُنَا الَّذِينَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِإِسْلَامِ ثَقِيفٍ قَالَ: وَقَدِمُوا عَلَيْهِ فِي رَمَضَانَ، «فَضَرَبَ عَلَيْهِمْ قُبَّةً فِي الْمَسْجِدِ، فَلَمَّا أَسْلَمُوا صَامُوا مَا بَقِيَ عَلَيْهِمْ مِنَ الشَّهْرِ»(٣).

واتە: عەتیەی کوڕی سوفیانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەبیعە ﷺ دەڵێ: ئەو وەفدەمان کە بۆ مسوڵمان بوون چووبوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەقیف،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٥٣، ومسلم: ١١٤٨، وأبو داود: ٣٣١٠، والترمذي: ٧١٦، والنسائي: ٣٨١٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٤٩، وأبو داود: ١٦٥٦ و ٢٨٧٧ و ٣٣٠٩، والترمذي: ٦٦٧ و ٩٢٩.

(٣) ضعيف.

گوتی: جا لە مانگی ڕەمەزاندا چوونە خزمەتی، (پێغەمبەریش ﷺ) لە ناو مزگەوتدا شوێنێکی مانەوەی پێدان، جا کاتێک کە مسوڵمان بوون ئەوەی کە لە مانگی ڕەمەزان مابوو تیایدا بەڕۆژوو بوون.

## بابەت: بەڕۆژوو بوونی ئافرەت بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی

١٧٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَصُومُ الْمَرْأَةُ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ يَوْمًا مِنْ غَيْرِ شَهْرِ رَمَضَانَ إِلَّا بِإِذْنِهِ»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئافرەت مێردەکەی لە ماڵەوە بێ، بۆی نیە بەبێ مۆڵەتی ئەو جگە لە مانگی ڕەمەزاندا بەڕۆژووبێ (ڕۆژووی سوننەت).

١٧٦٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النِّسَاءَ أَنْ يَصُمْنَ إِلَّا بِإِذْنِ أَزْوَاجِهِنَّ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە ئافرەتان بەبێ مۆڵەتی مێردەکانیان بەڕۆژووبن (ڕۆژووی سوننەت).

## بابەت: کەسێک کە لە شوێنێک میوانە نابێ بەبێ مۆڵەتی ئەوان بەڕۆژوو بێت

١٧٦٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا نَزَلَ الرَّجُلُ بِقَوْمٍ فَلَا يَصُومُ إِلَّا بِإِذْنِهِمْ»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێک لەلای کەسانێک دابەزی (میوان بوو لایان) و مایەوە، بەبێ مۆڵەتی ئەوان بۆی نیە بەڕۆژووبێ.

١٧٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ بِمَنْزِلَةِ الصَّائِمِ الصَّابِرِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٩٢ و ٥١٩٥، ومسلم: ١٠٢٦، وأبو داود: ٢٤٥٨، والترمذي: ٧٨٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٥٩ مطولاً.

(٣) ضعيف جداً. أخرجه الترمذي: ٧٨٩.

(٤) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٤٨٦.

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە لەسەر خواردن سوپاس و ستایشی خوا دەکات، وەکو ئەو کەسە وایە کە بەڕۆژوو دەبێ و ئارام دەگرێ لەسەری.

**١٧٦٥-** عَنْ سِنَانِ بْنِ سَنَّةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ، صَاحِبِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ الصَّائِمِ الصَّابِرِ»(١).

واتە: سینانی کوڕی سەنەی ئەسلەمی ﷺ هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە لەسەر خواردن سوپاس و ستایشی خوا دەکات، پاداشتی وەک ئەو کەسەیە کە بەڕۆژوو دەبێ و ئارام دەگرێ لەسەری.

## بابەت: شەوی قەدر

**١٧٦٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: اعْتَكَفْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْعَشْرَ الْأَوْسَطَ مِنْ رَمَضَانَ، فَقَالَ: «إِنِّي أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ فَأُنْسِيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، فِي الْوَتْرِ»(٢).

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لە دە شەوی ناوەڕاستی ڕەمەزاندا دەماینەوە، ئنجا فەرمووی: من نیشانم درابوو کە شەوی قەدر کامەیە، بەڵام دواتر لەبیرم برایەوە، جا بۆیە لە شەوە تاکەکانی دە شەوی کۆتایی بۆی بگەڕێن.

## بابەت: گەورەیی دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان

**١٧٦٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، «يَجْتَهِدُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، مَا لَا يَجْتَهِدُ فِي غَيْرِهِ»(٣).

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی لە دە شەوی کۆتاییدا خێر و چاکە و خواپەرستی دەکرد، لە کاتەکانی تردا نەیدەکرد.

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٨١٣ و ٢٠١٦ و ٢٠١٨، ومسلم: ١١٦٧/٢١٣، وأبو داود: ١٣٨٢ و ١٣٨٣، والنسائي: ١٣٥٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٧٥، والترمذي: ٧٩٦.




١٧٦٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ «إِذَا دَخَلَتِ الْعَشْرُ أَحْيَا اللَّيْلَ، وَشَدَّ الْمِئْزَرَ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێ دە شەوی کۆتایی دەهات پێغەمبەر ﷺ شەوەکانی زیندوو دەکردەوە (بە شەونوێژ و قورئان خوێندن)، وە خۆی گورج دەکردەوە (بۆ خواپەرستی)، وە خێزانەکانی بەئاگا دەهێنا بۆ هەمان مەبەست.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ئیعتیکاف

١٧٦٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، «يَعْتَكِفُ كُلَّ عَامٍ عَشْرَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا، وَكَانَ يُعْرَضُ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ عُرِضَ عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەموو ساڵێک دە ڕۆژ لە مزگەوتدا دەمایەوە، بەڵام لەو ساڵەدا کە وەفاتی کرد بیست ڕۆژ مایەوە، وە هەروەها ساڵی جارێک دەوری قورئانی پێدەکرایەوە (لەلایەن جیبریلەوە)، بەڵام ئەو ساڵەی کە وەفاتی کرد، دوو جار دەوری قورئانی پێکرایەوە.

١٧٧٠- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ: «يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ، فَسَافَرَ عَامًا، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْعَامِ الْمُقْبِلِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا»[3].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە دە ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا دەمایەوە، ساڵێکیان (لە مانەوەیدا) گەشتی کرد، جا لە ساڵی دواتردا بیست ڕۆژ دەمایەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٢٤، ومسلم: ١١٧٤، وأبو داود: ١٣٧٦، والنسائي: ١٦٣٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٤٤ و ٤٩٩٨، وأبو داود: ٢٤٦٦.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٤٦٣.

## بابەت: دەستپێکردنی ئیعتیکاف و گێڕانەوەی ئیعتیکاف

**١٧٧١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الصُّبْحَ، ثُمَّ دَخَلَ الْمَكَانَ الَّذِي يُرِيدُ أَنْ يَعْتَكِفَ فِيهِ، فَأَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ، فَأَمَرَ فَضُرِبَ لَهُ خِبَاءٌ، فَأَمَرَتْ عَائِشَةُ بِخِبَاءٍ فَضُرِبَ لَهَا، وَأَمَرَتْ حَفْصَةُ بِخِبَاءٍ فَضُرِبَ لَهَا، فَلَمَّا رَأَتْ زَيْنَبُ خِبَاءَهُمَا أَمَرَتْ بِخِبَاءٍ فَضُرِبَ لَهَا، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «آلْبِرَّ تُرِدْنَ» فَلَمْ يَعْتَكِفْ فِي رَمَضَانَ، وَاعْتَكَفَ عَشْرًا مِنْ شَوَّالٍ[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەیویست بمێنێتەوە نوێژی بەیانی دەکرد، پاشان دەڕۆیشتە ناو ئەو شوێنەوە دەیویست تێیدا بمێنێتەوە، وە دەیویست دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان بمێنێتەوە، جا فەرمانی کرد چادرێکیان بۆ ئامادەکرد، ئنجا عائیشە فەرمانی کرد و چادرێکیان بۆ ئامادەکرد، وە حەفصەش فەرمانی کرد و چادرێکیان بۆ ئامادەکرد، جا کاتێ زەینەب چادرەکانی ئەوانی بینی ئەویش فەرمانی کرد و چادرێکیان بۆ ئامادەکرد، ئنجا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بینی فەرمووی: ئایا مەبەستتان ئەنجامدانی کردەوەی چاکەیە؟ (یان بۆ چاولێکەرییە و هیچی تر؟) جا بۆیە لە ڕەمەزاندا نەمایەوە، وە لە دە ڕۆژی یەکەمی شەوالدا مایەوە.

## بابەت: ئیعتیکاف کردن بە شەو و ڕۆژێک

**١٧٧٢-** عَنْ عُمَرَ ﵁، أَنَّهُ كَانَ عَلَيْهِ نَذْرُ لَيْلَةٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَعْتَكِفُهَا، فَسَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ «فَأَمَرَهُ أَنْ يَعْتَكِفَ»[2].

واتە: عومەر ﵁ دەگێڕێتەوە، لە سەردەمی نەزانیدا نەزری کردبوو کە شەوێک بمێنێتەوە، جا بۆ ئەو مەبەستە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش فەرمانی پێکرد کە بمێنێتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٣٣، ومسلم: ١١٧٢ و ١١٧٣، وأبو داود: ٢٤٦٤، والترمذي: ٧٩١، والنسائي: ٧٠٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٣٢، ومسلم: ١٦٥٦/٢٧، وأبو داود: ٣٣٢٥، والترمذي: ١٥٣٩، والنسائي: ٣٨٢٠_٣٨٢٢.

## بابەت: ئیعتیکاف کردن لە شوێنێکی دیاریکراوی مزگەوت

**١٧٧٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ» قَالَ نَافِعٌ: وَقَدْ أَرَانِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ الْمَكَانَ الَّذِي كَانَ يَعْتَكِفُ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[(١)].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا دەمایەوە، نافیع گوتی: بەڕاستی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ئەو شوێنەی نیشان دام کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا دەمایەوە.

**١٧٧٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «أَنَّهُ كَانَ إِذَا اعْتَكَفَ طُرِحَ لَهُ فِرَاشُهُ، أَوْ يُوضَعُ لَهُ سَرِيرُهُ وَرَاءَ أُسْطُوَانَةِ التَّوْبَةِ»[(٢)].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە کاتێ (لە مزگەوت) دەمایەوە، جێگاکەی یان شوێنی نوستنەکەی بۆ دادەنرا لە پشت کۆڵەکەی تەوبە.

## بابەت: ئیعتیکاف کردن لە چادری مزگەوتدا

**١٧٧٥-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «اعْتَكَفَ فِي قُبَّةٍ تُرْكِيَّةٍ، عَلَى سُدَّتِهَا قِطْعَةُ حَصِيرٍ، قَالَ: فَأَخَذَ الْحَصِيرَ بِيَدِهِ، فَنَحَّاهَا فِي نَاحِيَةِ الْقُبَّةِ، ثُمَّ أَطْلَعَ رَأْسَهُ فَكَلَّمَ النَّاسَ»[(٣)].

**واتە:** ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو چادرێکی توركیدا دەمایەوە کە پارچە حەسیرێک لەسەر دەرگاکەی دانرابوو (بۆ ئەوەی خەڵکی نەیبینێ)، (ڕاوی) دەڵێ: جا پێغەمبەر ﷺ حەسیرەکەی هەڵگرت و لە گۆشەیەکی چادرەکەی دانا، پاشان سەری هێنایە دەرەوەو قسەی بۆ خەڵکەکە کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٢٥، ومسلم: ١١٧١، وأبو داود: ٢٤٦٥.

(٢) حسن لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١١٦٧/٢١٥.

## بابەت: ئەوەی کە ئەو کەسەی لە ئیعتیکاف دایە سەردانی نەخۆش دەکات و ئامادەی ناشتنی جەنازە دەبێت

١٧٧٦- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَعَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﭫ، أَنَّ عَائِشَةَ ﭫ، قَالَتْ: إِنْ كُنْتُ لَأَدْخُلُ الْبَيْتَ لِلْحَاجَةِ، وَالْمَرِيضُ فِيهِ، فَمَا أَسْأَلُ عَنْهُ إِلَّا وَأَنَا مَارَّةٌ، قَالَتْ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «لَا يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةٍ إِذَا كَانُوا مُعْتَكِفِينَ»[1].

واتە: عوڕوەی کوڕی زوبەیرو عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمان ﭫ دەگێڕنەوە، عائیشە ﭫ گوتوویەتی: ئەگەر بمویستبایە بۆ پێداویستییەک بچمە ماڵەوەو، سەردانی نەخۆشێک کە تێیدایە، ئەحواڵم نەدەپرسی مەگەر بە دەم ڕێگاوە، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەچوو بۆ ماڵەوە تەنها بۆ پێداویستییەک نەبایە کاتێ لە ئیعتیکاف دەبووین.

١٧٧٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﭬ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُعْتَكِفُ يَتْبَعُ الْجِنَازَةَ، وَيَعُودُ الْمَرِيضَ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی ئیعتیکاف دەکات، شوێنی جەنازە دەکەوێ و سەردانی نەخۆشیش دەکات.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی سەر شۆردن و شانە کردنی ئەوەی ئیعیتکافی کردوە

١٧٧٨- عَنْ عَائِشَةَ ﭫ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «يُدْنِي إِلَيَّ رَأْسَهُ وَهُوَ مُجَاوِرٌ، فَأَغْسِلُهُ وَأُرَجِّلُهُ وَأَنَا فِي حُجْرَتِي، وَأَنَا حَائِضٌ، وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ»[3].

واتە: عائیشە ﭫ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کە لە مانەوەدا بوو، سەری لە من نزیک دەکردەوە، کە زۆر نزیک بوو لێم، منیش سەریم بۆ دەشۆردو پرچیم شانە دەکرد، لە کاتێکدا من لە ژوورەکەی خۆم بووم، وە لەو کاتەدا من لە سوڕی مانگانەش دابووم، وە پێغەمبەریش ﷺ لەناو مزگەوتدا بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٢٩، ومسلم: ٢٩٧، وأبو داود: ٢٤٦٨، والترمذي: ٨٠٤.

(٢) موضوع.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٢٨، ومسلم: ٢٩٧، وأبو داود: ٢٤٦٧ و ٢٤٦٩، والترمذي: ٨٠٤، والنسائي: ٢٧٥_٢٧٧ و ٣٨٦_٣٨٨.

## بابەت: ئەو کەسەی لە ئیعتیکافە دەکرێ خێزانەکەی لە مزگەوتدا سەردانی بکات

**١٧٧٩-** عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَزُورُهُ وَهُوَ مُعْتَكِفٌ فِي الْمَسْجِدِ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ، فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً مِنَ الْعِشَاءِ، ثُمَّ قَامَتْ تَنْقَلِبُ، فَقَامَ مَعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْلِبُهَا، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ بَابَ الْمَسْجِدِ الَّذِي كَانَ عِنْدَ مَسْكَنِ أُمِّ سَلَمَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَمَرَّ بِهِمَا رَجُلَانِ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَسَلَّمَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ نَفَذَا، فَقَالَ لَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ» قَالَا: سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَبُرَ عَلَيْهِمَا ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ ابْنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئًا»[1].

واتە: صەفیەی کچی حوییەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو هاتوە سەردانی پێغەمبەری خوای ﷺ کردوە لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لەناو مزگەوتدا لە دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزاندا لە خەڵوەکێشان دابووە، جا ماوەیەک لە شەو قسەی لەگەڵ کردوە، پاشان هەڵساوە کە بگەڕێتەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بۆ ئەوەی بیگەڕێنێتەوە ماڵەوە، تا گەیشتە ئەو دەرگایەی مزگەوت کە کەوتبووە لای شوێنی مانەوەی ئوممو سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ، لەوکاتەدا دوو پیاو لە ئەنصارِ بەلایاندا تێپەڕین و سەلامیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پاشان بە خێرایی تێپەڕین، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: هێواش بن بوەستن ئەوە صەفیەی کچی حوییە (لەگەڵمدایە)، گوتیان: پاکی و بێگەردی بۆ خوا، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو قسەیان بەلاوە قورس بوو (چونکە وەیانزانی کە پێغەمبەر ﷺ پێی وایە کە گومانی خراپی پێدەبەن)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان شەیتان بەناو جەستەی ئادەمیزاددا هاتوچۆ دەکات وەک هاتن و چوونی خوێن، وە بێگومان من ترسام کە شتێک لە ناختاندا دروستبێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٣٥ و ٢٠٣٨ و ٢٠٣٩، ومسلم: ٢١٧٥، وأبو داود: ٢٤٧٠ و ٢٤٧١ و ٤٩٩٤.

## بابەت: ئافرەت کە خوێنچرکەی بێ ئیعتیکاف بکات

١٧٨٠- عَنْ عِكْرِمَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: «اعْتَكَفَتْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ امْرَأَةٌ مِنْ نِسَائِهِ، فَكَانَتْ تَرَى الْحُمْرَةَ وَالصُّفْرَةَ، فَرُبَّمَا وَضَعَتْ تَحْتَهَا الطَّسْتَ»[1].

واتە: عیکریمە دەڵێ: عائیشە گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ یەکێ لە خێزانەکانیدا لە خەڵوەکێشان دابوو، کە (ئەو خێزانەی) خوێنی سوورو زەردی دەبینی (واتە: لە ڕۆژانی عادەبوون دانەبوو)، هەندێ جار تاسێکی لە ژێر خۆی دادەنا.

## بابەت: پاداشتی ئیعتیکاف

١٧٨١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي الْمُعْتَكِفِ «هُوَ يَعْكِفُ الذُّنُوبَ، وَيُجْرَى لَهُ مِنَ الْحَسَنَاتِ كَعَامِلِ الْحَسَنَاتِ كُلِّهَا»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کە لە مزگەوت دەمێنێتەوە فەرموویەتی: ئەو کەسە خۆی دەپارێزێ تووشی لە گوناح کردن، وە خێر و چاکەی بۆ دێ وەکو ئەو کەسەی کە هەموو جۆرێکی خێر و چاکە دەکات.

## بابەت: کەسێک کە لە شەوەکانی جەژن بێدار بێ

١٧٨٢- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَامَ لَيْلَتَيِ الْعِيدَيْنِ مُحْتَسِبًا لِلَّهِ لَمْ يَمُتْ قَلْبُهُ يَوْمَ تَمُوتُ الْقُلُوبُ»[3].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شەوەکانی دوو جەژنەکە لە پێناو خوادا بێداربێ بێتەوە، ئەوە لەو ڕۆژەدا کە دڵەکان دەمرن، دڵی ئەو نامرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٩ و ٣١٠ و ٣١١ و ٢٠٣٧، وأبو داود: ٢٤٧٦.

(٢) ضعيف.

(٣) موضوع.

## بابەت: فەرزی زەکات

١٧٨٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ، فَقَالَ: «إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ، فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ، تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ فِي فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ؛ فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ موعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: تۆ دەچییە لای خەڵکێک خاوەن کتێبی ئاسمانین، سەرەتا داوایان لێبکە کە شایەتی بدەن کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا، منیش پێغەمبەر و نێردراوی ئەوم، ئەگەر لەوەدا گوێڕایەڵبوون، جا پێیان بڵێ: کە خودا لە هەر شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەریان واجب کردوە، ئەگەر لەوەشدا گوێڕایەڵبوون، پێیان بڵێ: کە خودا زەکاتی لەسەریان واجب کردوە کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، ئەگەر لەوەشدا گوێڕایەڵبوون، نەکەیت بچیت نایابی ماڵەکانیان هەڵبژێری و لە بری زەکات وەری بگری، وە خۆشت بپارێزە لە نزای ستەم لێکراو، چونکە بەڕاستی نزای ستەم لێکراو هیچ شتێک پێشی پێناگرێ تاکو خۆی دەگەیەنێتە بارەگای پەروەردگار (پەردە لە نێوانی پاڕانەوەی ستەملێکراوو خودا نیە).

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی زەکات نەدان

١٧٨٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ لَا يُؤَدِّي زَكَاةَ مَالِهِ، إِلَّا مُثِّلَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ حَتَّى يُطَوِّقَ عُنُقَهُ» ثُمَّ قَرَأَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِصْدَاقَهُ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴿١٨٠﴾ ﴾ آل عمران، الْآيَةَ[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٦، ومسلم: ١٩، وأبو داود: ١٥٨٤، والترمذي: ٦٢٥ و ٢٠١٤، والنسائي: ٢٤٣٥.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ٣٠١٢ مطولًا، والنسائي: ٢٤٤١.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک زەکاتی ماڵەکەی نەدات، لە ڕۆژی دواییدا ماڵەکەی بۆ دەکرێ بە مارێکی کەچەڵی ژەهراوی، تاکو خۆی لە ملی دەئاڵێنێ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو بەڕاستدانانی فەرمایشتەکەی لە کتێبی خوا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ﴿١٨٠﴾﴾ آل عمران، واتە: هەرگیز واگومان نەبەن ئەوکەسانەی کەچروکی دەکەن بەوەی کە خوا پێی بەخشیوون لەڕێز و بەهرەی خۆی.

**١٧٨٥-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ، وَلَا غَنَمٍ، وَلَا بَقَرٍ، لَا يُؤَدِّي زَكَاتَهَا، إِلَّا جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ، تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، وَتَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا، عَادَتْ عَلَيْهِ أُولَاهَا، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ»[1].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک مەڕ و بزن و مانگا و وشتری هەبێ و زەکاتیان لێنەدات، لە ڕۆژی دواییدا ئەوانە دەهێنرێن کە لەوەی دونیا بەهێزترن و قەڵەوتریشن، جا لە خاوەنەکانیان هەڵدەدەن و بە شاخەکانیان و سمەکانیان دەیشێلن، هەرکاتێ کۆتا دانەیان بەسەریدا تێدەپەڕێ یەکەمەکەیان دەگەڕێتەوە سەری، هەتا ئەو کاتەی کە خوا دادوەری دەکات لە نێوان خەڵکدا.

**١٧٨٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تَأْتِي الْإِبِلُ الَّتِي لَمْ تُعْطِ الْحَقَّ مِنْهَا تَطَأُ صَاحِبَهَا بِأَخْفَافِهَا، وَتَأْتِي الْبَقَرُ وَالْغَنَمُ تَطَأُ صَاحِبَهَا بِأَظْلَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، وَيَأْتِي الْكَنْزُ شُجَاعًا أَقْرَعَ، فَيَلْقَى صَاحِبَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَفِرُّ مِنْهُ صَاحِبُهُ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ يَسْتَقْبِلُهُ فَيَفِرُّ، فَيَقُولُ: مَا لِي وَلَكَ فَيَقُولُ: أَنَا كَنْزُكَ، أَنَا كَنْزُكَ، فَيَتَقِيهِ بِيَدِهِ فَيَلْقَمُهَا»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو وشترەی کە زەکاتی لێنەدراوە لە ڕۆژی دواییدا دێت و بە سمەکانی خاوەنەکەی دەشێلێ، وە ئەو مانگا و مەڕ و بزنانەی کە زەکاتیان لێنەدراوە دێن و بە سمەکانیان خاوەنەکەیان

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٠، ومسلم: ٩٩٠، والترمذي: ٦١٧، والنسائي: ٢٤٤٠ و ٢٤٤٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٠٢، ومسلم: ٩٨٧، وأبو داود: ١٦٥٨، والنسائي: ٢٤٤٢ و ٢٤٤٨.

دەشێلن، بە شاخەکانیان لە خاوەنەکانیان هەڵدەدەن، ئەو گەنجینەیەشی کە زەکاتی لێنەدراوە لە ڕۆژی دواییدا لەسەر شێوەی مارێکی کەچەڵی ژەهراوی دێت و دەگاتەوە بە خاوەنەکەی، خاوەنەکەی دوو جار لێی ڕادەکات، پاشان هەر بەرەو ڕووی دێتەوە، جا هەر ڕادەکات و دەڵێ: چی لە نێوانی من و تۆدا هەیە؟! (مارەکە) دەڵێ: من گەنجینەکەی تۆم، من گەنجینەکەی تۆم، کابرا بە دەستی لە خۆی دوور دەخاتەوە، مارەکەش قەپی لێ دەدات.

## بابەت: ئەو ماڵەی کە زەکاتی لێ بدرێ بەو گەنجینەیە ئەژمار ناکرێ کە هەڕەشەی لەسەرە

**١٧٨٧-** خَالِدُ بْنُ أَسْلَمَ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، فَلَحِقَهُ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ لَهُ: قَوْلُ اللَّهِ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٣٤﴾﴾ التوبة، قَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ: «مَنْ كَنَزَهَا فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهَا فَوَيْلٌ لَهُ، إِنَّمَا كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تُنْزَلَ الزَّكَاةُ، فَلَمَّا أُنْزِلَتْ جَعَلَهَا اللَّهُ طَهُورًا لِلْأَمْوَالِ، ثُمَّ الْتَفَتَ، فَقَالَ: مَا أُبَالِي لَوْ كَانَ لِي أُحُدٌ ذَهَبًا، أَعْلَمُ عَدَدَهُ وَأُزَكِّيهِ، وَأَعْمَلُ فِيهِ بِطَاعَةِ اللَّهِ ﷻ»[1].

واتە: خالیدی کوڕی ئەسلەمی ﷺ خزمەتکاری عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر چوومە دەرەوە، جا دەشتەکییەک پێیگەیشت و ئەو ئایەتەی خوای بۆ خوێندەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٣٤﴾﴾ التوبة، واتە: وە ئەوانەی ئاڵتون و زیو سەریەک دەنێن و کۆدەکەنەوە و نایبەخشن و زەکاتەکەی دەرناکەن لە پێناو خودا. ئیبنو عومەر پێی گوت: سزا بۆ ئەو کەسەی کە سەروەت و سامانەکەی کۆدەکاتەوەو زەکاتی لێنادا، ئەو ئایەتە پێش ئەوە بوو کە ئایەتی زەکات دابەزێ، بەڵام کاتێک ئایەتی زەکات دابەزی خوا کردییە خاوێنکەرەوەی سەروەت و سامان، پاشان ئاوڕی دایەوە، گوتی: مادام بزانم ئەندازەی چەندە و زەکاتی لێبدەم، هەروەها لە ڕێگای خوادا خەرجی بکەم، ئەگەر بە ئەندازەی چیای ئوحود زێڕم هەبێ گوێی پێنادەم.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٠٤ و ٤٦٦١ تعليقاً.




١٧٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَدَّيْتَ زَكَاةَ مَالِكَ فَقَدْ قَضَيْتَ مَا عَلَيْكَ»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر زەکاتی ماڵەکەتدا، ئەوەی کە لەسەرت پێویست بووە جێبەجێت کردوە.

١٧٨٩- عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ ﷺ، أَنَّهَا سَمِعَتْهُ تَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَيْسَ فِي الْمَالِ حَقٌّ سِوَى الزَّكَاةِ»(٢).

واتە: فاتیمەی کچی قەیس ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لێبووە مەبەستی پێغەمبەرە ﷺ دەیفەرموو: ماڵ هیچ مافێکی تێدانیە جگە لە زەکات.

## بابەت: زەکاتی زێڕ و زیو

١٧٩٠- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي قَدْ عَفَوْتُ عَنْكُمْ عَنْ صَدَقَةِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، وَلَكِنْ هَاتُوا رُبُعَ الْعُشْرِ، مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمًا»(٣).

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی من لە زەکاتی ئەسپ و بەندەکانتان چاوپۆشیم لێکردن، بەڵام زەکاتی زیو لە دە بەش چارەگێک بدەن، لە هەر چل درهەمێک یەک درهەم.

١٧٩١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «كَانَ يَأْخُذُ مِنْ كُلِّ عِشْرِينَ دِينَارًا فَصَاعِدًا نِصْفَ دِينَارٍ، وَمِنَ الْأَرْبَعِينَ دِينَارًا دِينَارًا»(٤).

واتە: ئیبنو عومەر و عائیشە ﷺ دەگێڕنەوە، پێغەمبەر ﷺ لە هەر بیست دینارێک نیو دیناری (وەکو زەکات) وەردەگرت، وە لە هەر چل دینار دینارێکی (وەکو زەکات) وەردەگرت.

---

(١) حسن بشواهده. أخرجه الترمذي: ٦١٨.

(٢) ضعيف. انفرد بهذا اللفظ ابن ماجه وهو خطأ.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ١٥٧٢ مطولًا و ١٥٧٤ والترمذي: ٦٢٠، والنسائي: ٢٤٧٧_٢٤٧٨.

(٤) صحيح لغيره.

## بابەت: قازانجی ماڵ

**١٧٩٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا زَكَاةَ فِي مَالٍ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ماڵ زەکاتی ناکەوێتە سەر تاوەکو ساڵی تێهەڵنەسوڕێتەوە.

## بابەت: ئەو ماڵ و سامانەی زەکاتیان تێدایە

**١٧٩٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «لَا صَدَقَةَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسَاقٍ مِنَ التَّمْرِ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ، وَلَا فِيمَا دُونَ خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﵁ دەگێڕێتەوە، گوێی لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خورما تاوەکو ئەندازەی نەگاتە پێنج ویسق زەکاتی تێدانیە، وە زیو تاوەکو ئەندازەی نەگاتە پێنج ئۆقیە زەکاتی تێدانیە، وشتر ئەگەر ژمارەی لە پێنج کەمتر بێ زەکاتی تێدانیە.

**١٧٩٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسَاقٍ صَدَقَةٌ»[٣].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە پێنج وشتر کەمتربێ زەکات نیە، لە پێنج ئۆقیە زیویش کەمتربێ زەکات نیە، وە لە خورماو دانەوێڵەشدا لە پێنج ویسق کەمتر زەکاتی نیە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٠٥، ومسلم: ٩٧٩، وأبو داود: ١٥٥٨ و ١٥٥٩، والترمذي: ٦٢٦، والنسائي: ٢٤٤٥ و ٢٤٤٦ و ٢٤٧٣_٢٤٧٦ و ٢٤٨٣ و ٢٤٨٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٨٠.

## بابەت: زەکات دەرکردن، پێش کاتی خۆی

١٧٩٥- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ الْعَبَّاسَ ﷺ «سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فِي تَعْجِيلِ صَدَقَتِهِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ، فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِكَ»[1].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە، عەبباس ﷺ پرسیاری کردوە لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی زەکاتدان پێش ئەوەی واجب بێ (ساڵی تێهەڵسوڕێتەوە)، (پێغەمبەریش ﷺ) مۆڵەتی داوە کە ئەوە بکات.

## بابەت: ئەوەی دەگوترێ لە کاتی دەرکردنی زەکات لە ماڵ

١٧٩٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ، يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِذَا أَتَاهُ الرَّجُلُ بِصَدَقَةِ مَالِهِ، صَلَّى عَلَيْهِ، فَأَتَيْتُهُ بِصَدَقَةِ مَالِي، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِي أَوْفَى»[2].

واتە: عەمرى کوڕی مورە دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا بوو ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ پیاوێک زەکاتی بۆ بهێنایە، دەیفەرموو: خودایە ڕەحمەت بڕێژە بەسەریدا، وە کاتێک من زەکاتی ماڵی خۆمم بۆ برد، فەرمووی: خودایە ڕەحمەت بڕێژە بەسەر بنەماڵەی ئەبو ئەوفادا.

١٧٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَعْطَيْتُمُ الزَّكَاةَ فَلَا تَنْسَوْا ثَوَابَهَا، أَنْ تَقُولُوا: اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا مَغْنَمًا، وَلَا تَجْعَلْهَا مَغْرَمًا»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێ زەکاتتان بەخشی پاداشت و خێرەکەی لەبیر مەکەن، بەوەی کە (ئەو دوعایە) بڵێن: خوایە بیکەی بە مایەی پاداشت و قازانجێکی زۆر، نەک هەر وەک قەرزێک کە دەدرێتەوە خاوەن قەرز.

---

(١) حسن بطريقيه وشواهده. أخرجه أبو داود: ١٦٢٤، والترمذي: ٦٧٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٧ و ٤١٦٦ و ٦٣٣٢ و ٦٣٥٩، ومسلم: ١٠٧٨، وأبو داود: ١٥٩٠، والنسائي: ٢٤٥٩.

(٣) موضوع.

## بابەت: زەکاتی وشتر

**١٧٩٨-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: أَقْرَأَنِي سَالِمٌ كِتَابًا كَتَبَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الصَّدَقَاتِ قَبْلَ أَنْ يَتَوَفَّاهُ اللَّهُ، فَوَجَدْتُ فِيهِ: «فِي خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ شَاةٌ، وَفِي عَشْرٍ شَاتَانِ، وَفِي خَمْسَ عَشْرَةَ ثَلَاثُ شِيَاهٍ، وَفِي عِشْرِينَ أَرْبَعُ شِيَاهٍ، وَفِي خَمْسٍ وَعِشْرِينَ بِنْتُ مَخَاضٍ إِلَى خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ، فَإِنْ لَمْ تُوجَدْ بِنْتُ مَخَاضٍ فَابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، فَإِنْ زَادَتْ عَلَى خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ وَاحِدَةً، فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ إِلَى خَمْسَةٍ وَأَرْبَعِينَ، فَإِنْ زَادَتْ عَلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ وَاحِدَةً، فَفِيهَا حِقَّةٌ إِلَى سِتِّينَ، فَإِنْ زَادَتْ عَلَى سِتِّينَ وَاحِدَةً، فَفِيهَا جَذَعَةٌ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ، فَإِنْ زَادَتْ عَلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ وَاحِدَةً، فَفِيهَا ابْنَتَا لَبُونٍ إِلَى تِسْعِينَ، فَإِنْ زَادَتْ عَلَى تِسْعِينَ وَاحِدَةً فَفِيهَا حِقَّتَانِ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا كَثُرَتْ فَفِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ»[1].

واتە: (ئیبنو شیهاب) لە سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکییەوە ﵄، لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، دەڵێ: سالیم نووسراوێکی بۆ خوێندمەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوسیبووی دەربارەی زەکاتدان پێش ئەوەی وەفات بکات، لە نووسراوەکەدا ئەوە هاتبوو: لە پێنج وشتر یەک مەڕی یەک ساڵە، لە دە وشتر دوو مەڕی یەک ساڵە، لە پازدە وشتر سێ مەڕ، یان سێ بزن، لە بیست وشتر چوار مەڕ، وە لە بیست و پێنج وشتر تا سی و پێنج وشتر یەک بەچکە وشتری مێینەی تەمەن یەک ساڵە، ئەگەر ئەوە دەست نەکەوێ با بەچکە وشترێکی نێری دوو ساڵە بکاتە زەکات، ئەگەر یەک سەر زیادی کرد (واتە: بوون بە سی و شەش سەر) تاوەکو دەبن بە چل و پێنج سەر بەچکە وشترێکی مێینەی دوو ساڵە زەکاتە، ئەگەر یەک سەر زیادی کرد (واتە: بوو بە چل و شەش) تاوەکو شەست سەر بەچکە وشترێکی سێ ساڵەی بەرکەڵ زەکاتە، ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکو دەبن بە حەفتا و پێنج سەر وشترێکی مێینەی چوار ساڵ زەکاتە، وە ئەگەر یەک سەر زیادی کرد هەتاوەکو دەبن بە نەوەد سەر دوو بەچکە وشتری مێینەی دوو ساڵ زەکاتە، ئەگەر بوون بە نەوەد و یەک تاوەکو دەبن بە سەد سەر دوو وشتری مێینەی سێ ساڵەی بەرکەڵ زەکاتە، وە ئەگەر ژمارەی وشترەکان لەوە زیاتر بوو، ئەوە بۆ هەموو پەنجا سەر وشترێ بەچکە وشترێکی سێ ساڵە زەکاتە، وە بۆ هەموو چل سەرێ بەچکە وشترێکی مێینەی دوو ساڵە زەکاتە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٦٨ و ١٥٦٩، والترمذي: ٦٢١.

**١٧٩٩-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسٍ مِنَ الْإِبِلِ صَدَقَةٌ، وَلَا فِي الْأَرْبَعِ شَيْءٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا فَفِيهَا شَاةٌ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ تِسْعًا، فَإِذَا بَلَغَتْ عَشْرًا فَفِيهَا شَاتَانِ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ أَرْبَعَ عَشْرَةَ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسَ عَشْرَةَ فَفِيهَا ثَلَاثُ شِيَاهٍ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ تِسْعَ عَشْرَةَ، فَإِذَا بَلَغَتْ عِشْرِينَ فَفِيهَا أَرْبَعُ شِيَاهٍ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ أَرْبَعًا وَعِشْرِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ إِلَى خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ، فَإِذَا لَمْ تَكُنْ بِنْتُ مَخَاضٍ فَابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، فَإِنْ زَادَتْ بَعِيرًا فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ خَمْسًا وَأَرْبَعِينَ، فَإِنْ زَادَتْ بَعِيرًا فَفِيهَا حِقَّةٌ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ سِتِّينَ، فَإِنْ زَادَتْ بَعِيرًا فَفِيهَا جَذَعَةٌ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ خَمْسًا وَسَبْعِينَ، فَإِنْ زَادَتْ بَعِيرًا فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ تِسْعِينَ، فَإِنْ زَادَتْ بَعِيرًا فَفِيهَا حِقَّتَانِ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ عِشْرِينَ وَمِائَةً، ثُمَّ فِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە پێنج وشتر کەمتر زەکات نیە، وە چوار سەر هیچی تێدانیە، جا ئەگەر بوون بە پێنج سەر تاکو دەبنە نۆ سەر زەکاتیان مەڕێکە، جا ئەگەر بوون بە دە سەر تاکو دەبن بە چواردە سەر زەکاتیان دوو مەڕە، وە ئەگەر بوون بە پازدە سەر تاکو دەبن بە نۆزدە سەر زەکاتیان سێ مەڕە، وە ئەگەر بوون بە بیست سەر تاکو دەبن بە بیست و چوار سەر زەکاتیان چوار مەڕە، وە ئەگەر بوون بە بیست و پێنج سەر تاکو دەبن بە سی و پێنج سەر زەکاتیان بەچکە وشترێکی مێینەی یەک ساڵەیە، وە ئەگەر بەچکە وشتری مێینەی یەک ساڵە نەبوو (دەست نەکەوت)، بەچکە وشترێکی نێرەی دوو ساڵە، وە ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکو دەبن بە چل و پێنج سەر زەکاتیان بەچکە وشترێکی مێینەی دوو ساڵەیە، جا ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکو دەبن بە شەست سەر زەکاتیان وشترێکی مێینەی بەرکەڵە، وە ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکو دەبن بە حەفتا و پێنج سەر زەکاتیان وشترێکی مێینەی چوار ساڵەیە، وە ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکو دەبن بە نەوەد سەر زەکاتیان دوو بەچکە وشتری مێینەی دوو ساڵەیە، وە ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکو دەبن بە سەد و بیست سەر زەکاتیان دوو وشتری مێینەی سێ ساڵەی بەرکەڵن، وە ئەگەر ژمارەی وشترەکان لەوە زیاتر

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٠٥، ومسلم: ٩٧٩/١، وأبو داود: ١٥٥٨، والترمذي: ٦٢٦ و ٦٢٧، والنسائي: ٢٤٤٥ و ٢٤٤٦ و ٢٤٧٣ و ٢٤٧٤ مختصراً عندهم.

بوو، ئەوە بۆ هەموو پەنجا سەر وشترێ بەچکە وشترێکی سێ ساڵە زەکاتە، وە بۆ هەموو چل سەرێ بەچکە وشترێکی مێینەی دوو ساڵە زەکاتە.

## بابەت: ئەگەر زەکات کۆکەرەوە لە تەمەن بچوکتر، یان گەورەتری وەرگرت

١٨٠٠- عَنْ ثُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ، كَتَبَ لَهُ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «فَإِنَّ مِنْ أَسْنَانِ الْإِبِلِ فِي فَرَائِضِ الْغَنَمِ، مَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ مِنَ الْإِبِلِ صَدَقَةُ الْجَذَعَةِ، وَلَيْسَ عِنْدَهُ جَذَعَةٌ، وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الْحِقَّةُ، وَيَجْعَلُ مَكَانَهَا شَاتَيْنِ إِنِ اسْتَيْسَرَتَا، أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ عِنْدَهُ صَدَقَةُ الْحِقَّةِ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ إِلَّا بِنْتُ لَبُونٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ بِنْتُ لَبُونٍ، وَيُعْطِي مَعَهَا شَاتَيْنِ، أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ لَبُونٍ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ، وَعِنْدَهُ حِقَّةٌ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ الْحِقَّةُ، وَيُعْطِيهِ الْمُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا، أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ لَبُونٍ، وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ، وَعِنْدَهُ بِنْتُ مَخَاضٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ ابْنَةُ مَخَاضٍ وَيُعْطِي مَعَهَا عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، وَمَنْ بَلَغَتْ صَدَقَتُهُ بِنْتَ مَخَاضٍ وَلَيْسَتْ عِنْدَهُ، وَعِنْدَهُ ابْنَةُ لَبُونٍ، فَإِنَّهَا تُقْبَلُ مِنْهُ بِنْتُ لَبُونٍ، وَيُعْطِيهِ الْمُصَدِّقُ عِشْرِينَ دِرْهَمًا أَوْ شَاتَيْنِ، فَمَنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ ابْنَةُ مَخَاضٍ عَلَى وَجْهِهَا، وَعِنْدَهُ ابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، فَإِنَّهُ يُقْبَلُ مِنْهُ وَلَيْسَ مَعَهُ شَيْءٌ»[1].

واتە: سومامە ﷺ دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بۆی گێڕامەوە، ئەبو بەکر ﷺ نامەیەکی بۆ نوسی (کە تێیدا نووسرابوو): بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، ئەوەی ناو ئەو پەڕاوە بڕیاری ئەو زەکاتدانەیە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مسوڵمانانی پێویست کردوەو، خوا فەرمانی پێکردوە: زەکاتی وشتر ئەگەر بە مەڕ بدرێ (پڕ بکرێتەوە)، هەرکەس زەکاتی وشترەکانی گەیشتە وشترێکی چوار ساڵ، ئەو وشترە چوار ساڵەی نەبوو، بەڵام لە بری ئەوە وشترێکی سێ ساڵەی هەبوو، ئەو وشترە سێ ساڵەیەی لە بری زەکاتەکەی لێوەردەگیرێ، لەگەڵ دوو مەڕ بۆ پڕکردنەوەی نرخی وشترە چوار ساڵەکە، ئەگەر مەڕەکان ئاسان دەستەبەر دەبوون، یان لە بری دوو مەڕەکان بیست درهەمی لێوەردەگیرێ، وە هەر کەس زەکاتی وشترەکانی گەیشتە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٤٨ و ١٤٥٠ و ١٤٥٣ و ٢٤٨٧، وأبو داود: ١٥٦٧، والنسائي: ٢٤٤٧ و ٢٤٥٥.

وشترێکی سێ ساڵ، وە تەنها وشتری دوو ساڵەشی هەبوو، وشترە دوو ساڵەکەی لێوەردەگیرێ، لەگەڵ دوو مەڕ یان بیست درهەم (لەبری دوو مەڕەکە)، وە هەر کەسێک زەکاتی وشترەکانی گەیشتە وشترێکی مێی دوو ساڵە، ئەو وشترە دوو ساڵەیەشی نەبوو، بەڵام وشتری سێ ساڵی هەبوو، وشترە سێ ساڵەکەی لێوەردەگیرێ، لە بری زیادەکە زەکات وەرگرەکە بیست درهەم یان دوو مەڕی پێدەداتەوە، وە ئەگەر زەکاتی وشترەکانی گەیشتە وشترێکی مێی دوو ساڵەو نەیبوو، بەڵام وشتری مێی یەک ساڵەی هەبوو، وشترە یەک ساڵەکەی لێوەردەگیرێ لەگەڵ بیست درهەم، یان دوو مەڕ، وە ئەوەی کە زەکاتی وشترەکانی گەیشتە وشترێکی مێی یەک ساڵەو دەستی نەکەوت، بەڵام وشتری مێی دوو ساڵەی هەبوو، وشترە دوو ساڵەکەی لێوەردەگیرێ و زەکات وەرگرەکەش بیست درهەم یان دوو مەڕی لە بری زیادەکە پێدەداتەوە، وە ئەوەی وشتری مێی یەک ساڵەی نەبوو، بەڵام وشتری نێری یەک ساڵەی هەبوو، ئەوە لێیوەردەگیرێ و هیچی دیکەی لەگەڵ نیە.

### بابەت: ئەو شتانەی کە لە بری زەکاتی وشتر وەردەگیرێن

١٨٠١- عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَنَا مُصَدِّقُ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ وَقَرَأْتُ فِي عَهْدِهِ: «لَا يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلَا يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ بِنَاقَةٍ عَظِيمَةٍ مُلَمْلَمَةٍ، فَأَبَى أَنْ يَأْخُذَهَا، فَأَتَاهُ بِأُخْرَى دُونَهَا، فَأَخَذَهَا، وَقَالَ: أَيُّ أَرْضٍ تُقِلُّنِي، وَأَيُّ سَمَاءٍ تُظِلُّنِي، إِذَا أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ أَخَذْتُ خِيَارَ إِبِلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ»[1].

واتە: سوەیدی کوڕی غەفلە ﷺ دەڵێ: زەکات کۆکەرەوەی پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان، منیش ئەوەی بە دەستیەوە بوو لێم وەرگرت و خوێندمەوە، کە تێیدا نووسرابوو: نابێ ئاژەڵی جیا کۆبکرێنەوە، وە ناشبێ کۆمەڵێک جیابکرێتەوە لە ترسی زەکات لێکەوتن، جا پیاوێک وشترێکی گەورەی قەڵەوی بۆ هێنا (وەکو زەکات)، ئەویش ڕەتی کردەوە کە وەری بگرێ، ئنجا پیاوەکە دانەیەکی تری بۆ هێنا، ئەویش وەریگرت و گوتی: چ ئەرزێک لە خۆم دەگرێ و لە ژێر چ ئاسمانێک جێگام دەبێتەوە ئەگەر بچمەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺو، باشترین وشتری پیاوێکی مسوڵمانم (وەکو زەکات) وەرگرتبێ.

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٥٧٩ و ١٥٨٠، والنسائي: ٢٤٥٧.

**١٨٠٢- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَرْجِعُ الْمُصَدِّقُ إِلَّا عَنْ رِضًا»[1].**

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکات وەرگر ناگەڕێتەوە بە ڕازیبوون نەبێ (واتە: دەبێ پێی دڵخۆشبن و، گوێڕایەڵیشی بکەن بۆ زەکات دانەکە).

## بابەت: زەکاتی مانگا و گامێش

**١٨٠٣- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: «بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ، وَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنَ الْبَقَرِ، مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً، وَمِنْ كُلِّ ثَلَاثِينَ تَبِيعًا، أَوْ تَبِيعَةً»[2].**

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن و فەرمانی پێکردم کە لە زەکاتی مانگادا لە هەر چل سەر مێینەیەکی دوو ساڵەو لە هەر سی سەر نێرینە یان مێیینەیەکی یەک ساڵە وەربگرم.

**١٨٠٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «فِي ثَلَاثِينَ مِنَ الْبَقَرِ تَبِيعٌ، أَوْ تَبِيعَةٌ، وَفِي أَرْبَعِينَ مُسِنَّةٌ»[3].**

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەکاتی سی سەر مانگا بریتیە لە گوێرەکەیەکی نێر یان مێ کە یەک ساڵی تەواوکردبێ و چووبێتە نێو دوو ساڵییەوە، وە زەکاتی چل سەریش بریتیە لە گوێرەکەیەکی مێ، کە دوو ساڵی تەواوکردبێ و پێی نابێتە سێ ساڵییەوە.

## بابەت: زەکاتی مەڕ و بزن

**١٨٠٥- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: أَقْرَأَنِي سَالِمٌ كِتَابًا كَتَبَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الصَّدَقَاتِ، قَبْلَ أَنْ يَتَوَفَّاهُ اللَّهُ، فَوَجَدْتُ فِيهِ: «فِي أَرْبَعِينَ شَاةً شَاةٌ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً، فَفِيهَا شَاتَانِ إِلَى مِائَتَيْنِ، فَإِنْ زَادَتْ وَاحِدَةً، فَفِيهَا ثَلَاثُ شِيَاهٍ إِلَى**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٨٩ وإثر ١٠٧٨، وأبو داود: ١٥٨٩، والترمذي: ٦٤٧، والنسائي: ٢٤٦٠ و ٢٤٦١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٧٦_١٥٧٨، والترمذي: ٦٢٣، والنسائي: ٢٤٥٠_٢٤٥٣.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٦٢٢.

ثَلَاثِمِائَةٍ، فَإِذَا كَثُرَتْ، فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ» وَوَجَدْتُ فِيهِ: «لَا يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلَا يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ» وَوَجَدْتُ فِيهِ: «لَا يُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ تَيْسٌ، وَلَا هَرِمَةٌ، وَلَا ذَاتُ عَوَارٍ»(١).

واتە: (ئیبنو شیهاب دەڵێ) سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە و گوتوویەتی: سالیم نووسراوێکی بۆ خوێندمەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوسیبووی دەربارەی زەکاتدان پێش ئەوەی وەفات بکات، لە نووسراوەکەدا ئەوە هاتبوو: لە چل سەر مەڕ و بزن تاوەکو سەد و بیست سەر، مەڕێک زەکاتە، وە ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکو دوو سەد سەر دوو مەڕ زەکاتە، جا ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکو سێ سەد سەر سێ مەڕ زەکاتە، وە ئەگەر لەوە زیاتر بوو هەر سەد سەرێ مەڕێک زەکاتیەتی، وە ئەوەشی تێدا هاتبوو: نابێ ئاژەڵی جیا کۆبکرێتەوە، وە ناشبێ کۆمەڵێک جیابکرێتەوە، وە ئەوەشی تێدا نووسرابوو: نێری و پیرو عەیبدار وەرناگیرێ.

١٨٠٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تُؤْخَذُ صَدَقَاتُ الْمُسْلِمِينَ عَلَى مِيَاهِهِمْ»(٢).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکاتی مسوڵمانان لە شوێنی مانەوەی خۆیان وەردەگیرێ (واتە: داوایان لێناکرێ کە زەکاتەکانیان بگوازنەوە بۆ شوێنێکی تر، بەڵکو زەکات وەرگر خۆی دەچێ بۆ لایان جا لە هەر شوێنێک بن).

١٨٠٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «فِي أَرْبَعِينَ شَاةً شَاةٌ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً، فَفِيهَا شَاتَانِ إِلَى مِائَتَيْنِ، فَإِنْ زَادَتْ وَاحِدَةً، فَفِيهَا ثَلَاثُ شِيَاهٍ إِلَى ثَلَاثِمِائَةٍ، فَإِنْ زَادَتْ فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، لَا يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ، وَلَا يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ، وَكُلُّ خَلِيطَيْنِ يَتَرَاجَعَانِ بِالسَّوِيَّةِ، وَلَيْسَ لِلْمُصَدِّقِ هَرِمَةٌ، وَلَا ذَاتُ عَوَارٍ، وَلَا تَيْسٌ، إِلَّا أَنْ يَشَاءَ الْمُصَدِّقُ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٥٦٨ و ١٥٦٩، والترمذي: ٦٢١..

(٢) حسن لغيره.

(٣) صحيح.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە چل سەر مەڕ و بزن تاوەکو سەد و بیست سەر مەڕێک زەکاتە، وە ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکو دوو سەد سەر دوو مەڕ زەکاتە، جا ئەگەر یەک سەر زیادی کرد تاوەکو سێ سەد سەر سێ مەڕ زەکاتە، وە ئەگەر لەوە زیاتر بوو هەر سەد سەرێ مەڕێک زەکاتیەتی، وە ئەوەشی تێدا هاتبوو: نابێ ئاژەڵی جیا کۆبکرێتەوە، وە ناشبێ کۆمەڵێک جیابکرێتەوە، وە ئەوەشی تێدا هاتبوو: بەران و نێری و پیرو عەیبدار وەرناگیرێ، مەگەر زەکات کۆکەرەوەکە بیەوێ.

## بابەت: ئەوە هاتوە دەربارەی کۆکەرەوەی زەکات

**١٨٠٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُعْتَدِي فِي الصَّدَقَةِ كَمَانِعِهَا»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی زەکات دەدات بە ناشایستە، وەکو ئەو کەسە وایە زەکات نادات.

**١٨٠٩-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْعَامِلُ عَلَى الصَّدَقَةِ بِالْحَقِّ كَالْغَازِي فِي سَبِيلِ اللَّهِ، حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ»[2].

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەو کەسەی کە ئیشی کۆکردنەوەی زەکاتە و بە تەواوی و دروستی ئیشەکەی دەکات، وەکو ئەو کەسە وایە کە لە پێناوی خوادا تێدەکۆشێ و جیهاد دەکات، تاوەکو دەگەڕێتەوەماڵی خۆی.

**١٨١٠-** عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحُبَابِ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ، حَدَّثَهُ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُنَيْسٍ، حَدَّثَهُ أَنَّهُ تَذَاكَرَ هُوَ وَعُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَوْمًا الصَّدَقَةَ، فَقَالَ عُمَرُ: أَلَمْ تَسْمَعْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، حِينَ يَذْكُرُ غُلُولَ الصَّدَقَةِ، «أَنَّهُ مَنْ غَلَّ مِنْهَا بَعِيرًا، أَوْ شَاةً، أُتِيَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَحْمِلُهُ؟» قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُنَيْسٍ: بَلَى[3].

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٥٨٥، والترمذي: ٦٤٦.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٩٣٦، والترمذي: ٦٤٥.

(٣) صحيح لغيره.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حوبابی ئەنصاریی دەگێڕێتەوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە کە ڕۆژێک لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ باسی زەکاتیان دەکرد، عومەر ﷺ گوتی: ئایا گوێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووە کاتێ باسی ئەوانەی دەکرد کە ناپاکی و دزی دەکەن لە زەکاتدا، دەیفەرموو: هەر کەسێک لە زەکاتدا وشترێک یان مەڕێک بدزێ (واتە: زەکاتی نەدات)، لە ڕۆژی دواییدا دەیهێنن و وشترەکە یان مەڕەکە بە کۆڵیەوەیەتی؟ (ڕاوی) دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس، گوتی: بەڵێ بیستومە.

١٨١١- عَنْ إِبْرَاهِيمُ بْنُ عَطَاءٍ، مَوْلَى عِمْرَانَ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، أَنَّ عِمْرَانَ بْنَ الْحُصَيْنِ، اسْتُعْمِلَ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا رَجَعَ قِيلَ لَهُ: أَيْنَ الْمَالُ؟ قَالَ: «وَلِلْمَالِ أَرْسَلْتَنِي؟ أَخَذْنَاهُ مِنْ حَيْثُ كُنَّا نَأْخُذُهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَوَضَعْنَاهُ حَيْثُ كُنَّا نَضَعُهُ»[1].

واتە: ئیبراهیمی کوڕی عەتائی خزمەتکاری عیمڕان ﷺ دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە کە عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ کرا بە کۆکەرەوەی زەکات، جا کاتێ گەڕایەوە پێی گوترا: کوا ماڵ و سامانەکە؟ گوتی: ئایا بۆ ماڵ و سامان منت ناردووە؟! بەو شێوازە وەرمان گرت کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ وەرمان دەگرت، وە بەو شێوەیەش دابەشمان کرد (بەسەر ئەوانەی کە شایستەن) کە لەو سەردەمەدا دابەشمان دەکرد (واتە: لەو شارەی کە وەری گرتووە هەر بەسەر خەڵکی هەژاری ئەو شارەشدا دابەشی کردۆتەوە).

### بابەت: زەکاتی ئەسپ و کۆیلە

١٨١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ وَلَا فِي فَرَسِهِ صَدَقَةٌ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەندەو ئەسپی مسوڵمان زەکاتی لەسەر نیە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٢٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٣، ومسلم: ٩٨٢، وأبو داود: ١٥٩٤ و ١٥٩٥، والترمذي: ٦٢٨، والنسائي: ٢٤٦٧_٢٤٧٢.

١٨١٣- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «تَجَوَّزْتُ لَكُمْ عَنْ صَدَقَةِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ»[١].

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زەکاتی بەندە و ئەسپم لەسەر لابردوون.

## بابەت: ئەو ماڵەی کە زەکاتی تێدا پێویست دەبێ

١٨١٤- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَهُ إِلَى الْيَمَنِ، وَقَالَ لَهُ: «خُذِ الْحَبَّ مِنَ الْحَبِّ، وَالشَّاةَ مِنَ الْغَنَمِ، وَالْبَعِيرَ مِنَ الْإِبِلِ، وَالْبَقَرَةَ مِنَ الْبَقَرِ»[٢].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ یەمەن و پێی فەرموو: لە دانەوێڵەدا دانەوێڵە وەربگرە، وە لە مەڕ و بزندا مەڕ و بزن وەربگرە، وە لە وشتردا وشتر وەربگرە، وە لە مانگادا مانگا وەربگرە.

١٨١٥- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: «إِنَّمَا سَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الزَّكَاةَ فِي هَذِهِ الْخَمْسَةِ: فِي الْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرِ، وَالزَّبِيبِ، وَالذُّرَةِ»[٣].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیرییەوە ﷺ، دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا لەو پێنجانەدا زەکاتی داناوە: لە گەنم و جۆ و خورما و مێوژ و گەنمەشامیدا.

## بابەت: زەکاتی کشتوکاڵ و میوە

١٨١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْعُيُونُ الْعُشْرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالنَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٥٧٢ مطولًا و ١٥٧٤ والترمذي: ٦٢٠، والنسائي: ٢٤٧٧_٢٤٧٨.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٥٩٩.

(٣) ضعيف جداً. وصح نحوه بلفظ: «الْأَرْبَعَةَ» فذكرها دون الذرة، فهي منكرة.

(٤) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٦٣٩.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی کە بە باران و سەرچاوە سروشتیەکان ئاو دەدرێ دەیەکی زەکات لێ دەکەوێ، وە ئەوەشی کە مرۆڤ ئاوی دەدا نیوەی دەیەکی زەکات لێ دەکەوێ.

١٨١٧- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ k، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْأَنْهَارُ وَالْعُيُونُ، أَوْ كَانَ بَعْلًا، الْعُشْرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّوَانِي نِصْفُ الْعُشْرِ»(١).

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرچی بە باران و ڕووبار و کانیاوەکان ئاو بدرێ، یان بە ڕیشکی خۆی ئاو بخواتەوە دە یەکی زەکات دەکەوێ، وە هەرچی بە وڵاخی ئاو (ئامێر) هەڵکێش ئاو بدرێ نیوەی دە یەکی زەکات دەکەوێ.

١٨١٨- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ، «وَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِمَّا سَقَتِ السَّمَاءُ، وَمَا سُقِيَ بَعْلًا، الْعُشْرَ، وَمَا سُقِيَ بِالدَّوَالِي نِصْفَ الْعُشْرِ» قَالَ يَحْيَى بْنُ آدَمَ: «الْبَعْلُ، وَالْعَثَرِيُّ، وَالْعَذْيُ هُوَ الَّذِي يُسْقَى بِمَاءِ السَّمَاءِ، وَالْعَثَرِيُّ: مَا يُزْرَعُ بِالسَّحَابِ وَالْمَطَرِ خَاصَّةً، لَيْسَ يُصِيبُهُ إِلَّا مَاءُ الْمَطَرِ، وَالْبَعْلُ: مَا كَانَ مِنَ الْكُرُومِ قَدْ ذَهَبَتْ عُرُوقُهُ فِي الْأَرْضِ إِلَى الْمَاءِ، فَلَا يَحْتَاجُ إِلَى السَّقْيِ، الْخَمْسَ سِنِينَ وَالسِّتَّ، يَحْتَمِلُ تَرْكَ السَّقْيِ، فَهَذَا الْبَعْلُ، وَالسَّيْلُ: مَاءُ الْوَادِي إِذَا سَالَ، وَالْغَيْلُ: سَيْلٌ دُونَ سَيْلٍ»(٢).

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن وە فەرمانی پێکردم کە لەوەی بە ئاوی باران پاراو دەبێ ئەوەی بەهۆی ڕەگەکانیەوە بە ئاوی ژێر زەوی پاراو دەبێ دە، وە یەک وەربگرم، وە لەوەشی کە بە هۆی ئامڕازی دەرهێنانی ئاوەوە پاراو دەکرێ نیوەی دە یەک وەربگرم. یەحیای کوڕی ئادەم گوتی: بەعل و عەسەری و عەزی لەو جۆرە بەرهەمانەن کە بە ئاوی باران پاراو دەبن، وە تایبەت عەسەری لەو جۆرە بەرهەمانەیە کەوا بە هۆی هەور و بارانەوە بەرهەمدێ، وە تەنیا ئاوی بارانی بەردەکەوێ، وە بەعل لەو جۆرەیە کە وەکو مێوی ترێ ڕەگەکانی بەناخی زەویدا چۆتە خوار و گەیشتۆتە ئاو، وە پێویستی بە پاراوکردن نیە، بە پێنج

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٨٣، وأبو داود: ١٥٩٦، والترمذي: ٦٤٠، والنسائي: ٢٤٨٨.

(٢) حسن صحيح. أخرجه النسائي: ٢٤٩٠.

شەش ساڵێ دەکرێ هەر ئاو نەدرێ، وە سەیل بریتیە لە ئاوی شیو و دۆڵەکان کاتێ کە هەڵدەچێ (هەڵدەستێ)، وە غەیلیش وەکو سەیل وایە بەڵام کەمترە.

## بابەت: خەمڵاندنی خورما و ترێ

١٨١٩- عَنْ عَتَّابِ بْنِ أَسِيدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «كَانَ يَبْعَثُ عَلَى النَّاسِ مَنْ يَخْرُصُ عَلَيْهِمْ كُرُومَهُمْ وَثِمَارَهُمْ»[١].

واتە: عەتتابی کوڕی ئەسید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کەسێکی دەنارد بۆ لای خەڵکی کە هەم ترێیەکەو، هەم خورماکەیانی بۆ دەخەمڵاندن (بۆ زەکات لێ دەرکردنی).

١٨٢٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ، اشْتَرَطَ عَلَيْهِمْ أَنَّ لَهُ الْأَرْضَ، وَكُلَّ صَفْرَاءَ وَبَيْضَاءَ، يَعْنِي الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ، وَقَالَ لَهُ أَهْلُ خَيْبَرَ: نَحْنُ أَعْلَمُ بِالْأَرْضِ، فَأَعْطِنَاهَا عَلَى أَنْ نَعْمَلَهَا وَيَكُونَ لَنَا نِصْفُ الثَّمَرَةِ وَلَكُمْ نِصْفُهَا، فَزَعَمَ أَنَّهُ أَعْطَاهُمْ عَلَى ذَلِكَ، فَلَمَّا كَانَ حِينَ يُصْرَمُ النَّخْلُ، بَعَثَ إِلَيْهِمُ ابْنَ رَوَاحَةَ، فَحَزَرَ النَّخْلَ، وَهُوَ الَّذِي يَدْعُونَهُ أَهْلُ الْمَدِينَةِ الْخَرْصَ، فَقَالَ: فِي ذَا كَذَا وَكَذَا، فَقَالُوا: أَكْثَرْتَ عَلَيْنَا يَا ابْنَ رَوَاحَةَ، فَقَالَ: فَأَنَا أَحْزِرُ النَّخْلَ، وَأُعْطِيكُمْ نِصْفَ الَّذِي قُلْتُ، قَالَ: فَقَالُوا: هَذَا الْحَقُّ، وَبِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ، فَقَالُوا: قَدْ رَضِينَا أَنْ نَأْخُذَ بِالَّذِي قُلْتَ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەتحی خەیبەری کرد، مەرجی لەسەر خەڵکەکەی دانا کە هەرچی زەوی و ماڵە، واتە: زێڕ و زیو بۆ ئەو بێت، خەڵکی خەیبەریش پێیان گوت: ئێمە شارەزاترین لە زەوی و زاری ئێرە، بۆیە ئەگەر بماندەیەوە کە ئیشی تێدا بکەین و نیوەی بەر وبومەکەی بۆ ئێمە و نیوەکەی تر بۆ ئێوە، ئیتر پێی وابوو کە لەسەر ئەو ڕێکەوتنە زەویەکەی پێدانەوە، کە کاتی چنینی خورما هات، ئیبنو ڕەواحەی بۆ ناردن تاوەکو خورماکەیان بۆ بخەمڵێنێ، ئەویش گوتی: لەوەدا ئەوەندە و ئەوەندە (زەکات) هەیە، ئەوانیش گوتیان: ئەوە

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٦٠٣، والترمذي: ٦٤٤، والنسائي: ٢٦١٨.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٤١٠_٣٤١٢.

لەسەرت زیاد کردین ئەی ئیبنو ڕەواحە؟! ئەویش گوتی: من خورماکان دەخەملێنم و نیوەی ئەوەی گوتیشم پێتان دەدەم، (ڕاوی) دەڵێ: گوتیان: ئا ئەوە هەقە و ئاسمان و زەویش هەر بە هەق ڕادەوەستن، ئنجا گوتیان: بێگومان ڕازین بە وەرگرتنی ئەوەی کە تۆ گوتت.

## بابەت: نەهیکردن لە بەخشینی خراپترینی ماڵ بۆ زەکات

١٨٢١- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَدْ عَلَّقَ رَجُلٌ أَقْنَاءً، أَوْ قِنْوًا، وَبِيَدِهِ عَصًا، فَجَعَلَ يَطْعَنُ يُدَقْدِقُ فِي ذَلِكَ الْقِنْوِ وَيَقُولُ: «لَوْ شَاءَ رَبُّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ تَصَدَّقَ بِأَطْيَبَ مِنْهَا، إِنَّ رَبَّ هَذِهِ الصَّدَقَةِ يَأْكُلُ الْحَشَفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان بۆ مزگەوت و گۆچانێکی بە دەستەوەبوو، وە پیاوێک هێشوە خورمایەکی وشک و ڕەقەڵەی خراپی هەڵواسیبوو بۆ ئەوەی هەر کەسێ بیەوێ لێی بخوات، پێغەمبەر ﷺ بە دارەکەی دەستی بە خێرایی لە هێشوە خورماکەی دەداو دەیفەرموو: ئەگەر خاوەنی ئەم زەکاتە بیویستایە خورمای چاکتری دەکردە زەکات، وە هەروەها فەرمووی: بێگومان خاوەنی ئەم زەکاتە خورمای وشک و ڕەقەڵەی خراپ دەخوات لە ڕۆژی دواییدا.

١٨٢٢- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، فِي قَوْلِهِ سُبْحَانَهُ: ﴿وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴿٢٦٧﴾﴾ البقرة، قَالَ: نَزَلَتْ فِي الْأَنْصَارِ، كَانَتِ الْأَنْصَارُ تُخْرِجُ إِذَا كَانَ جِدَادُ النَّخْلِ مِنْ حِيطَانِهَا أَقْنَاءَ الْبُسْرِ، فَيُعَلِّقُونَهُ عَلَى حَبْلٍ بَيْنَ أُسْطُوَانَتَيْنِ فِي مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَيَأْكُلُ مِنْهُ فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ، فَيَعْمِدُ أَحَدُهُمْ فَيُدْخِلُ قِنْوًا فِيهِ الْحَشَفُ، يَظُنُّ أَنَّهُ جَائِزٌ فِي كَثْرَةِ مَا يُوضَعُ مِنَ الْأَقْنَاءِ، فَنَزَلَ فِيمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ: ﴿وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ ﴿٢٦٧﴾﴾ البقرة، يَقُولُ: «لَا تَعْمِدُوا لِلْحَشَفِ مِنْهُ تُنْفِقُونَ: ﴿وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ﴿٢٦٧﴾﴾ البقرة، يَقُولُ: لَوْ أُهْدِيَ لَكُمْ مَا قَبِلْتُمُوهُ إِلَّا عَلَى اسْتِحْيَاءٍ مِنْ صَاحِبِهِ، غَيْظًا أَنَّهُ بَعَثَ إِلَيْكُمْ مَا لَمْ يَكُنْ لَكُمْ فِيهِ حَاجَةٌ، وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْ صَدَقَاتِكُمْ»[٢].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٦٠٨، والنسائي: ٢٤٩٣.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٩٨٧.

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەربارەی فەرمایشتی خوا: ﴿وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ ٢٦٧﴾ البقرة، واتە: وە لەوەی کە بۆمان دەرهێناون (ڕواندون) لە زەوی مەڕۆن لەوەی ببەخشن کە خراپە، گوتوویەتی: ئەوە دەربارەی ئەنصارِ دابەزی، ئەنصارِ لە کاتی چنینەوەی خورما لەناو باغەکانیاندا هێشوویان جیادەکردەوە، وە لەسەر پەتێک هەڵیان دەواسین لە نێوانی دوو پایەدا لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئنجا هەژارەکانی موهاجیرین لێیان دەخوارد، جا یەکێک هەڵدەسا و هێشوویەکی خراپی دەکردە ناو هێشووەکانەوە، وایدەزانی لەبەر ئەوەی کە ژمارەی هێشووەکان زۆرە ئەوە دروستە (کە هێشووی خراپی تێدابێ)، جا دەربارەی ئەوانەی ئەو کارەیان دەکرد ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ ٢٦٧﴾ البقرة، واتە: مەڕۆن لەوەی ببەخشن کە خراپە، واتە: مەچن خراپەکەی لێ جیابکەنەوەو بیبەخشن لە ڕێگەی خوادا، ﴿وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ ٢٦٧﴾ البقرة، واتە: وە لەوەی کە بۆمان دەرهێناون (ڕواندون) لە زەوی مەڕۆن لەوەی ببەخشن کە خراپە، دەڵێ: ئەگەر خودی ئەو خورمایە بکرابایە دیاری بۆ خۆتان ئەوە لەبەر شەرمکردن نەبا وەرتان نەدەگرت، لە توڕەیی ئەوەی کە شتێکی بۆ هێناون کە هیچ ئیشتان پێی نیە، وە بزانن کە بێگومان خوا بێ پێویستییە لە بەخشینەکانتان.

## بابەت: زەکاتی هەنگوین

١٨٢٣- عَنْ أَبِي سَيَّارَةَ الْمُتَعِيِّ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي نَحْلًا، قَالَ: «أَدِّ الْعُشْرَ» قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، احْمِهَا لِي، فَحَمَاهَا لِي[1].

واتە: ئەبو سەییارەی موتەعیی ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من مێشم هەیە، فەرمووی: دە یەکی هەنگوینەکە بدە (وەکو زەکات)، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شوێنە بکە بە پاوان بۆ من، ئەویش کردیە پاوان بۆ من.

---

(١) حسن لغيره.

**١٨٢٤-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «أَنَّهُ أَخَذَ مِنَ الْعَسَلِ الْعُشْرَ»[١].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب ﷺ لە باوکییەوە لە باپیریەوە، عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دە یەکی هەنگوینی (وەکو زەکات) وەرگرتوە.

## بابەت: سەرفیترە

**١٨٢٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «أَمَرَ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ» قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: «فَجَعَلَ النَّاسُ عِدْلَهُ مُدَّيْنِ مِنْ حِنْطَةٍ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ زەکاتی سەرفیترە فەرمانی کرد بە مەنێک خورما، یان مەنێک جۆ، عەبدوڵڵا گوتی: جا خەڵکی لە بری ئەوە دوو مود گەنـمیان بەخشی.

**صاع:** یەکسانە بە چوار (مـد). واتە، مشتێک، واتە: پڕ بە هەردوو دەست.

**١٨٢٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مەنێک خورما، یان مەنێک جۆ سەرفترەی دانا لەسەر هەموو مسوڵمانێ، ئیتر بەندە بێ یان ئازاد بێ، نێر بێ یان مێ.

**١٨٢٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ، وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ، فَمَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلَاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ»[٤].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ١٦٠٠_١٦٠٢، والنسائي: ١٤٩٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٠٣، ومسلم: ٩٨٤ و ٩٨٦، وأبو داود: ١٦١١ و ١٦١٣ و ١٦١٤، والترمذي: ٦٧٥ و ٦٧٦، والنسائي: ٢٥٠٠_٢٥٠٥ و ٢٥١٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٠٣، ومسلم: ٩٨٤ و ٩٨٦، وأبو داود: ١٦١١ و ١٦١٣ و ١٦١٤، والترمذي: ٦٧٥ و ٦٧٦، والنسائي: ٢٥٠٠_٢٥٠٥ و ٢٥١٦.

(٤) حسن. أخرجه أبو داود: ١٦٠٩.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مەنێک خورما، یان مەنێک جۆ زەکاتی سەرفیترەی فەرز کرد لەسەر مسوڵمانان، بۆ ئەوەی پاککەرەوەی ڕۆژووان بێ لە قسەی پڕ و پوچ و وتەی ناپەسەند، وە خۆراکیش بێت بۆ هەژاران، جا هەر کەس پێش نوێژی جەژن سەرفیترەکەی بدات، ئەوە زەکاتێکی وەرگیراوە، هەر کەسێکیش لەدوای نوێژی جەژن بیدات ئەوە خێرێکە لە خێرەکان.

١٨٢٨- عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ تَنْزَلَ الزَّكَاةُ، فَلَمَّا نَزَلَتِ الزَّكَاةُ، لَمْ يَأْمُرْنَا، وَلَمْ يَنْهَنَا، وَنَحْنُ نَفْعَلُهُ»[١].

واتە: قەیسی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە زەکاتی سەرفترە پێش دابەزینی (ئایەتی) زەکات، جا کاتێ (ئایەتی) زەکات دابەزی چیتر فەرمانی پێنەکردین، وە قەدەغەشی نەکردین لە کردنی، وە ئێمەش هەر دەمان کرد.

١٨٢٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، فَلَمْ نَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاوِيَةُ الْمَدِينَةَ، فَكَانَ فِيمَا كَلَّمَ بِهِ النَّاسَ أَنْ قَالَ: لَا أُرَى مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ إِلَّا يَعْدِلُ صَاعًا مِنْ هَذَا، فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ» قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: «لَا أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَبَدًا مَا عِشْتُ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێومان دابوو ئێمە مەنێک خۆراک، یان مەنێک خورما، یان مەنێک جۆ، یان مەنێک کەشک، یان مەنێک مێوژمان دەدا بۆ زەکاتی سەرفترە، وە بەردەوام بووین لە کردنی ئەوە هەتاوەکو موعاویە هات بۆ مەدینە، جا یەکێک لەو قسانەی کە بۆ خەڵکی کرد ئەمە بوو کە گوتی: بەڕاستی وادەزانم کە دوو مشت لە گەنمی شام هاوتای مەنێکی ئەو خورمایەی ئێوەیە، ئیتر خەڵکیش کاریان بەو قسەیەی موعاویە کرد و گەنمیان دەدا بۆ زەکاتی سەرفترە، ئەبو سەعید گوتی: من تاوەکو لە ژیاندا مابم لە زەکاتی سەرفترەدا هەر ئەو شتانە دەدەم کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ داومە.

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٥٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٠٨، ومسلم: ٩٨٥، وأبو داود: ١٦١٦ و ١٦١٨، والترمذي: ٦٧٣، والنسائي: ٢٥١٣_٢٥١٤ و ٢٥١٧_٢٥١٨.

**١٨٣٠- عَنْ عَمَّارِ بْنِ سَعْدٍ ، مُؤَذِّنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَمَرَ بِصَدَقَةِ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ سُلْتٍ»[١].**

واتە: عەماری کوڕی سەعد  بانگبێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە مەنێک خورما، یان مەنێک جۆ، یان مەنێک جۆی سپی دەکرد بۆ زەکاتی سەرفترە.

## بابەت: دەیەک و باج

**١٨٣١- عَنِ الْعَلَاءِ بْنِ الْحَضْرَمِيِّ ، قَالَ: «بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْبَحْرَيْنِ، أَوْ إِلَى هَجَرَ، فَكُنْتُ آتِي الْحَائِطَ يَكُونُ بَيْنَ الْإِخْوَةِ، يُسْلِمُ أَحَدُهُمْ، فَآخُذُ مِنَ الْمُسْلِمِ الْعُشْرَ، وَمِنَ الْمُشْرِكِ الْخَرَاجَ»[٢].**

واتە: عەلای کوڕی حەزرەمیی  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ بەحرەین یان بۆ هەجەر، منیش چووم بۆ لای باخێک کە هی دوو برا بوو، یەکێک لە براکان مسوڵمان بوو، جا لە مسوڵمانەکە دەیەکم وەرگرت (لە بری زەکات)، لە هاوبەشدانەرەکە باجم وەرگرت.

## بابەت: وەسق شەست صاعە

**١٨٣٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ، رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «الْوَسْقُ سِتُّونَ صَاعًا»[٣].**

واتە: ئەبو سەعید  ئەم فەرموودەیەی بەرز کردۆتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، فەرموویەتی: وەسق شەست مەنە (واتە: صاع).

**١٨٣٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْوَسْقُ سِتُّونَ صَاعًا»[٤].**

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وەسق شەست مەنە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ١٥٥٩.

(٤) ضعيف جداً.




## بابەت: زەکات دان بە خزم و کەسی نزیک

**١٨٣٤-** عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ ﵂، قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُجْزِئُ عَنِّي مِنَ الصَّدَقَةِ النَّفَقَةُ عَلَى زَوْجِي، وَأَيْتَامٍ فِي حِجْرِي؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَهَا أَجْرَانِ: أَجْرُ الصَّدَقَةِ، وَأَجْرُ الْقَرَابَةِ»[١].

**واتە: زەینەبی خێزانی عەبدوڵڵا ﵂ دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ئایا دروستە کە لە زەکاتەکەم خەرجی ژیانی پیاوەکەم و ئەو هەتیوانەش کە لە ماڵی منن بکێشم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دوو پاداشتی هەیە، یەکیان هی زەکات دەرکردنەکە، یەکیشیان هی بەجێ گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی.**

**١٨٣٤م-** حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ الصَّبَّاحِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ، عَنْ شَقِيقٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ، ابْنُ أَخِي زَيْنَبَ، عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[٢].

**واتە: ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.**

**١٨٣٥-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالصَّدَقَةِ، فَقَالَتْ زَيْنَبُ امْرَأَةُ عَبْدِ اللَّهِ: أَيُجْزِينِي مِنَ الصَّدَقَةِ أَنْ أَتَصَدَّقَ عَلَى زَوْجِي وَهُوَ فَقِيرٌ، وَبَنِي أَخٍ لِي أَيْتَامٍ، وَأَنَا أُنْفِقُ عَلَيْهِمْ هَكَذَا وَهَكَذَا، وَعَلَى كُلِّ حَالٍ؟ قَالَ: «نَعَمْ» قَالَ: وَكَانَتْ صَنَاعَ الْيَدَيْنِ[٣].

**واتە: ئومو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین کە زەکات بدەین، جا زەینەبی خێزانی عەبدوڵڵا گوتی: ئایا دروستە کە زەکاتەکەم بدەم بە هاوسەرەکەم کە هەژارە، وە برازایەکم کە هەتیوە، وە من ئاوا و ئاوا خەرجی ژیانیان دەکێشم، وە لە هەموو بار و دۆخێکدا؟ فەرمووی: بەڵێ (دروستە)، (ڕاوی) دەڵێ: جا ئەویش زۆر ئیشی دەکرد و کەسابەتی دەکرد.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٦، ومسلم: ١٠٠٠، والترمذي: ٦٣٥ و ٦٣٦، والنسائي: ٢٥٨٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٦، ومسلم: ١٠٠٠، والترمذي: ٦٣٥ و ٦٣٦، والنسائي: ٢٥٨٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٦٧، ومسلم: ١٠٠١.

## بابەت: ناپەسندی داواکردن لە خەڵک (سواڵ کردن)

١٨٣٦- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَأَنْ يَأْخُذَ أَحَدُكُمْ أَحْبُلَهُ، فَيَأْتِيَ الْجَبَلَ، فَيَجِيءَ بِحُزْمَةِ حَطَبٍ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَبِيعَهَا، فَيَسْتَغْنِيَ بِثَمَنِهَا، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ، أَعْطَوْهُ أَوْ مَنَعُوهُ»[١].

واتە: هیشامی کوڕی عوروە لە باوکییەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان گوریسەکانی هەڵبگرێ و بچێ بۆ شاخ، جا بە کۆڵ کۆڵەدار بێنێ و بیفرۆشێ و بە پارەکەی بێ پێویستی بێ لە خەڵکی، ئەوە زۆر بۆی باشترە لەوەی کە داوا لە خەڵکی بکات، جا خەڵک پێی بدەن، یان پێی نەدن.

١٨٣٧- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَمَنْ يَتَقَبَّلُ لِي بِوَاحِدَةٍ أَتَقَبَّلُ لَهُ بِالْجَنَّةِ؟» قُلْتُ: أَنَا، قَالَ: «لَا تَسْأَلِ النَّاسَ شَيْئًا» قَالَ: «فَكَانَ ثَوْبَانُ يَقَعُ سَوْطُهُ وَهُوَ رَاكِبٌ، فَلَا يَقُولُ لِأَحَدٍ: نَاوِلْنِيهِ، حَتَّى يَنْزِلَ فَيَأْخُذَهُ»[٢].

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سیفەتێک هەیە هەر کەسێک کاری پێبکات و دەستی پێوە بگرێ من گرەنتی چوونە بەهەشتی بۆ دەکەم، گوتم: من (دەستی پێوە دەگرم)، فەرمووی: داوای هیچ شتێک لە خەڵکی مەکە، (ڕاوی) دەڵێ: جا سەوبان ﷺ جار هەبوو لە کاتی سواریدا قامچییەکەی لێدەکەوت، وە بە کەسی نەدەگوت بیدەوە دەستم، تاوەکو خۆی دادەبەزی و هەڵی دەگرتەوە.

## بابەت: کەسێک کە دەوڵەمەند بێ و داواش لە خەڵک بکات

١٨٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَأَلَ النَّاسَ أَمْوَالَهُمْ تَكَثُّرًا، فَإِنَّمَا يَسْأَلُ جَمْرَ جَهَنَّمَ، فَلْيَسْتَقِلَّ مِنْهُ أَوْ لِيُكْثِرْ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٧١.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٥٩٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٤١.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس داوای ماڵ لە خەڵکی بکات بۆ ئەوەی ماڵی خۆی پێ زیاتر بکات (واتە پێویستی پێ نەبێ)، داوای پشکۆی ئاگری دۆزەخ دەکات، جا با (ئاگری دۆزەخ بۆ خۆی) کەمبکاتەوە، یان با زۆری بکات.

١٨٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ، وَلَا لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ دەوڵەمەند و بۆ کەسێ کە تەندروست و بەهێز بێ دروست نیە داوای زەکات بکات.

١٨٤٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَأَلَ، وَلَهُ مَا يُغْنِيهِ، جَاءَتْ مَسْأَلَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ خُدُوشًا، أَوْ خُمُوشًا، أَوْ كُدُوحًا فِي وَجْهِهِ» قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا يُغْنِيهِ؟ قَالَ «خَمْسُونَ دِرْهَمًا، أَوْ قِيمَتُهَا مِنَ الذَّهَبِ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی بەشی خۆی هەبێ و سواڵ بکات، ڕۆژی قیامەت کە هات نیشانەی ئەو سواڵە بەڕووخسارییەوە دەبێ وەکو پەڵەیەکی ڕووشاوی، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مرۆڤ چەندی هەبێ بەشی دەکات و ئیتر نابێ سواڵ بکات؟ فەرمووی: پەنجا درهەمی هەبێ، یان بایی ئەوەندە زێڕی هەبێ.

## بابەت: ئەو کەسەی شایستەی زەکات پێدانە

١٨٤١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ إِلَّا لِخَمْسَةٍ: لِعَامِلٍ عَلَيْهَا، أَوْ لِغَازٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ لِغَنِيٍّ اشْتَرَاهَا بِمَالِهِ، أَوْ فَقِيرٍ تُصُدِّقَ عَلَيْهِ فَأَهْدَاهَا لِغَنِيٍّ، أَوْ غَارِمٍ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٢٥٩٧.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ١٦٢٦، والترمذي: ٦٥٠، والنسائي: ٢٥٩٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٦٣٥ و ١٦٣٦.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەوڵەمەند زەکاتی پێ ناشێ مەگەر لەم پێنج کەسە بێ: بۆ ئەو کەسەی کە کاری کۆکردنەوەی زەکات دەکات، یان ئەو کەسەی کە غەزا دەکات لەڕێی خوادا، یان ئەو کەسەی کە بە پارەی خۆی زەکاتەکە دەکڕێتەوە، یان هەژارێک زەکاتی پێبدرێ و ئەویش بە دیاری بیداتە دەوڵەمەندێک، یان قەرزدار بێ (بە جۆرێک کە ئەگەر قەرزەکانی بداتەوە بە ئەندازەی نیصابی زەکات پارەی نەمێنێ).

## بابەت: گەورەیی بەخشین

**١٨٤٢-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَصَدَّقَ أَحَدٌ بِصَدَقَةٍ مِنْ طَيِّبٍ، وَلَا يَقْبَلُ اللَّهُ إِلَّا الطَّيِّبَ، إِلَّا أَخَذَهَا الرَّحْمَنُ بِيَمِينِهِ وَإِنْ كَانَتْ تَمْرَةً، فَتَرْبُو فِي كَفِّ الرَّحْمَنِ حَتَّى تَكُونَ أَعْظَمَ مِنَ الْجَبَلِ، وَيُرَبِّيهَا لَهُ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فُلُوَّهُ، أَوْ فَصِيلَهُ»[1].

واتە: سەعیدی کوڕی یەسار ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە ئەبو هوڕەیڕە ﷺ بووە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە باشترینی ماڵەکەی بکاتە خێر، وە خوا ماڵی باش نەبێ وەری ناگرێ، ئەوە خوا بە دەستی ڕاستی لێی وەردەگرێ، وە ئەگەر یەک دەنکە خورما بێ، ئەوە لەلایەن خوا زیاد دەکات، تاکو لە کێویش گەورەتر دەبێ، وە سەرپەرشتی دەکات و پەروەردەی دەکات بۆی، هەروەکو چۆن یەکێک لە ئێوە بێچووی ئەسپەکەی، یان بێچووی وشترەکەی بە خێو دەکات.

**١٨٤٣-** عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا سَيُكَلِّمُهُ رَبُّهُ، لَيْسَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ تُرْجُمَانٌ، فَيَنْظُرُ أَمَامَهُ فَتَسْتَقْبِلُهُ النَّارُ، وَيَنْظُرُ عَنْ أَيْمَنَ مِنْهُ فَلَا يَرَى إِلَّا شَيْئًا قَدَّمَهُ، وَيَنْظُرُ عَنْ أَشْأَمَ مِنْهُ فَلَا يَرَى إِلَّا شَيْئًا قَدَّمَهُ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَّقِيَ النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَلْيَفْعَلْ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤١٠، ومسلم: ١٠١٤، والترمذي: ٦٦١، والنسائي: ٢٥٢٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥١٢، ومسلم: ١٠١٦/٦٧، والترمذي: ٢٤١٥، والنسائي: ٢٥٥٢ مختصراً.

واتە: عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە بەدڵنیایی لە ڕۆژی دواییدا پەروەردگاری قسەی لەگەڵدا دەکات، لە کاتێکدا کە لە بەینی ئەو و پەروەردگاردا وەرگێڕ نیە، ئنجا ئەو کەسە تەماشای پێش خۆی دەکات ئاگر لە پێشیەتی، وە تەماشای ڕاستی خۆی دەکات هیچ شتێک نابینێ جگە لەو کردەوەیە نەبێ کە لە پێش خۆی ناردوویەتی، وە تەماشای لای چەپی دەکات، هیچ شتێک نابینێ جگە لەوەی کە پێش خۆی خستووە لە دونیادا، جا هەر یەکێکتان کە توانای هەیە ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێ، با خۆی لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێ.

**١٨٤٤- عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ الضَّبِّيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَعَلَى ذِي الْقَرَابَةِ اثْنَتَانِ: صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ»[1].**

واتە: سەلمانی کوڕی عامری زەبیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خێرکردن بە کەسی هەژار چاکەیە، خێرکردن بە کەسی نزیک دوو شتە: هەم خێرکردنە، وە هەم بەجێ گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتییە.



---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٦٥٨، والنسائي: ٢٥٨٢.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی گەورەیی هاوسەرگیریی

**١٨٤٥-** عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ قَيْسٍ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ بِمِنًى، فَخَلَا بِهِ عُثْمَانُ فَجَلَسْتُ قَرِيبًا مِنْهُ، فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: هَلْ لَكَ أَنْ أُزَوِّجَكَ جَارِيَةً بِكْرًا تُذَكِّرُكَ مِنْ نَفْسِكَ بَعْضَ مَا قَدْ مَضَى؟ فَلَمَّا رَأَى عَبْدُ اللَّهِ أَنَّهُ لَيْسَ لَهُ حَاجَةٌ سِوَى هَذَا، أَشَارَ إِلَيَّ بِيَدِهِ، فَجِئْتُ وَهُوَ يَقُولُ: لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ، لَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ»[١].

واتە: عەلقەمەی کوڕی قەیس دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ بووم لە مینا، جا لەگەڵ عوسمان دانیشتن و منیش لە نزیکیانەوە دانیشتم، ئنجا عوسمان پێی گوت: ئایا دەتەوێ کەنیزەکێکی کچت لێ مارە ببڕم کە ڕۆژانی ڕابردووت لە گەنجیدا بۆ قەرەبوو بکاتەوە؟ جا کاتێک عەبدوڵڵا زانی کە تەنها ئیشی ئەوەی پێبوو ئاماژەی بۆ من کرد (مەبەستی ئەوەبوو کە من گەنجم و فەرمانەکەشی بۆ گەنجە)و، منیش هاتم و ئەویش گوتی: ئەگەر تۆ ئەوە دەڵێی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵی گەنجان هەر یەکێک لە ئێوە ئەگەر توانای هەیە با ژن بهێنێ، چونکە بێگومان ژن هێنان باشتر و پارێزەرترە بۆ پاراستنی چاو لە تەماشاکردنی حەڕام، وە پارێزەری دامێنیشە لە کاری نەشیاو، هەر کەسێک نەیتوانی با بەڕۆژوو بێ، چونکە بێگومان ڕۆژوو دەبێتە قەڵغان بۆی.

**١٨٤٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «النِّكَاحُ مِنْ سُنَّتِي، فَمَنْ لَمْ يَعْمَلْ بِسُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي، وَتَزَوَّجُوا، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الْأُمَمَ، وَمَنْ كَانَ ذَا طَوْلٍ فَلْيَنْكِحْ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَعَلَيْهِ بِالصِّيَامِ، فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوسەرگیری لە سوننەت و ڕێبازی منە، جا هەر کەسێک کار بە ڕێبازی من نەکات، ئەوە لەسەر ڕێبازی من نیە، وە ژن بێنن، بەڕاستی من شانازی بە زۆریتانەوە دەکەم لە ناو ئوممەتانی دیکەدا، جا

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٦٥، ومسلم: ١٤٠٠، وأبو داود: ٢٠٤٦، والترمذي: ١٠٨١، والنسائي: ٢٢٣٩_٢٢٤٢ و ٣٢٠٧_٣٢٠٩.

(٢) حسن لغيره.

هەر یەکێکتان ئەگەر توانای دارایی هەیە با ژن بێنێ، وە هەر یەکێکیش توانای نیە با بەڕۆژوو بێت، بێگومان ڕۆژوو بۆی دەبێتە قەڵغان.

**١٨٤٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَمْ نَرَ - يُرَ - لِلْمُتَحَابَّيْنِ مِثْلُ النِّكَاحِ»**[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ چارەسەرێک نابینین باشتر بێ لە هاوسەرگیری بۆ دوو کەس کە یەکتریان خۆش بوێ.

## بابەت: قەدەغەکردنی ڕەبەنی و وازهێنان لە هاوسەرگیریی

**١٨٤٨- عَنْ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: «لَقَدْ رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ التَّبَتُّلَ، وَلَوْ أَذِنَ لَهُ لَاخْتَصَيْنَا»**[2].

واتە: سەعد ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای نەدا کە عوسمانی کوڕی مەزعون بە ڕەبەنی بمێنێتەوە (وەک بڕیاری دابوو)، خۆ ئەگەر ڕێگای پێدابایە، ئێمەش خۆمان دەخەساند (خۆمان بۆ عیبادەت یەکلادەکردەوە و ژنمان نەدەهێنا).

**١٨٤٩- عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «نَهَى عَنِ التَّبَتُّلِ». زَادَ زَيْدُ بْنُ أَخْزَمَ: وَقَرَأَ قَتَادَةُ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً ﴿٣٨﴾ ﴾ الرعد**[3].

واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەبەنی و ژن نەهێنانی قەدەغە کردوە، زەیدی کوڕی ئەخزەم لە گێڕانەوەکەیدا ئەوشی زیاد کردوە، دەڵێ: قەتادە ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً ﴿٣٨﴾ ﴾ الرعد، واتە: سوێند بەخوا بێگومان پێش تۆ پێغەمبەرانێکمان ناردووە و پێماندان هاوسەر و نەوە و وەچە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٧٤، ومسلم: ١٤٠٢، والترمذي: ١٠٨٣، والنسائي: ٣٢١٢.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ١٠٨٢، والنسائي: ٣٢١٤.

## بابەت: مافی ژن لەسەر مێرد

١٨٥٠- عَنْ حَكِيمِ بْنِ مُعَاوِيَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ مَا حَقُّ الْمَرْأَةِ عَلَى الزَّوْجِ؟ قَالَ: «أَنْ يُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمَ، وَأَنْ يَكْسُوَهَا إِذَا اكْتَسَى، وَلَا يَضْرِبِ الْوَجْهَ، وَلَا يُقَبِّحْ، وَلَا يَهْجُرْ إِلَّا فِي الْبَيْتِ»[1].

واتە: حەکیمی کوڕی موعاویە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ئایا مافی ئافرەت بەسەر مێردەکەیەوە چییە؟ فەرمووی: ئەگەر پێویستی بە خواردن بوو خواردنی بداتێ، وە ئەگەر پێویستی بە پۆشاک بوو پۆشاکی بۆ دابین بکات، وە لە ڕوخساری نەدات، وە ڕوخساری ناشیرین نەکات (یان قسەی ناشیرین و نەشیاوی پێ نەڵێت)، وە پشتی تێنەکات و لێی دوور نەکەوێتەوە تەنها لە ماڵەوە نەبێ (واتە: نە دەری بکات و نە خۆشی لە ماڵ دەربچێ و بچێتە شوێنێکی تر).

١٨٥١- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْأَحْوَصِ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي ﷺ، أَنَّهُ شَهِدَ حَجَّةَ الْوَدَاعِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ، وَذَكَّرَ وَوَعَظَ، ثُمَّ قَالَ: «اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا، فَإِنَّهُنَّ عِنْدَكُمْ عَوَانٍ، لَيْسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئًا غَيْرَ ذَلِكَ، إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ، فَإِنْ فَعَلْنَ فَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ، وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ، فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا، إِنَّ لَكُمْ مِنْ نِسَائِكُمْ حَقًّا، وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا، فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ، فَلَا يُوَطِّئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ، وَلَا يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ، أَلَا وَحَقُّهُنَّ عَلَيْكُمْ أَنْ تُحْسِنُوا إِلَيْهِنَّ فِي كِسْوَتِهِنَّ وَطَعَامِهِنَّ»[2].

واتە: سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ئەحوەص دەڵێ: باوکم ﷺ بۆی گێڕامەوە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادە بووە لە حەجی ماڵئاواییدا، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) سوپاس و ستایشی خوای کرد و یادی خوای بیرخستنەوە و ئامۆژگاری کردن، پاشان فەرمووی: وەسیەتتان بۆ دەکەم لەگەڵ ئافرەتان باش و چاکەکاربن، بێگومان ئەوان لەبەر دەستی ئێوە دان، هیچی ترتان بەسەریانەوە نیە جگە لەو شتە (کە بە نیکاح بۆتان حەڵاڵ بووە)، مەگەر ئەوان خراپەیەکی ئاشکرا بکەن، جا ئەگەر کارێکی ئاوا

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٤٢.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ١١٦٣ و ٣٠٨٧ مطولًا.

نەشیاویان کرد، جێگایان لێ جیابکەنەوە و لێیان بدەن، بەڵام لێدانێک کە توند و بە ئازار نەبێ، ئنجا ئەگەر فەرمان بەرداریان کردن وازیان لێبێنن (ئازاریان مەدەن)، بێگومان مافتان هەیە بەسەر ژنەکانتانەوەو، ژنەکانیشتان مافیان هەیە بەسەرتانەوە، مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە کە لەگەڵ کەسێک قسە نەکەن و هاتوچۆ نەکەن کە ڕقتان لێیەتی و پێتان خۆش نیە، وە بێ مۆڵەتی ئێوە ڕێگە نەدەن کەسێک بێتە ماڵەکانتان کە ڕقتان لێیەتی، وە مافی ئەوان لەسەر ئێوە ئەوەیە کە لەگەڵیان باش بن و بەرگ و پۆشاک و خواردن و خواردنەوەیان پێبدەن.

## بابەت: مافی پیاو لەسەر ژنەکەی

**١٨٥٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَوْ أَمَرْتُ أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لِأَحَدٍ، لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا، وَلَوْ أَنَّ رَجُلًا أَمَرَ امْرَأَتَهُ أَنْ تَنْقُلَ مِنْ جَبَلٍ أَحْمَرَ إِلَى جَبَلٍ أَسْوَدَ، وَمِنْ جَبَلٍ أَسْوَدَ إِلَى جَبَلٍ أَحْمَرَ، لَكَانَ نَوْلُهَا أَنْ تَفْعَلَ»[1].**

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دروست بایە و فەرمانم بکردایە کە سوجدە بۆ یەکێک ببرێ فەرمانم دەکرد بە ئافرەت کە سوجدە بۆ پیاوەکەی ببات، خۆ ئەگەر پیاو فەرمان بکات بە ژنەکەی کە بەردی کێوێک بگوازێتەوە بۆ کێوێکی تر، هەق وایە کە ئافرەتەکە ئەو کارە بکات.**

**١٨٥٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﵁، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ مُعَاذٌ مِنَ الشَّامِ سَجَدَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا هَذَا يَا مُعَاذُ؟» قَالَ: أَتَيْتُ الشَّامَ فَوَافَقْتُهُمْ يَسْجُدُونَ لِأَسَاقِفَتِهِمْ وَبَطَارِقَتِهِمْ، فَوَدِدْتُ فِي نَفْسِي أَنْ نَفْعَلَ ذَلِكَ بِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَلَا تَفْعَلُوا، فَإِنِّي لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لِغَيْرِ اللَّهِ، لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَا تُؤَدِّي الْمَرْأَةُ حَقَّ رَبِّهَا حَتَّى تُؤَدِّيَ حَقَّ زَوْجِهَا، وَلَوْ سَأَلَهَا نَفْسَهَا وَهِيَ عَلَى قَتَبٍ لَمْ تَمْنَعْهُ»[2].**

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا ﵁ دەڵێ: کاتێ موعاز لە شام هاتەوە سوجدەی برد بۆ پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: ئەوە چییە ئەی موعاز؟! گوتی: کە چووم بۆ شام ئەوەم بینی کە ئەوان بۆ زانا و سەرۆک و گەورەکانیان سوجدە دەبەن، ئنجا منیش**

---

(١) ضعيف لكن الشرط الأول منه صحيح لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

لە دڵی خۆمدا ئەوەم پێ خۆش بوو کە ئێمەش ئەوە بۆ تۆ بکەین، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو کارە مەکەن، خۆ ئەگەر من فەرمانم بە یەکێک بکردبایە کە سوجدە بۆ جگە لەخوا ببات ئەوا فەرمانم بە ئافرەت دەکرد کە سوجدە بۆ مێردەکەی ببات، وە سوێند بەو زاتەی کە گیانی موحەممەدی ﷺ بەدەستە ئافرەت ناتوانێ مافی پەروەردگاری بدات تاکو مافی مێردەکەی نەدات، جا ئەگەر داوای (جیماعی) لێبکات ئەگەر لەسەر پشتی وشتریش بێ ڕێگری نەکات.

١٨٥٤- عَنْ مُسَاوِرٍ الْحِمْيَرِيِّ، عَنْ أُمِّهِ، قَالَتْ: سَمِعْتُ أُمَّ سَلَمَةَ ، تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ مَاتَتْ، وَزَوْجُهَا عَنْهَا رَاضٍ، دَخَلَتِ الْجَنَّةَ»[١].

واتە: موساویری حیمیەریی لە دایکییەوە دەگێڕێتەوە: کە گوتوویەتی: گوێم لە ئومو سەلەمە  بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر ئافرەتێک کاتێ مردو پیاوەکەی لێی ڕازی بوو، دەچێتە بەهەشت.

## بابەت: باشترینی ئافرەتان

١٨٥٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّمَا الدُّنْيَا مَتَاعٌ، وَلَيْسَ مِنْ مَتَاعِ الدُّنْيَا شَيْءٌ أَفْضَلَ مِنَ الْمَرْأَةِ الصَّالِحَةِ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دونیا بریتیە لە هەندێ خۆشی و خۆشگوزەرانی، وە هیچ شتێک لە خۆشیەکانی دونیا باشتر نیە لە ئافرەتێکی چاکەکار.

١٨٥٦- عَنْ ثَوْبَانَ ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَ فِي الْفِضَّةِ وَالذَّهَبِ مَا نَزَلَ، قَالُوا: فَأَيَّ الْمَالِ نَتَّخِذُ؟ قَالَ عُمَرُ : فَأَنَا أَعْلَمُ لَكُمْ ذَلِكَ، فَأَوْضَعَ عَلَى بَعِيرِهِ، فَأَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ، وَأَنَا فِي أَثَرِهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيَّ الْمَالِ نَتَّخِذُ؟ فَقَالَ: «لِيَتَّخِذْ أَحَدُكُمْ قَلْبًا شَاكِرًا، وَلِسَانًا ذَاكِرًا، وَزَوْجَةً مُؤْمِنَةً، تُعِينُ أَحَدَكُمْ عَلَى أَمْرِ الْآخِرَةِ»[٣].

---

(١) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١١٦١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٦٧، والنسائي: ٣٢٣٢.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٠٩٤.

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: کاتێک کە دەربارەی زێڕ و زیو ئەو ئایەتە دابەزی کە دابەزی، گوتیان: کەواتە کامە ماڵ و سامان کۆ بکەینەوە؟ عومەر ﷺ گوتی: من ئەوەتان بۆ ڕادەگەیەنم، جا بە پەلە بە وشترەکەی ڕۆیشت و گەیشتە پێغەمبەر ﷺ، منیش لە دوای بووم، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ ماڵ و سامانێک هەڵبگرین؟ ئەویش فەرمووی: هەر یەکێک لە ئێوە با دڵێکی سوپاسگوزاری هەبێ، لەگەڵ زمانێکی پاراو بە یاد و ستایشی خوا، وە ئافرەتێکی بڕوادار کە یارمەتی دەری بێت بۆ کار وباری ڕۆژی دوایی.

**١٨٥٧-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: «مَا اسْتَفَادَ الْمُؤْمِنُ بَعْدَ تَقْوَى اللَّهِ خَيْرًا لَهُ مِنْ زَوْجَةٍ صَالِحَةٍ، إِنْ أَمَرَهَا أَطَاعَتْهُ، وَإِنْ نَظَرَ إِلَيْهَا سَرَّتْهُ، وَإِنْ أَقْسَمَ عَلَيْهَا أَبَرَّتْهُ، وَإِنْ غَابَ عَنْهَا نَصَحَتْهُ فِي نَفْسِهَا وَمَالِهِ»[١].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: هیچ شتێک لە دوای تەقوای خوا سوود بە بڕوادار ناگەیەنێ بە ئەندازەی ئافرەتێکی چاک کە ئەگەر فەرمانی پێکرد گوێڕایەڵی بکات و ئەگەر تەماشای کرد (جوانی و خاوێنیەکەی) دڵخۆشی بکات و ئەگەر سوێندی لەسەر خوارد بۆ کارێک جێبەجێی بکات و سوێندی نەشکێنێ (یان ئەگەر داوای سوێند خواردنی لە ژنەکەی کرد ئەوە سوێندی بۆ بخوات، وەکو هەندێ لە ڕاڤەکارانی فەرموودەکە ئاماژەیان پێکردوە)، وە ئەگەر پیاوەکەی لە ماڵ نەبوو، خۆی و ماڵەکەی بپارێزێ.

## بابەت: مارەبڕین و هاوسەرگیری ئافرەتی دیندار

**١٨٥٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ «تُنْكَحُ النِّسَاءُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ، تَرِبَتْ يَدَاكَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت لە پێناو چوار شتدا مارەبڕ دەکرێ (دەخوازرێ)، یان لەبەر ماڵەکەی یان لەبەر نەژاد و بنەماڵەکەی یان لەبەر جوانیەکەی یان لەبەر دینداریەکەی، ئنجا تۆ خاوەن دینەکە هەڵبژێرە، دەستت بە خۆڵدا بچێ.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٩٠، ومسلم: ١٤٦٦، وأبو داود: ٢٠٤٧، والنسائي: ٢٢٣٠.




**تربت يداك: چەمکێکە مەبەستی دوعا نییە، عەرەب بەکاری هێناوە بۆ نکوڵی کردن، یان سەرسوڕمان یان گەورەیی شتەکە، بەپێی شوێن و بەکارهێنانی، جار هەیە بۆ ستایش کردنە و جاریش هەیە سەرزەنشت کردنە.**

**١٨٥٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَزَوَّجُوا النِّسَاءَ لِحُسْنِهِنَّ، فَعَسَى حُسْنُهُنَّ أَنْ يُرْدِيَهُنَّ، وَلَا تَزَوَّجُوهُنَّ لِأَمْوَالِهِنَّ، فَعَسَى أَمْوَالُهُنَّ أَنْ تُطْغِيَهُنَّ، وَلَكِنْ تَزَوَّجُوهُنَّ عَلَى الدِّينِ، وَلَأَمَةٌ خَرْمَاءُ سَوْدَاءُ ذَاتُ دِينٍ أَفْضَلُ»[١].

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت تەنیا بۆ جوانیەکەی مەخوازن، چونکە بۆی هەیە جوانیەکەی ببێتە مایەی شەڕ و ناخۆشی (بە هۆی ئەوەی کە ئافرەتەکە شانازی بەسەردا دەکات و خۆی پێ گەورەترە)، وە هەروەها تەنها بۆ ماڵ و سامان مەیخوازن، بۆی هەیە ببێتە هۆی یاخی بوونی و خۆ هەڵکێشانی بەسەر پیاوەکەدا، بەڵکو بیانخوازن لەبەر بەدینداریيان، وە کەنیزەکێک کە ڕەش بێ و بە شتێ لوتی و گوێی بڕابێ و خاوەن دین و بڕوا بێت باشترە.**

## بابەت: مارەکردن و هێنانی کچ

**١٨٦٠-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَلَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «أَتَزَوَّجْتَ يَا جَابِرُ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «أَبِكْرًا أَوْ ثَيِّبًا؟» قُلْتُ: ثَيِّبًا، قَالَ: «فَهَلَّا بِكْرًا تُلَاعِبُهَا؟» قُلْتُ: كُنَّ لِي أَخَوَاتٌ، فَخَشِيتُ أَنْ تَدْخُلَ بَيْنِي وَبَيْنَهُنَّ، قَالَ: «فَذَاكَ إِذَنْ»[٢].

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ژنم هێنا، بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتم و فەرمووی: ئەی جابیر ئەوە ژنت هێناوە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: کچە یان بێوە ژنە؟ گوتم: بێوە ژنە، فەرمووی: نەدەکرا کچ بووایە بۆ ئەوەی یاری لەگەڵدا بکەی؟ گوتم: من چەند خوشکێکم هەیە، ترسام (کە ئەگەر کچ بێ و مناڵ بێ) شتێک بخاتە نێوانی من و ئەوانەوە، فەرمووی: کەواتە لەبەر ئەوەیە.**

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٠٧٩، ومسلم بإثر: ١٤٦٦، وأبو داود: ٢٠٤٨، والترمذي: ١١٠٠، والنسائي: ٣٢١٩ و ٣٢٢٠ و ٣٢٢٦.

١٨٦١- عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَالِمِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ عُوَيْمِ بْنِ سَاعِدَةَ الْأَنْصَارِيُّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالْأَبْكَارِ، فَإِنَّهُنَّ أَعْذَبُ أَفْوَاهًا، وَأَنْتَقُ أَرْحَامًا، وَأَرْضَى بِالْيَسِيرِ»[١].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سالیمی کوڕی عوتبەی کوڕی عوەیمی کوڕی ساعیدەی ئەنصاریی ﷺ لە باوکییەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتی کچ بخوازن و بیهێنن، چونکە ئەوان قسەیان شیرین و خۆشترە، وە باشترن بۆ منداڵ خستنەوە، وە ڕەزامەندییان بە شتی کەم و ئاسان زیاترە.

## بابەت: مارەکردنی ئافرەتی ئازاد کە زۆر منداڵ دەخاتەوە

١٨٦٢- عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ مُزَاحِمٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ أَرَادَ أَنْ يَلْقَى اللَّهَ طَاهِرًا مُطَهَّرًا، فَلْيَتَزَوَّجِ الْحَرَائِرَ»[٢].

واتە: زەحاکی کوڕی موزاحیم دەڵێ: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیک بوو ﷺ دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک دەیەوێ بە پاک و بێگەردی بە خوا بگات، با ئافرەتی ئازاد بکاتە هاوسەری خۆی.

١٨٦٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «انْكِحُوا، فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمْ»[٣].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ژن بهێنن (وە مناڵ بخەنەوە)، بێگومان من شانازی دەکەم بە زۆریتانەوە.

## بابەت: ڕوانین بۆ ئافرەت ئەگەر مەبەست هاوسەگیری لەگەڵ کردنی بێ

١٨٦٤- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مَسْلَمَةَ ﷺ، قَالَ: خَطَبْتُ امْرَأَةً، فَجَعَلْتُ أَتَخَبَّأُ لَهَا، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَيْهَا فِي نَخْلٍ لَهَا، فَقِيلَ لَهُ: أَتَفْعَلُ هَذَا وَأَنْتَ صَاحِبُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِذَا أَلْقَى اللَّهُ فِي قَلْبِ امْرِئٍ خِطْبَةَ امْرَأَةٍ، فَلَا بَأْسَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَيْهَا»[٤].

---

(١) حسن لغيره.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.

(٤) صحيح لغيره.

واتە: موحەممەدی کوڕی مەسلەمە ﷺ دەڵێ: خوازبێنی ئافرەتێکم کرد، سەرەتا چووم لەناو باخێکی خورما خۆم شاردەوە بۆ ئەوەی بتوانم تەماشای بکەم، ئنجا پێیان گوت: لە کاتێکدا کە تۆ هاوەڵی پێغەمبەری خوای ﷺ چۆن ئەو کارە دەکەی؟ ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر خوا خستییە دڵی کەسێکەوە کە داخوازی ئافرەتێک بکات، هیچ کێشەیەک نیە کە تەماشای بکات.

١٨٦٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ أَرَادَ أَنْ يَتَزَوَّجَ امْرَأَةً، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا» فَفَعَلَ، فَتَزَوَّجَهَا، فَذَكَرَ مِنْ مُوَافَقَتِهَا[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ ویستی داخوازی ئافرەتێک بکات، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: بچۆ تەماشای بکە، ئەوە باشترینە بۆ ئەوەی (لە هاوسەرگیریەکە) سەرکەوتو و بەردەوام بن، ئنجا ڕۆیشت ئەو کارەی کرد (واتە: تەماشای کرد)، مارەم بڕی، دواتر باسی ئەوەی کرد کە سەرکەوتوو بوون.

١٨٦٦- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ لَهُ امْرَأَةً أَخْطُبُهَا، فَقَالَ: «اذْهَبْ فَانْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهُ أَجْدَرُ أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا» فَأَتَيْتُ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ، فَخَطَبْتُهَا إِلَى أَبَوَيْهَا، وَأَخْبَرْتُهُمَا بِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ، فَكَأَنَّهُمَا كَرِهَا ذَلِكَ، قَالَ: فَسَمِعَتْ ذَلِكَ الْمَرْأَةُ، وَهِيَ فِي خِدْرِهَا، فَقَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَمَرَكَ أَنْ تَنْظُرَ، فَانْظُرْ، وَإِلَّا فَأَنْشُدُكَ، كَأَنَّهَا أَعْظَمَتْ ذَلِكَ، قَالَ: فَنَظَرْتُ إِلَيْهَا فَتَزَوَّجْتُهَا، فَذَكَرَ مِنْ مُوَافَقَتِهَا[2].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و باسی ئافرەتێکم بۆی کرد کە دەمویست بچمە خوازبێنی، ئەویش فەرمووی: بڕۆ تەماشای بکە، چونکە ئەوە شایەن و باشترە بۆ ئەوەی کە (هاوسەرگیرییەکە) بەردەوام و هەمیشەیی بێ، منیش هاتم بۆ لای ئافرەتەکە کە لە ئەنصارییەکان بوو، داخوازیم لە دایک و باوکی کرد و ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەریشم پێ ڕاگەیاندن (کە فەرمووی: تەماشای بکە)، وەک بڵێی ئەوانیش بەلایانەوە زەحمەت بوو، گوتی: ئەو ئافرەتە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٨٧، والنسائي: ٣٢٣٥.




لە ژوورەکەی خۆی گوێی لە قسەکان بوو، (ئافرەتەکە) گوتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووی تەماشا بکە، ئەگەرنا بە خوا سوێندت دەدەم (ئەگەر ئەو فەرمانی نەکردبێ نابێ)، وەک ئەوەی بڵێی بەڕاستی ئەو تەماشا کردنەی پێ کارێکی گران بوو (ئەگەر فەرمانی پێغەمبەری خوای ﷺ لەسەر نەبێ)، گوتی منیش تەماشام کرد و دواتر مارەم بڕی و هێنام، ئنجا باسی ئەوەی کرد کە سەرکەوتوو بووە (لە هاوسەرگیرییەکەداو پێکەوە گونجاو بوون).

## بابەت: ئەوەی کە نابێ برای مسوڵمان داخوازی لەسەر داخوازی برای مسوڵمانی بکات

**١٨٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَخْطُبِ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاو داخوازی لەسەر داخوازی براکەی ناکات (واتە: نابێ بکرێ، تاکو کەسی یەکەم وەڵام نەدرێتەوە و دڵنیانەبێتەوە).

**١٨٦٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَخْطُبِ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاو داخوازی بەسەر داخوازی براکەیدا ناکات.

**١٨٦٩-** عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي الْجَهْمِ بْنِ صُخَيْرٍ الْعَدَوِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ ﷺ، تَقُولُ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِي»، فَآذَنْتُهُ، فَخَطَبَهَا مُعَاوِيَةُ، وَأَبُو الْجَهْمِ بْنُ صُخَيْرٍ، وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَّا مُعَاوِيَةُ فَرَجُلٌ تَرِبٌ لَا مَالَ لَهُ، وَأَمَّا أَبُو الْجَهْمِ فَرَجُلٌ ضَرَّابٌ لِلنِّسَاءِ، وَلَكِنْ أُسَامَةُ»، فَقَالَتْ بِيَدِهَا هَكَذَا: أُسَامَةُ، أُسَامَةُ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طَاعَةُ اللَّهِ وَطَاعَةُ رَسُولِهِ خَيْرٌ لَكِ»، قَالَتْ: فَتَزَوَّجْتُهُ فَاغْتَبَطْتُ بِهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤٠، ومسلم: ١٤١٣، وأبو داود: ٢٠٨٠، والترمذي: ١١٣٤، والنسائي: ٣٢٣٩ و ٣٢٤٠ و ٣٢٤٢ و ٤٥٠٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٣٩ و ٥١٤٢، ومسلم: ١٤١٢، وأبو داود: ٢٠٨١، والترمذي: ١٢٩٢، والنسائي: ٣٢٣٨ و ٣٢٤٣.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٧ و ١٤٨٠/٤٨، وأبو داود: ٢٢٨٤، والترمذي: ١١٣٥، والنسائي: ٣٤١٨ و ٣٥٥١.

واتە: ئەبو بەکری کوڕی ئەبو جەهمی کوڕی صوخەیری عەدەویی دەڵێ: گوێم لە فاتیمەی کچی قەیس ﵂ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: هەرکات عیددەت بەسەرچوو ئامادەی شوکردن بووی پێم بڵێ، ئنجا منیش پێم گوت، جا موعاویە و ئەبو جەهمی کوڕی صوخەیر و ئوسامەی کوڕی زەید داخوازییان کردبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: موعاویە کەسێکی هەژارەو ماڵ و سامانی نیە، وە ئەبو جەهمیش پیاوێکە زۆر زاڵە و لە ئافرەتان دەدات، بەڵام ئوسامە، (فاتیمە) بەدەستی ئاماژەی کرد و گوتی: ئوسامە، ئوسامە (وەک بڵێی پێی ڕازی بوو)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ باشترە بۆ تۆ، دەڵێ: منیش شووم بە ئوسامە کرد، (ئیتر لەمەودوا) خەڵکی خۆزگەیان پێدەخواستم (لەبەر باشی ئوسامە بۆ من).

## بابەت: ڕاوێژ و پرسکردن بە کچ و بێوەژن

**١٨٧٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأَيِّمُ أَوْلَى بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْمَرُ فِي نَفْسِهَا» قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ الْبِكْرَ تَسْتَحْيِي أَنْ تَتَكَلَّمَ، قَالَ: «إِذْنُهَا سُكُوتُهَا»[1].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن لەپێشترە بۆ مافی خۆی لە وەلییەکە (سەرپەرشتیارەکەی)، وە کچیش پرس و ڕاوێژ بە خۆی دەکرێ، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان کچ شەرم دەکات کە قسە بکات (کاتێ پرسی پێدەکرێ بۆ بە شوودان)، فەرمووی: بێدەنگ بوونی (بەبێ هۆ) مانای ڕەزامەندییەتی.

**١٨٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا تُنْكَحُ الثَّيِّبُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلَا الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، وَإِذْنُهَا الصُّمُوتُ»[2].**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٢١، وأبو داود: ٢٠٩٨ و ٢١٠٠، والترمذي: ١١٠٨، والنسائي: ٣٢٦٠ و ٣٢٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٣٦، ومسلم: ١٤١٩، وأبو داود: ٢٠٩٢، والترمذي: ١١٠٧، والنسائي: ٣٢٦٥ و ٣٢٦٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن بەبێ پرس کردن و بڕیاردانی ڕاستەوخۆ لەلایەن خۆیەوە مارە ناکرێ، وە کچیش بەبێ مۆڵەت لێوەرگرتنی مارە ناکرێ، وە مۆڵەتدانی کچ بێدەنگ بوونیەتی.

١٨٧٢- عَنْ عَدِيِّ بْنِ عَدِيٍّ الْكِنْدِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الثَّيِّبُ تُعْرِبُ عَنْ نَفْسِهَا، وَالْبِكْرُ رِضَاهَا صَمْتُهَا»[١].

واتە: عەدی کوڕی عەدی کیندیی ﷺ لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێوەژن دەبێ ڕازی بوونی خۆی دەربڕێ و ئاشکرا بکات، وە کچیش بێدەنگ بوونەکەی ڕازی بوونە.

## بابەت: ئەوەی کچەکەی
## بە شوو بدات و کچەکەش پێی ناخۆش بێ

١٨٧٣- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ يَزِيدَ، وَمُجَمِّعَ بْنَ يَزِيدَ الْأَنْصَارِيَّيْنِ، أَخْبَرَاهُ: «أَنَّ رَجُلًا مِنْهُمْ يُدْعَى خِذَامًا أَنْكَحَ ابْنَةً لَهُ، فَكَرِهَتْ نِكَاحَ أَبِيهَا، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَتْ لَهُ، فَرَدَّ عَلَيْهَا نِكَاحَ أَبِيهَا» فَنَكَحَتْ أَبَا لُبَابَةَ بْنَ عَبْدِ الْمُنْذِرِ وَذَكَرَ يَحْيَى «أَنَّهَا كَانَتْ ثَيِّبًا»[٢].

واتە: یەحیای کوڕی سەعید دەگێڕێتەوە، قاسمی کوڕی موحەممەد هەواڵی پێداوە کە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید و موجەمیعی کوڕی یەزید کە هەردووکیان ئەنصارین هەواڵیان پێی داوە: کە پیاوێکی ئەنصاری پێیان دەگوت خیزام کچەکەی خۆی مارە بڕی بوو لە کاتێکدا کە کچەکە ئەو مارە بڕینەی باوکی پێناخۆش بوو، جا (ئافرەتەکە) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و باسەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش مارە بڕینەکەی باوکی لەسەر لابرد، ئنجا (ئەو ئافرەتە) شووی بە ئەبو لوبابەی کوڕی عەبدولمونزیر کرد، وە یەحیا (کە ڕاوی فەرموودەکەیە) باسی لەوە کرد کە ئافرەتەکە بێوەژن بوو.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٣٨ و ٦٩٤٥ و ٦٩٦٩، وأبو داود: ٢١٠١، والنسائي: ٣٢٦٨.

**١٨٧٤- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: جَاءَتْ فَتَاةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: «إِنَّ أَبِي زَوَّجَنِي ابْنَ أَخِيهِ، لِيَرْفَعَ بِي خَسِيسَتَهُ، قَالَ: فَجَعَلَ الْأَمْرَ إِلَيْهَا، فَقَالَتْ: قَدْ أَجَزْتُ مَا صَنَعَ أَبِي، وَلَكِنْ أَرَدْتُ أَنْ تَعْلَمَ النِّسَاءُ أَنْ لَيْسَ إِلَى الْآبَاءِ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ»[١].**

**واتە: ئیبنو بورەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: کچێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: باوکم منی لە برازاکەی خۆی مارەکردوە بۆئەوەی بەهۆی منەوە سەری بەرزبکاتەوە، ڕاوی گوتی: پێغەمبەر ﷺ بڕیارەکەی بۆ کچەکە گێڕایەوە (کە دەتوانێ ڕازی نەبێ)، جا کچەکە گوتی: لە ڕاستیدا مۆڵەتم داوە بەوەی کە باوکم کردوویەتی، بەڵام ویستم ئافرەتان بزانن کە باوکەکان ناتوانن هیچ بڕیارێک لەسەر کچەکانیان بدەن (بەبێ ڕەزامەندی ئەوان).**

**١٨٧٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ جَارِيَةً بِكْرًا أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَتْ لَهُ أَنَّ «أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ، فَخَيَّرَهَا النَّبِيُّ ﷺ»[٢].**

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، کچێکی گەنج هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئنجا باسی ئەوەی بۆ کرد کە باوکی بە شووی داوە لە کاتێکدا کە ئەو بۆ خۆی پێی خۆش نیە و ڕازی نیە، ئنجا پێغەمبەر بڕیارەکەی دایە دەست خۆیی (بە ڕازی بوون و ڕازی نەبوون).**

**١٨٧٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّبَّاحِ قَالَ: أَنْبَأَنَا مُعَمَّرُ بْنُ سُلَيْمَانَ الرَّقِّيُّ، عَنْ زَيْدِ بْنِ حَبَّانَ، عَنْ أَيُّوبَ السَّخْتِيَانِيِّ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ[٣].**

**واتە: ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.**

## بابەت: بە شوودانی کچی بچووک لەلایەن باوکیانەوە

**١٨٧٦- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا بِنْتُ سِتِّ سِنِينَ، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، فَنَزَلْنَا فِي بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، فَوُعِكْتُ، فَتَمَرَّقَ شَعَرِي حَتَّى وَفَى لَهُ جُمَيْمَةٌ، فَأَتَتْنِي أُمِّي أُمُّ**

---

(١) ضعيف شاذ.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٩٦ و ٢٠٩٧.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٩٦ و ٢٠٩٧.





رُومَانَ، وَإِنِّي لَفِي أُرْجُوحَةٍ وَمَعِي صَوَاحِبَاتٌ لِي، فَصَرَخَتْ بِي، فَأَتَيْتُهَا وَمَا أَدْرِي مَا تُرِيدُ، فَأَخَذَتْ بِيَدِي فَأَوْقَفَتْنِي عَلَى بَابِ الدَّارِ، وَإِنِّي لَأَنْهَجُ حَتَّى سَكَنَ بَعْضُ نَفَسِي، ثُمَّ أَخَذَتْ شَيْئًا مِنْ مَاءٍ فَمَسَحَتْ بِهِ عَلَى وَجْهِي وَرَأْسِي، ثُمَّ أَدْخَلَتْنِي الدَّارَ، فَإِذَا نِسْوَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ فِي بَيْتٍ، فَقُلْنَ: عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ، وَعَلَى خَيْرِ طَائِرٍ، فَأَسْلَمَتْنِي إِلَيْهِنَّ، فَأَصْلَحْنَ مِنْ شَأْنِي، فَلَمْ يَرُعْنِي إِلَّا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ضُحًى، فَأَسْلَمَتْنِي إِلَيْهِ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ»[1].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ منی مارە کرد شەش ساڵان بووم، ئنجا هاتین بۆ مەدینە و لەناو هۆزی نەوەی حارسی کوڕی خەزرەج دابەزین، منیش تووشی لەرز و تا هاتبووم و قژم هەڵوەریبوو، دوای ماوەیەک بەشی پەلکۆڵەیەکی لێ پەیدا ببوو، جا کاتێک کە لەگەڵ هاوڕێکانم جۆلانێم دەکرد دایکم ئومو ڕومان هات بۆ لام و بانگی کردم، منیش بێئەوەی بزانم چی دەوێ چووم بۆ لای، ئنجا دەستی گرتم و لەبەر دەرگای ماڵ ڕایگرتم، وە منیش هەناسە بڕکێم بوو (ماندوو ببووم) تاکو کەمێک هەناسە بڕکێکەم ئارام بۆوە، پاشان هەندێ ئاوی هەڵگرت و دەم و چاو و سەرمی مەسح کرد، پاشان بردمیە ناو ماڵەکە، بینیم کۆمەڵێ ئافرەتی ئەنصاری لێیە، ئەوانیش گوتیان: لەسەر خێر و بەرەکەت بێ و بە بەختی باش بێ، ئیتر منی دایە دەستی ئەوان، ئنجا ئەوانیش پۆشاک و سەر و پرچیان ڕێکخستم، لەوکاتەی چێشتەنگاودا نەمزانی تاکو لە ناکاو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایچڵەکاندم، ئیتر منیان دایە دەستی ئەو، لەوکاتەدا من نۆ ساڵان بووم.

**١٨٧٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «تَزَوَّجَ النَّبِيُّ ﷺ عَائِشَةَ ﷺ وَهِيَ بِنْتُ سَبْعٍ، وَبَنَى بِهَا وَهِيَ بِنْتُ تِسْعٍ، وَتُوُفِّيَ عَنْهَا وَهِيَ بِنْتُ ثَمَانِي عَشْرَةَ سَنَةً»[2].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە عائیشەی ﷺ مارە بڕی لە تەمەنی شەش ساڵیدا بوو، وە لە نۆ ساڵیدا گواستییەوە، وە کاتێک پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد عائیشە ﷺ تەمەنی هەژدە ساڵ بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨٩٤، ومسلم: ١٤٢٢، وأبو داود: ٤٩٣٣، والنسائي مقطعاً ومختصراً: ٣٢٥٥ و ٣٢٥٨ و ٣٣٨٧ و ٣٣٧٩.

(٢) صحيح.

## بابەت: بە شوودانی کچی گچکە لەلایەن جگە لە باوکیانەوە

**١٨٧٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، «أَنَّهُ حِينَ هَلَكَ عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ تَرَكَ ابْنَةً لَهُ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَزَوَّجَنِيهَا خَالِي قُدَامَةُ، وَهُوَ عَمُّهَا، وَلَمْ يُشَاوِرْهَا، وَذَلِكَ بَعْدَ مَا هَلَكَ أَبُوهَا، فَكَرِهَتْ نِكَاحَهُ، وَأَحَبَّتِ الْجَارِيَةُ أَنْ يُزَوِّجَهَا الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ، فَزَوَّجَهَا إِيَّاهُ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، کاتێک عوسمانی کوڕی مەزعون مرد، کچێکی لە دوای خۆی جێهێشت، ئیبنو عومەر دەڵێ: قودامەی خاڵم ئەو کچەی لێ مارە کردم کە مامی کچەکەش بوو، وە پرس و ڕاوێژی پێنەکرد، ئەوەش لە دوای ئەوە بوو کە باوکی مرد، جا مارەکردنەکەی پێ خۆش نەبوو، کچەکە پێی خۆش بوو کە لە موغیرەی کوڕی شوعبە مارە ببڕێ، ئەویش لە ئەوی مارەی کرد (دوای هەڵوەشاندنەوەی مارەکردنی یەکەم).

## بابەت: هاوسەرگیری دروست نیە بەبێ سەرپەرشتیار

**١٨٧٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ لَمْ يُنْكِحْهَا الْوَلِيُّ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ، فَإِنْ أَصَابَهَا، فَلَهَا مَهْرُهَا بِمَا أَصَابَ مِنْهَا، فَإِنِ اشْتَجَرُوا، فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لَا وَلِيَّ لَهُ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێک کە سەرپەرشتیارەکەی مارەی نەبڕێ، هاوسەرگیریەکە دانەمەزراوە، هاوسەرگیریەکە دانەمەزراوە، ئەگەر مارەی بڕی و چووە لای، مارەیی دەکەوێتە سەر ئەو کەسە، بە هۆی چوونە لای ئافرەتەکە (لەگەڵ ئەوەشدا کە مارە بڕینەکە دانامەزرێ بەپێی ئەم فەرموودەیە)، ئەگەر کێشە کەوتە نێوانیان، فەرمانڕەوا سەرپەرشتیاری هەر کەسێکە کە سەرپەرشتیاری نەبێ.

**١٨٨٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وعَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ» وَفِي حَدِيثِ عَائِشَةَ: «وَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لَا وَلِيَّ لَهُ»[٣].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٨٣، والترمذي: ١١٠٢.

(٣) صحيح لغيره.

واتە: عائیشە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، هەروەها عیکریمە لە ئیبنو عەبباس دەگێڕنەوە و دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوسەرگیری دانامەزرێ بەبێ سەرپەرشتیار، وە لە فەرموودەکەی عائیشەدا ئەوەش هاتووە: فەرمانڕەوا سەرپەرشتیاری هەر کەسێکە کە سەرپەرشتیاری نەبێ.

١٨٨١- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ»[١].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوسەرگیری دانامەزرێ بەبێ سەرپەرشتیار.

١٨٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُزَوِّجُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ، وَلَا تُزَوِّجُ الْمَرْأَةُ نَفْسَهَا، فَإِنَّ الزَّانِيَةَ هِيَ الَّتِي تُزَوِّجُ نَفْسَهَا»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نابێ ئافرەت ئافرەتێکیتر بە شوو بدات، وە نابێ بۆ خۆی خۆی بە شوو بدات بە کەسێکیتر، لەڕاستیدا ئافرەتی زیناکار ئەو ئافرەتەیە کە بۆ خۆی خۆی بە شوو دەدات.

## بابەت: قەدەغەکردنی ژن بە ژنە

١٨٨٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الشِّغَارِ، وَالشِّغَارُ أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: زَوِّجْنِي ابْنَتَكَ أَوْ أُخْتَكَ، عَلَى أَنْ أُزَوِّجَكَ ابْنَتِي أَوْ أُخْتِي، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ژن بە ژنەی قەدەغە کردوە، ژن بە ژنەش ئەوەیە کە پیاوێک بە پیاوێک بڵێ: کچەکەی خۆت، یان خوشکەکەتم لێ مارە بکە، لە بری ئەوە کە منیش کچەکەی خۆم یان خوشکەکەمت لێ مارە دەکەم، وە هیچ مارەییان لە نێواندا نیە.

١٨٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الشِّغَارِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٨٥، والترمذي: ١١٠١.

(٢) صحيح لغيره دون جملة الزانية.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١١٢، ومسلم: ١٤١٥، وأبو داود: ٢٠٧٤، والترمذي: ١١٢٤، والنسائي: ٣٣٣٤ و ٣٣٣٧.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤١٦، والنسائي: ٣٣٣٨.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە ژن بە ژنەو حەڕامی کردوە.

**١٨٨٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا شِغَارَ فِي الْإِسْلَامِ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ژن بە ژنی (بەبێ مارەیی) نیە لە ئیسلامدا.

## بابەت: مارەیی ئافرەتان

**١٨٨٦-** عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ: كَمْ كَانَ صَدَاقُ نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَتْ: «كَانَ صَدَاقُهُ فِي أَزْوَاجِهِ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً وَنَشًا، هَلْ تَدْرِي مَا النَّشُّ؟ هُوَ نِصْفُ أُوقِيَّةٍ، وَذَلِكَ خَمْسُمِائَةِ دِرْهَمٍ»(٢).

واتە: ئەبو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﷺ: مارەیی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ چەند بوو؟ گوتی: مارەیی خێزانەکانی دوازدە ئۆقیە و نیو بوو، (گوتی:) دەزانی نەش چییە؟ نیو ئۆقیەیە، وە ئەوەش دەبێتە پێنج سەد درهەم.

**أوقية:** چل درهەمە.

**نش:** بیست درهەمە.

**١٨٨٧-** عَنْ أَبِي الْعَجْفَاءِ السُّلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ: «لَا تُغَالُوا صَدَاقَ النِّسَاءِ، فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَكْرُمَةً فِي الدُّنْيَا، أَوْ تَقْوَى عِنْدَ اللَّهِ، كَانَ أَوْلَاكُمْ وَأَحَقَّكُمْ بِهَا مُحَمَّدٌ ﷺ، مَا أَصْدَقَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ، وَلَا أُصْدِقَتِ امْرَأَةٌ مِنْ بَنَاتِهِ أَكْثَرَ مِنَ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُثَقِّلُ صَدَقَةَ امْرَأَتِهِ حَتَّى يَكُونَ لَهَا عَدَاوَةٌ فِي نَفْسِهِ، وَيَقُولُ: قَدْ كَلِفْتُ إِلَيْكِ عَلَقَ الْقِرْبَةِ، أَوْ عَرَقَ الْقِرْبَةِ» وَكُنْتُ رَجُلًا عَرَبِيًّا مَوْلِدًا، مَا أَدْرِي مَا عَلَقُ الْقِرْبَةِ، أَوْ عَرَقُ الْقِرْبَةِ(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٢٦، وأبو داود: ٢١٠٥، والنسائي: ٣٣٤٧.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٠٦، والترمذي: ١١١٤م، والنسائي: ٣٣٤٩.

واتە: ئەبو عەجفائی سولەمیی ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: زێدەڕۆیی مەکەن لە مارەیی ئافرەتەکاندا، ئەگەر ئەو زێدەڕۆییە ڕێز و شکۆ بووایە لە دونیادا، یان هۆی پارێزکاری و تەقوای خوا بووایە، لە پێشترین کەس لە ئێوە موحەممەد ﷺ بوو، (لەگەڵ ئەوەشدا) هیچ یەکێک لە کچەکانی لە دوازدە ئۆقیە زیاتر مارەیی نەبووە، وە بێگومان پیاو مارەیی ئەوەندە لەسەر قورس دەبێ تاکو دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە ببێتە هۆی ئەوەی پیاوەکەی لە دەروونیدا دوژمنایەتی بکات، وە دەڵێ: بەوپەڕی ماندوویمەوە خۆم پێتەوە ماندوو کرد، بەجۆرێک وەکو ئەوەی کە کوندە ئارەق بکات، (ڕاوی دەڵێ:) من لەناو عەرەبدا لەدایک بووم و بە عەرەبی لەدایک بووم، بەڵام نازانم «عَلَقُ الْقِرْبَةِ، أَوْ عَرَقُ الْقِرْبَةِ» واتای چی.

«عَلَقُ الْقِرْبَةِ، أَوْ عَرَقُ الْقِرْبَةِ»: ئەو دەستەواژەیە بۆ فەرمانێک، یان کارێکی قورس و گران بەکاردێ، کە قورسییەکەی نزیک بێت لە مەحاڵ، هەروەکو چۆن ئەستەمە کوندەی ئاو ئارەق بکات!!

**١٨٨٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، «أَنَّ رَجُلًا مِنْ بَنِي فَزَارَةَ تَزَوَّجَ عَلَى نَعْلَيْنِ، فَأَجَازَ النَّبِيُّ ﷺ نِكَاحَهُ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پیاوێک لە هۆزی بەنی فەزارە ژنی مارە کردبوو لەسەر مارەیی دوو نەعل، ئنجا پێغەمبەریش ﷺ مارەکردنەکەی ڕێگەپێدا.

**١٨٨٩-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ يَتَزَوَّجُهَا؟» فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أَعْطِهَا وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ» فَقَالَ: لَيْسَ مَعِي، قَالَ: «قَدْ زَوَّجْتُكَهَا عَلَى مَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ»[2].

واتە: سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: ئافرەتێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: کێ مارەی دەکات؟ جا پیاوێک گوتی: من، ئنجا پێغەمبەر ﷺ پێی

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١١١٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣١٠، ومسلم: ١٤٢٥، وأبو داود: ٢١١١، والترمذي: ١١١٤، والنسائي: ٣٢٠٠ و ٣٢٨٠ و ٣٣٥٩.

فەرمووی: شتێکی پێبدە (وەک مارەیی) ئەگەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ، ئەویش گوتی: هیچم نیە، فەرمووی: کەواتە ئەوە مارەم بڕی لەتۆ لەسەر ئەوەی کە فێری ئەوەندە قوڕئانەی بکەی کە دەیزانی.

١٨٩٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَزَوَّجَ عَائِشَةَ عَلَى مَتَاعِ بَيْتٍ قِيمَتُهُ خَمْسُونَ دِرْهَمًا»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ عائیشەی مارەبڕی لەسەر کەل و پەلی ماڵ کە نرخەکەی دەگەیشتە پەنجا درهەم.

## بابەت: پیاو ئافرەتێک مارە بکات، مارەیی بۆ دیاری نەکات و پیاوەکە بمرێ

١٨٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً فَمَاتَ عَنْهَا، وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا، وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا، قَالَ: فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: «لَهَا الصَّدَاقُ، وَلَهَا الْمِيرَاثُ، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ» فَقَالَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ الْأَشْجَعِيُّ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ بِمِثْلِ ذَلِكَ[٢].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیاری لێکراوە دەربارەی پیاوێک کە ئافرەتێک مارە بکات، پێش ئەوەی بچێتە لای و بمرێ (واتە: نەیگواستبێتەوە)، وە مارەییشی بۆ دیاری نەکردبێ، عەبدوڵڵاش گوتوویەتی: ئافرەتەکە مارەیی و میراتی دەکەوێ لەو پیاوە، وە عیدەشی لەسەرە، ئنجا مەعقیلی کوڕی سینانی ئەشجەعی دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم کە بەو شێوەیە بڕیاریدا لەسەر بیروەعی کچی واشیق.

١٨٩١م- حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ عَلْقَمَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ مِثْلَهُ[٣].

واتە: ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١١٤، والترمذي: ١١٤٥، والنسائي: ٣٣٥٥ و ٣٣٥٦_٣٣٥٨ و ٣٥٢٤.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١١٤، والترمذي: ١١٤٥، والنسائي: ٣٣٥٥ و ٣٣٥٦_٣٣٥٨ و ٣٥٢٤.

## بابەت: وتاردانی کاتی مارەبڕین

١٨٩٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: أُوتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَوَامِعَ الْخَيْرِ، وَخَوَاتِمَهُ، أَوْ قَالَ: فَوَاتِحَ الْخَيْرِ، فَعَلَّمَنَا خُطْبَةَ الصَّلَاةِ، وَخُطْبَةَ الْحَاجَةِ، خُطْبَةُ الصَّلَاةِ: «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ» وَخُطْبَةُ الْحَاجَةِ: «أَنِ الْحَمْد لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ تَصِلُ خُطْبَتَكَ بِثَلَاثِ آيَاتٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ ﴿١٠٢﴾﴾ آل عمران، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ﴿١﴾﴾ النساء، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ﴿٧١﴾﴾ الأحزاب، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی پێ بەخشرابوو کە وتەکانی پڕ مانا و سەرەنجامی خێر و چاکەیان هەبوو، یان کلیلی چاکە بوون، ئنجا فێری وتار و دەستپێکی نوێژ و هەم وتاری داواکردنی پێویستییەکانی کردبووین، وتاری نوێژ بریتی بوو لە: «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»، وە وتاری کاتی پێویستی بریتی بوو لە: «أَنِ الْحَمْد لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»، پاشان گەیاندن و لکاندنی وتارەکە بە سێ ئایەت لە قورئان: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ ﴿١٠٢﴾﴾ آل عمران، واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە بترسن لە خوا ترسانێک کە شیاوێتی. تا کۆتایی ئایەتەکە، ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ﴿١﴾﴾ النساء، واتە: خۆتان بپارێزن لەو خوایەی کە بەناوی ئەوەوە داوا دەکەن لە یەکتر.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١١٠٥ واقتصر: أبو داود: ٢١١٨، والنسائي: ١٤٠٤ علي التشهد في الحاجة.

تا کۆتایی ئایەتەکە. ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ﴿٧١﴾﴾ الأحزاب، واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و پارێزکار بن وقسەی ڕاست و دروست بکەن ﴿٧٠﴾ کردەوەکانتان چاك دەکات ولەتاوانەکانتان خۆش دەبێت تا کۆتایی ئایەتەکە ﴿٧١﴾.

١٨٩٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ، وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، أَمَّا بَعْدُ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە، سوپاس و ستایشی خوا دەکەین وە داوای یارمەتی هەر لەو دەکەین، پەنادەگرین بە خوا لە و خراپانەی کە لەلایەن خۆمانەوەیە، وە پەنادەگرین بەخوا لە کردەوەی ناشیرینمان، کەسێک خوا ڕێنوێنی بدات هیچ کەس ناتوانێ گومڕای بکات، وە ئەگەر بیەوێ کەسێ گومڕا بکات ئەو کەسە هیچ ڕێنوێنێکی دەست ناکەوێ، وە شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا تاکەو، هیچ هاوبەشێکی نیە، وە موحەممەد ﷺ بەندە و نێردراوی ئەوە، پاش ئەوە (ئنجا دەست بەو بابەتە دەکات کە دەیەوێ قسەی لەسەر بکات).

١٨٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ أَمْرٍ ذِي بَالٍ، لَا يُبْدَأُ فِيهِ بِالْحَمْدِ، أَقْطَعُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کارێک بە «الحمد لله» سوپاس و ستایشی خوا دەست پێنەکات، بێ فەڕو بەرەکەتە.

## بابەت: ئاشکراکردنی مارەبڕین

١٨٩٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَعْلِنُوا هَذَا النِّكَاحَ، وَاضْرِبُوا عَلَيْهِ بِالْغِرْبَالِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٦٨، والنسائي: ٣٢٧٨.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٨٤٠.

(٣) ضعيف إلا الإعلان. أخرجه الترمذي: ١٠٨٩.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ژنهێنان و شووکردن ئاشکرا بکەن و دەفی تێدا لێبدەن (تاکو ئاشکراو دیاربێ، خەڵکی پێی بزانن).

**١٨٩٦-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ حَاطِبٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَصْلٌ بَيْنَ الْحَلَالِ وَالْحَرَامِ، الدُّفُّ وَالصَّوْتُ فِي النِّكَاحِ»[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی حاتیب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی کە نێوانی هاوسەرگیری حەڵاڵ و حەڕام جیادەکاتەوە دەف لێدان و ئاشکراکردن و ڕاگەیاندنیەتی.

## بابەت: گۆرانی گوتن و دەف لێدان

**١٨٩٧-** عَنْ أَبِي الْحُسَيْنِ اسْمُهُ خَالِد الْمَدَنِيُّ ﵁، قَالَ: كُنَّا بِالْمَدِينَةِ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَالْجَوَارِي يَضْرِبْنَ بِالدُّفِّ، وَيَتَغَنَّيْنَ، فَدَخَلْنَا عَلَى الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ، فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهَا، فَقَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَبِيحَةَ عُرْسِي، وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ يَتَغَنَّيَانِ، وَتَنْدُبَانِ آبَائِي الَّذِينَ قُتِلُوا يَوْمَ بَدْرٍ، وَتَقُولَانِ، فِيمَا تَقُولَانِ: وَفِينَا نَبِيٌّ يَعْلَمُ مَا فِي غَدِ، فَقَالَ: «أَمَّا هَذَا فَلَا تَقُولُوهُ، مَا يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلَّا اللَّهُ»[2].

واتە: ئەبولـحوسەین کە ناوی خالیدی مەدەنی بوو دەڵێ: لە ڕۆژی عاشوردا لە مەدینە بووین، لەوکاتەدا کەنیزەکەکان دەفیان لێدەدا و گۆرانیان دەگوت، ئێمەش چووین بۆ لای ڕوبەیعی کچی موعەویز و باسەکەمان بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی ڕۆژی بوکێنیم هات بۆ لام، لەوکاتەدا دوو کەنیزەکم لابوون گۆرانیان دەگوت، بە باوانی منیاندا هەڵدەدا کە لە بەدردا کوژرابوون، وە لە گوتنەکەیاندا ئەوەشیان دەگوت: پێغەمبەرێک لەناوماندایە کە ئاگاداری سبەینێشە، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ئەوەیان مەڵێن، چونکە ئەوەی کە بەیانی ڕوودەدات تەنها خوا دەیزانێ، (واتە: زانینی غەیب تەنها تایبەتە بە خوا، تەنانەت پێغەمبەرەکەشی ﷺ نایزانێ).

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ١٠٨٨، والنسائي: ٣٣٦٩ و ٣٣٧٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٠١، وأبو داود: ٤٩٢٢، والترمذي: ١٠٩٠.

١٨٩٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ أَبُو بَكْرٍ، وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ مِنْ جَوَارِي الْأَنْصَارِ تُغَنِّيَانِ بِمَا تَقَاوَلَتْ بِهِ الْأَنْصَارُ فِي يَوْمِ بُعَاثٍ، قَالَتْ: وَلَيْسَتَا بِمُغَنِّيَتَيْنِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَبِمَزْمُورِ الشَّيْطَانِ فِي بَيْتِ النَّبِيِّ ﷺ؟ وَذَلِكَ فِي يَوْمِ عِيدِ الْفِطْرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا بَكْرٍ، إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيدًا، وَهَذَا عِيدُنَا»[1].

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: جارێکیان ئەبو بەکر هاتە لام (لە ماڵەکەی خۆم) لەوکاتەدا دوو کەنیزەک لە کەنیزەکە ئەنصارییەکانم لەلا بوون کە گۆرانییان دەگوت بەو دروشمانەی کە ئەنصارییەکان لە شەڕی بوعاسدا دەیانگوت، دەڵێ: ئەو دوو کەنیزەکە گۆرانی بێژی پیشەی ئەوان نەبوو، ئنجا ئەبو بەکر گوتی: ئایا ئاواز و ئامرازی شەیتان لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ؟! ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بوو، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر هەموو گەلێک جەژنی تایبەت بە خۆی هەیە، وە ئەوەش (کە جەژنی ڕەمەزانە) جەژنی ئێمەیە.**

١٨٩٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِبَعْضِ الْمَدِينَةِ، فَإِذَا هُوَ بِجَوَارٍ يَضْرِبْنَ بِدُفِّهِنَّ، وَيَتَغَنَّيْنَ، وَيَقُلْنَ:

نَحْنُ جَوَارٍ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ ... يَا حَبَّذَا مُحَمَّدٌ مِنْ جَارِ

فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّهُ يَعْلَمُ إِنِّي لَأُحِبُّكُنَّ»[2].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە بەشێک لەشاری مەدینەدا تێپەڕ بوو، بینی کە چەند کەنیزەکێک دەف لێدەدەن و گۆرانی دەڵێن و دەڵێن: ئێمە کەنیزەکین لە هۆزی بەنی نەجار، باشترین دراوسێمان هەیە کە موحەممەدە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا دەزانێ کە منیش ئێوەم خۆشدەوێ.**

١٩٠٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: أَنْكَحَتْ عَائِشَةُ ﵂ ذَاتَ قَرَابَةٍ لَهَا مِنَ الْأَنْصَارِ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «أَهْدَيْتُمُ الْفَتَاةَ؟» قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «أَرْسَلْتُمْ مَعَهَا مَنْ يُغَنِّي»، قَالَتْ: لَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْأَنْصَارَ قَوْمٌ فِيهِمْ غَزَلٌ، فَلَوْ بَعَثْتُمْ مَعَهَا مَنْ يَقُولُ: أَتَيْنَاكُمْ أَتَيْنَاكُمْ فَحَيَّانَا وَحَيَّاكُمْ»[3].

---

**(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٥٢، ومسلم: ٨٩٢، والنسائي: ١٥٩٣ و ١٥٩٧.**

**(٢) صحيح.**

**(٣) ضعيف.**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: عائیشە ﷺ یەکێکی ئەنصاڕی بۆ یەکێک لە نزیکەکانی خۆی مارەبڕی، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ هات و فەرمووی: ئایا کچەکەتان نارد؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: کەسێکی ئاواتان لەگەڵ نارد کە گۆرانی بڵێ؟ گوتی: نەخێر، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەنصارەکان خەڵکانێکن شیعر پێدا هەڵدانی ئافرەتیان لەناودا باوە، ئەگەر کەسێکتان بناردبایە ئەوەی گوتبا: هاتین بۆ لاتان هاتین بۆ لاتان، خوا ئێمە و ئێوەش بە زیندوویی بێڵێتەوە (یان سەلام لەسەر ئێمەو ئێوەش بێت).

١٩٠١- عَنْ مُجَاهِدٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ ﷺ «فَسَمِعَ صَوْتَ طَبْلٍ، فَأَدْخَلَ إِصْبَعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ، ثُمَّ تَنَحَّى، حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[1].

واتە: موجاهید ﷺ دەڵێ: لەگەڵ ئیبنو عومەر ﷺ دابووم، جا گوێی لە دەنگی تەپڵێک بوو، ئەویش پەنجەی خستە ناو گوێچکەکانی، پاشان خۆی لاداو دوورکەوتەوە، تاوەکو سێ جار ئەوەی کرد (بۆ ئەوەی گوێی لێ نەبێ)، پاشان گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیەی کرد.

## بابەت: ئەوانەی خۆیان بە ژن دەچوێنن (پیاوی سەر ژنانی)

١٩٠٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا، فَسَمِعَ مُخَنَّثًا وَهُوَ يَقُولُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ: إِنْ يَفْتَحِ اللَّهُ الطَّائِفَ غَدًا، دَلَلْتُكَ عَلَى امْرَأَةٍ تُقْبِلُ بِأَرْبَعٍ، وَتُدْبِرُ بِثَمَانٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «أَخْرِجُوهُ مِنْ بُيُوتِكُمْ»[2].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لام، بیستی پیاوێکی سەرژنانی بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەییەی ﷺ دەگوت: ئەگەر سبەینێ خوا کردی و تائیف ئازادکرا، ئافرەتێکت نیشان دەدەم کە ئەگەر لە پێشەوەڕا ببینی چوار لۆیە، وە ئەگەر لە دواوەش ببینی هەشت لۆیە (واتە: وەسفی قەڵەوی و خڕ و پڕیی نەرم و نیانی ئەو ئافرەتەی بۆ دەکرد)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو جۆرە کەسانە لە ماڵەکانتان دەربکەن (مەهێڵن بێنە ماڵتان).

---

(١) صحيح بلفظ: «زمارة راع».

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٣٥، ومسلم: ٢١٨٠، وأبو داود: ٤٩٢٩.

١٩٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «لَعَنَ الْمَرْأَةَ تَتَشَبَّهُ بِالرِّجَالِ، وَالرَّجُلَ يَتَشَبَّهُ بِالنِّسَاءِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی كردوە لە ئافرەتێک كە خۆی بە پیاوان بچوێنێ، وە لە پیاوێک كە خۆی بە ئافرەتان بچوێنێ.

١٩٠٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «لَعَنَ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَلَعَنَ الْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی كردوە لەو پیاوانەی كە خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن، نەفرینیشی كردوە لەو ئافرەتانەی كە خۆیان بە پیاوان دەچوێنن.

## بابەت: پیرۆزبایی هاوسەرگیری كردن

١٩٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ إِذَا رَفَّأَ، قَالَ: «بَارَكَ اللَّهُ لَكُمْ، وَبَارَكَ عَلَيْكُمْ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ كاتێ پیرۆزبایی دەكرد (لە كەسێ كە هاوسەرگیری كردبوو) دەیفەرموو: خوا فەڕو بەرەكەت بڕێژێت بەسەرتاندا، وە لەسەر خێر و چاكە كۆتان بكاتەوە.

١٩٠٦- عَنْ عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّهُ تَزَوَّجَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي جُشَمَ، فَقَالُوا: بِالرِّفَاءِ، وَالْبَنِينَ، فَقَالَ: لَا تَقُولُوا هَكَذَا، وَلَكِنْ قُولُوا كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ، وَبَارِكْ عَلَيْهِمْ»[٤].

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٠٩٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٨٥، وأبو داود: ٤٠٩٧، والترمذي: ٢٧٨٤.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٣٠، والترمذي: ١٠٩١.

(٤) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٣٧١.

واتە: عەقیلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ژنێکی مارە کرد لە هۆزی بەنو جوشەم، ئنجا گوتیان: بەیەکەوە بژین و ئاسودە بن و کوڕتان لێ پاش بکەوێ، ئەویش گوتی: ئاوا مەڵێن، بەڵکو ئەوە بڵێن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە بەرەکەتداریان بکەی، خوایە خێر و فەڕ بڕژێنە بەسەریاندا.

## بابەت: خواردنی شایی (هاوسەرگیری)

**١٩٠٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَثَرَ صُفْرَةٍ، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟ أَوْ مَهْ» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ: «بَارَكَ اللَّهُ لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنەواری زاوایەتی بینی بەسەر عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە، فەرمووی: ئەوە چییە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ژنم مارە کردوە لەسەر کێشی دەنکە خورمایەک لە زێڕ (سێ درهەم یان پێنج درهەم)، ئنجا فەرمووی: خوا بەرەکەتداری بکات بۆت، داوەتێک بکە ئەگەر بە شەکە مەڕێکیش بێ.

**١٩٠٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَوْلَمَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ نِسَائِهِ مَا أَوْلَمَ عَلَى زَيْنَبَ، فَإِنَّهُ ذَبَحَ شَاةً»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: نەمبینیوە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هیچ کام لە خێزانەکانی وەلیمەیەک (داوەتی ژن هێنان) بکات، وەکو ئەوەی بۆ زەینەب کردی، کە مەڕێکی سەربڕی.

**١٩٠٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «أَوْلَمَ عَلَى صَفِيَّةَ بِسَوِيقٍ وَتَمْرٍ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٤٩، ومسلم: ١٤٢٧، وأبو داود: ٢١٠٩، والترمذي: ١٠٩٤ و ١٩٣٣، والنسائي: ٣٣٥١ و ٣٣٧٢_٣٣٧٤ و ٣٣٨٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٦٨ و ٥١٧١، ومسلم: ١٤٢٨، وأبو داود: ٣٧٤٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧١ و ٢٨٩٣، وأبو داود: ٣٧٤٤، والترمذي: ١٠٩٥، والنسائي: ٣٣٨٠_٣٣٨٢.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ وەلیمەی کرد بۆ صەفیە بە قاوت (حەلوا) لەگەڵ خورما دروست کرد.

١٩١٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «شَهِدْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ وَلِيمَةً، مَا فِيهَا لَحْمٌ وَلَا خُبْزٌ». قَالَ ابْنُ مَاجَةَ: «لَمْ يُحَدِّثْ بِهِ إِلَّا ابْنُ عُيَيْنَةَ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئامادەی خوانێکی هاوسەرگیری پێغەمبەر ﷺ بووم کە نە گۆشت و نە نانی تێدا نەبوو. ئیبنو ماجە دەڵێ: کەس ئەوەی نەگێڕاوەتەوە جگە لە ئیبنو عویەینە.

١٩١١- عَنْ عَائِشَةَ، وَأُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، قَالَتَا: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نُجَهِّزَ فَاطِمَةَ حَتَّى نُدْخِلَهَا عَلَى عَلِيٍّ، فَعَمَدْنَا إِلَى الْبَيْتِ، فَفَرَشْنَاهُ تُرَابًا لَيِّنًا مِنْ أَعْرَاضِ الْبَطْحَاءِ، ثُمَّ حَشَوْنَا مِرْفَقَتَيْنِ لِيفًا، فَنَفَشْنَاهُ بِأَيْدِينَا، ثُمَّ أَطْعَمْنَا تَمْرًا وَزَبِيبًا، وَسَقَيْنَا مَاءً عَذْبًا، وَعَمَدْنَا إِلَى عُودٍ، فَعَرَضْنَاهُ فِي جَانِبِ الْبَيْتِ، لِيُلْقَى عَلَيْهِ الثَّوْبُ، وَيُعَلَّقَ عَلَيْهِ السِّقَاءُ، فَمَا رَأَيْنَا عُرْسًا أَحْسَنَ مِنْ عُرْسِ فَاطِمَةَ»[٢].

واتە: عائیشەو ئوممو سەلەمە ﷺ گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێمان کرد کەوا فاتیمە ئامادە بکەین بیبەین بۆ عەلی، ئێمەش چووینە ماڵەکە و ماڵەکەمان بە گڵ و خۆڵی نەرم فەڕش کرد کە لە قەراخی شیوی «البطحاء» هێنابوومان، پاشان دوو پشتیمان (سەرین) لە توێکڵی نەرمی دار خورما بۆ دروست کردن، جا بە دەستی خۆمان پشتییەکانمان خۆش کرد و نەرممان کردن، پاشان (وەکو نانی شایی) خورما و مێوژمان خوارد و ئاوی شیرینمان خواردەوە، ئنجا دارێکمان هێنا لە گۆشەیەکی ماڵەکەدا دامانانا، تاکو پۆشاک و کوندەی ئاو خواردنەوەی پێوە هەڵبواسن، ئیتر هیچ بوکێکمان نەبینی کە وەکو بوکێنی و شایی فاتیمە جوان و باش بێ.

١٩١٢- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: دَعَا أَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِلَى عُرْسِهِ، فَكَانَتْ خَادِمَهُمُ الْعَرُوسُ، قَالَتْ: «تَدْرِي مَا سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: أَنْقَعْتُ تَمَرَاتٍ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ صَفَّيْتُهُنَّ، فَأَسْقَيْتُهُنَّ إِيَّاهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٥٩.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٧٦، ومسلم: ٢٠٠٦.

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: ئەبو ئوسەیدی ساعیدی لە ڕۆژی زەماوەندەکەیدا بانگهێشتی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد، وە بوکەکەشی خزمەتی دەکرد، گوتی: دەزانی چ خواردنەوەیەکم بە پێغەمبەری خوادا ﷺ؟ گوتی: لە شەودا هەندێ خورمام خوساندبوون، جا بەیانی پاڵاوتمن و خۆشاوەکەیم بە پێغەمبەردا ﷺ.

## بابەت: بە دەمەوە چوونی دەعوەت کردن

١٩١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ، يُدْعَى لَهَا الْأَغْنِيَاءُ وَيُتْرَكُ الْفُقَرَاءُ، وَمَنْ لَمْ يُجِبْ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: خراپترین خواردن خواردنی زەماوەندە کە دەوڵەمەندەکان بانگهێشت دەکرێن و هەژارەکان پشت گوێ دەخرێن، (لەگەڵ ئەوەشدا) هەر کەسێک بانگهێشت بکرێ و نەچێ، بەدڵنیاییی سەرپێچی خوا و پێغەمبەری ﷺ کردوە.

١٩١٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى وَلِيمَةِ عُرْسٍ فَلْيُجِبْ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە ئەگەر بۆ نان خواردنی زەماوەند و ژن گواستنەوە بانگکرا با بچێ.

١٩١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْوَلِيمَةُ أَوَّلَ يَوْمٍ حَقٌّ، وَالثَّانِيَ مَعْرُوفٌ، وَالثَّالِثَ رِيَاءٌ وَسُمْعَةٌ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نان سازکردنی یەکەم ڕۆژ بۆ زەماوەند هەقە و لەجێی خۆیەتی، دووەم ڕۆژ باوو نەریتێکی باشە (بۆ زیاتر ئاشکرابوونی پرۆسەکە)، هی سێیەم ڕۆژ ناپەسندە و بۆ ڕووپامایی و ناوبانگە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٧٧، ومسلم: ١٤٣٢، وأبو داود: ٣٧٤٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٧٣، ومسلم: ١٤٢٩، وأبو داود: ٣٧٣٦ و ٣٧٣٨، والترمذي: ١٠٩٨.

(٣) ضعيف.

## بابەت: شەومانەوە لە لای کچ و بێوەژن

**١٩١٦-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِلثَّيِّبِ ثَلَاثًا، وَلِلْبِكْرِ سَبْعًا»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ئەگەر ئەو ئافرەتەی هێناویەتی بێوەژن بوو) مافی بێوەژن سێ شەوە، هی کچیش حەوت شەوە (واتە: دوای ئەو ماوەیە ئەوجار شەومانەوەی بە یەکسانی دەست پێدەکاتەوە).

**١٩١٧-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا تَزَوَّجَ أُمَّ سَلَمَةَ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا، وَقَالَ: «لَيْسَ بِكِ عَلَى أَهْلِكِ هَوَانٌ، إِنْ شِئْتِ سَبَّعْتُ لَكِ، وَإِنْ سَبَّعْتُ لَكِ سَبَّعْتُ لِنِسَائِي»[2].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرگیری کرد لەگەڵ ئوممو سەلەمەدا سێ شەو لەلای مایەوە و پێی فەرموو: لەلام بە زەحمەت نیە و تۆ بە کەم نازانم (کە هەر سێ شەو لە لات دەمێنمەوە)، خۆ ئەگەر پێت خۆشە ئەو حەوت شەو دەمێنمەوە، بەڵام ئەگەر حەوت شەو لەلای تۆ بم، هەر خێزانە و حەوت شەو لەلای دەبم.

## بابەت: ئەو قسەی پیاو دەیڵێ کاتێک دەچێ بۆ لای هاوسەرەکەی

**١٩١٨-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا أَفَادَ أَحَدُكُمُ امْرَأَةً، أَوْ خَادِمًا، أَوْ دَابَّةً، فَلْيَأْخُذْ بِنَاصِيَتِهَا، وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهَا، وَخَيْرِ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَشَرِّ مَا جُبِلَتْ عَلَيْهِ»[3].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە ئەگەر ژنێک، یان خزمەتکارێک، یان ئاژەڵێکی دەستکەوت، با دەستبهێنێ بەناوچاوانیدا، وە بڵێ:

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢١٣، ومسلم: ١٤٦١، وأبو داود: ٢١٢٤، والترمذي: ١١٣٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٦٠/٤١، وأبو داود: ٢١٢٢.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢١٦٠.

خوایە داوای باشترین شتیت لێدەکەم، وە باشترین خو و ڕەفتارێک کە لەسەری دروست کراوە، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەکانی و ئەو خو و ڕەوشتە خراپانەی کە تێیدا دروست کراوە.

**١٩١٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى امْرَأَتَهُ، قَالَ: اللَّهُمَّ جَنِّبْنِي الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنِي، ثُمَّ كَانَ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ، لَمْ يُسَلِّطِ اللَّهُ عَلَيْهِ الشَّيْطَانَ، أَوْ لَمْ يَضُرَّهُ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە کاتێک دەچێتە لای خێزانەکەی ئەگەر بڵێ: خوایە بمپارێزە لە شەیتان و لێم دوور بخەیتەوە، وە شەیتان دوور بخەیتەوە لەوەی کە پێمی دەبەخشی، ئنجا (دوای ئەوە) ئەگەر منداڵێکیان لە نێواندا پەیدابوو، خوا لێناگەڕێ شەیتان بەسەریدا زاڵ بێ، یان زەرەر و زیانی پێ بگەیەنێ.

## بابەت: خۆداپۆشین لە کاتی جووتبووندا

**١٩٢٠-** عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﵁، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَوْرَاتُنَا، مَا نَأْتِي مِنْهَا، وَمَا نَذَرُ؟ قَالَ: «احْفَظْ عَوْرَتَكَ إِلَّا مِنْ زَوْجَتِكَ، أَوْ مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ الْقَوْمُ بَعْضُهُمْ فِي بَعْضٍ؟ قَالَ: «إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ لَا تُرِيَهَا أَحَدًا، فَلَا تُرِيَنَّهَا»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنْ كَانَ أَحَدُنَا خَالِيًا؟ قَالَ: «فَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ يُسْتَحْيَا مِنْهُ مِنَ النَّاسِ»[2].

واتە: بەهزی کوڕی حەکیم لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﵁ دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی عەوڕەتە و کامەیان داپۆشین و کامەیان لێی گەڕێین؟ فەرمووی: دامێن بپارێزە تەنها لە خێزان و کەنیزەکەکانت نەبێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەگەر لە پاڵ یەکدا بووین و تێکەڵ بووین؟ فەرمووی: ئەگەر توانیت وابکەی کە کەس نەیبینێ وابکە کەس نەیبینێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەگەر یەکێک لە ئێمە بە تەنیا بوو؟ فەرمووی: خوا زۆر شایستەترە لە خەڵکی کە شەرمی لێ بکرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤١، ومسلم: ١٤٣٤، وأبو داود: ٢١٦١، والترمذي: ١٠٩٢.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٠١٧، والترمذي: ٢٧٦٩ و ٢٧٩٤.

١٩٢١- عَنْ عُتْبَةَ بْنِ عَبْدٍ السُّلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ فَلْيَسْتَتِرْ، وَلَا يَتَجَرَّدْ تَجَرُّدَ الْعَيْرَيْنِ»[١].

واتە: عوتبەی کوڕی عەبدی سولەمیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان ویستی لەگەڵ خێزانی کۆببێتەوە با خۆی داپۆشێ و، خۆی ڕووت نەکاتەوە وەکو کەرەکێوی.

١٩٢٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «مَا نَظَرْتُ، أَوْ مَا رَأَيْتُ فَرْجَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَطُّ» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ أَبُو نُعَيْمٍ: عَنْ مَوْلَاةٍ لِعَائِشَةَ[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: هەرگیز تەماشای دامێنی پێغەمبەری خوام ﷺ نەکردوە. ئەبو بەکر دەڵێ: ئەبو نەعیم گوتی: لە خزمەتکارێکی عائیشەوە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: قەدەغەکردنی چوونە لای ئافرەتان لە دواوە

١٩٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَى رَجُلٍ جَامَعَ امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا تەماشای پیاوێک ناکات کە بچێتە لای ژنەکەی لە دواوە (واتە: لەڕێگای کۆمەوە لەگەڵی جووت بێ).

١٩٢٤- عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، لَا تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَدْبَارِهِنَّ»[٤].

واتە: خوزەیمەی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: بەدڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا لە ئاست هەق شەرم ناکات، سێ جار وای فەرموو، مەچوونە لای خێزانەکانتان لە دواوە.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢١٦٢.

(٤) صحيح.

**١٩٢٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «كَانَتْ يَهُودُ تَقُولُ: مَنْ أَتَى امْرَأَةً فِي قُبُلِهَا مِنْ دُبُرِهَا، كَانَ الْوَلَدُ أَحْوَلَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ البقرة»[1].**

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ گوتوویەتی: جوولەکە دەیانگوت: هەر کەس لە دواوە جووت بێ لەگەڵ ئافرەت لە شوێنی منداڵ بوونەوە، منداڵەکەی خێل دەبێ، خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ البقرة، واتە: ژنەکانتان کێڵگەی خۆتانن جا تۆوەکانتان بوەشێننە ناو کێڵگەکانتانەوە (مەبەست چوونە لایانە) بەهەرشێوەیەک دەتانەوێ (لەشوێنی تایبەتی خۆی کە پێشەوەیە نەک دواوە).**

## بابەت: ڕێگری کردن لە منداڵ بوون

**١٩٢٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْعَزْلِ، فَقَالَ: «أَوَتَفْعَلُونَ؟ لَا عَلَيْكُمْ أَنْ لَا تَفْعَلُوا، فَإِنَّهُ لَيْسَ مِنْ نَسَمَةٍ قَضَى اللَّهُ لَهَا أَنْ تَكُونَ، إِلَّا هِيَ كَائِنَةٌ»[2].**

**واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ڕێگری کردن لە منداڵ بوون، ئەویش فەرمووی: بۆ ئەم کارە دەکەن؟ زیانی نابێ بۆتان ئەگەر نەیکەن، چونکە هەر کەسێ خوا بڕیاری لەسەردابێ کە ببێ ئەوە شتێکی حەتمییە و دەبێ (یان مانای: «لَا عَلَيْكُمْ أَنْ لَا تَفْعَلُوا»، واتە: هیچ زەرەرێکی نیە ئەگەر ڕێگری لە منداڵ بوون بکەن، ئەوە لە کاتێکدا کە بڵێین پیتی «لا» زیادەیە).**

**١٩٢٧- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نَعْزِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَالْقُرْآنُ يَنْزِلُ»[3].**

**واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ڕێگریان دەکرد لە منداڵ بوون، لە کاتێکدا قورئانیش دادەبەزی (واتە: ئەگەر قەدەغە بووایە قورئان قەدەغەی دەکرد).**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٢٨، ومسلم: ١٤٣٥، وأبو داود: ٢١٦٣، والترمذي: ٢٩٧٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٢٩، ومسلم: ١٤٣٨، وأبو داود: ٢١٧٠ و ٢١٧٢، والترمذي: ١١٣٨، والنسائي: ٣٣٢٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٠٧_٥٢٠٩، ومسلم: ١٤٤٠، والترمذي: ١١٣٧.

**١٩٢٨-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُعْزَلَ عَنِ الْحُرَّةِ إِلَّا بِإِذْنِهَا»[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە ڕێگری کردن لە منداڵ بوون کە ئافرەتەکە ئازادبێ و کۆیلە نەبێ، مەگەر بە مۆڵەتی ئافرەتەکە.

## بابەت: ئافرەت مارەبڕ ناکرێ بەسەر پوورو پلکی (خوشکی باوک و دایکی)

**١٩٢٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، وَلَا عَلَى خَالَتِهَا»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت مارەبڕ ناکرێ بەسەر پوورو پلکی.

**عمة:** واتە: خوشکی باوک.

**خالة:** واتە: خوشکی دایک.

**١٩٣٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «يَنْهَى عَنْ نِكَاحَيْنِ، أَنْ يَجْمَعَ الرَّجُلُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَبَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا»[٣].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دوو جۆر مارەبڕینی قەدەغەکرد: یەکیان کۆکردنەوەی ژن لەگەڵ خوشکی باوکی ژنەکە (پووری)، دووەم کۆکردنەوەی ژن لەگەڵ خوشکی دایکی ژنەکەدا (پلک).

**١٩٣١-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُنْكَحُ الْمَرْأَةِ عَلَى عَمَّتِهَا، وَلَا عَلَى خَالَتِهَا»[٤].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نابێ ئافرەت بەسەر خوشکی باوکیدا مارە بکرێ، وە بەسەر خوشکی دایکیشیدا.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٠٩، ومسلم: ١٤٠٨، وأبو داود: ٢٠٦٦، والترمذي بإثر: ١١٢٥، والنسائي: ٣٢٩٥ و ٣٢٩٦.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح لغيره.

## بابەت: پیاوێک سێ بە سێ ژنەکەی تەڵاق داوە و شو دەکاتەوە، تەڵاق دەدرێتەوە پێش ئەوەی مێردی دووەمی لەگەڵی جووتبێ، ئایا دروستە بگەڕێتەوە بۆ لای مێردی یەکەمی؟

١٩٣٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ امْرَأَةَ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنِّي كُنْتُ عِنْدَ رِفَاعَةَ فَطَلَّقَنِي فَبَتَّ طَلَاقِي، فَتَزَوَّجْتُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، وَإِنَّ مَا مَعَهُ مِثْلُ هُدْبَةِ الثَّوْبِ، فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «أَتُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِي إِلَى رِفَاعَةَ؟ لَا، حَتَّى تَذُوقِي عُسَيْلَتَهُ، وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە خێزانی ریفاعەی قورەزی هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: لە لای ریفاعە بووم، بەڵام تەڵاقی داوم، بە تەڵاقی یەکجاری و کۆتایی (سێ بە سێ)، جا شووم کردەوە بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زوبەیر، (لایەکی کراسەکەی گرت و گوتی) ئەویش هەر پەڕۆیە، (واتە: توانای جووتبوونی نیە)، ئنجا پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد، فەرمووی: دەتەوێ بگەڕێیتەوە بۆ لای ڕافیعە؟! نەخێر، نابێ تاکو چێژی ژن و مێردایەتی لە (عەبدوڕڕەحمان) دەبینی و، ئەویش چێژ لە تۆ دەبینی.

**تێبینی:** کەواتە ئافرەت کە سێ جار تەڵاق درا (سێ بە سێ)، پاشان شوی کردەوە دەبێ مێردی دووەمی لەگەڵیدا جووت بێ، ئەوجار کە تەڵاقی دایەوە بە ئارەزووی خۆی، بۆی هەیە بچێتەوە لای مێردی یەکەم بە مارەیی و گرێبەستێکی نوێ).

١٩٣٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فِي الرَّجُلِ تَكُونُ لَهُ الْمَرْأَةُ فَيُطَلِّقُهَا، فَيَتَزَوَّجُهَا رَجُلٌ فَيُطَلِّقُهَا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، أَتَرْجِعُ إِلَى الْأَوَّلِ؟ قَالَ: «لَا، حَتَّى يَذُوقَ الْعُسَيْلَةَ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پیاوێک کە ژنی هەیە و تەڵاقی دەدات، ئنجا پیاوێکی تر مارەی دەکات و تەڵاقی دەداتەوە پێش ئەوەی کە بچێتە لای و سەرجێی لەگەڵ بکات، ئایا ئەو ئافرەتە بۆی هەیە بچێتەوە بۆ لای پیاوی یەکەمی یان نا؟ گوتی: نەخێر بۆی نیە تاکو خۆشی جووتبوونی دەچێژێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٣٩، ومسلم: ١٤٣٣، وأبو داود: ٢٣٠٩، والترمذي: ١١١٨، والنسائي: ٣٢٨٣ و ٣٤٠٧_٣٤٠٩ و ٣٤١١ و ٣٤١٢.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه النسائي: ٣٤١٤.

## بابەت: كەسێک ئافرەتی تەڵاقدراو مارە بكات، بە مەبەستی تەڵاقدانەوە تاكو بۆ مێردی یەكەمی حەڵاڵ بێتەوە (مارە بە جاش)

**١٩٣٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُحَلِّلَ، وَالْمُحَلَّلَ لَهُ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی كردوە لەو كەسەی كە ئافرەتێک مارە دەكاتەوە بە نیەتی ئەوەی كە بۆ مێردی پێشووی حەڵاڵ بێتەوە و تەڵاقی دەداتەوە، وە ئەو كەسەش كە ئافرەتەكەی بۆ حەڵاڵ دەكرێتەوە (مێردی یەكەمی).

**١٩٣٥-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: «لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُحَلِّلَ، وَالْمُحَلَّلَ لَهُ»[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی كردوە لەو پیاوەی كە ئافرەتێكی تەڵاقدراو مارە دەبڕێ، بۆ ئەوەی بۆ مێردی یەكەمی حەڵاڵی بكاتەوە، وە لەو كەسەش كە ئافرەتەكەی بۆ تەڵاق دەدرێتەوە.

**١٩٣٦-** عَنْ عُقْبَةَ بْنُ عَامِرٍ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِالتَّيْسِ الْمُسْتَعَارِ» قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «هُوَ الْمُحَلِّلُ، لَعَنَ اللَّهُ الْمُحَلِّلَ، وَالْمُحَلَّلَ لَهُ»[٣].

واتە: عوقبەی كوڕی عامیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا پێتان ڕانەگەیەنم كە كەڵی بە كرێ گیراو چییە؟ گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان بڵێ، فەرمووی: ئەو كەسەیە كە ئافرەتێكی تەڵاقدراو بۆ پیاوێكی تر حەڵاڵ دەكاتەوە، نەفرینی خوا لە هەردووكیان بێ.

**كەڵ:** لە نێرینەی ئاژەڵانە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٠٧٦ و ٢٠٧٧، والترمذي: ١١١٩، والنسائي: ٢١٠٥ مطولًا.

(٣) صحيح لغيره دون قصة التيس المستعار.

## بابەت: هەر شتێک بەهۆی ڕەچەڵەکەوە حەڕام بێ، بەهۆی شیرپێدانیشەوە حەڕام دەبێ

**١٩٣٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر شتێک بەهۆی ڕەچەڵەکەوە حەڕام بێ، بەهۆی شیرپێدانیشەوە حەڕام دەبێ.

**١٩٣٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُرِيدَ عَلَى بِنْتِ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالَ: «إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، وَإِنَّهُ يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێشنیاری کچی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیبیان کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: ئەو کچە برازای شیریمە (واتە: من و حەمزە لە یەک کەس شیرمان خواردوە)، وە بێگومان بەهۆی شیرەوە حەڕام دەبێ هەر شتێک یان هەر کەسێک بەهۆی ڕەچەڵەکەوە حەڕام بێ.

**١٩٣٩-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ زَيْنَبَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ، حَدَّثَتْهُ أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ حَدَّثَتْهَا ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: انْكِحْ أُخْتِي عَزَّةَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتُحِبِّينَ ذَلِكِ؟» قَالَتْ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَلَسْتُ لَكَ بِمُخْلِيَةٍ، وَأَحَقُّ مَنْ شَرِكَنِي فِي خَيْرٍ أُخْتِي، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِنَّ ذَلِكَ لَا يَحِلُّ لِي» قَالَتْ: فَإِنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّكَ تُرِيدُ أَنْ تَنْكِحَ دُرَّةَ بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ، فَقَالَ: «بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ؟» قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِنَّهَا لَوْ لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي فِي حَجْرِي مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّهَا لَابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَاهَا ثُوَيْبَةُ، فَلَا تَعْرِضْنَ عَلَيَّ أَخَوَاتِكُنَّ وَلَا بَنَاتِكُنَّ»[٣].

واتە: عورووەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە، زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە بۆی گێڕاوەتەوە کە ئوممو حەبیبە ﵂ بۆی گێڕاوەتەوە، بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوتوە: خوشکەکەم عەزە لە خۆت مارە بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: ئایا ئەو کارەت پێخۆشە؟

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٤٤، وأبو داود: ٢٠٥٥، والترمذي: ١١٤٧، والنسائي: ٣٣٠٠ و ٣٣٠٣ و ٣٣١٣. وانظر البخاري: ٢٦٤٤ و ٥٢٣٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٤٥ و ٥١٠٠، ومسلم: ١٤٤٧، والنسائي: ٣٣٠٥ و ٣٣٠٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٠١ و ٥١٠٦ و ٥١٠٧ و ٥١٢٣ و ٥٣٧٢، ومسلم: ١٤٤٩، وأبو داود: ٢٠٥٦، والنسائي: ٣٢٨٤_٣٢٨٧.

ئەویش گوتوویەتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، تەنها من هی تۆ نیم (واتە: هاوبەشم هەیە)، بۆیە باشترین هاوبەش کە هەمبێ لەو چاکەیەدا خوشکەکەی خۆمە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاخر ئەوە بۆ من حەڵاڵ و ڕێگەپێدراو نیە، ئەویش گوتی: ئێمە باسی ئەوەمان کردوە کە تۆ دەتەوێ دوورەی کچی ئەبو سەلەمە بخوازی، ئەویش فەرمووی: کچی ئەبو سەلەمە؟ گوتی: بەڵێ! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆ ئەگەر ئەو زڕکچیشم نەبا و لە ماڵەکەی منیشدا نەبووایە، هەر بۆم حەڵاڵ نەبوو، چونکە کچی برای شیریمە، من و باوکی ئەو کچە سوەیبە شیری پێداوین، جا بۆیە پێشنیاری خوشک و کچەکانتان بۆ من مەکەن (بۆ هاوسەرگیری).

**١٩٣٩م-** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ نُمَيْرٍ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[1].

واتە: ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: ئەوەی کە مژێک یان دوو مژ شیرخواردن نابێتە هۆی حەڕام بوون لەیەکتر

**١٩٤٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ، أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ ﵂، حَدَّثَتْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا تُحَرِّمُ الرَّضْعَةُ وَلَا الرَّضْعَتَانِ، أَوِ الْمَصَّةُ وَالْمَصَّتَانِ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریس دەگێڕێتەوە، ئوممو فەزڵ ﵂ بۆی گێڕاوەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جارێک و دووجار شیرپێدان، یان مژێک و، دوو مژ، نابنە هۆی حەڕام بوونی دوو کەس لە یەکتری.

**١٩٤١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَالْمَصَّتَانِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٠١ و ٥١٠٦ و ٥١٠٧ و ٥١٢٣ و ٥٣٧٢، ومسلم: ١٤٤٩، وأبو داود: ٢٠٥٦، والنسائي: ٣٢٨٤_٣٢٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٥١، والنسائي: ٣٣٠٨.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٥٠، وأبو داود: ٢٠٦٣، والترمذي: ١١٥٠، والنسائي: ٣٣١٠ و ٣٣١١.




واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەک مژین و دوو مژین دوو کەس لە یەکتر حەڕام ناکات.

**١٩٤٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ الْقُرْآنِ ثُمَّ سَقَطَ، «لَا يُحَرِّمُ إِلَّا عَشْرُ رَضَعَاتٍ، أَوْ خَمْسٌ مَعْلُومَاتٌ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: یەکێک لەوانەی کە کاتی خۆی لەناو قورئاندا دابەزیوە، پاشان (حوکمەکەی هەڵوەشایەوەو) نەماوە، ئەوەبوو کە: ئەوەی دەبێتە هۆی حەڕام بوون دە جار شیرخواردنە یان پێنج جاری زانراو دیار.

## بابەت: شیرپێدان بە کەسی گەورە

**١٩٤٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: جَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَرَى فِي وَجْهِ أَبِي حُذَيْفَةَ الْكَرَاهِيَةَ مِنْ دُخُولِ سَالِمٍ عَلَيَّ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَرْضِعِيهِ» قَالَتْ: كَيْفَ أُرْضِعُهُ وَهُوَ رَجُلٌ كَبِيرٌ؟ فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ: «قَدْ عَلِمْتُ أَنَّهُ رَجُلٌ كَبِيرٌ» فَفَعَلَتْ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَتْ: مَا رَأَيْتُ فِي وَجْهِ أَبِي حُذَيْفَةَ شَيْئًا أَكْرَهُهُ بَعْدُ، وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا»[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: سەهلەی کچی سوهەیل هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناڕەحەتی و بێزاری لە ڕووخساری ئەبو حوزەیفەدا دەبینم کاتێ سالیم دێت بۆ لام، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شیری پێبدە (بە سالیم)، گوتی: چۆن شیری پێبدەم لە کاتێکدا کە ئەو گەورەیە (منداڵ نیە)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد، فەرمووی: بێگومان دەزانم کە ئەو پیاوەو گەورەیە، ئنجا ئەویش وای کرد (واتە: شیری پێدا)، ئنجا هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئیتر لە دوای ئەوە هیچ پێناخۆش بوونێکم بە ڕوخساری ئەبو حوزەیفەوە نەدیوە، وە سالیم ئامادەی غەزای بەدر بووە.

**١٩٤٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «لَقَدْ نَزَلَتْ آيَةُ الرَّجْمِ، وَرَضَاعَةُ الْكَبِيرِ عَشْرًا، وَلَقَدْ كَانَ فِي صَحِيفَةٍ تَحْتَ سَرِيرِي، فَلَمَّا مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَتَشَاغَلْنَا بِمَوْتِهِ، دَخَلَ دَاجِنٌ فَأَكَلَهَا»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٥٢، وأبو داود: ٢٠٦٢، والترمذي: ١١٥٠م، والنسائي: ٣٣٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٠٠، ومسلم: ١٤٥٣، وأبو داود: ٢٠٦١ مطولًا، والنسائي: ٣٣٢٠.

(٣) حسن. أخرجه مسلم: ١٤٥٢، وأبو داود: ٢٠٦٢، والترمذي بإثر: ١١٥٠، والنسائي: ٣٣٠٧.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: لە ڕاستیدا ئایەتی ڕەجم و ئایەتی شیرپێدانی گەورە بە دە جار شیرخواردن دابەزی و لە پەڕاوێکدا نووسرابووەو لە ژێر سەرینەکەمدا بوو، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و سەرقاڵ بووین (لەو کاتەدا) ئاژەڵەکەمان هاتبووە ژوورەکەو خواردبووی.

## دوای گەورەبوون شیرپێدان کاریگەری نیە

**١٩٤٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا رَجُلٌ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَتْ: هَذَا أَخِي، قَالَ: «انْظُرُوا مَنْ تُدْخِلْنَ عَلَيْكُنَّ، فَإِنَّ الرَّضَاعَةَ مِنَ الْمَجَاعَةِ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ جارێکیان دەچێتە ژوورەکەی، لەوکاتەدا پیاوێک لە ژوورەکەی عائیشە دەبێ، ئەویش دەفەرمووێ: ئەوە کێیە؟ عائیشە ﵂ گوتی: ئەوە برامە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەرنجی ئەو کەسانە بدەن دێنە لاتان، چونکە بێگومان شیرپێدانێک دادەمەزرێ (بۆ ئەوەی کە ببنە خوشک و برای شیری) کە لەسەر برسییەتی بێ.

**١٩٤٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا رَضَاعَ إِلَّا مَا فَتَقَ الْأَمْعَاءَ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شیرپێدان هیچ کاریگەرییەکی نیە (بۆ مەحرەمکردنی یەکتر) مەگەر شیرپێدانێک نەبێ کە جێگای خواردن بگرێ و پێی تێر ببێ (واتە: دەبێ کاتێک بێ کە منداڵەکە شیرەخۆرە بێ و گەورە نەبووبێ).

**١٩٤٧-** عَنْ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ ﵁، عَنْ أُمِّهِ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ، «أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ كُلَّهُنَّ خَالَفْنَ عَائِشَةَ، وَأَبَيْنَ أَنْ يَدْخُلَ عَلَيْهِنَّ أَحَدٌ بِمِثْلِ رَضَاعَةِ سَالِمٍ، مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَقُلْنَ: وَمَا يُدْرِينَا؟ لَعَلَّ ذَلِكَ كَانَتْ رُخْصَةً لِسَالِمٍ وَحْدَهُ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٤٧، ومسلم: ١٤٥٥، وأبو داود: ٢٠٥٨، والنسائي: ٣٣١٢.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٥٤، والنسائي: ٣٣٢٥ كلا هما أخرجاء عن أم سلمة.



واتە: ئەبو عوبەیدەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە لە دایکییەوە زەینەبی کچی ئەبو سەلەمەیە، هەواڵی پێداوە کەوا: سەرجەم خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی ڕای عائیشە بوون و ڕازی نەبوون کە هیچ کەسێک سەردانیان بکات (بە مەبەستی شیردانی گەورە) بە وێنەی ئەو شیرخواردنەی سالیم کە خزمەتکاری ئەبو حوزەیفە بوو، وە گوتیان: ئێمە هیچ بەڵگەیەکمان لەبەر دەستدا نیە، بۆیە دەگونجێ کە ئەو مۆڵەتی (جۆری شیرخواردنە) تەنها تایبەت بێ بە سالیم.

## بابەت: ئەوەی کە شیرپێدان پەیوەندی بە پیاویشەوە هەیە

**١٩٤٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: أَتَانِي عَمِّي مِنَ الرَّضَاعَةِ أَفْلَحُ بْنُ أَبِي قُعَيْسٍ يَسْتَأْذِنُ عَلَيَّ بَعْدَ مَا ضُرِبَ الْحِجَابُ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ، حَتَّى دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّهُ عَمُّكِ، فَأْذَنِي لَهُ» فَقُلْتُ: إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي الْمَرْأَةُ، وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ، قَالَ: «تَرِبَتْ يَدَاكِ، أَوْ يَمِينُكِ»[1].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: مامی شیریم ئەفلەحی کوڕی ئەبو قوعەیس ویستی سەردانم بکات، لە دوای ئەوەی کە حیجاب و پەردەگرتنەوە فەڕزکرابوو لەسەرمان، منیش ڕێگام پێنەدا کە سەردانم بکات، تاکو پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام، ئەویش فەرمووی: ئەوە مامتە ڕێگای پێبدە، ئنجا منیش گوتم: ئەو کەسەی شیری پێمداوە ئافرەتەکەیە خۆ پیاوەکە شیری پێنەداوم، ئەویش فەرمووی: هەی دەست ڕاستت بچێ بە خۆڵدا (واتە: شتەکە بەو شێوەیە نیەو مامەتە لە شیردا).

**تربت يداك:** مانای وشە بە وشە واتا: دەستت بە خۆڵ بێ، بەڵام ئەوە وەک ئەو وشەیە وایە کە ئێمە لە کوردەوارییدا دەڵێین: وانییە هەی بەستەزمان.

**١٩٤٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: جَاءَ عَمِّي مِنَ الرَّضَاعَةِ يَسْتَأْذِنُ عَلَيَّ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ عَمُّكِ» فَقُلْتُ: إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي الْمَرْأَةُ، وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ، قَالَ: «إِنَّهُ عَمُّكِ، فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٤٤، ومسلم: ١٤٤٥، وأبو داود: ٢٠٥٧، والترمذي: ١١٤٨، والنسائي: ٣٣٠١ و ٣٣١٤_٣٣١٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٤٤، ومسلم: ١٤٤٥، وأبو داود: ٢٠٥٧، والترمذي: ١١٤٨، والنسائي: ٣٣٠١ و ٣٣١٤_٣٣١٨.




واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: مامێکی شیریم داوای مۆڵەتی کرد سەردانم بکات، منیش ڕێگام پێنەدا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با سەردانت بکات، چونکە مامتە، منیش گوتم: بەڵام من ئافرەت شیری پێداوم نەک پیاو، ئەویش فەرمووی: لەڕاستیدا ئەو مامەتە با سەردانت بکات.

## بابەت: ئەو پیاوەی مسوڵمان دەبێ و، دوو خوشک پێکەوە هاوسەرین

١٩٥٠- عَنِ الدَّيْلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَعِنْدِي أُخْتَانِ تَزَوَّجْتُهُمَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَالَ: «إِذَا رَجَعْتَ فَطَلِّقْ إِحْدَاهُمَا»[١].

واتە: دەیلەمیی ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەوکاتەدا کەوا من هاوسەرگیریم لەگەڵ دوو خوشکدا کردبوو لەسەردەمی نەفامیدا (هەردووکیان لەلام بوون)، ئەویش فەرمووی: کاتێك گەڕایتەوە یەکێکیان تەڵاق بدە.

١٩٥١- عَنْ أَبِي وَهْبٍ الْجَيْشَانِيِّ، حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ الضَّحَّاكَ بْنَ فَيْرُوزَ الدَّيْلَمِيَّ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَسْلَمْتُ وَتَحْتِي أُخْتَانِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِي: «طَلِّقْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ»[٢].

واتە: ئەبو وەهبی جەیشانیی دەگێڕێتەوە، گوێی لێبووە کە زەحاکی کوڕی فەیروزی دەیلەمی لە باوکییەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، گوتوویەتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من مسوڵمان بووم و ئێستاش دوو خوشک هاوسەرمن، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: بە دڵی خۆت یەکێکیان تەڵاق بدە.

## بابەت: ئەو پیاوەی مسوڵمان دەبێ و زیاتر لە چوار هاوسەری هەیە

١٩٥٢- عَنْ قَيْسِ بْنِ الْحَارِثِ ﷺ، قَالَ: أَسْلَمْتُ وَعِنْدِي ثَمَانِ نِسْوَةٍ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «اخْتَرْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا»[٣].

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٢٤٣، والترمذي: ١١٢٩ و ١١٣٠.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٢٤٣، والترمذي: ١١٢٩ و ١١٣٠.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٢٤١ و ٢٢٤٢.

واتە: قەیسی کوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: مسوڵمان بووم و هەشت ژنم هەبوو، منیش هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئەو شتەم پێگوت، ئەویش فەرمووی: چوار دانەیان لێ هەڵبژێرە (ئەوانی تریش واز لێبێنە).

**١٩٥٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: أَسْلَمَ غَيْلَانُ بْنُ سَلَمَةَ وَتَحْتَهُ عَشْرُ نِسْوَةٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «خُذْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا»[1].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: غەیلانی کوڕی سەلەمە مسوڵمان بوو لە کاتێکدا کە دە ژنی هەبوو، ئنجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: چوار دانەیان لێ بگێڕەوە (ئەوانیتر واز لێ بێنە).

## بابەت: مەرجدانان لە هاوسەرگیری

**١٩٥٤- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ أَحَقَّ الشَّرْطِ أَنْ يُوفَى بِهِ، مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ»[2].**

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی شایستەترین مەرجێک کە دەبێ جێبەجێ بکرێ، ئەو مەرجەیە کە بە هۆیەوە دامێنتان بۆ حەڵاڵ بووە.

**١٩٥٥- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا كَانَ مِنْ صَدَاقٍ، أَوْ حِبَاءٍ، أَوْ هِبَةٍ قَبْلَ عِصْمَةِ النِّكَاحِ فَهُوَ لَهَا، وَمَا كَانَ بَعْدَ عِصْمَةِ النِّكَاحِ فَهُوَ لِمَنْ أُعْطِيَهُ، أَوْ حُبِيَ، وَأَحَقُّ مَا يُكْرَمُ الرَّجُلُ بِهِ ابْنَتُهُ أَوْ أُخْتُهُ»[3].**

واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیرییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر شتێک لە مارەیی، یان بەخشین یان دیاری، کە لە پێش مارەبڕین بەڵێنی پێدرا ئەوە هی ئافرەتەکەیە، ئەوەی لە پاش مارە بڕینیش بڕیاری لەسەر درا، ئەوە بۆ ئەو کەسەیە کە بەخشین، یان دیارییەکەی پێدەدرێ، وە شایستەترین شتێک کە پاداشتی پیاوی پێ بدرێتەوە، مارەکردنی کچی یان خوشکیەتی لە پیاوێکی چاک.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١١٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٢١، ومسلم: ١٤١٨، وأبو داود: ٢١٣٩، والترمذي: ١١٢٧، والنسائي: ٣٢٨١ و ٣٢٨٢.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٢١٢٩، والنسائي: ٣٣٥٣.

## بابەت: پیاوێک کەنیزەکەی خۆی ئازاد بکاو پاشان مارەی بکات لە خۆی

**١٩٥٦-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ جَارِيَةٌ فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا، وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ، وَآمَنَ بِمُحَمَّدٍ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَأَيُّمَا عَبْدٍ مَمْلُوكٍ أَدَّى حَقَّ اللَّهِ عَلَيْهِ، وَحَقَّ مَوَالِيهِ، فَلَهُ أَجْرَانِ» قَالَ صَالِحٌ: قَالَ الشَّعْبِيُّ: «قَدْ أَعْطَيْتُكَهَا بِغَيْرِ شَيْءٍ، إِنْ كَانَ الرَّاكِبُ لَيَرْكَبُ فِيمَا دُونَهَا إِلَى الْمَدِينَةِ»[1].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کەنیزەکێکی هەبێ و بە جوانترین شێوە پەروەردەی بکات و بە باشترین شێوە زانستی فێربکات، پاشان ئازادی بکات و خۆی مارەی بکاتەوە، دوو پاداشتی بۆ هەیە، وە هەر پیاوێک لە ئەهلی کیتاب بڕوای بە پێغەمبەرەکەی خۆی هێنابێت و بڕوایشی بە موحەممەد ﷺ هێنا ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە، وە هەر بەندەیەک هەقی خوا بدات و هەقی گەورەکەشی بدات ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە. صالیح گوتی: شەعبی گوتی: ئەوا من بەبێ هیچ بەرانبەرێک پێمدایت، ئەگەرچی سوار بۆ کەمتر لەوەش هاتووە بۆ مەدینە.

**١٩٥٧-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: «صَارَتْ صَفِيَّةُ لِدِحْيَةَ الْكَلْبِيِّ، ثُمَّ صَارَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ بَعْدُ، فَتَزَوَّجَهَا وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا» قَالَ حَمَّادٌ: فَقَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ لِثَابِتٍ: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ، أَنْتَ سَأَلْتَ أَنَسًا مَا أَمْهَرَهَا؟ قَالَ: «أَمْهَرَهَا نَفْسَهَا»[2].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: سەرەتا صەفیە بوو بە هی دیحیەی کەلبی، دواتر بوو بە هی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا دوای ئەوە (پێغەمبەر ﷺ) لە خۆی مارە کرد و ئازادکردنەکەی کردە مارەیی (بۆ صەفییە)، حەماد دەڵێ: جا عەبدولعەزیز بە سابیتی گوت: ئەی باوکی موحەممەد ئایا لە ئەنەست پرسی کە چی کردە مارەیی بۆی؟ گوتی: ئازادکردنەکەی کردە مارەیی.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٧، ومسلم: ١٥٤، وأبو داود: ٢٠٥٣، والترمذي: ١١١٦، والنسائي: ٣٣٤٤ و ٣٣٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٩٤٧ و ٥٠٨٦، ومسلم بإثر: ١٤٢٧، وأبو داود: ٢٠٥٤، والترمذي: ١١١٥، والنسائي: ٣٣٤٢ و ٣٣٤٣ و ٣٣٨٠.

**١٩٥٨- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَعْتَقَ صَفِيَّةَ وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا، وَتَزَوَّجَهَا»[١].**

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ صەفییەی ئازادکرد و ئازادکردنەکەی بۆ کردە مارەیی و خۆی مارەی کردەوە.

## بابەت: ژنهێنانی بەندە بەبێ مۆڵەتی گەورەکەی

**١٩٥٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَزَوَّجَ الْعَبْدُ بِغَيْرِ إِذْنِ سَيِّدِهِ كَانَ عَاهِرًا»[٢].**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەک بەبێ مۆڵەتی گەورەکەی ژن مارە بکات (لە خۆی) ئەوە زیناکارە.

**١٩٦٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا عَبْدٍ تَزَوَّجَ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَهُوَ زَانٍ»[٣].**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەک بەبێ مۆڵەتی گەورەکەی ژن مارە ببڕێ، ئەوە زیناکارە.

## بابەت: قەدەغەکردنی هاوسەرگیری کاتی

**١٩٦١- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْإِنْسِيَّةِ»[٤].**

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا مارە بڕین و ژنهێنانی کاتی، هەروەها خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵی قەدەغە کرد.

**١٩٦٢- عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ الْعُزْبَةَ قَدِ اشْتَدَّتْ عَلَيْنَا، قَالَ: «فَاسْتَمْتِعُوا مِنْ هَذِهِ النِّسَاءِ»، فَأَتَيْنَاهُنَّ فَأَبَيْنَ**

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) حسن لغيره.

(٣) حسن لغيره.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢١٦، ومسلم: ١٤٠٧، والترمذي: ١١٢١ و ١٧٩٤، والنسائي: ٤٣٣٤ و ٤٣٣٥.




أَنْ يَنْكِحْنَنَا إِلَّا أَنْ نَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُنَّ أَجَلًا، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «اجْعَلُوا بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُنَّ أَجَلًا»، فَخَرَجْتُ أَنَا وَابْنُ عَمٍّ لِي، مَعَهُ بُرْدٌ وَمَعِي بُرْدٌ، وَبُرْدُهُ أَجْوَدُ مِنْ بُرْدِي، وَأَنَا أَشَبُّ مِنْهُ، فَأَتَيْنَا عَلَى امْرَأَةٍ، فَقَالَتْ: بُرْدٌ كَبُرْدٍ، فَتَزَوَّجْتُهَا، فَمَكَثْتُ عِنْدَهَا تِلْكَ اللَّيْلَةَ، ثُمَّ غَدَوْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمٌ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْبَابِ، وَهُوَ يَقُولُ: «أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِي الِاسْتِمْتَاعِ، أَلَا وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَيْءٌ فَلْيُخْلِ سَبِيلَهَا، وَلَا تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا»[١].

واتە: ڕەبیعی کوڕی سەبرە لە باوکییەوە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا دەرچووین، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی کە ژنمان لەگەڵدا نیە تینی بۆ هێناوین، فەرمووی: ئەو ئافرەتانە مارە ببڕن و چێژیان لێ ببینن، ئێمەش هاتینە لای ئافرەتەکان و ئەوانیش ڕێگایان نەدا (بە مارە بڕین) بەبێ دانانی کاتێکی دیاریکراو، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: لە نێوان خۆتان و ئەواندا کاتێک دابنێین، (ڕاوی) دەڵێ: من و کوڕە مامێکم بەیەکەوە ڕۆیشتین، هەریەکەمان پۆشاکێکی یەمەنی خەتداری پێبوو، پۆشاکی کوڕە مامەکەم لە هی من چاکتر بوو، بەڵام من گەنجتر بووم لەو، جا هاتین بۆ لای ئافرەتێک و ئەویش گوتی: پۆشاکەکە وەکو پۆشاکەکەیە (واتە: جیاوازیان نیە، جا هی ئەو باشتریش بێ)، من مارەم کرد و ئەو شەوەش لەگەڵم بوو، پاشان بەیانیم کردەوە و لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان ڕوکن و دەرگای کەعبە ڕاوەستابوو، دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە بێگومان من مۆڵەتم پێدان بە مارەکردنی ئافرەت بە شێوەی کاتی، بەڵام ئاگاداربن بە دڵنیایی خوا قەدەغەی کرد تاوەکو ڕۆژی قیامەت، جا هەر کەسێک یەکێکی لایە با ڕێگەی بدات بڕوات و لەو شتەی کە پێتان داون هیچیان لێ وەرمەگرنەوە.

**١٩٦٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: لَمَّا وَلِيَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ خَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: «إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَذِنَ لَنَا فِي الْمُتْعَةِ ثَلَاثًا، ثُمَّ حَرَّمَهَا، وَاللَّهِ لَا أَعْلَمُ أَحَدًا يَتَمَتَّعُ وَهُوَ مُحْصَنٌ إِلَّا رَجَمْتُهُ بِالْحِجَارَةِ، إِلَّا أَنْ يَأْتِيَنِي بِأَرْبَعَةٍ يَشْهَدُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ أَحَلَّهَا بَعْدَ إِذْ حَرَّمَهَا»[٢].

---

(١) صحيح دون قوله: «حَجَّةِ الْوَدَاعِ» والصواب «يَوْمَ الْفَتْحِ». أخرجه مسلم: ١٤٠٦ بلفظ: «يَوْمَ الْفَتْحِ» والنسائي: ٣٣٦٨.

(٢) حسن.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: کاتێ کە عومەری کوڕی خەتتاب بوو بەفەرمانڕەوا، وتاری بۆ خەڵک دا و گوتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ سێ جار مۆڵەتی مارەبڕینی کاتی پێداین، پاشان قەدەغە و حەڕامی کرد، سوێند بە خوا بزانم هەر کەس ژنی هەبێ و ئەو مارەبڕینە بکات بەردبارانی دەکەم، مەگەر چوار شایەد بێنێ شایەدی بدەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی قەدەغەی کردوە ، جارێک تر حەڵاڵی کردۆتەوە.

## بابەت: ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە و ئافرەت مارە دەکات

**١٩٦٤-** عَنْ يَزِيدَ بْنِ الْأَصَمِّ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي مَيْمُونَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَزَوَّجَهَا وَهُوَ حَلَالٌ» قَالَ: «وَكَانَتْ خَالَتِي وَخَالَةَ ابْنِ عَبَّاسٍ»[١].

واتە: یەزیدی کوڕی ئەصەم ﷺ دەڵێ: مەیمونەی کچی حاریس بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ مارەی بڕیوە و لە ئیحرامدا نەبووە، یەزید دەڵێ: مەیمونە پووری من و ئیبنو عەبباس بوو.

**١٩٦٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَكَحَ وَهُوَ مُحْرِمٌ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ مارەبڕینی کردوە و لە ئیحرامیشدا بووە.

**١٩٦٦-** عَنْ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُحْرِمُ لَا يَنْكِحُ، وَلَا يُنْكِحُ، وَلَا يَخْطُبُ»[٣].

واتە: ئەبانی کوڕی عوسمانی کوڕی عەففان لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە ژن مارە ناکات لە خۆی و ژن بە شوو نادات و خوازبێنیش ناکات (واتە: نابێ ئەوانە ئەنجام بدات).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤١١، وأبو داود: ١٨٤٣، والترمذي: ٨٤٥.

(٢) شاذ. أخرجه البخاري: ١٨٣٧، ومسلم: ١٤١٠، وأبو داود: ١٨٤٤، والترمذي: ٨٤٢، والنسائي: ٢٨٣٧_٢٨٤١ و ٣٢٧١_٣٢٧٤.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٠٩، وأبو داود: ١٨٤١، والترمذي: ٨٤٠، والنسائي: ٢٨٤٢_٢٨٤٤ و ٣٢٧٥ و ٣٢٧٦.

## بابەت: هاوشانی و هاوئاستی

**١٩٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَتَاكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ خُلُقَهُ وَدِينَهُ فَزَوِّجُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ عَرِيضٌ»(١).

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک هات (داخوازی کچی لێکردن) لە ڕەوشت و دینداری ڕازی بوون، لێی مارە بکەن، خۆ ئەگەر ئەوە نەکەن، ئاشووب لەسەر زەوی بڵاودەبێتەوە و پەرەدەسێنێ.

**١٩٦٨-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَخَيَّرُوا لِنُطَفِكُمْ، وَانْكِحُوا الْأَكْفَاءَ، وَأَنْكِحُوا إِلَيْهِمْ»(٢).

**واتە:** عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی باش هەڵبژێرن، بۆ ئەوەی ببێتە خێزانتان و منداڵی لێ بکەوێتەوە، وە هاوشانی خۆتان مارە بکەن و کچ بدەن بە هاوشانی خۆتان.

## بابەت: دابەشکردنی کاتی مانەوە لە نێوان هاوسەراندا

**١٩٦٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ، يَمِيلُ مَعَ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَحَدُ شِقَّيْهِ سَاقِطٌ»(٣).

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دوو ژنی هەبێ و دادگەر نەبێ لە نێوانیاندا و مەیلی بەلای یەکێکیاندا زیاتر بێ، لە ڕۆژی قیامەتدا بە لارو لەنگ دێ.

**١٩٧٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ إِذَا سَافَرَ أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ»(٤).

**واتە:** عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر گەشتی دەکرد لە نێوان هاوسەرانیدا تیرو پشکی دەکرد (بۆ ئەوە کە کامەیان لەگەڵ خۆی بیات).

---

(١) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١٠٨٤. وانظر الترمذي: ١٠٨٥.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٣٣، والترمذي: ١١٤١، والنسائي: ٣٩٤٢.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٩٣، ومسلم: ٢٧٧٠ ضمن حديث طويل، والنسائي: ٣٩٤٢.

**١٩٧١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْسِمُ بَيْنَ نِسَائِهِ فَيَعْدِلُ، ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ هَذَا فِعْلِي فِيمَا أَمْلِكُ، فَلَا تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلَا أَمْلِكُ»[1].**

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی مانەوەی دابەشدەکرد لە نێوان هاوسەرانیدا و دادگەر بوو، پاشان دەیفەرموو: خودایە ئەوەیان ئیشی منە و لە دەست مندایە، سا لێم مەگرە لەسەر شتێک کە بە دەسەڵاتی تۆیە و دەسەڵاتی منی تێدانیە (کە بریتیە لە خۆشویستن لە دڵدا).**

## بابەت: ژن دەتوانێ نۆرە ڕۆژەکەی خۆی بداتە هەوێیەکەی

**١٩٧٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «لَمَّا كَبِرَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا لِعَائِشَةَ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْسِمُ لِعَائِشَةَ بِيَوْمِ سَوْدَةَ»[2].**

**واتە: لە عائیشە ﵂ دەگێڕنەوە، کە گوتوویەتی: کاتێک سەودەی کچی زەمعە لە تەمەن گەورەبوو، ڕۆژەکەی خۆی بەخشی بە عائیشە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەشەکەی سەودەشی لەلای عائیشە بەسەردەبرد.**

**١٩٧٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَجَدَ عَلَى صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ فِي شَيْءٍ، فَقَالَتْ صَفِيَّةُ: يَا عَائِشَةُ، هَلْ لَكِ أَنْ تُرْضِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِّي، وَلَكِ يَوْمِي؟ قَالَتْ: نَعَمْ، فَأَخَذَتْ خِمَارًا لَهَا مَصْبُوغًا بِزَعْفَرَانٍ، فَرَشَّتْهُ بِالْمَاءِ لِيَفُوحَ رِيحُهُ، ثُمَّ قَعَدَتْ إِلَى جَنْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا عَائِشَةُ، إِلَيْكِ عَنِّي، إِنَّهُ لَيْسَ يَوْمَكِ» فَقَالَتْ: ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ، فَأَخْبَرَتْهُ بِالْأَمْرِ، فَرَضِيَ عَنْهَا[3].**

**واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی بەرانبەر صەفیەی کچی حویەی بۆ پەیدابوو، جا صەفیە گوتی: ئەی عائیشە دەتوانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی بکەیەوە لە من و منیش لە بەرانبەردا ڕۆژەکەی خۆمت پێدەدەم؟ (عائیشە) گوتی: بەڵێ! ئنجا سەرپۆشێکی خۆی هێنا کە بە زەعفەران ڕەنگ کرابوو، ئاوی لێ پرژاند بۆ**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢١٣٤، والترمذي: ١١٤٠، والنسائي: ٣٩٤٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٩٣ و ٥٢١٢، ومسلم: ١٤٦٣/٤٧، وأبو داود: ٢١٣٥ و ٢١٣٨ باختلاف.

(٣) ضعيف.

ئەوەی بۆنەکەی بڵاوبێتەوە، پاشان لە تەنیشتی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عائیشە لێم دووربکەوە، چونکە ئەمڕۆ نۆرەی تۆ نیە، (عائیشە) گوتی: ئەوە فەزڵ و چاکەی خوایە کە دەیدات بە هەر کەسێک بیەوێ، ئنجا هەواڵی ئەو کارەی پێدا (کە لە نێوان ئەو و صەفیەدا هەیە)، جا پێغەمبەر ﷺ ڕەزامەندی بۆ صەفیە دەربڕی.

**١٩٧٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: «نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ ﴿وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ ﴿١٢٨﴾﴾ النساء، فِي رَجُلٍ كَانَتْ تَحْتَهُ امْرَأَةٌ قَدْ طَالَتْ صُحْبَتُهَا، وَوَلَدَتْ مِنْهُ أَوْلَادًا، فَأَرَادَ أَنْ يَسْتَبْدِلَ بِهَا، فَرَاضَتْهُ عَلَى أَنْ تُقِيمَ عِنْدَهُ وَلَا يَقْسِمَ لَهَا»[١].**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئەو ئایەتە: ﴿وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ ﴿١٢٨﴾﴾ النساء، واتە: هەر ئاشتەوایی و ڕێککەوتن چاکترە، لەسەر پیاوێک دابەزی کە ژنی هەبوو ماوەیەکی زۆر بەیەکەوە بوون و منداڵی لێی هەبوو، ئنجا پیاوەکە ویستی وازی لێ بێنێ، ژنەکە پیاوەکەی ڕازی کرد (کە وازی لێنەهێنێ) بەوەی کە لەلای پیاوەکەی بێ، بەڵام بەشەکەی خۆی دەست لێ هەڵبگرێ لەوکاتەی کە دەبێ پیاوەکە لەلای بمێنێتەوە.

## بابەت: تکاکردن بۆ مارەبڕینی دوو کەس

**١٩٧٥- عَنْ أَبِي رُهْمٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِنْ أَفْضَلِ الشَّفَاعَةِ، أَنْ يُشَفَّعَ بَيْنَ الِاثْنَيْنِ فِي النِّكَاحِ»[٢].**

واتە: ئەبو ڕوهم ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین تکاکردن ئەو تکاکردنەیە کە لە نێوان دوو کەسدا دەکرێ کە دەیانەوێ هاوسەرگیری بکەن.

**١٩٧٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: عَثَرَ أُسَامَةُ بِعَتَبَةِ الْبَابِ، فَشُجَّ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمِيطِي عَنْهُ الْأَذَى» فَتَقَذَّرْتُهُ، فَجَعَلَ يَمُصُّ عَنْهُ الدَّمَ وَيَمُجُّهُ عَنْ وَجْهِهِ، ثُمَّ قَالَ: «لَوْ كَانَ أُسَامَةُ جَارِيَةً لَحَلَّيْتُهُ وَكَسَوْتُهُ حَتَّى أُنَفِّقَهُ»[٣].**

---

(١) حسن. وانظر البخاري: ٢٤٥٠، ومسلم: ٣٠٢١.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ئوسامە قاچی خلیسکاو لە لای شیپانەی دەرگاو ڕووخساری خوێناوی بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو خوێنە لە (ڕوخساری) ئوسامە لابەرە، منیش بێزم لێی بوویەوە، بۆیە خۆی ﷺ خوێنەکەی ڕووخساری دەمژی فڕێی دەدایەوە (واتە: خاوێنی کردەوە)، پاشان فەرمووی: ئەگەر ئوسامە کچ بووایە، دەمڕازاندەوە و پۆشاکم لەبەر دەکرد هەتاکو جوان دەرکەوتبایە و دەمدا بە شوو (بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سوننەتە کیژۆڵە بە مەبەستی بە شوودان بڕازێنرێتەوە و جوان بکرێ).

## بابەت: جوان مامەڵەکردن لەگەڵ هاوسەرەکاندا

**١٩٧٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِأَهْلِهِ، وَأَنَا خَيْرُكُمْ لِأَهْلِي»[(١)].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: باشترینتان باشترینتانە بۆ خانەوادەکەی، وە من باشترینی ئێوەم بۆ خانەوادەکەم.

**١٩٧٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِهِمْ»[(٢)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترینتان باشترینتانە بۆ هاوسەرانی.

**١٩٧٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «سَابَقَنِي النَّبِيُّ ﷺ فَسَبَقْتُهُ»[(٣)].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێشبڕکێی لەگەڵدا کردم، پێشی کەوتمەوە.

**١٩٨٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ وَهُوَ عَرُوسٌ بِصَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ، جِئْنَ نِسَاءُ الْأَنْصَارِ فَأَخْبَرْنَ عَنْهَا، قَالَتْ: فَتَنَكَّرْتُ وَتَنَقَّبْتُ فَذَهَبْتُ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى عَيْنِي فَعَرَفَنِي، قَالَتْ: فَالْتَفَتَ، فَأَسْرَعْتُ الْمَشْيَ، فَأَدْرَكَنِي فَاحْتَضَنَنِي، فَقَالَ: «كَيْفَ رَأَيْتِ؟» قَالَتْ: قُلْتُ: أَرْسِلْ، يَهُودِيَّةٌ وَسْطَ يَهُودِيَّاتٍ[(٤)].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٧٨.

(٤) ضعيف.




واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە، کە نزیکی هاوسەرگیری بوو لەگەڵ صەفییەی کچی حویەی، ئافرەتانی ئەنصارڕ هاتن بۆ دەنگ و باسی صەفییە، عائیشە دەڵێ: خۆم گۆڕی و پەچەم بە ڕوخسارم دادا و ڕۆیشتم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای چاوی کردم و ناسیمیەوە، دەڵێ: جا ئاوڕی دایەوە، منیش بە خێرایی ڕۆیشتم، دواتر پێغەمبەر ﷺ بینیمیەوە و گرتمیە باوەشی و فەرمووی: (صەفییەت) پێ چۆن بوو؟ گوتم: بەرمبدە، جوولەکەی ناو جوولەکانە (عائیشە بۆیە ئەو قسەیەی کرد چونکە صەفییە تازە مسوڵمان ببو و، باوکی لە گەورە پیاوانی یەهود بووە).

**١٩٨١-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﵁، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: مَا عَلِمْتُ حَتَّى دَخَلَتْ عَلَيَّ زَيْنَبُ بِغَيْرِ إِذْنٍ وَهِيَ غَضْبَى، ثُمَّ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَحَسْبُكَ إِذَا قَلَبَتْ بُنَيَّةُ أَبِي بَكْرٍ ذُرَيْعَتَيْهَا، ثُمَّ أَقْبَلَتْ عَلَيَّ، فَأَعْرَضْتُ عَنْهَا، حَتَّى قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «دُونَكِ، فَانْتَصِرِي» فَأَقْبَلْتُ عَلَيْهَا، حَتَّى رَأَيْتُهَا وَقَدْ يَبِسَ رِيقُهَا فِي فِيهَا، مَا تَرُدُّ عَلَيَّ شَيْئًا، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ[(١)].

واتە: عورِوەی کوڕی زوبەیر ﵁ دەڵێ: عائیشە ﵂ گوتی: نەمزانی هەتا زەینەب هات بۆ ماڵەکەم بەبێ مۆڵەت، کە هاتیش تووڕە بوو، پاشان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا بە تەنها کچەکەی ئەبو بەکرت بەسە (گوێ بە کەسیتر نادەی)؟ عائیشە گوتی: ئنجا ڕووی لە من کرد، منیش ڕووم لێ وەرگێڕا و وەڵامم نەدایەوە، هەتا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یەخەی بگرە و وەڵامی بدەوە خۆت سەربخە، منیش ڕووبەڕووی بوومەوە هەتا وای لێهات تف لە دەمیدا وشک بووەوەو نەیتوانی وەڵامی قسەکانم بداتەوە، بۆیە بینیم پێغەمبەر ﷺ ڕووخساری گەوشایەوە (کە بینی بەسەریدا سەرکەوتم).

**١٩٨٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كُنْتُ أَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ وَأَنَا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَانَ يُسَرِّبُ إِلَيَّ صَوَاحِبَاتِي يُلَاعِبْنَنِي»[(٢)].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: من لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، بە بوکەڵە و شتومەکی یاری منداڵان یاریم دەکرد، (پێغەمبەر ﷺ) کیژۆڵەی هاوڕێی خۆمی بۆ دەناردم تا گەمەو یاریم لەگەڵ بکەن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٣٠، ومسلم: ٢٤٤٠، وأبو داود: ٤٩٣١.

## بابەت: لێدانی ئافرەتان

**١٩٨٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ ﷺ، قَالَ: خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ، ثُمَّ ذَكَرَ النِّسَاءَ، فَوَعَظَهُمْ فِيهِنَّ، ثُمَّ قَالَ: «إِلَامَ يَجْلِدُ أَحَدُكُمُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْأَمَةِ؟ وَلَعَلَّهُ أَنْ يُضَاجِعَهَا مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا، پاشان ئامۆژگاری پیاوانی کرد دەربارەی ئافرەتان، پاشان فەرمووی: (ئەوە چ ڕەفتارێکە) یەکێک لە ئێوە لە هاوسەرەکەی دەدات، وەک چۆن لە کەنیزەکەکەی دەدات، کەچی لە کۆتایی ڕۆژەکەشدا لەوانەیە لەگەڵی بخەوێ.

**١٩٨٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَادِمًا لَهُ، وَلَا امْرَأَةً، وَلَا ضَرَبَ بِيَدِهِ شَيْئًا»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز لە خزمەتکارێکی نەداوە، وە لە هیچ ژنێکیشی نەداوە، وە بە دەستی خۆی لە هیچ شتێکی نەداوە (واتە: لە ماڵەوە یان لە مسوڵمان، ئەگەرنا لە شەڕدا جیاوازە).

**١٩٨٥-** عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَضْرِبُنَّ إِمَاءَ اللَّهِ» فَجَاءَ عُمَرُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ ذَئِرَ النِّسَاءُ عَلَى أَزْوَاجِهِنَّ، فَأْمُرْ بِضَرْبِهِنَّ، فَضُرِبْنَ، فَطَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ ﷺ طَائِفُ نِسَاءٍ كَثِيرٍ، فَلَمَّا أَصْبَحَ، قَالَ: «لَقَدْ طَافَ اللَّيْلَةَ بِآلِ مُحَمَّدٍ سَبْعُونَ امْرَأَةً، كُلُّ امْرَأَةٍ تَشْتَكِي زَوْجَهَا، فَلَا تَجِدُونَ أُولَئِكَ خِيَارَكُمْ»[3].

واتە: ئیاسی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو زوباب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ژنەکانتان مەدەن، ئنجا عومەر هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتان بەرانبەر پیاوەکانیان شەرمیان شکاوە، بۆیە فەرمان بفەرموو بە تەمبێ کردنیان، ئنجا ئافرەتان هەندێکیان لێیان دەدرا، بۆیە ئافرەتانێکی زۆر دەهاتنە لای خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ سکاڵایان دەکرد لە پیاوەکانیان، جا کاتێ بەیانی داهات فەرمووی: ئەمشەو حەفتا ئافرەت هاتووە بۆ لای خانەوادەی موحەممەد ﷺ،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩٤٢، ومسلم: ٢٨٥٥، والترمذي: ٣٣٤٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٣٢٨، وأبو داود: ٤٧٨٦.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٤٦.

هەر ئافرەتێک لەوانە شکایەتی هەبووە لە مێردەکەی، بەڕاستی ئەو پیاوانە (کە لە ژنەکانیان دەدەن بەبێ هۆ) لە پیاوە باشەکانتان نین.

**١٩٨٦-** عَنِ الْأَشْعَثِ بْنِ قَيْسٍ ﷺ، قَالَ: ضِفْتُ عُمَرَ لَيْلَةً، فَلَمَّا كَانَ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ، قَامَ إِلَى امْرَأَتِهِ يَضْرِبُهَا، فَحَجَزْتُ بَيْنَهُمَا، فَلَمَّا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ لِي: يَا أَشْعَثُ، احْفَظْ عَنِّي شَيْئًا سَمِعْتُهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، «لَا يُسْأَلُ الرَّجُلُ فِيمَ يَضْرِبُ امْرَأَتَهُ، وَلَا تَنَمْ إِلَّا عَلَى وِتْرٍ» وَنَسِيتُ الثَّالِثَةَ[١].

واتە: ئەشعەسی کوڕی قەیس ﷺ دەڵێ: شەوێک بە میوانی لەلای عومەر بووم، لە کاتی نیوەشەودا عومەر هەڵساو چوو بۆ لای ژنەکەی لێی بدات، منیش چوومە نێوانیان، جا کاتێ هاتەوە سەر جێگا پێی گوتم: ئەی ئەشعەس سێ شت لە من وەرگرە کە بۆ خۆم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستومە: پیاو پرسیاری لێناکرێ بۆچی لە ژنەکەی داوە، هەروەها مەخەوە تا نوێژی ویتر دەکەی، هی سێیەمیشم بیرچۆتەوە.

**١٩٨٦م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ خَالِدِ بْنِ خِدَاشٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ[٢].

واتە: ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: قژ لکاندن بە قژەوە و خاڵ کوتان

**١٩٨٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، «أَنَّهُ لَعَنَ الْوَاصِلَةَ، وَالْمُسْتَوْصِلَةَ، وَالْوَاشِمَةَ، وَالْمُسْتَوْشِمَةَ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کردوە لەو ئافرەتەی کە قژ (پرچ) دەلکێنێ بە قژی ئافرەتێکی دیکە، یان دەیلکێنێ بە قژی خۆیەوە، هەروەها (نەفرینی کردوە) لەو ئافرەتەی کە خاڵ دەکوتێ بۆ ئافرەتێکی دیکە، وە ئەوەی بۆی کوتراوە.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢١٤٧.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢١٤٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٣٧، ومسلم: ٢١٢٤، وأبو داود: ٤١٦٨، والترمذي: ١٧٥٩ و ٢٧٨٣، والنسائي: ٥٠٩٥ و ٥٢٥١.

**١٩٨٨-** عَنْ أَسْمَاءَ ﵂، قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ ابْنَتِي عُرَيِّسٌ، وَقَدْ أَصَابَتْهَا الْحَصْبَةُ فَتَمَرَّقَ شَعْرُهَا، فَأَصِلُ لَهَا فِيهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعَنَ اللَّهُ الْوَاصِلَةَ، وَالْمُسْتَوْصِلَةَ»[1].

واتە: ئەسماء ﵂ دەڵێ: ئافرەتێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: کچەکەم بووەتە بووک و لەڕاستیدا توشی نەخۆشییەکی پێست بوو، قژی هەڵوەریوە، ئایا قژێکی دیکەی پێوەبلکێنم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا نەفرینی کردوە لەو ئافرەتەی کە قژ دەلکێنێ بە قژی ئافرەتانەوەو، ئەو ئافرەتەش کە بۆی ئەنجام دەدرێ.

**١٩٨٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁، قَالَ: «لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْوَاشِمَاتِ، وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ، وَالْمُتَنَمِّصَاتِ، وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ، الْمُغَيِّرَاتِ لِخَلْقِ اللَّهِ» فَبَلَغَ ذَلِكَ امْرَأَةً مِنْ بَنِي أَسَدٍ، يُقَالُ لَهَا أُمُّ يَعْقُوبَ، فَجَاءَتْ إِلَيْهِ، فَقَالَتْ: بَلَغَنِي عَنْكَ أَنَّكَ قُلْتَ: كَيْتَ وَكَيْتَ، قَالَ: وَمَا لِي لَا أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ قَالَتْ: إِنِّي لَأَقْرَأُ مَا بَيْنَ لَوْحَيْهِ فَمَا وَجَدْتُهُ، قَالَ: إِنْ كُنْتِ قَرَأْتِهِ فَقَدْ وَجَدْتِهِ، أَمَا قَرَأْتِ: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۝٧﴾ الحشر، قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ نَهَى عَنْهُ، قَالَتْ: فَإِنِّي لَأَظُنُّ أَهْلَكَ يَفْعَلُونَ، قَالَ: اذْهَبِي فَانْظُرِي، فَذَهَبَتْ فَنَظَرَتْ فَلَمْ تَرَ مِنْ حَاجَتِهَا شَيْئًا، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ شَيْئًا، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَوْ كَانَتْ كَمَا تَقُولِينَ مَا جَامَعَتْنَا[2].

واتە: عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەو ئافرەتانەی کە خاڵ دەکوتن بۆ خەڵک و ئەوانەشی کە خاڵیان بۆ دەکوترێ، (نەفرینی کردوە) لەو ئافرەتانەی کە موو لە برۆ هەڵدەگرن، ئەوانەشی کە ددانەکانیان شاش دەکەن و کەلێنیان دەخەنە نێوان بۆ جوانی و دروستکراوانی خوا دەگۆڕن، جا ئەو هەواڵە گەیشت بە ئافرەتێک لە بەنو ئەسەد پێیان دەگوت: ئوممو یەعقوب، ئنجا (ئەو ئافرەتە) هات بۆ لای عەبدوڵڵا و پێیگوت: لە تۆوە ئەوەم پێگەیشتووە کە ئەمەو ئەوەت گوتوە، (عەبدوڵڵا) گوتی: چۆن نەفرین لە کەسێک ناکەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی لێکردوە، کە ئەوەش لە قورئاندا هاتوە، ژنەکەش گوتی: هەموو قورئانم خوێندۆتەوە، ئەو شتەی تێدانیە! (عەبدوڵڵا) گوتی: ئەگەر قورئانت خوێندبێتەوە، ئەو ئایەتەت

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٣٥، ومسلم: ٢١٢٢، والنسائي: ٥٠٩٤ و ٥٢٥٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨٨٦، ومسلم: ٢١٢٥، وأبو داود: ٤١٦٩، والترمذي: ٢٧٨٢، والنسائي: ٣٤١٦ و ٥٠٩٩ و ٥١٠٨ و ٥٢٥٢_٥٢٥٥.

بینیوه كه دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۝٧ ﴾ الحشر، واتە: وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی دان وەریبگرن وە ئەوەی لێتانی قەدەغەكرد وازی لێ بهێنن. گوتی: بەڵێ وایە، (عەبدوڵڵا) گوتی: دەی جا پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ئەو شتانەی قەدەغە كردوە، ژنەكە گوتی: من وا گومان دەبەم كە خێزانی تۆ ئەو كارانە دەكات، عەبدوڵڵا گوتی: بڕۆ و تەماشا بكە، ئنجا ژنەكە ڕۆیشت تەماشای كرد هیچی لەو بابەتە نەبینی كە دەیویست، گوتی: هیچم نەبینی، عەبدوڵڵا گوتی: ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێی وابێ (واتە: ئەگەر ئەو كارانە بكەن، كە نایان كەن)، ئەوان لەگەڵ مندا نابن.

## بابەت: چ کاتێك بە باش دەزانرێ بۆ چوونە لای ئافرەت

١٩٩٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «تَزَوَّجَنِي النَّبِيُّ ﷺ فِي شَوَّالٍ، وَبَنَى بِي فِي شَوَّالٍ، فَأَيُّ نِسَائِهِ كَانَ أَحْظَى عِنْدَهُ مِنِّي» وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَسْتَحِبُّ أَنْ تُدْخِلَ نِسَاءَهَا فِي شَوَّالٍ[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ منی لە شەوالدا مارەكرد و هێنامی و لە شەوالیشدا هاتە لام، وە كامە خێزانەی لە من خاوەن بەختتر بوو؟ هەروەها عائیشە بە سوننەتی دەزانی كە ژن هێنان و چوونە لای ژنەكان لە شەوالدا بێت.

١٩٩١- عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، تَزَوَّجَ أُمَّ سَلَمَةَ فِي شَوَّالٍ، وَجَمَعَهَا إِلَيْهِ فِي شَوَّالٍ»[2].

واتە: عەبدولمەلیكی كوڕی حاریسی كوڕی هیشام لە باوكییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئوممو سەلەمەی لە شەوالدا مارەكرد و هەر لە شەوالیشدا هێنایە لای خۆی و لەگەڵیدا كۆبوویەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٢٣، والترمذي: ١٠٩٣، والنسائي: ٣٢٣٦ و ٣٣٧٧.

(٢) ضعيف مرسل.

## بابەت: ئەوەی کە پیاو دەچێتە لای ژنەکەی پێش ئەوەی مارەیشی بداتێ

١٩٩٢- عَنْ عَائِشَةَ ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَمَرَهَا أَنْ تُدْخِلَ عَلَى رَجُلٍ امْرَأَتَهُ قَبْلَ أَنْ يُعْطِيَهَا شَيْئًا»[١].

واتە: عائیشە  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوە کە پیاو بچێتە لای ژنەکەی پێش ئەوەی هیچیشی بداتێ (واتە: دروستە پێش ئەوەی مارەیشی بداتێ بچێتە لای ژنەکەی).

## بابەت: ئەو شتانەی گەشبینی و ڕەشبینی یان تێدایە

١٩٩٣- عَنْ مِخْمَرِ بْنِ مُعَاوِيَةَ ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَا شُؤْمَ، وَقَدْ يَكُونُ الْيُمْنُ فِي ثَلَاثَةٍ: فِي الْمَرْأَةِ، وَالْفَرَسِ، وَالدَّارِ»[٢].

واتە: میخمەری کوڕی موعاویە  دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: ڕەشبینی و بەدبەختی نیە، هەندێ جار دەکرێ گەشبینی و بەختەوەری هەبێ لە سێ شتدا: لە ئافرەت و ئەسپ و خانوودا.

١٩٩٤- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنْ كَانَ فَفِي الْفَرَسِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالْمَسْكَنِ»، يَعْنِي الشُّؤْمَ[٣].

واتە: سەهلی کوڕی سەعد  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بەدبینی و شومی هەبێ، لە ئەسپ و ژن و خانوودایە.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢١٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي بإثر: ٢٨٢٤ عن حكيم بن معاوية.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٥٩، ومسلم: ٢٢٢٦.

**١٩٩٥**- عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «الشُّؤْمُ فِي ثَلَاثٍ: فِي الْفَرَسِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالدَّارِ»، قَالَ الزُّهْرِيُّ: فَحَدَّثَنِي أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ، أَنَّ أُمَّهُ زَيْنَبَ، حَدَّثَتْهُ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، «أَنَّهَا كَانَتْ تَعُدُّ هَؤُلَاءِ الثَّلَاثَةَ، وَتَزِيدُ مَعَهُنَّ السَّيْفَ»[١].

واتە: سالیم لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەدبینی و شومی لە سێ شتدایە: ئەسپ و ژن و خانوو. زوهری دەڵێ: ئەبو عوبەیدەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە بۆی گێڕامەوە لە زەینەبی دایکییەوە کە ئوممو سەلەمە ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەو سێ شتەی بژاردووە و شمشێریشی زیاد کردوە.

## بابەت: ئیرەیی و غیرە کردن

**١٩٩٦**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِنَ الْغَيْرَةِ مَا يُحِبُّ اللَّهُ، وَمِنْهَا مَا يَكْرَهُ اللَّهُ، فَأَمَّا مَا يُحِبُّ اللَّهُ، فَالْغَيْرَةُ فِي الرِّيبَةِ، وَأَمَّا مَا يَكْرَهُ، فَالْغَيْرَةُ فِي غَيْرِ رِيبَةٍ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەندێ غیرەو ئیرەیی هەیە خوا پێی ڕازییە و خۆشی دەوێ، هەندێکیشی هەیە کە خوا خۆشی ناوێ و پێی ڕازی نیە، جا ئەوەی کە خوا پێی خۆشە ئەوەیە کە غیرە بکرێ لەو شتانەی کە جێی گومانن بۆ خراپەکاری و ئەوەشی کە پێی خۆش نیە ئەوەیە کە جێی گومان نەبێ بۆ خراپەکاری.

**١٩٩٧**- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «مَا غِرْتُ عَلَى امْرَأَةٍ قَطُّ مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ، مِمَّا رَأَيْتُ مِنْ ذِكْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَهَا، وَلَقَدْ أَمَرَهُ رَبُّهُ أَنْ يُبَشِّرَهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ» «يَعْنِي مِنْ ذَهَبٍ» قَالَهُ ابْنُ مَاجَةَ[٣].

---

(١) شاذ. والمحفوظ دون السيف. أخرجه البخاري: ٢٨٥٨، ومسلم: ٢٢٢٥/١١٥ أخرجاه بزيادة دون قول الزهري أبو داود: ٣٩٢٢، والترمذي: ٢٨٢٤، والنسائي: ٣٥٦٨ و ٣٥٦٩.

(٢) حسن لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٨١٦، ومسلم: ٢٤٣٥، والترمذي: ٢٠١٧ و ٣٨٧٥.

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: هەرگیز بەرانبەر هیچ ژنێک ئیرەییم نەبردوە بە ئەندازەی ئیرەییم بۆ خاتوو خەدیجە، لەبەر ئەو هەموو باسکردن و یادکردنەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو، هەروەها پەروەردگاری فەرمانی کردوە کە مژدەی پێبدات (بە خاتوو خەدیجە) بە ماڵێک لە بەهەشتدا کە لە «مرواری» یان زێڕ دروستکراوە. ئیبنو ماجە دەڵێ: «قصب»، واتە: زێڕ.

١٩٩٨- عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: «إِنَّ بَنِي هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ اسْتَأْذَنُونِي أَنْ يُنْكِحُوا ابْنَتَهُمْ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ، فَلَا آذَنُ لَهُمْ، ثُمَّ لَا آذَنُ لَهُمْ، ثُمَّ لَا آذَنُ لَهُمْ، إِلَّا أَنْ يُرِيدَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ أَنْ يُطَلِّقَ ابْنَتِي وَيَنْكِحَ ابْنَتَهُمْ، فَإِنَّمَا هِيَ بَضْعَةٌ مِنِّي، يَرِيبُنِي مَا رَابَهَا، وَيُؤْذِينِي مَا آذَاهَا»[١].

واتە: میسوەری کوڕی مەخڕەمە ﷺ دەڵێ: بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە لەسەر دوانگە (مینبەر) بوو دەیفەرموو: بەنو هاشیمی کوڕی موغیرە داوای مۆڵەتیان لێکردووم کە کچەکەیان مارە ببڕن و بیدەن بە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، جا منیش ڕێگایان پێنادەم، پاشان ڕێگایان پێنادەم، پاشان ڕێگایان پێنادەم، مەگەر کە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب کچەکەی من تەڵاق بدات و کچەکەی ئەوان بخوازێ، چونکە بەڕاستی کچەکەم پارچەیەکە لە من، تووشی دڵەڕاوکێ و گومانم دەکات هەر شتێک ئەو تووشی دڵەڕاوکێ و گومان بکات و ئەزیەت بارم دەکات هەر شتێ ئەو ئەزیەت بار بکات.

١٩٩٩- عَنِ الزُّهْرِيِّ ﷺ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْنِ، أَنَّ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ، أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ خَطَبَ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ، وَعِنْدَهُ فَاطِمَةُ بِنْتُ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا سَمِعَتْ بِذَلِكَ فَاطِمَةُ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ قَوْمَكَ يَتَحَدَّثُونَ أَنَّكَ لَا تَغْضَبُ لِبَنَاتِكَ، وَهَذَا عَلِيٌّ نَاكِحًا ابْنَةَ أَبِي جَهْلٍ، قَالَ الْمِسْوَرُ: فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ، فَسَمِعْتُهُ حِينَ تَشَهَّدَ، ثُمَّ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي قَدْ أَنْكَحْتُ أَبَا الْعَاصِ بْنَ الرَّبِيعِ فَحَدَّثَنِي فَصَدَقَنِي، وَإِنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ بَضْعَةٌ مِنِّي، وَأَنَا أَكْرَهُ أَنْ تَفْتِنُوهَا، وَإِنَّهَا وَاللَّهِ لَا تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ وَبِنْتُ عَدُوِّ اللَّهِ عِنْدَ رَجُلٍ وَاحِدٍ أَبَدًا» قَالَ: فَنَزَلَ عَلِيٌّ عَنِ الْخِطْبَةِ[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٣٠، ومسلم: ٢٤٤٩، وأبو داود: ٢٠٧١، والترمذي: ٣٨٦٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١١٠، ومسلم: ٢٤٤٩، وأبو داود: ٢٠٦٩ و ٢٠٧٠.

واتە: زوهریی ﷺ دەڵێ: عەلی کوڕی حوسەین هەواڵی پێدام کە میسوەری کوڕی مەخرەمە هەواڵی پێداوە کە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب داخوازی کچی ئەبو جەهلی کرد، لە کاتێکدا کە فاتیمەی کچی پێغەمبەری ﷺ لەلابوو، جا کاتێک فاتیمە گوێ بیستی ئەو هەواڵە بوو هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: گەل و هۆزەکەت باسی ئەوە دەکەن کە تۆ لەسەر کچەکانت توڕە نابیت و نایەیتە وەڵام، ئەوەتا عەلی داوای کچی ئەبو جەهل دەکات، میسوەر گوتی: ئنجا پێغەمبەر ﷺ هەڵساو (لەسەر مینبەر) گوێم لێبوو کە شایەتمانی هێنا، پاشان فەرمووی: لە دوای ئەوە لەڕاستیدا من ژنم دا بە ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع ئەوەی کە پێی گوتم و پەیمانی پێدام ڕاستی کرد، وە فاتیمەی کچی موحەممەد ﷺ پارچەیەکە لە من و پێم ناخۆشە کە ئەزیەتی بدەن و ناڕەحەتی بکەن، وە بێگومان و سوێند بە خوا کچی پێغەمبەری خوا ﷺ و کچی دوژمنی خوا هەرگیز بەیەکەوە کۆنابنەوە لەلای پیاوێک، ڕاوی دەڵێ: ئنجا عەلیش وازی لە داخوازیەکە هێنا.

## بابەت: ئەو ئافرەتەی خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ کرد

٢٠٠٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: «أَمَا تَسْتَحِي الْمَرْأَةُ أَنْ تَهَبَ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ ﷺ؟ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ﴿٥١﴾ ﴾ الأحزاب، قَالَتْ: فَقُلْتُ إِنَّ رَبَّكَ لَيُسَارِعُ فِي هَوَاكَ»[1].

واتە: عائیشە ﷺ گووتویەتی: ئایا ئافرەت شەرم ناکات کە خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ دەکات؟ تاکو خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ﴿٥١﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) سەرەی هەریەکێک لەخێزانەکانت وویست دوای بخە و هەریەکێ لەوانت وویست (پێشی بخەو) بیهێنە بۆ لای خۆت. (عائیشە) گوتی: گوتم: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) بەڕاستی خوا هەمیشە لەگەڵ ئاواتەکانی تۆ دایە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٨٨، ومسلم: ١٤٦٤.

٢٠٠١- عَنْ ثَابِت ﷺ، قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا مَعَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ وَعِنْدَهُ ابْنَةٌ لَهُ، فَقَالَ أَنَسٌ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَعَرَضَتْ نَفْسَهَا عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ لَكَ فِيَّ حَاجَةٌ؟ فَقَالَتِ ابْنَتُهُ: مَا أَقَلَّ حَيَاءَهَا، قَالَ: «هِيَ خَيْرٌ مِنْكِ، رَغِبَتْ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَعَرَضَتْ نَفْسَهَا عَلَيْهِ»[١].

واتە: سابیت ﷺ دەڵێ: لەلای ئەنەسی کوڕی مالیک دانیشتبووین کچەکەشی لەلای بوو، جا ئەنەس گوتی: ئافرەتێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ کرد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا هیچ پێویستیەکت بە من هەیە، (لەوکاتەدا) کچەکەی (ئەنەس بەسەرسوڕمانەوە) گوتی: ئای کە کەم شەرم بووە، (خۆی پێشکەش کرد بە پێغەمبەر ﷺ)، ئەنەس گوتی: ئەو باشتر بووە لە تۆ، پێغەمبەری خوای ﷺ خۆشویستوەو خۆی پێشکەشی کردوە.

## بابەت: پیاو کە لە منداڵەکەی دەکەوێتە گومانەوە (ئایا لە خۆیەتی، یان نا)

٢٠٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلَامًا أَسْوَدَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟» قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَمَا أَلْوَانُهَا؟» قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: «هَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ؟» قَالَ: إِنَّ فِيهَا لَوُرْقًا، قَالَ: «فَأَنَّى أَتَاهَا ذَلِكَ؟» قَالَ: عَسَى عِرْقٌ نَزَعَهَا قَالَ: «وَهَذَا لَعَلَّ عِرْقًا نَزَعَهُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە بەنی فەزارە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانەکەم منداڵێکی ڕەشی بووە (دیارە بۆ خۆیان سپی پێست بوون و منداڵەکەش ڕەش پێست)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا تۆ وشترت هەیە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ڕەنگیان چۆنە؟ گوتی: سورن، فەرمووی: ئایا ڕەشتاڵەیان تێدایە؟ گوتی: بەڵێ ڕەشتاڵەیان تێدایە، فەرمووی: ئەو ڕەشتاڵە لە کوێوە هاتوە؟ گوتی: دەگونجێ یەکێ لە ڕەچەڵەک و ئەسڵی وشترەکە ڕەشتاڵە بوبێ، فەرمووی: لەوانەیە ئەو منداڵەش بچێتەوە سەر ئەسڵێکی.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥١٢٠ و ٦١٢٣، والنسائي: ٣٢٤٩ و ٣٢٥٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٠٥، ومسلم: ١٥٠٠، وأبو داود: ٢٢٦٠، والترمذي: ٢١٢٨، والنسائي: ٣٤٧٨_٣٤٨٠.




**٢٠٠٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ عَلَى فِرَاشِي غُلَامًا أَسْوَدَ، وَإِنَّا أَهْلُ بَيْتٍ لَمْ يَكُنْ فِينَا أَسْوَدُ قَطُّ، قَالَ: «هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟» قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَمَا أَلْوَانُهَا؟» قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: «هَلْ فِيهَا أَسْوَدُ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «فِيهَا أَوْرَقُ؟» قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَأَنَّى كَانَ ذَلِكَ؟» قَالَ: عَسَى أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ، قَالَ: «فَلَعَلَّ ابْنَكَ هَذَا نَزَعَهُ عِرْقٌ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پیاوێکی خەڵکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ژنەکەم لەسەر جێگەکەم کوڕێکی ڕەش پێستی بووە، وە بنەماڵەی ئێمە هەرگیز ڕەش پێستیان نەبووە، فەرمووی: ئایا وشترت هەیە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ڕەنگیان چۆنە؟ گوتی: سورن، فەرمووی: ڕەشیان تێدایە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: ڕەش تاڵەیان تێدایە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ئێ ئەوە لە کوێوە هاتووە؟! گوتی: لەوانەیە بە ئەسڵێکی خۆی بچێتەوە لە ڕەچەڵەکەکەی، فەرمووی: ئێ کەواتە لەوانەیە کوڕەکەی تۆش بە یەکێک لە ڕەچەڵەکەکەی چوبێتەوە.

## بابەت: منداڵ پاڵدەدرێتە لای شوێنی لە دایک بوونی، داوێن پیسیش بەردی بەزاری

**٢٠٠٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: إِنَّ عَبْدَ بْنَ زَمْعَةَ، وَسَعْدًا اخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي ابْنِ أَمَةِ زَمْعَةَ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَوْصَانِي أَخِي إِذَا قَدِمْتُ مَكَّةَ أَنْ أَنْظُرَ إِلَى ابْنِ أَمَةِ زَمْعَةَ فَأَقْبِضَهُ، وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: أَخِي وَابْنُ أَمَةِ أَبِي، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي، فَرَأَى النَّبِيُّ ﷺ شَبَهَهُ بِعُتْبَةَ، فَقَالَ: «هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ بْنَ زَمْعَةَ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَاحْتَجِبِي عَنْهُ يَا سَوْدَةُ»[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: عەبدی کوڕی زەمعە و سەعد بۆ کێشەیەک هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کە دەربارەی کوڕێکی کەنیزەکی زەمعە بوو، جا سەعد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ براکەم ڕایسپاردووم کە کاتێ هاتمە مەککە بگەڕێم بەدوای کوڕی کەنیزەکی زەمعەدا و بیبەمەوە و وەریگرمەوە، عەبدی کوڕی زەمعەش گوتی: ئەو منداڵە برامە و لە کەنیزەکی باوکم و لەسەر جێگای باوکم بووە، پێغەمبەر ﷺ کە تەماشای کرد بە عوتبە دەچوو (برای سەعد)، ئنجا فەرمووی: ئەی عەبدی کوڕی

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٢١، ومسلم: ١٤٥٧، وأبو داود: ٢٢٧٣، والنسائي: ٣٤٨٤ و ٣٤٨٧.

زەمعە هەق بە تۆیە، چونکە منداڵ بۆ ئەو کەسەیە کە لەسەر جێگای ئەو لە دایک دەبێ (واتە: لە ماڵی ئەو و لە ژێر هاوسەرگیری ئەو)، وە تۆش ئەی سەودە پەچەی بەرانبەر بکەو با نەتبینێ (چونکە برای تۆ نیە).

٢٠٠٥- عَنْ عُمَرَ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى بِالْوَلَدِ لِلْفِرَاشِ»[1].

واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیار و فەرمانی داوە بەوەی کە منداڵ هی ئەو کەسەیە کە لەسەر جێگا و ماڵی ئەودا لە دایک دەبێ (واتە: ژنەکە لە ژێر نیکاحی ئەو بێ و، لەگەڵی دابێ).

٢٠٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: منداڵ هی ئەو کەسەیە کە لەسەر جێگای ئەو منداڵەکە دەبێ، داوێن پیسیش بەردی بە زاری.

٢٠٠٧- عَنْ شُرَحْبِيلِ بْنِ مُسْلِمٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ الْبَاهِلِيَّ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ»[3].

واتە: شورەحبیلی کوڕی موسلیم دەڵێ: گوێم لە ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ بوو، دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: منداڵ هی ئەو کەسەیە کە لەسەر جێگای ئەو منداڵەکە دەبێ، داوێن پیسیش بەردی بە زاری.

## بابەت: ژن و مێرد کە یەکێکیان لە پێش ئەویتر مسوڵمان دەبێ

٢٠٠٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَسْلَمَتْ، فَتَزَوَّجَهَا رَجُلٌ، قَالَ: فَجَاءَ زَوْجُهَا الْأَوَّلُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَسْلَمْتُ مَعَهَا، وَعَلِمَتْ بِإِسْلَامِي، قَالَ: «فَانْتَزَعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ زَوْجِهَا الْآخَرِ، وَرَدَّهَا إِلَى زَوْجِهَا الْأَوَّلِ»[4].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨١٨، ومسلم: ١٤٥٨، والترمذي: ١١٥٧، والنسائي: ٣٤٨٢ و ٣٤٨٣.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٢٣٨، والترمذي: ١١٤٤.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ مسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، دواتر پیاوێک مارەی کرد، ئنجا مێردی یەکەمی هات، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان منیش لەگەڵ ئەودا مسوڵمان بووم و ئەویش بە مسوڵمان بوونی منی زانیوە، گوتی: ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ژنەکەی لە کابرای دیکە وەرگرتەوەو بۆ مێردی یەکەمی گێڕایەوە، (چونکە لە پیاوی دووەم مارەیی نەهاتوە).

٢٠٠٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَدَّ ابْنَتَهُ عَلَى أَبِي الْعَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ بَعْدَ سَنَتَيْنِ بِنِكَاحِهَا الْأَوَّلِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کچەکەی خۆی دوای دوو ساڵ بۆ ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع گێڕایەوە هەر بە مارەکردنی یەکەم جار.

٢٠١٠- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَدَّ ابْنَتَهُ زَيْنَبَ عَلَى أَبِي الْعَاصِ بْنِ الرَّبِيعِ بِنِكَاحٍ جَدِيدٍ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی کچی گێڕایەوە بۆ ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیع بە مارەکردنێکی نوێ.

## بابەت: جووتبوون لەگەڵ هاوسەرەکەی کاتێک شیر بدات بە منداڵ

٢٠١١- عَنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وَهْبٍ الْأَسَدِيَّةِ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «قَدْ أَرَدْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الْغِيَالِ، فَإِذَا فَارِسُ وَالرُّومُ يُغِيلُونَ، فَلَا يَقْتُلُونَ أَوْلَادَهُمْ» وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: وَسُئِلَ عَنِ الْعَزْلِ، فَقَالَ: «هُوَ الْوَأْدُ الْخَفِيُّ»[٣].

واتە: جودامەی کچی وەهبی ئەسەدییە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لەڕاستیدا ویستم کە چوونە لای ئافرەتێک (بۆ جووتبوون) کە شیردەدات بە منداڵ قەدەغە و حەڕام بکەم، بەڵام بیستم کە فارس و ڕۆم دەچنە لای ئافرەتی

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٤٠، والترمذي: ١١٤٣.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١١٤٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٤٢، وأبو داود: ٣٨٨٢، والترمذي: ٢٠٧٦، والنسائي: ٣٣٢٦.




شیردەرو منداڵەکانیشیان ناکوژن، وە ڕاوی دەڵێ: گوێبیست بووم دەیگوت: وە پرسیارکرا دەربارەی عەزل (عەزل: واتە ئاو نەخرێتە شوێنی منداڵبوون)، فەرمووی: عەزل کردن زیندە بە چاڵکردنێکی سووک و شاراوەیە.

**٢٠١٢- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ بْنِ السَّكَنِ ﷺ، وَكَانَتْ مَوْلَاتَهُ، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ سِرًّا، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّ الْغَيْلَ لَيُدْرِكُ الْفَارِسَ عَلَى ظَهْرِ فَرَسِهِ حَتَّى يَصْرَعَهُ»[١].**

واتە: ئەسمائی کچی یەزیدی کوڕی سەکەن ﷺ دەگێڕێتەوە: کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: منداڵەکانتان بە نهێنی مەکوژن، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە چوونە لای ژن کاتێک شیر دەدات بە منداڵ، ئەو کارە ئەوەندە زیانی زۆرە کە ئەگەر ئەو منداڵە ببێ بە سوارچاکیش دوور نیە لەسەر ئەسپەکەی بیخاتە خوارەوەو لە ناوی ببات.

### بابەت: ئەو ژنەی کە مێردەکەی ئەزیەت دەدات

**٢٠١٣- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ امْرَأَةٌ مَعَهَا صَبِيَّانِ لَهَا، قَدْ حَمَلَتْ أَحَدَهُمَا وَهِيَ تَقُودُ الْآخَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حَامِلَاتٌ، وَالِدَاتٌ، رَحِيمَاتٌ، لَوْلَا مَا يَأْتِينَ إِلَى أَزْوَاجِهِنَّ، دَخَلَ مُصَلِّيَاتُهُنَّ الْجَنَّةَ»[٢].**

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ژنێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ دوو منداڵەکەی کە یەکێکیانی هەڵگرتبوو ئەوی دیکەشی بە دەست گرتبوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئافرەتان دووگیان دەبن و نارەحەت دەبن، پاشان منداڵەکانیان دەبێ و ماندوو دەبن پێیەوە، هەروەها بە بەزەیی و بە سۆزن، خۆ ئەگەر مێردەکانیان ئەزیەت نەدەن، تەنها بە نوێژەکانیان دەچنە بەهەشت.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٨٨١.

(٢) ضعيف.




٢٠١٤- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَهَا إِلَّا قَالَتْ زَوْجَتُهُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ: لَا تُؤْذِيهِ، قَاتَلَكِ اللَّهُ، فَإِنَّمَا هُوَ عِنْدَكِ دَخِيلٌ، أَوْشَكَ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَيْنَا»[١].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ ئافرەتێک مێردەکەی ئەزیەت نادات مەگەر ئەوەی کە خێزانەکەی لە حۆریەکان دەڵێ: ئەزیەتی مەدە خوا بتکوژێ، بەڕاستی ئەو پیاوە (ئێستا) لای تۆ میوانە و نزیکە (مردن) لێت جیابکاتەوە و بێت بۆ لای ئێمە.

## بابەت: ئەوەی کە حەڕام شتی حەڵاڵ حەڕام ناکات

٢٠١٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا يُحَرِّمُ الْحَرَامُ الْحَلَالَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شتی حەڕام حەڵاڵەکان حەڕام ناکات.

**تێبینی:** بۆ نمونە ئەگەر کەسێک شتێکی حەڵاڵی لە خۆی حەڕام کرد، وەک خواردنی گۆشتی کەڵەشێر، ئەوە ئەو حەڕام کردنە حەڵاڵی گۆشتی کەڵەشێر حەڕام ناکات. ئەوە مانایەک، مانایەکی تر: ئەگەر کەسێک ژنی پێنجەم بێنێ، ئەوە حەڕامە، بەڵام ژنی چوارەم کە حەڵاڵە لە کابرا حەڕام نابێ!!.



---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١١٧٤.

(٢) ضعيف.




## بابەت: سوەیدی کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە

٢٠١٦- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، طَلَّقَ حَفْصَةَ، ثُمَّ رَاجَعَهَا»[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ حەفصەی خێزانی (بەتەڵاقێك) تەڵاقدا، پاشان گەڕاندیەوە.

٢٠١٧- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَلْعَبُونَ بِحُدُودِ اللَّهِ، يَقُولُ أَحَدُهُمْ: قَدْ طَلَّقْتُكِ، قَدْ رَاجَعْتُكِ، قَدْ طَلَّقْتُكِ»[٢].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی چییانە کە گاڵتە بە سنورەکانی خوا دەکەن، کاتێ یەکێکیان (بە خێزانەکەی) دەڵێ: ئەوە تەڵاقم دای و ئەوە گێڕامیەوە (ژێر نیکاحی خۆم، دیسان دەڵێ:) ئەوە تەلاقم دایەوە (واتە: بەبێ پێویستی ژن تەڵاق دەدەن، پاشان دەیگێڕنەوە، پاشان تەڵاقی دەدەن، بەوەش وەک گاڵتەکردن وایە، چونکە تەلاقدان حاڵەتی ناچاری و پێویستییە نەک بۆ گاڵتەپێکردن).

٢٠١٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبْغَضُ الْحَلَالِ إِلَى اللَّهِ الطَّلَاقُ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بوغزێنراوترین حەڵاڵ لە لای خوا تەڵاقە.

## بابەت: تەڵاقدان لەسەر سوننەتی (پێغەمبەر ﷺ)

٢٠١٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: طَلَّقْتُ امْرَأَتِي وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ طَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يُجَامِعَهَا، وَإِنْ شَاءَ أَمْسَكَهَا، فَإِنَّهَا الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٨٣، والنسائي: ٣٥٦٠.

(٢) حسن.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢١٧٧ و ٢١٧٨.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩٠٨، ومسلم: ١٤٧١، وأبو داود: ٢١٧٩_٢١٨٢، والنسائي: ٣٥٥٥_٣٥٥٧ و ٣٥٥٩.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ژنەکەم تەڵاق دابوو لە کاتێکدا کە لە حەیز دابوو، جا عومەر ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، ئەویش فەرمووی: فەرمانی پێبکە با بیگێڕێتەوە هەتا پاکدەبێتەوە، پاشان دەکەوێتەوە سوڕی مانگانە، پاشان پاک بێتەوە، ئنجا ئەگەر پێی خۆش بوو با تەڵاقی بدات پێش ئەوەی سەرجێی لەگەڵدا بکات، ئەگەر پێشی خۆش بوو با لەلای خۆی بیهێڵێتەوە، ئەوە ئەو ماوەیەیە کە خوا فەرمانی پێکردوە.

٢٠٢٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «طَلَاقُ السُّنَّةِ أَنْ يُطَلِّقَهَا طَاهِرًا مِنْ غَيْرِ جِمَاعٍ»[١].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: تەڵاقی سوننی (یان ڕێگە پێدراو و شەرعی ئەوەیە) لە کاتێکدا تەڵاقی بدات کە پاک بێت و لەو پاکیەدا سەرجێی لەگەڵ نەکردبێ.

٢٠٢١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «فِي طَلَاقِ السُّنَّةِ: يُطَلِّقُهَا عِنْدَ كُلِّ طُهْرٍ تَطْلِيقَةً، فَإِذَا طَهُرَتِ الثَّالِثَةَ، طَلَّقَهَا، وَعَلَيْهَا بَعْدَ ذَلِكَ حَيْضَةٌ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: تەڵاقی سوننەتی ئەوەیە کە لە هەر پاک بوونەوەیەکدا یەک تەڵاقی بدات، جا ئەگەر جاری سێیەم پاک بۆوە تەڵاقی بدات، پاش ئەوە ژنەکە حەیزێکی لەسەر دەبێ (وەکو عیدە).

٢٠٢٢- عَنْ يُونُسَ بْنِ جُبَيْرٍ أَبِي غَلَّابٍ، قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ ﷺ عَنْ رَجُلٍ، طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَقَالَ: «تَعْرِفُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ؟ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَأَتَى عُمَرُ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا» قُلْتُ: أَيُعْتَدُّ بِتِلْكَ؟ قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ؟[٣].

واتە: یونوسی کوڕی جوبەیری ئەبو غەللاب دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو عومەر ﷺ دەربارەی پیاوێک کە ژنەکەی تەڵاق بدات لە کاتێکدا ژنەکەی لە سوڕی مانگانەدایە (ئایا حوکمەکەی چییە؟)، ئنجا (لە وەڵامدا) گوتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەناسی؟ ژنەکەی لە کاتێکدا لە سوڕی مانگانە دابوو تەڵاقدا، جا عومەر هاتە

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٣٩٤ و ٣٣٩٥.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٣٩٤ و ٣٣٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٥٢ و ٥٢٥٨ و ٥٣٣٣، ومسلم: ١٤٧١، وأبو داود: ٢١٨٣ و ٢١٨٤، والترمذي: ١١٧٥، والنسائي: ٣٣٩٩ و ٣٤٠٠.

خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێکرد (بە عەبدوڵڵا) کە ژنەکەی بگێڕێتەوە، گوتم: ئایا ئەو تەڵاقە حیساب دەکرێ و دەکەوێ؟ گوتی: ئەی تۆ چی دەڵێی ئەگەر ئەو تەڵاقدەرە نەیتوانی ژنەکەی بگێڕێتەوە و فەرمانەکە بەجێ بێنێ؟ یان خۆی گێل و ئەحمەق کرد و سەرپێچی کرد و ژنەکەی نەگەڕاندەوە، ئایا بۆی دەبێتە بەهانە و تەڵاقەکەی دەکەوێ؟! (یان بە مانای: تۆ چی دەڵێی ئەگەر کابرای تەڵاقدەر عەقڵی نەما و نەیتوانی بیگێڕێتەوە، ئایا ژنەکە دەبێ بە موعەللەقی بمێنێتەوە؟ نە مێردی هەبێ و نە تەڵاقدراویش بێ؟ کەواتە: هەر چۆنێک بێت ئەو تەڵاقە دەکەوێ و هەژمار دەکرێ با بیدعی و پێچەوانەی سوننەتیش بێت).

## بابەت: ئافرەتی دووگیان چۆن تەڵاق دەدرێت

**٢٠٢٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ يُطَلِّقْهَا وَهِيَ طَاهِرٌ، أَوْ حَامِلٌ»**[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ژنەکەی تەڵاقدا لە کاتێکدا لە سوڕی مانگانە دابوو، جا عومەر ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرد، ئەویش فەرمووی: فەرمانی پێبکە بیگێڕێتەوە، پاشان با لە پاکیدا تەڵاقی بدات یان کاتێ کە دوو گیانە.

## بابەت: کەسێک کە لە دانیشتنێکدا ژنەکەی سێ بە سێ تەڵاق دەدات

**٢٠٢٤- عَنْ عَامِرٍ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: قُلْتُ لِفَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ ﷺ: حَدِّثِينِي عَنْ طَلَاقِكِ، قَالَتْ: «طَلَّقَنِي زَوْجِي ثَلَاثًا، وَهُوَ خَارِجٌ إِلَى الْيَمَنِ، فَأَجَازَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»**[2].

واتە: عامیری شەعبیی ﷺ دەڵێ: بە فاتیمەی کچی قەیسم ﷺ گوت: باسی تەڵاقدانەکەتم بۆ بکە، ئەویش گوتی: مێردەکەم سێ جار تەڵاقی دام، لە کاتێکدا لە دەرەوە لە یەمەن بوو، جا ئەو جۆرە تەڵاقەش پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی پێدا و پەسندی کرد.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٧١، وأبو داود: ٢١٨١، والترمذي: ١١٧٦، والنسائي: ٣٣٩٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٨٠، وأبو داود: ٢٢٩١، والترمذي: ١١٨٠م، والنسائي: ٣٤٠٢ و ٣٤٠٣ و ٣٥٤٥ و ٣٥٤٦.

## بابەت: گەڕاندنەوە (ی ژن، دوای تەڵاقدان)

٢٠٢٥- عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، أَنَّ عِمْرَانَ بْنَ الْحُصَيْنِ ﷺ، سُئِلَ عَنْ رَجُلٍ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ، ثُمَّ يَقَعُ بِهَا وَلَمْ يُشْهِدْ عَلَى طَلَاقِهَا، وَلَا عَلَى رَجْعَتِهَا، فَقَالَ عِمْرَانُ: «طَلَّقْتَ بِغَيْرِ سُنَّةٍ، وَرَاجَعْتَ بِغَيْرِ سُنَّةٍ، أَشْهِدْ عَلَى طَلَاقِهَا، وَعَلَى رَجْعَتِهَا»[1].

واتە: موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی شیخخیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیار کرا لە عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەربارەی پیاوێک کە ژنەکەی تەڵاقداوە (بە تەڵاقی ڕەجعی)، پاشان دەچێتەوە لای بێ ئەوەی شایەدی گرتبێ لەسەر تەڵاقەکەی، یان لەسەر گێڕانەوەکەشی، عیمڕان گوتی: بە جۆرێ تەڵاقت داوە کە لەسەر سوننەت نیەو، گێڕانەوەکەشت بەپێی سوننەت نیە، لەسەر تەڵاقدان و گێڕانەوەکەشی شایەد بگرە (بۆ ئەوەی نەبێتە جێگەی توانج و گومان).

## بابەت: ئافرەتی تەڵاقدراوی دووگیان کاتێ منداڵەکەی بوو دەبێتە تەڵاقی جیابوونەوە

٢٠٢٦- عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَتْ عِنْدَهُ أُمُّ كُلْثُومٍ بِنْتُ عُقْبَةَ، فَقَالَتْ لَهُ وَهِيَ حَامِلٌ: طَيِّبْ نَفْسِي بِتَطْلِيقَةٍ، فَطَلَّقَهَا تَطْلِيقَةً، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ، فَرَجَعَ وَقَدْ وَضَعَتْ، فَقَالَ: مَا لَهَا؟ خَدَعَتْنِي، خَدَعَهَا اللَّهُ، ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «سَبَقَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ، اخْطُبْهَا إِلَى نَفْسِهَا»[2].

واتە: زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ دەگێڕێتەوە، ئوممو کولسومی کچی عوقبە خێزانی بووە، ئنجا (ئوممو کولسوم) لە کاتێکدا کە دوو گیان بووە پێی گوتووە: دڵم خۆش بکە بە تەڵاقێک، ئەویش تەڵاقێکی داوە، پاشان ڕۆیشتوە بۆ نوێژ، ئنجا (لە نوێژ) گەڕاوتەوە، لەوکاتەدا (ژنەکەی) منداڵەکەی بووە، پێی گوتووە: چەندە فێڵباز بوو؟! فێڵی لێکردم، خوا بە فێڵەکەی خۆی لەگەڵی بکات، پاشان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: تازە کار لە کار ترازاوە و بڕیارەکە کۆتایی پێهاتووە (تەڵاقت کەوتووە ناتوانی بیگێڕیتەوە، چونکە عیددەی بەسەرچووە بە بوونی منداڵەکە)، داخوازی بکەوە (بە مارەکردنێکی نوێ).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٨٦.

(٢) صحيح.

## بابەت: ئافرەتی دووگیانی مێرد مردوو، هەرکات منداڵەکەی بوو بۆی هەیە شوو بکاتەوە

٢٠٢٧- عَنْ أَبِي السَّنَابِلِ، قَالَ: وَضَعَتْ سُبَيْعَةُ الْأَسْلَمِيَّةُ بِنْتُ الْحَارِثِ ﵂ حَمْلَهَا بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِبِضْعٍ وَعِشْرِينَ لَيْلَةً، فَلَمَّا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا تَشَوَّفَتْ، فَعِيبَ ذَلِكَ عَلَيْهَا، وَذُكِرَ أَمْرُهَا لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنْ تَفْعَلْ فَقَدْ مَضَى أَجَلُهَا»[١].

واتە: ئەبو سەنابیل، دەڵێ: سوبەیعەی ئەسلەمی کچی حاریس ﵂ بیست و هەندێک شەو لە دوای وەفاتی مێردەکەی منداڵی بوو، جا کاتێک پاکبووە لە خوێنی منداڵ بوون حەزی ئەوەی کرد کە کەسێک داخوازی بکات، بەڵام ڕەخنەیان لێگرت (توانجیان لێدا) لەسەر ئەوە، ئنجا باسەکەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرد، ئەویش فەرمووی: ئەگەر ئەو کارەش بکات (مێرد بکاتەوە) ئاساییە، چونکە ماوەی عیدەکەی بەسەرچووە (بە منداڵ بوونەکە).

٢٠٢٨- عَنْ مَسْرُوقٍ، وَعَمْرِو بْنِ عُتْبَةَ ﵄، أَنَّهُمَا كَتَبَا إِلَى سُبَيْعَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ ﵂ يَسْأَلَانِهَا عَنْ أَمْرِهَا، فَكَتَبَتْ إِلَيْهِمَا: إِنَّهَا وَضَعَتْ بَعْدَ وَفَاةِ زَوْجِهَا بِخَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ، فَتَهَيَّأَتْ تَطْلُبُ الْخَيْرَ، فَمَرَّ بِهَا أَبُو السَّنَابِلِ بْنُ بَعْكَكٍ، فَقَالَ: قَدْ أَسْرَعْتِ، اعْتَدِّي آخِرَ الْأَجَلَيْنِ، أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اسْتَغْفِرْ لِي، قَالَ: «وَفِيمَ ذَاكَ؟» فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: «إِنْ وَجَدْتِ زَوْجًا صَالِحًا فَتَزَوَّجِي»[٢].

واتە: مەسروق و عەمری کوڕی عوتبە ﵄ دەگێڕنەوە: کە هەردووکیان نامەیەکیان نووسی بۆ سوبەیعەی کچی حاریس ﵂ تێیدا پرسیاریان لێکردبوو دەربارەی خۆی (کە عیدەکەی چۆن بەسەرچوو، بە منداڵ بوون یان بە چوار مانگ و دە ڕۆژەکە)، ئەویش لە وەڵامدا بۆی نووسین کە ئەو بیست و پێنج شەو لە پاش مردنی مێردەکەی منداڵەکەی بوو، جا بۆیە خۆی ئامادەکردوە کە شوو بکاتەوە، لەوکاتەدا ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەک بەلایدا تێدەپەڕێ و پێی دەڵێ: پەلەت کرد لە خۆ ئامادەکردن، دەبێ چاوەڕێی درێژترین ماوەی عیدە بکەی کە چوار مانگ و دە ڕۆژە، (سوبەیعە)

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١١٩٣، والنسائي: ٣٥٠٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٩١ تعليقاً ٥٣١٩، ومسلم: ١٤٨٤، وأبو داود: ٢٣٠٦، والنسائي: ٣٥١٨_٣٥٢٠.





گوتی: منیش هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێ خۆشبوونم بۆ لە خوا بکە، ئەویش فەرمووی: بۆچی و لەسەر چی؟! منیش هەواڵەکەم پێیدا، ئنجا فەرمووی: هەرکات پیاوێکی باش و چاکەکارت دەستکەوت شووی پێبکە.

**٢٠٢٩- عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، «أَمَرَ سُبَيْعَةَ أَنْ تَنْكِحَ إِذَا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا»[١].**

واتە: میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە سوبەیعە و ڕێگای پێدا کە هەرکات لە خوێنی منداڵ بوون پاک بووەوە، شوو بکاتەوە.

**٢٠٣٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: «وَاللَّهِ، لَمَنْ شَاءَ لَاعَنَّاهُ، لَأُنْزِلَتْ سُورَةُ النِّسَاءِ الْقُصْرَى بَعْدَ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[٢].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: سوێند بە خوا هەرکەس دەیەوێ ئەوە مولاعەنەی لەگەڵ دەکەم لەسەر ئەوەی کە بێگومان سووڕەتی نیسائی کورت (سووڕەتی تەڵاق) لە دوای ئەو حوکمە دابەزی کە دەڵێ: چوار مانگ و دە ڕۆژ.

**ملاعنة:** دوعاکردن لە خود و لەعنەت لەخۆ کردن ئەگەر درۆ بکات، لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوە.

## بابەت: ئەگەر ئافرەتێک مێردی مرد عیددەکەی لە کوێ بەسەر دەبات

**٢٠٣١-** عَنْ زَيْنَب بِنْتِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ - وَكَانَتْ تَحْتَ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ - أَنَّ أُخْتَهُ الْفُرَيْعَةَ بِنْتَ مَالِكٍ، قَالَتْ: خَرَجَ زَوْجِي فِي طَلَبِ أَعْلَاجٍ لَهُ، فَأَدْرَكَهُمْ بِطَرَفِ الْقَدُومِ، فَقَتَلُوهُ، فَجَاءَ نَعْيُ زَوْجِي وَأَنَا فِي دَارٍ مِنْ دُورِ الْأَنْصَارِ، شَاسِعَةٍ عَنْ دَارِ أَهْلِي، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ جَاءَ نَعْيُ زَوْجِي وَأَنَا فِي دَارٍ شَاسِعَةٍ عَنْ دَارِ أَهْلِي، وَدَارِ إِخْوَتِي، وَلَمْ يَدَعْ مَالًا يُنْفِقُ عَلَيَّ، وَلَا مَالًا وَرِثْتُهُ، وَلَا دَارًا يَمْلِكُهَا، فَإِنْ رَأَيْتَ أَنْ تَأْذَنَ لِي فَأَلْحَقَ بِدَارِ أَهْلِي، وَدَارِ إِخْوَتِي فَإِنَّهُ أَحَبُّ إِلَيَّ، وَأَجْمَعُ لِي فِي بَعْضِ أَمْرِي، قَالَ: «فَافْعَلِي إِنْ شِئْتِ» قَالَتْ: فَخَرَجْتُ قَرِيرَةً عَيْنِي لِمَا قَضَى اللَّهُ لِي عَلَى لِسَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، حَتَّى إِذَا كُنْتُ فِي الْمَسْجِدِ، أَوْ فِي بَعْضِ الْحُجْرَةِ دَعَانِي،

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٢٠، والنسائي: ٣٥٠٦ و ٣٥٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩١٠ بنحوه مطولًا، وأبو داود: ٢٣٠٧، والنسائي: ٣٥٢٣.

فَقَالَ: «كَيْفَ زَعَمْتِ؟» قَالَتْ: فَقَصَصْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «امْكُثِي فِي بَيْتِكِ الَّذِي جَاءَ فِيهِ نَعْيُ زَوْجِكِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ» قَالَتْ: فَاعْتَدَدْتُ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا(١).

واتە: زەینەبی کچی کەعبی کچی عوجرە ﷺ دەگێڕێتەوە: - کە لە ژێر نیکاحی ئەبو سەعیدی خودرییدا ﷺ بوو -، خوشکەکەی فوڕەیعەی کچی مالیک گوتی: مێردەکەم بە دوای بەندە هەڵاتووەکانیدا ڕۆیشت، جا لە نزیک قەدوم پێیان گەیشت، بەندەکانیش کوشتیان، هەواڵی مردنی مێردەکەمیان پێدام لە کاتێکدا کە لە یەکێک لە خانووەکانی ئەنصاڕدا بووم کە دوور بوو لە کەس و کارم، لەبەر ئەوە هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی مردنی مێردەکەم پێگەیشت و منیش لە ماڵێکدام کە دوورە لە ماڵی کەس و کارم و براکانم، وە هیچ ماڵێکی ئەوتۆی جێنەهێشتووە کە پێی بژیم و سامانی نیە بە میراتی وەریبگرم و خانویەکیشی نیە، جا ئەگەر ڕێگەم پێبدەی بچمەوە نێو کەس و کارم و براکانم، بۆ من خۆشترە و بۆ کار و بارم باشترە، فەرمووی: ئەگەر پێت خۆشە وابکە (بچۆوە نێو خزم و کەسانت)، منیش ڕۆیشتم و بڕیارەکەی خوام لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی ﷺ زۆر پێخۆش بوو، تا ئەو کاتەی کە لە مزگەوتدا بووم، یان لە یەکێک لە حوجرەکان بووم بانگی کردم و فەرمووی: چۆنت گوت؟ منیش چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: هەر لەو ماڵەدا بمێنەوە کە تیایدا هەواڵی مردنی مێردەکەت پێگەیشت تاکو عیددەت بەسەر دەچێ، گوتی: منیش چوار مانگ و دە ڕۆژ تێیدا مامەوە.

## بابەت: ئافرەتی عیددەدار ئایا لە ماڵ دەچێتە دەر؟

٢٠٣٢- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى مَرْوَانَ، فَقُلْتُ لَهُ: امْرَأَةٌ مِنْ أَهْلِكَ طُلِّقَتْ، فَمَرَرْتُ عَلَيْهَا وَهِيَ تَنْتَقِلُ، فَقَالَتْ: أَمَرَتْنَا فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ، وَأَخْبَرَتْنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «أَمَرَهَا أَنْ تَنْتَقِلَ» فَقَالَ مَرْوَانُ: هِيَ أَمَرَتْهُمْ بِذَلِكَ؟ - قَالَ عُرْوَةُ - فَقُلْتُ: أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ عَابَتْ ذَلِكَ عَائِشَةُ، وَقَالَتْ: «إِنَّ فَاطِمَةَ كَانَتْ فِي مَسْكَنٍ وَحْشٍ فَخِيفَ عَلَيْهَا، فَلِذَلِكَ أَرْخَصَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»(٢).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٠٠، والترمذي: ١٢٠٤، والنسائي: ٣٥٢٨_٣٥٣٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري تعليقاً: ٥٣٢٦، وأبو داود: ٢٢٩٢ وانظر مسلم: ١٤٨٠ و ١٤٨١.

واتە: هیشامی کوڕی عورِوە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: چوومە لای مەڕوان پێمگوت: ئافرەتێکی خزمی تۆ تەڵاق دراوە، منیش بەلایدا تێپەڕیم کە دەهات و دەچوو، ئنجا گوتی: کە فاتیمەی کچی قەیس ﵂ هەواڵی پێداوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای داوە کە دەربچێ، مەڕوان گوتی: ئایا ئەو ڕێگەی ئەوەی پێداون؟ (عورِوە گوتی) گوتم: سوێند بە خوا عائیشە ﵂ ئەو کارەی بە عەیبە و خراپ زانی و نکوڵیشی کردوە، وە گوتی: فاتیمە لە شوێنێکی دوور لە ئاوەدانی بوو بۆ مانەوە کە جێی ترس و ناخۆشی بوو بۆی، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێدا.

**٢٠٣٣-** عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ ﵂: «يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُقْتَحَمَ عَلَيَّ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَتَحَوَّلَ»[1].

واتە: هیشامی کوڕی عورِوە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کە فاتیمەی کچی قەیس ﵂ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە خۆم دەترسێم کە دز و پیاو خراپ بە زۆر بێنە ماڵەکەم، بۆیە (پێغەمبەر ﷺ) ڕێگای پێدا کە شوێنەکەی بگۆڕێ.

**٢٠٣٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: طُلِّقَتْ خَالَتِي، فَأَرَادَتْ أَنْ تَجُدَّ نَخْلَهَا، فَزَجَرَهَا رَجُلٌ أَنْ تَخْرُجَ إِلَيْهِ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «بَلَى، فَجُدِّي نَخْلَكِ، فَإِنَّكِ عَسَى أَنْ تَصَدَّقِي، أَوْ تَفْعَلِي مَعْرُوفًا»[2].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: پوورم تەڵاق درا، جا ویستی کە بەرهەمی خورماکانی ببڕێتەوە، ئنجا پیاوێک سەرزەنشتی کرد کە هاتۆتە دەرەوە لە ماڵ، بۆیە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: بەڵێ دەتوانی، بەرهەمی خورماکانت ببڕەوە، بەڵکو بیکەی بە خێر و صەدەقە، یان کردەوەیەکی چاکە بکەی.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٨٢، والنسائي: ٣٥٤٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٨٣، وأبو داود: ٢٢٩٧، والنسائي: ٣٥٥٠.

## بابەت: ئافرەتێک سێ جار تەڵاق درابێت ئایا جێی مانەوە و خەرجی لەسەر پیاوەکەیە؟

٢٠٣٥- عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي الْجَهْمِ بْنِ صُخَيْرٍ الْعَدَوِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ ﵂، تَقُولُ: «إِنَّ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا ثَلَاثًا، فَلَمْ يَجْعَلْ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُكْنَى، وَلَا نَفَقَةً»[١].

واتە: ئەبو بەکری کوڕی ئەبو جەهمی کوڕی صوخەیری عەدەویی ﷺ دەڵێ: گوێم لە فاتیمەی کچی قەیس ﵂ بوو کە دەیگوت: کە مێردەکەی تەڵاقیدا بە سێ جار تەڵاقدان، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ مافی شوێنی مانەوە و بژێوی ژیانی (لەلایەن مێردەکەیەوە) پێنەدا.

٢٠٣٦- عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: قَالَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ ﵂: طَلَّقَنِي زَوْجِي عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا سُكْنَى لَكِ، وَلَا نَفَقَةَ»[٢].

واتە: شەعبیی دەڵێ: فاتیمەی کچی قەیس گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ مێردەکەم بە سێ جار تەڵاقدان تەڵاقی دام، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مافی شوێنی مانەوە و بژێوی ژیانت لەسەر مێردەکەت نیە.

## بابەت: بەخشش پێدان لەکاتی تەڵاقداندا

٢٠٣٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ عَمْرَةَ بِنْتَ الْجَوْنِ تَعَوَّذَتْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ أُدْخِلَتْ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «لَقَدْ عُذْتِ بِمُعَاذٍ» فَطَلَّقَهَا، وَأَمَرَ أُسَامَةَ، أَوْ أَنَسًا فَمَتَّعَهَا بِثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ رَازِقِيَّةٍ[٣].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە عەمرەتەی کچی جەون (کاتێ پێغەمبەر ﷺ ویستی بچێتە لای) پەنای بە خوا گرت لە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی بەزاتێکی گەورە پەنات گرت، دواتر تەڵاقیدا و فەرمانی بە ئوسامە، یان ئەنەس کرد، کە سێ پارچە پۆشاکی ڕازیقیەی بداتێ (پۆشاکێکی سپییە لە کەتان دروستکراوە).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٤٧ و ١٤٨٠/٤٨، وأبو داود: ٢٢٨٤، والترمذي: ١١٣٥، والنسائي: ٣٤١٨ و ٣٥٥١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٨٠، وأبو داود: ٢٢٩١، والترمذي: ١١٨٠م، والنسائي: ٣٤٠٢ و ٣٤٠٣ و ٣٥٤٥ و ٣٥٤٦.

(٣) منكر بذكر أسامة وأنس. صحيح بلفظ: «فأمر أسيد أن يجهزها ويكسوها ثوبين رازقيين».

## بابەت: کەسێک کە نکووڵی بکات لە تەڵاق

**٢٠٣٨-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا ادَّعَتِ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ زَوْجِهَا، فَجَاءَتْ عَلَى ذَلِكَ بِشَاهِدٍ عَدْلٍ، اسْتُحْلِفَ زَوْجُهَا، فَإِنْ حَلَفَ بَطَلَتْ شَهَادَةُ الشَّاهِدِ، وَإِنْ نَكَلَ، فَنُكُولُهُ بِمَنْزِلَةِ شَاهِدٍ آخَرَ، وَجَازَ طَلَاقُهُ»[1].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک ئافرەتێک سکاڵای ئەوەی کرد کە مێردەکەی تەڵاقی داوەو، شایەدێکی سەر ڕاستیشی هەبوو بۆ دەعواکەی، ئەوە مێردەکەی سوێند دەدرێ، جا ئەگەر سوێندی خوارد (کە تەڵاقی نەداوە) شایەدی شایەدەکە بەتاڵ دەبێتەوە (تەڵاقەکەی ناکەوێ)، خۆ ئەگەر نکوولّی کرد (سوێندی نەخوارد)، نکوولّی کردنەکەی لە جێگای شایەدێکی تر هەژمار دەکرێ و تەڵاقەکەی دەکەوێ.

## بابەت: کەسێک کە گاڵتە بە تەڵاق و نیکاح و گەڕاندنەوەی دوای تەڵاقدان بکات

**٢٠٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ، وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَاحُ، وَالطَّلَاقُ، وَالرَّجْعَةُ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ شت هەیە کە بە ڕاستی بکرێن، یان بە گاڵتە وگەپ، هەر بە ڕاستی هەژمار دەکرێن، مارەبڕین و تەڵاقدان و گێڕانەوەی ئافرەت لە عیدەدا.

## بابەت: کەسێک کە لە دڵ و ناخیدا ژنەکەی تەڵاق بدات بەڵام بە زمان نەیڵێ

**٢٠٤٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا، مَا لَمْ تَعْمَلْ بِهِ، أَوْ تَكَلَّمْ بِهِ»[3].

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٢١٩٤، والترمذي: ١١٨٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٢٨، ومسلم: ١٢٧، وأبو داود: ٢٢٠٩، والترمذي: ١١٨٣، والنسائي: ٣٤٣٣_٣٤٣٥.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا چاوپۆشی کردوە لە ئوممەتەکەم لەوەی کە بە دڵی دادێ (بە خەیاڵ) مادام بە کردەوە کاری پێنەکات، یان بە زمانی نەیڵێ.

## بابەت: تەڵاقی شێتەڵوکە و گچکە و خەوتوو

٢٠٤١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبَرَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ، أَوْ يُفِيقَ» قَالَ أَبُو بَكْرٍ فِي حَدِيثِهِ: وَعَنِ الْمُبْتَلَى حَتَّى يَبْرَأَ[١].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنووس هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس: خەوتوو تاکو بە ئاگادێتەوە، بچووک تاکو گەورە دەبێ (باڵغ دەبێ)، شێت تاکو هۆشی دێتەوە، ئەبو بەکر (کوڕێ ئەبو شەیبە) لە گێڕانەوەکەیدا گوتوویەتی: دەردەدارێک (کە بەهۆیەوە عاقڵ لەدەست بدات) تاکو چاک دەبێتەوە.

٢٠٤٢- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «يُرْفَعُ الْقَلَمُ عَنِ الصَّغِيرِ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ، وَعَنِ النَّائِمِ»[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنووس لەسەر گچکە و شێت و خەوتوو هەڵدەگیرێ.

## بابەت: تەڵاقی بە زۆرو ئەو کەسەی کە لە بیری چۆتەوە

٢٠٤٣- عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغِفَارِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»[٣].

واتە: ئەبو زەڕی غیفاریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا چاوپۆشی کردوە لە ئوممەتەکەم لە هەڵەو، لە بیرچوون و، زۆرلێکردن.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٩٨، والنسائي: ٣٤٣٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٠١_٤٤٠٣، والترمذي: ١٤٢٣.

(٣) ضعيف.

٢٠٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا تُوَسْوِسُ بِهِ صُدُورُهَا، مَا لَمْ تَعْمَلْ بِهِ، أَوْ تَتَكَلَّمْ بِهِ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا چاوپۆشی کردوە لە ئوممەتەکەم لەسەر ئەو شتەی کە (بەبێ ویستی خۆی) بە خەیاڵی دادێ، مادام ئەنجمی نەدات، یان نەیڵێ، ئەو شتەش کە بە زۆری پێی دەکرێ.

٢٠٤٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا چاوپۆشی کردوە لە ئوممەتەکەم لە هەڵەو، لە بیرچوون و، زۆرلێکردن.

٢٠٤٦- عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ ﷺ، قَالَتْ: حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا طَلَاقَ، وَلَا عَتَاقَ فِي إِغْلَاقٍ»[3].

واتە: صەفییەی کچی شەیبە ﷺ دەڵێ: عائیشە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە تەڵاق و نە ئازادکردنی کۆیلە لە کاتی تورە بووندا حوکمەکەیان دانامەزرێ (تووڕەبوونێک کە خاوەنەکەی بە جۆرێک عەقڵی لە دەست بدات، نەزانێ لە کاتی تووڕەبوونەکەدا چی گوتووە، نەک هەموو تووڕەبوونێکی ئاسایی).

## بابەت: پێش مارەکردن، تەڵاق نیە

٢٠٤٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا طَلَاقَ فِيمَا لَا يَمْلِكُ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٢٨، ومسلم: ١٢٧، وأبو داود: ٢٢٠٩، والترمذي: ١١٨٣، والنسائي: ٣٤٣٣_٣٤٣٥.

(٢) صحيح.

(٣) حسن بمجموع شواهده. أخرجه أبو داود: ٢١٩٣.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢١٩٠ و ٢١٩١، والترمذي: ١١٨١.

واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەڵاق بوونی نیە (ناکەوێ) لە بەرانبەر کەسێکدا کە هی تۆ نیە (واتە: پێش مارەبڕینی کەسێک ئەگەر تەڵاقیشی لێبخۆی ئەو تەڵاقە دوای مارەبڕین هیچ کاریگەرییەکی نیە).

٢٠٤٨- عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا طَلَاقَ قَبْلَ نِكَاحٍ، وَلَا عِتْقَ قَبْلَ مِلْكٍ»[١].

واتە: میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێش مارەبڕین تەڵاق بوونی نیە، وە بەندە ئازادکردن نیە پێش ئەوەی کە ببێتە موڵکی تۆ.

٢٠٤٩- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا طَلَاقَ قَبْلَ النِّكَاحِ»[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تەڵاقدان پێش مارەبڕین بوونی نیە.

## بابەت: ئەو قسە و وشانەی کە تەڵاقیان پێ دەکەوێ

٢٠٥٠- عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ، أَيُّ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ اسْتَعَاذَتْ مِنْهُ؟ فَقَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ ابْنَةَ الْجَوْنِ لَمَّا دَخَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَدَنَا مِنْهَا، قَالَتْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُذْتِ بِعَظِيمٍ، الْحَقِي بِأَهْلِكِ»[٣].

واتە: ئەوزاعیی دەڵێ: پرسیارم لە زوهری کرد، ئایا کام لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ پەنای بە خوا گرت لە پێغەمبەر ﷺ؟ ئەویش گوتی: عوروە لە عائیشەوە ﷺ هەواڵی پێدام و بۆی گێڕامەوە کە کچی جەون کاتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای و لێی نزیک کەوتەوە، گوتی: پەنا بە خوا دەگرم لە تۆ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پەنات گرت بە زاتێکی گەورە، بۆیە بچۆوە ماڵە بابانت (واتە: «الحقی بأهلك»، ڕستەیەکە کە تەڵاقی پێدەکەوێ، مادام نیەتی لەگەڵدا بێ).

---

(١) حسن لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٥٤، والنسائي: ٣٤١٧.

## بابەت: تەڵاقێک کە تەڵاقی یەکجاری بێت

**٢٠٥١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ يَزِيدَ بْنِ رُكَانَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: «مَا أَرَدْتَ بِهَا؟» قَالَ: وَاحِدَةً، قَالَ: «آللَّهِ، مَا أَرَدْتَ بِهَا إِلَّا وَاحِدَةً؟» قَالَ: آللَّهِ، مَا أَرَدْتُ بِهَا إِلَّا وَاحِدَةً، قَالَ: فَرَدَّهَا عَلَيْهِ[1].

قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ مَاجَةَ: سَمِعْتُ أَبَا الْحَسَنِ عَلِيَّ بْنَ مُحَمَّدٍ الطَّنَافِسِيَّ، يَقُولُ: مَا أَشْرَفَ هَذَا الْحَدِيثَ

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەلی کوڕی یەزیدی کوڕی ڕوکانە لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، ڕوکانە ژنەکەی تەڵاقدا بەیەکجاری، ئنجا هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری لێکرد، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: مەبەستت چۆن بوو؟ گوتی: (مەبەستم تەنها) یەک تەڵاق بوو، فەرمووی: سوێند دەخۆی کە تەنها مەبەستت یەک دانە بووە؟ گوتی: سوێند بەخوا مەبەستم تەنها یەک (تەڵاق) بووە، (ڕاوی) دەڵێ: ئنجا ژنەکەی بۆ گێڕایەوە.

موحەممەدی کوڕی ماجە دەڵێ: گوێم لە ئەبولحەسەن عەلی کوڕی موحەممەدی تەنافیسی بوو (بە سەرسوڕمانەوە) دەیگوت: ئەو فەرموودەیە چەندە پایە و مەقامی بەرزە!!

## بابەت: کەسێک کە ژنەکەی سەرپشک بکات

**٢٠٥٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «خَيَّرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاخْتَرْنَاهُ، فَلَمْ يَرَهُ شَيْئًا»[2].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی کردین (لە نێوان ژیانی دنیاو پێغەمبەری خوا ﷺ)، ئێمەش ئەومان ﷺ هەڵبژارد، وە هیچ شتێکی لەو کارەدا نەبینی (واتە: بە تەڵاق هەژمار نەکرا).

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٢٠٨، والترمذي: ١١٧٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٦٢، ومسلم: ١٤٧٧، وأبو داود: ٢٢٠٣، والترمذي: ١١٧٩، والنسائي: ٣٢٠٢ و ٣٢٠٣ و ٣٤٤١_٣٤٤٥.

٢٠٥٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحزاب، دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْرًا، فَلَا عَلَيْكِ أَنْ لَا تَعْجَلِي فِيهِ حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ»، قَالَتْ: قَدْ عَلِمَ، وَاللَّهِ، أَنَّ أَبَوَيَّ لَمْ يَكُونَا لِيَأْمُرَانِي بِفِرَاقِهِ، قَالَتْ: فَقَرَأَ عَلَيَّ ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا ﴿٢٨﴾ ﴾ الأحزاب، الْآيَاتِ، فَقُلْتُ: فِي هَذَا أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ قَدِ اخْتَرْتُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: کاتێک ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴿٢٩﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: وە ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەکەیتان دەوێت. پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام و فەرمووی: ئەی عائیشە! من شتێکت بۆ باس دەکەم، بەڵام پەلە مەکە لە وەڵامەکەی تاکو ڕاوێژ بە دایک و باوکت دەکەی، (عائیشە ﵂) گوتی: سوێند بە خوا بێگومان دەیزانی کە دایک و باوکم فەرمانم پێناکەن کە لێی جیاببمەوە، ئنجا ئەو ئایەتەی بۆ خوێندمەوە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا ﴿٢٨﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بەخێزانەکانت بڵێ ئەگەر ئێوە ژیانی دونیاو ڕازاوەیی ئەوتان دەوێت. منیش گوتم: لەبارەی ئەوەوە ڕاوێژ بە دایک و باوکم بکەم؟! بێگومان خواو پێغەمبەری خوام ﷺ هەڵبژارد.

## بابەت: ناپەسندی خولع بۆ ئافرەت

٢٠٥٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «لَا تَسْأَلُ الْمَرْأَةُ زَوْجَهَا الطَّلَاقَ فِي غَيْرِ كُنْهِهِ فَتَجِدَ رِيحَ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًا»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت داوای تەڵاق لە مێردەکەی ناکات لە کاتی خۆیدا نەبێ (واتە: هۆکارەکە شەرعی نەبێ)، ئنجا بۆنی بەهەشتیش بکات، لە کاتێکدا کە بۆنی بەهەشت چل ساڵە ڕێگا دەڕوات (واتە: ئەو ئافرەتەی کە داوای تەڵاق لە مێردەکەی دەکات بەبێ هۆکاری شەرعی، شایەنی ئەوە نیە کە بۆنی بەهەشتیش بکات).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٨٦، ومسلم: ١٤٧٥، والترمذي: ٣٣١٨، والنسائي: ٣٤٣٩ و ٣٤٤٠.

(٢) ضعيف.

**٢٠٥٥- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا الطَّلَاقَ فِي غَيْرِ مَا بَأْسٍ، فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ»[1].**

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر ئافرەتێک داوای تەڵاق لە مێردەکەی بکات، بێ ئەوەی هیچ کێشەیەکی (شایەن بە جیابوونەوەی) هەبێ، بۆنی بەهەشتی لێ حەڕامە.

## بابەت: ئەو ئافرەتەی داوای خولع دەکات، چی وەرگرتوە، دەیداتەوە

**٢٠٥٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ جَمِيلَةَ بِنْتَ سَلُولَ ﷺ، أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَتْ: وَاللَّهِ مَا أَعْتِبُ عَلَى ثَابِتٍ فِي دِينٍ، وَلَا خُلُقٍ، وَلَكِنِّي أَكْرَهُ الْكُفْرَ فِي الْإِسْلَامِ، لَا أُطِيقُهُ بُغْضًا، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: «أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟» قَالَتْ: نَعَمْ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَأْخُذَ مِنْهَا حَدِيقَتَهُ، وَلَا يَزْدَادَ[2].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، جەمیلەی کچی سەلول ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئنجا گوتی: سوێند بە خوا ڕەخنەم نیە لە دینداریی و ڕەوشتی سابت، (بەڵام ئاکاری ناڕێکە)، ترسم هەیە کارێک بکەم کە پێچەوانەی ئیسلامە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەو باخچەیەی پێی دابووی بۆی دەگێڕیتەوە، گوتی: بەڵێ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە سابت کرد کە باخچەکەی لێ وەربگرێتەوەو، هیچی زیاتر لێ وەرنەگرێ.

**٢٠٥٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: كَانَتْ حَبِيبَةُ بِنْتُ سَهْلٍ تَحْتَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، وَكَانَ رَجُلًا دَمِيمًا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ، لَوْلَا مَخَافَةُ اللَّهِ، إِذَا دَخَلَ عَلَيَّ لَبَصَقْتُ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَرُدِّينَ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ؟» قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: فَرَدَّتْ عَلَيْهِ حَدِيقَتَهُ، قَالَ: فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[3].**

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٢٦، والترمذي: ١١٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٧٣ و ٥٢٧٧، والنسائي: ٣٤٦٣.

(٣) حسن لغيره.

واتە: عەمڕی كوڕی شوعەیب لە باوكییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: حەبیبەی كچی سەهل كە خێزانی سابتی كوڕی قەیسی كوڕی شەمماس بوو، كەسێكی ورتە باڵاو ناشیرین بوو، (حەبیبە) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بە خوا، ئەگەر لە ترسی خوا نەبێ هەركات هاتبایە بۆ لام، تفم لە ڕوخساری دەكرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەو باخچەیەی خۆی بۆ دەگێڕیتەوە (لە بەرانبەر تەڵاقدانەكەت)؟ گوتی: بەڵێ، ئنجا باخچەكەی بۆ گێڕایەوە، (ڕاوی) گوتی: ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەكتری جیاكردنەوە.

## بابەت: عیددەی ئافرەتێک کە خولعی کردبێ

٢٠٥٨- عَنْ عُبَادَةُ بْنُ الْوَلِيدِ بْنِ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ لَهَا: حَدِّثِينِي حَدِيثَكِ، قَالَتْ: اخْتَلَعْتُ مِنْ زَوْجِي، ثُمَّ جِئْتُ عُثْمَانَ، فَسَأَلْتُ: مَاذَا عَلَيَّ مِنَ الْعِدَّةِ؟ فَقَالَ: «لَا عِدَّةَ عَلَيْكِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ حَدِيثَ عَهْدٍ بِكِ، فَتَمْكُثِينَ عِنْدَهُ حَتَّى تَحِيضِينَ حَيْضَةً» قَالَتْ: «وَإِنَّمَا تَبِعَ فِي ذَلِكَ قَضَاءَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي مَرْيَمَ الْمَغَالِيَّةِ، وَكَانَتْ تَحْتَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ، فَاخْتَلَعَتْ مِنْهُ»[١].

واتە: عوبادەی كوڕی وەلیدی كوڕی عوبادەی كوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، لە ڕوبەییعی كچی موعەویزی كوڕی عەفرائەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، گوتوویەتی: پێمگوت (بە ڕوبەیع): باسی بەسەرهاتەكەی خۆتم بۆ بكە، ئەویش گوتی: لەگەڵ مێردەكەم خولعم كرد، پاشان هاتمە لای عوسمان و لێم پرسی: چ شتێكم لەسەرە لە عیددە و مانەوە (دوای خولع)؟ ئەویش گوتی: تۆ عیددەت لەسەر نیە، مەگەر تازە لەگەڵ مێردەكەت كۆبووبنەوە، ئەوكات لەلای دەمێنیەوە تاوەكو حەیزێک دەبینی، (ڕوبەییع) گوتی: لەو بڕیارەدا (عوسمان) شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ كەوت، (كە پێغەمبەر ﷺ) دەربارەی مەریەمی مەغالییە (مەعالییە تیرەیەكن لە ئەنصار) بڕیاری لەسەر دابوو، كە خێزانی سابیتی كوڕی قەیس بوو خولعی لەگەڵ كردبوو (واتە: پێغەمبەر ﷺ هەمان بڕیاری بینینی یەک حەیزی بۆ مەریەم دابوو).

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ١١٨٥، والنسائي: ٣٤٩٨.

## بابەت: سوێند خواردنی مێرد بۆ نەچوونە لای خێزانی

**٢٠٥٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: أَقْسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ لَا يَدْخُلَ عَلَى نِسَائِهِ شَهْرًا، فَمَكَثَ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ يَوْمًا، حَتَّى إِذَا كَانَ مِسَاءَ ثَلَاثِينَ، دَخَلَ عَلَيَّ، فَقُلْتُ: إِنَّكَ أَقْسَمْتَ أَنْ لَا تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْرًا، فَقَالَ: «الشَّهْرُ كَذَا» يُرْسِلُ أَصَابِعَهُ فِيهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، «وَالشَّهْرُ كَذَا» وَأَرْسَلَ أَصَابِعَهُ كُلَّهَا، وَأَمْسَكَ إِصْبَعًا وَاحِدًا فِي الثَّالِثَةِ**[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی لە خێزانەکانی خوارد کە تاوەکو یەک مانگ نەچێتە لایان، جا بیست و نۆ ڕۆژ مایەوە (نەچوو بۆ لایان) تاکو ئێوارەی سییەم، جا هات بۆ لای من، منیش گوتم: سوێندت خواردووە کە تاکو یەک مانگ نەیەیتە لامان! ئەویش فەرمووی: مانگ ئەوەندە ڕۆژەیە بە پەنجەکانی ئاماژەی پێکرد سێ جار، کە سی ڕۆژە، وە ئەو مانگەش ئەوەندەیە بە پەنجەکانی ئاماژەی پێکرد کە بیست و نۆ ڕۆژە (واتە: ئەو مانگەی کە سوێندی تێدا خواردووە بیست و نۆ ڕۆژی بووە، پەنجەکانی سێ جار بڵاوکردەوەو لە جاری سێیەمدا پەنجەیەکیانی گرتەوە، واتە: بیست و نۆ ڕۆژە).

**٢٠٦٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنَّمَا آلَى لِأَنَّ زَيْنَبَ رَدَّتْ عَلَيْهِ هَدِيَّتَهُ» فَقَالَتْ عَائِشَةُ: لَقَدْ أَقْمَأَتْكَ، فَغَضِبَ ﷺ فَآلَى مِنْهُنَّ**[2].

واتە: لە عائیشە ﵂ گێڕدراوەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەوەی کە زەینەب ئەو هەدیەیەی پێی دابوو بۆ (پێغەمبەر ﷺ)ـی گێڕایەوە سوێندی (لە خێزانەکانی) خوارد، عائیشەش ﵂ گوتبووی: بەڕاستی ڕێزی گەورەیی تۆی نەگرت (چونکە هەدیەکەی گێڕاوەتەوە)، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) تووڕە بوو سوێندی لە هەموویان خوارد (وەکو پەند و دەرس بۆ هەموویان).

**٢٠٦١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ آلَى مِنْ بَعْضِ نِسَائِهِ شَهْرًا، فَلَمَّا كَانَ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ رَاحَ، أَوْ غَدَا، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا مَضَى تِسْعٌ وَعِشْرُونَ، فَقَالَ: «الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ»**[3].

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩١٠ و ٥٢٠٢، ومسلم: ١٠٨٥.

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی لە هەندێک لە خێزانەکانی خوارد بۆ ماوەی مانگێک (کە نەچێتە لایان)، ئنجا کاتێک بیست و نۆ ڕۆژ تێپەڕی، لە ئێوارەکەیدا، یان لە بەرەبەیانییەکەیدا ڕۆیشت (بۆ لایان)، پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بیست و نۆ ڕۆژ ڕۆیشتووە! ئەویش فەرمووی: ئەم مانگە بیست و نۆیە.

## بابەت: زیهار
## (کەسێ خێزانی بە دایک و خوشکی خۆی بچوێنێ)[1]

٢٠٦٢- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ الْبَيَاضِيِّ ﵁، قَالَ: كُنْتُ امْرَأً أَسْتَكْثِرُ مِنَ النِّسَاءِ، لَا أَرَى رَجُلًا كَانَ يُصِيبُ مِنْ ذَلِكَ مَا أُصِيبُ، فَلَمَّا دَخَلَ رَمَضَانُ ظَاهَرْتُ مِنَ امْرَأَتِي حَتَّى يَنْسَلِخَ رَمَضَانُ، فَبَيْنَمَا هِيَ تُحَدِّثُنِي ذَاتَ لَيْلَةٍ انْكَشَفَ لِي مِنْهَا شَيْءٌ، فَوَثَبْتُ عَلَيْهَا فَوَاقَعْتُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ غَدَوْتُ عَلَى قَوْمِي فَأَخْبَرْتُهُمْ خَبَرِي، وَقُلْتُ لَهُمْ: سَلُوا لِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: مَا كُنَّا نَفْعَلُ، إِذًا يُنْزِلَ اللَّهُ فِينَا كِتَابًا، أَوْ يَكُونَ فِينَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَوْلٌ، فَيَبْقَى عَلَيْنَا عَارُهُ، وَلَكِنْ سَوْفَ نُسَلِّمُكَ بِجَرِيرَتِكَ، اذْهَبْ أَنْتَ، فَاذْكُرْ شَأْنَكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَخَرَجْتُ حَتَّى جِئْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ الْخَبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنْتَ بِذَاكَ؟» فَقُلْتُ: أَنَا بِذَاكَ، وَهَا أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ صَابِرٌ لِحُكْمِ اللَّهِ عَلَيَّ، قَالَ: «فَأَعْتِقْ رَقَبَةً» قَالَ: قُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَصْبَحْتُ أَمْلِكُ إِلَّا رَقَبَتِي هَذِهِ، قَالَ: «فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ» قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَهَلْ دَخَلَ عَلَيَّ مَا دَخَلَ مِنَ الْبَلَاءِ إِلَّا بِالصَّوْمِ، قَالَ: «فَتَصَدَّقْ، أَوْ أَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا» قَالَ: قُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، لَقَدْ بِتْنَا لَيْلَتَنَا هَذِهِ مَا لَنَا عَشَاءٌ، قَالَ: «فَاذْهَبْ إِلَى صَاحِبِ صَدَقَةِ بَنِي زُرَيْقٍ، فَقُلْ لَهُ، فَلْيَدْفَعْهَا إِلَيْكَ، وَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا، وَانْتَفِعْ بِبَقِيَّتِهَا»[2].

واتە: سەلەمەی کوڕی صەخری بەیازیی ﵁ دەڵێ: من لەو کەسانە بووم کە ئارەزووم بۆ ئافرەت زۆر بوو، هیچ پیاوێک نابینیم کە (لەبەرانبەر ئافرەت) لەو ڕووەوە وەکو خۆم بێت، ئنجا کاتێ کە مانگی ڕەمەزان هات (بۆ ئەوەی توشی قەدەغەکراوەکان نەبم) زیهارم لەگەڵ ژنەکەم کرد تاکو ڕەمەزان کۆتایی دێ، ئیتر شەوێک لە شەوان لە

---

(١) بۆ نموونە: بڵێ: تۆ بۆ من وەک دایکمی.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٢١٣، والترمذي: ١٢٠٠ و ٣٢٩٩.

کاتێکدا کە ئەو قسەی لەگەڵ دەکردم شتێکی (سەرنجڕاکێشی) لێدەرکەوت، منیش پەلامارم دا و جیاعم لەگەڵدا کرد، ئنجا کە بەیانی بۆوە چوومە لای خزمەکانم و هەواڵەکەم پێیاندا و پێم گوتن: ئەگەر پرسیارم بۆ لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، ئەوانیش گوتیان: ئێمە ئەو کارە ناکەین، نەبادا قوڕئانمان لەسەر دابەزێ، یان پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکمان پێ بڵێ، ئەوکات نەنگی و عەیبەکە بۆ ئێمە دەمێنێتەوە، بەڵام خۆت دەدەینە دەست تاوانەکەت، بڕۆ بۆ خۆت باس و خواسی خۆت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بکە، دەڵێ: منیش ڕۆیشتم تاکو گەیشتمە خزمەتی، ئنجا هەواڵەکەم پێدا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تۆ ئەوەت کردوە؟ گوتم: من ئەوەم کردوە، وە ئەوەش منم، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەم بۆ هەر بڕیارێکی خوا کە لەسەرم جێبەجێ بکرێ، فەرمووی: (مادام وایە) بەندەیەک ئازاد بکە، وتم: سوێند بەو زاتەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردوە، جگە لەو گەردنەی خۆم هیچ بەندەیەکی ترم نیە، فەرمووی: کەواتە دوو مانگ لەسەر یەک بەڕۆژوبە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەگەر ئەوەی بەسەرم هاتووە هەر بەهۆی ڕۆژووەوە نیە؟ فەرمووی: کەواتە بڕۆ خواردن دابەش بکە، یان خواردن بدە بە شەست هەژار، گوتم: سوێند بەو زاتەی کە بە هەق تۆی ڕەوانە کردوە، ئەمشەو شەومان کردۆتەوە بەبێ خواردن، فەرمووی: بچۆ بۆ لای ئەو کەسەی کە زەکاتی بەنو زوڕەیق کۆدەکاتەوە پێی بڵێ: بیدات بە تۆ، تۆش خواردنی شەست هەژاری لێبدە و ئەوەی مایەوە بۆ خۆت سوودی لێ وەربگرە و بەکاری بێنە.

**٢٠٦٣-** عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: «تَبَارَكَ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ كُلَّ شَيْءٍ، إِنِّي لَأَسْمَعُ كَلَامَ خَوْلَةَ بِنْتِ ثَعْلَبَةَ وَيَخْفَى عَلَيَّ بَعْضُهُ، وَهِيَ تَشْتَكِي زَوْجَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهِيَ تَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَكَلَ شَبَابِي، وَنَثَرْتُ لَهُ بَطْنِي، حَتَّى إِذَا كَبِرَتْ سِنِّي، وَانْقَطَعَ وَلَدِي، ظَاهَرَ مِنِّي، اللَّهُمَّ إِنِّي أَشْكُو إِلَيْكَ، فَمَا بَرِحَتْ حَتَّى نَزَلَ جِبْرَائِيلُ بِهَؤُلَاءِ الْآيَاتِ: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴿١﴾﴾ المجادلة»[1].

---

(١) صحيح لغيره.

واتە: عوڕوەی کوڕی زوبەیر، دەڵێ: عائیشە ﵂ گوتوویەتی: پاکی و پیرۆزی بۆ ئەو زاتەی کە هەموو شتێک دەبیستێ، (دەڵێ:) بێگومان من گوێم لە قسەکانی خەولەی کچی سەعلەبە بوو، هەندێک لە قسەکانی هەر تێنەدەگەیشتم، جا ئەو لەوکاتەدا سکاڵای لە مێردەکەی دەکرد لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەو (خەولە) دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (مێردەکەم) هەموو گەنجی منی کۆتایی پێهێنا و منداڵی زۆرم بۆ خستەوە هەتاکو تەمەنم گەورەبوو ئیتر منداڵم نابێت، (ئنجا هاتووە) زیهاری لەگەڵدا کردووم، سا ئەی خودایە من سکاڵا لەلای تۆ دەکەم، (عائیشە دەڵێ:) هێشتا نەڕۆیشتبوو جیبریل دابەزی، ئەو ئایەتانەی هێنا: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴿١﴾﴾ المجادلة، واتە: بەڕاستی خوا بیستی ووتەی ئەو ژنەی کە لەبارەی مێردەکەیەوە گفتوگۆی لەگەڵ ئەکردی وە سکاڵای خۆی بۆ لای خوا ئەبرد.

## بابەت: ئەو کەسەی زیهاری کردوە و پێش کەفارەت دانەکە لەگەڵ خێزانی جووت دەبێ

٢٠٦٤- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ صَخْرٍ الْبَيَاضِيِّ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فِي الْمُظَاهِرِ يُوَاقِعُ قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ، قَالَ: «كَفَّارَةٌ وَاحِدَةٌ»(١).

واتە: سەلەمەی کوڕی صەخری بەیازیی ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی کە زیهاری کردوە و چۆتە لای ژنەکەی، پێش ئەوەی کەفارەتەکە بدات، فەرموویەتی: تەنها یەک کەفارەت دەدات (واتە: بە هۆی چوونە لای ژنەکەی کەفارەتەکە نابێتە دوو جار).

٢٠٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ رَجُلًا ظَاهَرَ مِنَ امْرَأَتِهِ، فَغَشِيَهَا قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ «مَا حَمَلَكَ عَلَى ذَلِكَ؟» قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَأَيْتُ بَيَاضَ حِجْلَيْهَا فِي الْقَمَرِ، فَلَمْ أَمْلِكْ نَفْسِي أَنْ وَقَعْتُ عَلَيْهَا، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَمَرَهُ أَلَّا يَقْرَبَهَا حَتَّى يُكَفِّرَ(٢).

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١١٩٨ وجاء عند الترمذي: ١٢٠ و ٣٢٩٩ مطولًا. وانظر أبو داود: ٢٢١٣ و ٢٢١٧.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٢٣ مختصراً، والترمذي: ١١٩٩، والنسائي: ٣٤٥٧.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک زیهاری لەگەڵ ژنەکەی کرد، ئنجا پێش ئەوەی کە کەفارەت بدات چوو بۆ لای ژنەکەی و جیاعی لەگەڵدا کرد، دواتر هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و، باسەکەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: بۆچی ئەو کارەت کردووە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگە شەودا سپیایی خڕخاڵەکانی (پێی ئەوم) بینی، خۆم بۆ نەگیرا و چوومە لای، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی، فەرمانی پێکرد کە جارێکی تر نزیکی ژنەکە نەکەوێتەوە تاوەکو کەفارەتەکە دەدات.

## بابەت: لیعان (کەسێک ژنەکەی خۆی بە زینا تۆمەتبار بکات)

**٢٠٦٦-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: جَاءَ عُوَيْمِرٌ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ، فَقَالَ: سَلْ لِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَرَأَيْتَ رَجُلًا وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا فَقَتَلَهُ، أَيُقْتَلُ بِهِ؟ أَمْ كَيْفَ يَصْنَعُ؟ فَسَأَلَ عَاصِمٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَعَابَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ السَّائِلَ، ثُمَّ لَقِيَهُ عُوَيْمِرٌ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: مَا صَنَعْتَ؟ فَقَالَ: صَنَعْتُ أَنَّكَ لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ، سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَعَابَ السَّائِلَ، فَقَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ لَآتِيَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَلَأَسْأَلَنَّهُ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَوَجَدَهُ قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ فِيهِمَا، فَلَاعَنَ بَيْنَهُمَا، قَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ، لَئِنِ انْطَلَقْتُ بِهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَقَدْ كَذَبْتُ عَلَيْهَا، قَالَ: فَفَارَقَهَا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَصَارَتْ سُنَّةً فِي الْمُتَلَاعِنَيْنِ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «انْظُرُوهَا، فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَسْحَمَ أَدْعَجَ الْعَيْنَيْنِ، عَظِيمَ الْأَلْيَتَيْنِ، فَلَا أُرَاهُ إِلَّا قَدْ صَدَقَ عَلَيْهَا، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أُحَيْمِرَ، كَأَنَّهُ وَحَرَةٌ، فَلَا أُرَاهُ إِلَّا كَاذِبًا» قَالَ: فَجَاءَتْ بِهِ عَلَى النَّعْتِ الْمَكْرُوهِ[١].

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: عووەیمیر هات بۆ لای عاصیمی کوڕی عەددی و گوتی: پرسیارم بۆ بکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەگەر پیاوێک بەسەر ژنەکەیەوە پیاوێکی تری بینی و کوشتی ئایا ئەو کەسە دەکوژرێتەوە (لە تۆڵەدا)؟ یان چی لەگەڵدا دەکرێ؟ عاصیم لەوبارەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پرسیارەکەی پێ ناخۆش بوو بە نەنگی زانی (چونکە شتێک کە ڕوی نەدابێ و پرسیاری دەربارەوە بکرێ)، پاشان عووەیمیر (بە عاصیم) گەیشتەوە و پرسیاری لێکرد و گوتی: چیت کرد؟ ئەویش (عاصیم) گوتی: چیم کرد! بێگومان تۆ چاکەت بۆ من نیە، پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و پرسیارەکەی بە

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٥٩، ومسلم: ١٤٩٢، وأبو داود: ٢٢٤٥_٢٢٥٢، والنسائي: ٣٤٠٢.

عەیب و نەنگی زانی، ئنجا عووەیمیر گوتی: سوێند بە خوا دەچمە لای پێغەمبەری خوا ﷺو، پرسیاریشی لێدەکەم، دواتر هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و بینی کە قورئان دەربارەیان دابەزیوە، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) لیعانی پێکردن لە نێوانیاندا، جا عووەیمیر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەخوا ئەگەر ئاوا لێی بگەڕێم لەگەڵمدا بژیت کەواتە من درۆم کردوە و بوختانم پێکردوە، بۆیە پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێبکات تەڵاقی دا و لێی جیابۆوە، ئیتر لەوکاتەوە لیعان بەو شێوەیە دامەزرا لەنێوان دوو کەس کە لیعان بکەن، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تەماشا بکەن ئەگەر (منداڵەکە) ڕەش بوو، چاویشی گەورەو ڕەش بوون، سمتی گەورە بوون، ئەوە بە دڵنیایی (عووەیمیر) ڕاستی کردوە، خۆ ئەگەر (منداڵەکە) سوورکەڵە بوو وەکو سەرمازەڵە ئەوە بەدڵنیاییەوە درۆی کردوە، ئنجا منداڵەکە بەو شێوە بوو کە ناپەسند و نەویستراو بوو، (چونکە بەو پیاوە دەچوو کە مێردی ژنەکە نەبوو).

**٢٠٦٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ هِلَالَ بْنَ أُمَيَّةَ، قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ بِشَرِيكِ ابْنِ سَحْمَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْبَيِّنَةَ أَوْ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ» فَقَالَ هِلَالُ بْنُ أُمَيَّةَ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، إِنِّي لَصَادِقٌ، وَلَيُنْزِلَنَّ اللَّهُ فِي أَمْرِي مَا يُبَرِّئُ ظَهْرِي، قَالَ: فَنَزَلَتْ: «﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ ﴿٦﴾ ﴾ النور، حَتَّى بَلَغَ ﴿ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾ النور، فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِمَا فَجَاءَا، فَقَامَ هِلَالُ بْنُ أُمَيَّةَ فَشَهِدَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ، يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْ تَائِبٍ؟»، ثُمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ، فَلَمَّا كَانَ عِنْدَ الْخَامِسَةِ: ﴿ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾ النور، قَالُوا لَهَا: إِنَّهَا لَمُوجِبَةٌ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَتَلَكَّأَتْ، وَنَكَصَتْ، حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهَا سَتَرْجِعُ، فَقَالَتْ: وَاللَّهِ لَا أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «انْظُرُوهَا، فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ، سَابِغَ الْأَلْيَتَيْنِ، خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ، فَهُوَ لِشَرِيكِ ابْنِ سَحْمَاءَ» فَجَاءَتْ بِهِ كَذَلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْلَا مَا مَضَى مِنْ كِتَابِ اللَّهِ لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، هیلالی کوڕی ئومەییە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ژنەکەی تاوانبار کرد بە زیناکردن لەگەڵ شەریکی کوڕی سەحماء، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی هیلال) یان بەڵگە و شایەد، یان حەددی بوختانت دەکەوێتە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٤٧، وأبو داود: ٢٢٥٤ و ٢٢٥٦، والترمذي: ٣١٧٩.

سەر، هیلالیش گوتی: سوێند بەو زاتەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردوە بێگومان من ڕاست دەکەم، وە خوا (لەسەرم دێتە وەڵام و) لەسەر کێشەکەم بڕیارێک دادەبەزێنێ کە ڕزگارم بکات لە حەددەکە، (ڕاوی) گوتی: ئنجا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ ﴿٦﴾ ﴾ النور، واتە: ئەو (پیاوانەی) بوهتان بۆ خێزانەکانیان دەکەن وە بێجگە لەخۆیان هیچ شایەتێکیان نیە. تاکو گەیشتە (ئەم ئایەتە): ﴿ وَٱلْخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾ النور، واتە: وە لەپێنجەم جاردا (بڵێت) خەشمی خوای لەسەر بێت ئەگەر مێردەکەی لەڕاستگۆیان بێت. ئنجا پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت و بەدوای هەردووکیانیدا نارد، ئەوانیش هاتن، هیلال هەڵساو شایەتی دا، لەو کاتەشدا پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: بێگومان خوا دەزانێ کە یەکێکتان درۆ دەکات، ئایا کەستان تەوبە ناکات؟ ئنجا (ئافرەتەکە) هەڵساو شایەتیدا، جا کاتێ کاتی شایەتی پێنجەم بوو کە (دەبێ بڵێ): ﴿ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيْهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ ﴾ النور، واتە: خەشمی خوای لەسەر بێت ئەگەر مێردەکەی لەڕاستگۆیان بێت. ئیبنو عەبباس دەڵێ: (ئافرەتەکە) هێواش بووەو سستی کرد و بەرەو دوا گەڕایەوە، بە جۆرێک، گومانمان وابوو کە پاشگەز دەبێتەوە (لە سوێند خواردنەکە)، ئنجا (ئافرەتەکە) گوتی: سوێند بە خوا کەس و کار و خزمەکانم بە درێژایی ڕۆژگار سەرشۆڕ ناکەم (ئیتر سوێندەکەی خوارد)، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چاوەڕوانی بکەن، ئەگەر منداڵێکی بوو کە چاو ڕەش و سمت قەڵەو و پێچک ئەستوور بوو، ئەوە هی شەریکی کوڕی سەحمائە، ئنجا (منداڵێکی) لەو شێوەی بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە بڕیارەکە لە کتێبی خوادا ڕابورد، من لەگەڵ ئەو (ئافرەتە) شتێکی ترم دەبوو.

**٢٠٦٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا فِي الْمَسْجِدِ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ رَجُلٌ: لَوْ أَنَّ رَجُلًا وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا فَقَتَلَهُ، قَتَلْتُمُوهُ، وَإِنْ تَكَلَّمَ جَلَدْتُمُوهُ، وَاللَّهِ لَأَذْكُرَنَّ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَاتِ اللِّعَانِ، ثُمَّ جَاءَ الرَّجُلُ بَعْدَ ذَلِكَ يَقْذِفُ امْرَأَتَهُ، فَلَاعَنَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُمَا، وَقَالَ: «عَسَى أَنْ تَجِيءَ بِهِ أَسْوَدَ» فَجَاءَتْ بِهِ أَسْوَدَ جَعْدًا[1].**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٩٥/١٠، وأبو داود: ٢٢٥٣.

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: شەوێکی هەینی لە ناو مزگەوت بووین، پیاوێک گوتی: باشە ئەگەر پیاوێک لەگەڵ خێزانەکەی پیاوێکیتر ببینێ و بیکوژێ ئێوە دەیکوژنەوە، خۆ ئەگەر باسیشی بکات حەددی لێ دەردەکەن (حەددی بوختان)، سوێند بە خوا ئەبێ ئەو شتە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس بکەم، بۆ پێغەمبەری ﷺ باس کرد، ئیتر خوا ئایەتی لیعانی دابەزاند (ئەو ئایەتانەی کە حوکمی لیعانیان تێدایە)، پاشان هەر ئەو پیاوە هاتەوە و تۆمەتی داوێن پیسی دایە پاڵ ژنەکەی، ئنجا پێغەمبەر ﷺ لیعانی کرد لە نێوانیاندا و فەرمووی: بەڵکو ئەو (ژنە) منداڵێکی ڕەش پێستی قژ لوولی ببێ، ئیتر (هەر واش بوو) مناڵێکی ڕەشی قژ لوولی بوو.

٢٠٦٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، «أَنَّ رَجُلًا لَاعَنَ امْرَأَتَهُ وَانْتَفَى مِنْ وَلَدِهَا، فَفَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَهُمَا، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْمَرْأَةِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک لیعانی لەگەڵ ژنەکەی کرد و نکووڵی کرد لە منداڵەکەی، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکتری جیاکردنەوەو منداڵەکەی دایە ژنەکە.

٢٠٧٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «تَزَوَّجَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ امْرَأَةً مِنْ بَلْعِجْلَانَ، فَدَخَلَ بِهَا فَبَاتَ عِنْدَهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ، قَالَ: مَا وَجَدْتُهَا عَذْرَاءَ، فَرُفِعَ شَأْنُهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَدَعَا الْجَارِيَةَ فَسَأَلَهَا، فَقَالَتْ: بَلَى، قَدْ كُنْتُ عَذْرَاءَ، فَأَمَرَ بِهِمَا فَتَلَاعَنَا وَأَعْطَاهَا الْمَهْرَ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە ئەنصارِ ئافرەتێکی لە هۆزی بەنی عەجلان هێنا، ئنجا شەو لای مایەوە و چوو بۆ لای، جا کاتێک ڕۆژ بۆوە گوتی: ئافرەتەکە کچ نەبوو، ئیتر کێشەکەیان برد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ بانگی ئافرەتەکەی کرد و پرسیاری لێکرد، (ئافرەتەکەش) گوتی: بەڵێ من کچ بووم (پێش شوکردن)، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمانی پێکردن و لیعانیان کردو هەقە مارەیشی بە ئافرەتەکەدا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٧٤٨، ومسلم: ١٤٩٤، وأبو داود: ٢٢٥٩، والترمذي: ١٢٠٣، والنسائي: ٣٤٧٧.

(٢) ضعيف.

**٢٠٧١- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «أَرْبَعٌ مِنَ النِّسَاءِ لَا مُلَاعَنَةَ بَيْنَهُنَّ: النَّصْرَانِيَّةُ تَحْتَ الْمُسْلِمِ، وَالْيَهُودِيَّةُ تَحْتَ الْمُسْلِمِ، وَالْحُرَّةُ تَحْتَ الْمَمْلُوكِ، وَالْمَمْلُوكَةُ تَحْتَ الْحُرِّ»[١].**

واتە: عەمرى كوڕى شوعەيب ﷺ لە باوكييەوە لە باپيريەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: چوار جۆر لە ئافرەتان مولاعەنەيان لەگەڵدا ناكرێ، ئافرەتێكى نەصرانى كە هاوسەرى مسوڵمانێک بێ، وە ئافرەتێكى جوولەكە كە لە ژێر نيكاحى مسوڵماندا بێ، وە ئافرەتێكى ئازاد كە مێردەكەى بەندە بێ و ئافرەتێكى كۆيلە كە مێردەكەى ئازاد بێ.

## بابەت: كەسێ شتێک لە خۆی حەڕام بكات

**٢٠٧٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «آلَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ نِسَائِهِ، وَحَرَّمَ فَجَعَلَ الْحَلَالَ حَرَامًا، وَجَعَلَ فِي الْيَمِينِ كَفَّارَةً»[٢].**

واتە: عائيشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرى خوا ﷺ سوێندى لە خێزانەكانى خوارد و لەسەر خۆى حەڕام كردن، ئەوەى بۆى حەڵاڵ بوو، لەسەر خۆى حەڕام كرد، دوايى كەفارەتى سوێندەكەيدا.

**٢٠٧٣- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: «فِي الْحَرَامِ يَمِينٌ» وَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ، يَقُولُ: ﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب[٣].**

واتە: سەعيدى كوڕى جوبەير، دەڵێ: ئيبنو عەبباس ﷺ گوتوويەتى: كاتێ شتێكى حەڵاڵ بە سوێند خواردن لەسەر خۆت حەڕام دەكەى، وەک سوێند خواردن وايە (واتە: دەبێ كەفارەتى سوێندەكە بدەى، چونكە ئەو شتە حەڕام نابێت مادام خوا حەڵاڵى كردوە)، وە ئيبنو عەبباس ﷺ دەيگوت: ﴿ لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: سوێند بەخوا بەڕاستى لەپێغەمبەرى خوادا ﷺ بۆ ئێوە هەيە سەرمەشقى وپێشەوايەتى چاک.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٢٠١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٩١١ و ٥٢٦٦، ومسلم: ١٤٧٣.

## بابەت: سەرپشک کردنی کەنیزەک کاتێک ئازاد دەکرێ

**٢٠٧٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵄ «أَنَّهَا أَعْتَقَتْ بَرِيرَةَ، فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ لَهَا زَوْجٌ حُرٌّ»[1].

واتە: عائیشە ﵄ دەگێڕێتەوە، کە ئەو بەریرەی ئازاد کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشکی کرد (لەوەی کە لە مێردەکەی جیادەبێتەوە، یان لەلای دەمێنێتەوە)، لە کاتێکدا کە مێردەکەی کەسێکی ئازاد بوو (کۆیلە نەبوو).

**٢٠٧٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: كَانَ زَوْجُ بَرِيرَةَ عَبْدًا، يُقَالُ لَهُ مُغِيثٌ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ يَطُوفُ خَلْفَهَا وَيَبْكِي، وَدُمُوعُهُ تَسِيلُ عَلَى خَدِّهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلْعَبَّاسِ: «يَا عَبَّاسُ، أَلَا تَعْجَبُ مِنْ حُبِّ مُغِيثٍ بَرِيرَةَ، وَمِنْ بُغْضِ بَرِيرَةَ مُغِيثًا؟» فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ رَاجَعْتِيهِ، فَإِنَّهُ أَبُو وَلَدِكِ» قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: «إِنَّمَا أَشْفَعُ» قَالَتْ: لَا حَاجَةَ لِي فِيهِ[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: مێردەکەی بەریرە کۆیلە بوو، پێی دەوترا موغیس، وەک ئێستا لەبەر چاومە کە (موغیس) بە دەوریدا دەخولایەوە و دەگریا و فرمێسکەکانی بە ڕومەتیدا دەهاتە خوارێ، پێغەمبەر ﷺ بە عەبباسی فەرموو: ئایا سەیرت نایە لە خۆشەویستی موغیس بۆ بەریرە و ڕقی بەریرە بۆ موغیس؟ پێغەمبەر ﷺ بە بەریرەی فەرموو: ئەگەر چووبایەوە لای (موغیس)، چونکە ئەو باوکی منداڵەکەتە، بەریرەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا فەرمانم پێدەکەی؟ فەرمووی: نەخێر، من تەنها تکای بۆ دەکەم، (بەریرە) گوتی: من هیچ پێویستیەکم بە ئەو (موغیس) نیە.

**٢٠٧٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵄، قَالَتْ: مَضَى فِي بَرِيرَةَ ثَلَاثُ سُنَنٍ: خُيِّرَتْ حِينَ أُعْتِقَتْ وَكَانَ زَوْجُهَا مَمْلُوكًا، وَكَانُوا يَتَصَدَّقُونَ عَلَيْهَا فَتُهْدِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَيَقُولُ: «هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ، وَهُوَ لَنَا هَدِيَّةٌ» وَقَالَ «الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ»[3].

---

(١) شاذ بلفظ «حراً». أخرجه أبو داود: ٢٢٣٥، والترمذي: ١١٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٢٨٣، وأبو داود: ٢٢٣١ و ٢٢٣٢، والترمذي: ١١٥٦، والنسائي: ٥٤١٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٦ و ٥٢٧٩، ومسلم: ١٥٠٤، والنسائي: ٣٤٤٧_٣٤٤٨.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: سێ بڕیار بەسەر بەریرەدا تێپەڕی و جێگیر بوو: کاتێ ئازاد کرا سەرپشک کرا لە کاتێکدا کە مێردەکەی کۆیلە بوو، کاتێ زەکاتیان پێ دەدا ئەویش بە هەدیە دەیدا بە پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: بۆ ئەو زەکاتە و بۆ ئێمە هەدیە و بەخششە، وە فەرمووی: سەرپەرشتیاری و مافی میراتی کۆیلە بۆ ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەکات.

**٢٠٧٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «أُمِرَتْ بَرِيرَةُ أَنْ تَعْتَدَّ بِثَلَاثِ حِيَضٍ»[١].**

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: بەریرە (دوای ئازاد کردنی و جیابوونەوەی لە مێردەکەی) فەرمانی پێکرا بۆ ماوەی بەسەرچوونی (عیددەکەی) بە سێ حەیز.

**٢٠٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَيَّرَ بَرِيرَةَ»[٢].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەریرەی سەرپشک کرد (لەوەی کە دوای ئازاد کردنی لەلای مێردەکەی دەمێنێتەوە، یان نا).

## بابەت: تەڵاق و عیددەی کەنیزەک

**٢٠٧٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طَلَاقُ الْأَمَةِ اثْنَتَانِ، وَعِدَّتُهَا حَيْضَتَانِ»[٣].**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەڵاقی کەنیزەک دوو دانە تەڵاقە، وە عیددەکەشی دوو دانە حەیزە.

**٢٠٨٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «طَلَاقُ الْأَمَةِ تَطْلِيقَتَانِ، وَقُرْؤُهَا حَيْضَتَانِ»[٤].**

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تەڵاقی کەنیزەک دوو تەڵاقە، وە عیددەکەشی دوو حەیزە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢١٨٩، والترمذي: ١١٨٢.

## بابەت: تەڵاقی کۆیلە (بەندە)

**٢٠٨١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ سَيِّدِي زَوَّجَنِي أَمَتَهُ، وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنِي وَبَيْنَهَا، قَالَ: فَصَعِدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمِنْبَرَ، فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، مَا بَالُ أَحَدِكُمْ يُزَوِّجُ عَبْدَهُ أَمَتَهُ، ثُمَّ يُرِيدُ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَهُمَا، إِنَّمَا الطَّلَاقُ لِمَنْ أَخَذَ بِالسَّاقِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە ڕاستییدا گەورەکەم کەنیزەکێکی خۆی لێ مارە بڕیوم، ئێستاش دەیەوێ لە یەکترمان جیا بکاتەوە، (ڕاوی) گوتی: ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆشتە سەر مینبەرو، فەرمووی: ئەی خەڵکینە، ئەوە چییە بۆ یەکێکتان دێت کەنیزەکەکەی مارە دەبڕێ لە کۆیلەیەکی، پاشان دەیەوێ لە یەکتریان جیا بکاتەوە؟ بێگومان تەڵاق بە دەست ئەو کەسەیە کە مێردی ژنەکەیە (کەسیتر بۆی نیە بە تۆبزی پێی تەڵاق بدات).

## بابەت: ئەو کەسەی کە کەنیزەک تەڵاق بدات دوو جار پاشان بیکڕێتەوە

**٢٠٨٢-** عَنْ أَبِي الْحَسَنِ، مَوْلَى بَنِي نَوْفَلٍ ﷺ، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَنْ «عَبْدٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ تَطْلِيقَتَيْنِ، ثُمَّ أُعْتِقَا، يَتَزَوَّجُهَا؟» قَالَ: نَعَمْ، فَقِيلَ لَهُ: عَمَّنْ؟ قَالَ: قَضَى بِذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ: «لَقَدْ تَحَمَّلَ أَبُو الْحَسَنِ هَذَا صَخْرَةً عَظِيمَةً عَلَى عُنُقِهِ»[٢].

واتە: ئەبو حەسەنی خزمەتکاری بەنو نەوفەل ﷺ دەڵێ: پرسیار لە ئیبنو عەبباس کرا دەربارەی بەندەیەک (کۆیلەیەک) کە ژنەکەی دوو جار تەڵاق بدات، پاشان هەردووکیان ئازاد بین، ئایا دەتوانێ مارەی بکاتەوە؟ گوتی: بەڵێ، گوترا: بە چ بەڵگەیەک؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوە بڕیاری لەسەر داوە. عەبدوڕڕەزاق گوتی: عەبدوڵڵای کوڕی موبارەک گوتی: ئەبو حەسەن بەردێکی گەورەی خستۆتە سەر ملی خۆی.

---

(١) حسن.

(٢) (إسناده) ضعيف. أخرجه البخاري: ٢١٨٧ و ٢١٨٨ بنحوه، والنسائي: ٣٤٢٧ و ٣٤٢٨.

## بابەت: عیددەی ئەو کەنیزەکەی، گەورەکەی دەچێتە لای و منداڵی لێی دەبێ

٢٠٨٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، قَالَ: «لَا تُفْسِدُوا عَلَيْنَا سُنَّةَ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ ﷺ، عِدَّةُ أُمِّ الْوَلَدِ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[1].

واتە: عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: ڕێبازی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ لێ مەشێوێنن عیددەی کەنیزەک کە دەبێتە دایکی منداڵی گەورەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژە.

## بابەت: ناپەسندی خۆڕازاندنەوەی ئافرەتی مێرد مردوو

٢٠٨٤- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ نَافِعٍ، أَنَّهُ سَمِعَ زَيْنَبَ ابْنَةَ أُمِّ سَلَمَةَ، تُحَدِّثُ أَنَّهَا سَمِعَتْ أُمَّ سَلَمَةَ، وَأُمَّ حَبِيبَةَ، تَذْكُرَانِ أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ ابْنَةً لَهَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا، فَاشْتَكَتْ عَيْنُهَا، فَهِيَ تُرِيدُ أَنْ تَكْحَلَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عِنْدَ رَأْسِ الْحَوْلِ، وَإِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا»[2].

واتە: حومەیدی کوڕی نافیع دەگێڕێتەوە: کە گوێی لە زەینەبی کچی ئوممو سەلەمە ﷺ بوو، دەیگێڕایەوە کە گوێی لە ئوممو سەلەمە و ئوممو حەبیبە بووە، باسی ئافرەتێکیان کردوە کە هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتوویەتی: کچەکەی مێردی مردووە و چاوەکانیشی دێشن، ئەویش دەیەوێ کە بە کل بیانرێژێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جاران (لە سەردەمی نەفامیدا) ئێوە پشقلەکەتان لە دوای یەک ساڵ فڕێ دەدا، بەڵام عیددە لە ئیسلامدا چوار مانگ و دە ڕۆژە.

## بابەت: ئایا ئافرەت دەتوانێ تازیەبار بێ بۆ غەیری مێردەکەی؟

٢٠٨٥- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣٠٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٣٦، ومسلم: ١٤٨٨، وأبو داود: ٢٢٩٩، والترمذي: ١١٩٧، والنسائي: ٣٥٠١ و ٣٥٠٢ و ٣٥٠٤ و ٣٥٣٣ و ٣٥٣٨_٣٥٤١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٩١، والنسائي: ٣٥٢٥ و ٣٥٢٦.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بۆ هیچ ئافرەتێک دروست نیە کە لە سێ ڕۆژ زیاتر تازیەبار بێ، بۆ مردوویەک جگە لە مێردەکەی، (کە دەبێ چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیەبار بێ بۆی).

٢٠٨٦- عَنْ حَفْصَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ، إِلَّا عَلَى زَوْجٍ»[1].

واتە: حەفصە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ و ڕێگە پێدراونیە بۆ ئافرەتێک بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێ، لە سێ ڕۆژ زیاتر تازیەبار بێ بۆ هەر مردوویەک جگە لە مێردەکەی.

٢٠٨٧- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ، إِلَّا امْرَأَةٌ تُحِدُّ عَلَى زَوْجِهَا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَلَا تَلْبَسُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا، إِلَّا ثَوْبَ عَصْبٍ، وَلَا تَكْتَحِلُ، وَلَا تَطَيَّبُ إِلَّا عِنْدَ أَدْنَى طُهْرِهَا، بِنُبْذَةٍ مِنْ قُسْطٍ، أَوْ أَظْفَارٍ»[2].

واتە: ئوممو عەتیە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ هیچ مردوویەک زیاتر لە سێ ڕۆژ تازیەبار مەبن، جگە لەو ژنەی کە دەبێ بۆ مێردەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیەبار بێ، وە نابێ جلی ڕەنگکراو لەبەر بکات، مەگەر جلی عەسب نەبێ (جۆرە جلێکە یەمەنییە و ڕەش و سپییە، کە پێشتر ڕەنگ دەکرێ جا دەدورێ)، وە نابێ چاوی بەکل بڕێژێ و نابێ بۆنی خۆش بەکاربێنێ، مەگەر ئەو کاتەی کە لە بێ نوێژی پاک دەبێتەوە، کەمێک لە بۆنی قوست، یان ئەزفار بەکاردێنێ (دوو جۆر بۆنی خۆش بوون لەو سەردەمەدا).

## بابەت: پیاوێک کە باوکی فەرمانی پێدەکات بە تەڵاقدانی ژنەکەی

٢٠٨٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: «كَانَتْ تَحْتِي امْرَأَةٌ، وَكُنْتُ أُحِبُّهَا، وَكَانَ أَبِي يُبْغِضُهَا، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَرَنِي أَنْ أُطَلِّقَهَا، فَطَلَّقْتُهَا»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٩٠، والنسائي: ٣٥٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٣، ومسلم بإثر: ١٤٩١، وأبو داود: ٢٣٠٢ و ٢٣٠٣، والنسائي: ٣٥٣٤.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٥١٣٨، والترمذي: ١١٨٩.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: ژنێکم هەبوو زۆرم خۆشدەویست، باوکیشم ڕقی لێ دەبۆوە، ئنجا عومەر ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرد، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمانی پێکردم کە تەڵاقی بدەم (بە قسەی باوکم بکەم)، منیش تەڵاقم دا.

٢٠٨٩- عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا أَمَرَهُ أَبُوهُ أَوْ أُمُّهُ - شَكَّ شُعْبَةُ - أَنْ يُطَلِّقَ امْرَأَتَهُ، فَجَعَلَ عَلَيْهِ مِائَةَ مُحَرَّرٍ، فَأَتَى أَبَا الدَّرْدَاءِ، فَإِذَا هُوَ يُصَلِّي الضُّحَى وَيُطِيلُهَا، وَصَلَّى مَا بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، فَسَأَلَهُ، فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: «أَوْفِ بِنَذْرِكَ، وَبِرَّ وَالِدَيْكَ» وَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، فَحَافِظْ عَلَى وَالِدَيْكَ أَوِ اتْرُكْ»[1].

واتە: ئەبو عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک باوکی فەرمانی پێکردبوو یان دایکی (شوعبە گومانی هەبوو کامیان بوو) کە ژنەکەی تەڵاق بدات، پیاوەکەش سەد وشتری کردە نەزر ئەگەر تەڵاقی بدات، ئنجا ئەو پیاوە هات بۆ لای ئەبو دەرداء، لەو کاتەدا (ئەبو دەرداء) نوێژی چێشتەنگاوی دەکردو درێژی دەکردەوە، وە لە بەینی نیوەڕۆ و عەسریشدا نوێژی کرد، ئەوجار پرسیاری لێ کرد، جا ئەبو دەرداء گوتی: نەزرەکەت جێبەجێ بکە وە چاکەش لەگەڵ دایک و باوکت بکە، وە ئەبو دەرداء گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: باوک دەرگای هەرە بەرز و باشەکانی بەهەشتە، ئنجا ئاگاداری چاکەی باوک و دایکت بەو دەرگاکە بپارێزە، یان واز لەو دەرگایە بێنە (واتە: ئارەزووی خۆتە ڕاستییەکە ئاوایە، جا یان بیپارێزە، یان لە دەست خۆتی بدە).

* * *

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٩٠٠.

## بابەت: ئەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی پێ خواردوون

**٢٠٩٠-** عَنْ رِفَاعَةَ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا حَلَفَ قَالَ: «وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ»[1].

**واتە: ڕیفاعەی جوهەنیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ سوێندی دەخوارد، دەیفەرموو: سوێند بەو زاتەی کە گیانی موحەممەدی ﷺ بە دەستە.**

**٢٠٩١-** عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ عَرَابَةَ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: كَانَتْ يَمِينُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّتِي يَحْلِفُ بِهَا، أَشْهَدُ عِنْدَ اللَّهِ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ»[2].

**واتە: ڕیفاعەی کوڕی عەڕابەی جوهەنیی ﷺ دەڵێ: لە لای خوا شایەتی دەدەم کە ئەو سوێندەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی پێ دەخوارد ئەوە بوو: سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بە دەستە.**

**٢٠٩٢-** عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَتْ أَكْثَرُ أَيْمَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «لَا وَمُصَرِّفِ الْقُلُوبِ»[3].

**واتە: سالیم لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: زۆربەی سوێندی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بوو: نا، سوێند بەو زاتەی کە هەڵسوڕێنەری دڵەکانە.**

**٢٠٩٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَتْ يَمِينُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «لَا، وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ»[4].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: سوێندی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بوو: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم، ئەگەر ئەو شتە بە پێچەوانەی ئەوە بێ (کە من دەیڵێم).**

## بابەت: نەهی کردن لە سوێند خواردن بە جگە لە خوا

**٢٠٩٤-** عَنْ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَمِعَهُ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ» قَالَ عُمَرُ: «فَمَا حَلَفْتُ بِهَا ذَاكِرًا، وَلَا آثِرًا»[5].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦١٧، وأبو داود: ٣٢٦٣، والترمذي: ١٥٤٠، والنسائي: ٣٧٦١

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٢٦٥.

(٥) صحيح. أخرجه البخاري: ٦١٠٨، ومسلم: ١٦٤٦، وأبو داود: ٣٢٤٩ و ٣٢٥٠، والترمذي: ١٥٣٣، والنسائي: ٣٧٦٤_٤٧٦٦.




واتە: عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێ بوو كە (عومەر) سوێندی بە باوكی دەخوارد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی خوا لێتانی قەدەغە كردوە، سوێند بە باو و باپیرانتان بخۆن، عومەر گوتی: منیش (لەو كاتەوە) نە خۆم سوێندم بەو شێوەیە خواردوە، نە لە كەسیش گێڕاومەتەوە كە سوێندی بەو شێوەیە خواردبێ.

**٢٠٩٥**- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَحْلِفُوا بِالطَّوَاغِي، وَلَا بِآبَائِكُمْ»[١].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی سەموڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بە بتەكان و باو و باپیرانتان مەخۆن.

**٢٠٩٦**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي يَمِينِهِ: بِاللَّاتِ وَالْعُزَّى، فَلْيَقُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك سوێندی خوارد و لە سوێندەكەیدا گوتی: سوێند بە لات و عوززا، ئەوە با بڵێ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ»، واتە: هیچ پەرستراوێكی بە هەق نیە جگە لە خوا.

**٢٠٩٧**- عَنْ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: حَلَفْتُ بِاللَّاتِ وَالْعُزَّى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، ثُمَّ انْفُثْ عَنْ يَسَارِكَ ثَلَاثًا، وَتَعَوَّذْ وَلَا تَعُدْ»[٣].

واتە: سەعد ﷺ دەڵێ: سوێندم بە لات و عوززا خوارد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڵێ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ»، واتە: هیچ پەرستراوێكی بە هەق نیە جگە لە خوا، تاك و تەنهایە و هیچ هاوبەشێكی نیە، پاشان سێ جار بە لای چەپتدا تف بكە، وە پەنا بە خوا بگرە لە شەیتان و جارێكی تر (ئەو سوێندە) دووبارە مەكەرەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٤٨، والنسائي: ٣٧٧٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨٦٠، ومسلم: ١٦٤٧، وأبو داود: ٣٢٤٧، والترمذي: ١٥٤٥، والنسائي: ٣٧٧٥.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٧٧٦ و ٣٧٧٧.

## بابەت: ئەو کەسەی کە سوێند بخوات بە ئاینێکی جگە لە ئیسلام

**٢٠٩٨-** عَنْ ثَابِتِ بْنِ الضَّحَّاكِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ بِمِلَّةٍ سِوَى الْإِسْلَامِ كَاذِبًا مُتَعَمِّدًا، فَهُوَ كَمَا قَالَ»[١].

واتە: سابیتی کوڕی زەحاک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە درۆ و بە ئەنقەست بە ئایینێک جگە لە ئیسلام سوێندی خوارد (واتە: بۆ نمونە بڵێ: ئەگەر ئەو شتە وا نەبێ من جولەکە بم)، ئەوە وەکو ئەوەیە کە دەیڵێ (واتە: سوێندەکەی دادەمەزرێ).

**٢٠٩٩-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يَقُولُ: أَنَا إِذًا لَيَهُودِيٌّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَجَبَتْ»[٢].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بوو پیاوێک (سوێندی دەخوارد و) دەیگوت: کەواتە من جوولەکە بم (ئەگەر ئەو شتە وا نەبێ)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێندەکەت دامەزرا (واتە: واتە ئەگەر شتەکە ڕاست نەبێ بوویتە جوولەکە).

**٢١٠٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِنَ الْإِسْلَامِ، فَإِنْ كَانَ كَاذِبًا، فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَإِنْ كَانَ صَادِقًا لَمْ يَعُدْ إِلَى الْإِسْلَامِ سَالِمًا»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک (سوێند بخوات و پاشان) بڵێ: پەیوەندی بە ئیسلامەوە نەمێنێ (ئەگەر ئەو شتە وا نەبێ)، جا ئەگەر درۆی کرد ئەوە بەو جۆرەیە کە دەیڵێ (واتە: پەیوەندی بە ئیسلامەوە نامێنێ)، وە ئەگەر ڕاستیشی کرد، ئەوا بە سەلامەتی (سەلامەتی دڵ) ناگەڕێتەوە بۆ ناو ئیسلام.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٦٣، ومسلم: ١١٠، وأبو داود: ٣٢٥٧، والترمذي: ١٥٤٣، والنسائي: ٣٧٧٠ و ٣٧٧١ و ٣٨١٣.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٥٨، والنسائي: ٣٧٧٢.

## بابەت: ئەو کەسەی سوێندی بە خوا بۆ دەخورێ، با ڕازی بێ

**٢١٠١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَقَالَ: «لَا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، مَنْ حَلَفَ بِاللَّهِ فَلْيَصْدُقْ، وَمَنْ حُلِفَ لَهُ بِاللَّهِ فَلْيَرْضَ، وَمَنْ لَمْ يَرْضَ بِاللَّهِ، فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بوو پیاوێک سوێندی بە باوکی دەخوارد، بۆیە فەرمووی: سوێند بە باو و باپیرانتان مەخۆن، هەر کەسێک سوێندی بە خوا خوارد با ڕاستگۆ بێ (سوێندەکەی بەجێ بێنێ)، وە هەر کەسێک سوێندی بۆ خوارد بە خوا با ڕازی بێ، وە هەر کەسێک بە خوا ڕازی نەبێ، لە خوا نزیک نیە!

**٢١٠٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «رَأَى عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَجُلًا يَسْرِقُ، فَقَالَ: أَسَرَقْتَ؟ قَالَ: لَا، وَالَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، فَقَالَ عِيسَى: آمَنْتُ بِاللَّهِ وَكَذَّبْتُ بَصَرِي»(٢).

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: عیسای کوڕی مەریەم پیاوێکی بینی دزی دەکرد، جا فەرمووی: ئایا دزیت کرد؟ وتی: نەخێر سوێند بەو کەسەی کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لەو، ئنجا عیسا فەرمووی: بڕوام بە خوا هەیە و چاوەکانی خۆم بە درۆخستەوە (واتە: لەبەر پیرۆزی ناوی الله چاوەکانی خۆم بە درۆ دەخەمەوە، ئەگەر ڕاستیشیان بینیبێ).

## بابەت: سوێند خواردن تاوانە یان پەشیمانییە

**٢١٠٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الْحَلِفُ حِنْثٌ أَوْ نَدَمٌ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند خواردن یان تاوانە یان پەشیمانییە.

---

(١) صحيح. انظر البخاري: ٦٦٤٧، ومسلم: ١٦٤٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٤٤، ومسلم: ٢٣٦٨، والنسائي: ٥٤٢٧.

(٣) ضعيف.

## بابەت: هەڵاواردن لە سوێند خواردندا

**٢١٠٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ، فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ فَلَهُ ثُنْيَاهُ»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سوێندی خوارد و گوتی: ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ، ئەو هەڵاواردنەی بۆ هەژمار دەکرێ (سوێندەکە جێبەجێ بکات، یاخود نا سوێندەکەی ناکەوێ).

**٢١٠٥-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ وَاسْتَثْنَى، إِنْ شَاءَ رَجَعَ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرُ حَانِثٍ»[٢].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سوێندی خوارد و هەڵاواردنی تێدا کرد، ئەگەر ویستی لەسەر بوو سوێندەکەی جێبەجێ دەکات، ئەگەر پێی خۆش بوو وازی لێ بێنێ و گوناهباریش نابێ (سوێندەکەی ناکەوێ).

**٢١٠٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، رِوَايَةً، قَالَ: «مَنْ حَلَفَ وَاسْتَثْنَى فَلَنْ يَحْنَثْ»[٣].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: هەر کەسێک سوێندی خوارد و هەڵاواردنی تێدا کرد، سوێندەکەی ناکەوێ.

## بابەت: ئەو کەسەی سوێند دەخوات لەسەر شتێک، دواتر ببینێ خێر لە غەیری ئەو شتە دایە

**٢١٠٧-** عَنْ أَبِي بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ مِنَ الْأَشْعَرِيِّينَ نَسْتَحْمِلُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَاللَّهِ مَا عِنْدِي مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ» قَالَ: فَلَبِثْنَا مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أُتِيَ بِإِبِلٍ، فَأَمَرَ لَنَا بِثَلَاثَةِ إِبِلٍ ذَوْدٍ غُرِّ الذُّرَى، فَلَمَّا انْطَلَقْنَا، قَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَسْتَحْمِلُهُ، فَحَلَفَ أَلَّا يَحْمِلَنَا، ثُمَّ حَمَلَنَا، ارْجِعُوا بِنَا، فَأَتَيْنَاهُ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا أَتَيْنَاكَ

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٥٣٢، والنسائي: ٣٨٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٦١ و ٣٢٦٢، والترمذي: ١٥٣١، والنسائي: ٣٧٩٣.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٦١ و ٣٢٦٢، والترمذي: ١٥٣١، والنسائي: ٣٧٩٣.

نَسْتَحْمِلُكَ فَحَلَفْتَ أَنْ لَا تَحْمِلَنَا، ثُمَّ حَمَلْتَنَا، فَقَالَ: «وَاللَّهِ مَا أَنَا حَمَلْتُكُمْ، بَلِ اللَّهُ حَمَلَكُمْ، إِنِّي وَاللَّهِ، إِنْ شَاءَ اللَّهُ، لَا أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ، فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلَّا كَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي، وَأَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ» أَوْ قَالَ «أَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَكَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي»[١].

واته: ئەبو بوردە لە ئەبو موسای باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لەگەڵ کۆمەڵێک لە ئەشعەرییەکان (هۆزێک بووە) هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای وڵاخی سواریمان لێکرد (بۆ جەنگ)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: سوێند بە خوا وڵاخی سواریم لا نیە کە پێتانی بدەم بۆ سواری بەکاری بێنن، دەڵێ: جا ئەوەندەی خوا ویستی ماینەوە، پاشان وشتریان هێنان، جا (پێغەمبەر ﷺ ) فەرمانی کرد کە سێ وشتری سپی قەڵەومان پێبدەن، کاتێ دەرچووین لە ناو خۆماندا گوتمان: ئێمە چووینە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای وڵاخی سواریمان لێکرد، ئەویش سوێندی خوارد کە پێمان نەدات، پاشان پێیداین، با بگەڕێینەوە، جا هاتینەوە خزمەتی و گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە هاتینە خزمەتت داوای وڵاخی سواریمان لێتکرد، وە سوێندت خوارد کە پێمان نەدەی، پاشان پێتداین، ئەویش فەرمووی: سوێند بە خوا من پێتانم نەدا، بەڵکو خوا پێتانیدا، بێگومان من سوێند بە خوا، ئەگەر خوای گەورە پێی خۆش بێ، سوێند لەسەر شتێک ناخۆم و دواتر لەوە باشتر ببینم، ئەوە بێگومان سوێندەکەم دەشکێنم کەفارەتی سوێندەکەم دەدەم، وە ئەوە دەکەم کە باشترە، یان فەرمووی: ئەوەی کە باشترە ئەنجامی دەدەم و سوێندەکەم دەشکێنم و کەفارەتەکەی دەدەم.

**٢١٠٨-** عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، فَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ»[٢].

واته: عەدی کوڕی حاتیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سوێندی لەسەر شتێک خوارد، پاشان شتێکی باشتری بینی، با ئەوەی کە باشترە ئەنجامی بدات و کەفارەتی سوێندەکەی بدات.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٣٣، ومسلم: ١٦٤٩، وأبو داود: ٣٢٧٦، والنسائي: ٣٧٨٠.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٥١، والنسائي: ٣٧٨٦ و ٣٧٨٧.




**٢١٠٩-** عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الْجُشَمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﵁، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يَأْتِينِي ابْنُ عَمِّي فَأَحْلِفُ أَنْ لَا أُعْطِيَهُ، وَلَا أَصِلَهُ، قَالَ: «كَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ»[١].

**واتە: ئەبو ئەحوەص عەوفی کوڕی مالیکی جوشەمیی لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا کوڕە مامەکەم سەردانم دەکات، جا سوێندم خواردووە کە نە پێی ببەخشم و نە پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ بەجێ بهێنم، فەرمووی: سوێندەکەت بشکێنە (واتە: کەفارەتی سوێندەکەت بدە پێی ببەخشە و پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ بەجێبێنە).**

## بابەت: ئەوەی کە گوتوویەتی کەفارەتەکەی واز لێ هێنانیەتی

**٢١١٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ فِي قَطِيعَةِ رَحِمٍ، أَوْ فِيمَا لَا يَصْلُحُ، فَبِرُّهُ أَنْ لَا يُتِمَّ عَلَى ذَلِكَ»[٢].

**واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سوێندی خوارد لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، یان لە شتێکدا کە نەگونجاو بێ (لە ڕووی دینەوە)، ئەوە جێبەجێ نەکردنی سوێندەکەو وازهێنان لێی بۆی باشترە.**

**٢١١١-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَلْيَتْرُكْهَا، فَإِنَّ تَرْكَهَا كَفَّارَتُهَا»[٣].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سوێندی لەسەر شتێک خوارد، پاشان شتێکی لەوە باشتری بینی، با واز لە سوێندەکەی بهێنێ، وە بێگومان خودی واز لێهێنانەکە دەبێتە کەفارەتی سوێندەکە.**

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٧٨٨.

(٢) صحيح.

(٣) منكر. أخرجه أبو داود: ٣٢٧٤ مطولًا.

## بابەت: لە كەفارەتی سوێند خواردندا چەند خواردن دەدرێ؟

٢١١٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كَفَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِصَاعٍ مِنْ تَمْرٍ، وَأَمَرَ النَّاسَ بِذَلِكَ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَنِصْفُ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە صاعێک خورما کەفارەتی سوێندیدا، وە بە هەمان شێوەش فەرمانی بە خەڵک کرد، وە ئەگەر کەسێک نەیبو و دەستی نەکەوت، با نیو صاع گەنم بدات (لە کەفارەتی سوێندەکەیدا).

## بابەت: ڕوونکردنەوەی ئایەتی:

﴿ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ ﴿٨٩﴾ ﴾

٢١١٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ الرَّجُلُ يَقُوتُ أَهْلَهُ قُوتًا فِيهِ سَعَةٌ، وَكَانَ الرَّجُلُ يَقُوتُ أَهْلَهُ قُوتًا فِيهِ شِدَّةٌ، فَنَزَلَتْ: ﴿ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ ﴿٨٩﴾ ﴾ المائدة»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پیاو هەبوو ئەو خواردنەی کە بۆ ماڵ و منداڵەکەی دابینی دەکرد بژێوییەکی فراوان و گران بەها بوو، پیاویش هەبوو بژێوی ماڵ و منداڵی سادە و ئاسان بوو، جا بۆیە ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ ﴿٨٩﴾ ﴾ المائدة، واتە: لە خۆراکێکی مامناوەند کە بە منداڵ و خێزانی خۆتانی دەدەن.

## بابەت: قەدەغەکردنی ئەوەی کە پیاو پێداگری بکات لەسەر سوێندەکەی و کەفارەتیش نەدا

٢١١٤- عَنْ هَمَّامٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ ﷺ: «إِذَا اسْتَلَجَّ أَحَدُكُمْ فِي الْيَمِينِ فَإِنَّهُ آثَمُ، لَهُ عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الْكَفَّارَةِ الَّتِي أُمِرَ بِهَا»[3].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح.

واتە: هەمام، دەڵێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیگوت: ئەبو لقاسم ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە پێداگری بکات لەسەر سوێندەکەی (هەرچەندە شتێکی باشتریش ببینێ لەوەی کە سوێندی لەسەر خواردوە)، لە لای خوا گوناهبارە بە هۆی ئەنجام نەدانی ئەو کەفارەتەی کە فەرمانی پێکراوە، (واتە: لەبەرئەوەی کە شتێکی باشتری بینی لەوەی کە سوێندی لەسەر خواردووە، دەبێ سوێندەکەی بشکێنێ و کەفارەتەکەی بدات).

**٢١١٤م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ الْوُحَاظِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ سَلَّامٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[١].

واتە: ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: جێبەجێ کردنی سوێندی سوێندخۆر

**٢١١٥-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، قَالَ: «أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِإِبْرَارِ الْمُقْسِمِ»[٢].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە جێبەجێ کردنی سوێندی سوێندخۆر.

**٢١١٦-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ صَفْوَانَ ﷺ، أَوْ عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْقُرَشِيِّ ﷺ، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ جَاءَ بِأَبِيهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اجْعَلْ لِأَبِي نَصِيبًا مِنَ الْهِجْرَةِ، فَقَالَ: «إِنَّهُ لَا هِجْرَةَ» فَانْطَلَقَ فَدَخَلَ عَلَى الْعَبَّاسِ، فَقَالَ: قَدْ عَرَفْتَنِي؟ قَالَ: أَجَلْ، فَخَرَجَ الْعَبَّاسُ فِي قَمِيصٍ لَيْسَ عَلَيْهِ رِدَاءٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ عَرَفْتَ فُلَانًا وَالَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ، وَجَاءَ بِأَبِيهِ لِتُبَايِعَهُ عَلَى الْهِجْرَةِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّهُ لَا هِجْرَةَ» فَقَالَ الْعَبَّاسُ: أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ، فَمَدَّ النَّبِيُّ ﷺ يَدَهُ، فَمَسَّ يَدَهُ، فَقَالَ: «أَبْرَرْتُ عَمِّي، وَلَا هِجْرَةَ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٢٥ و ٦٦٢٦، ومسلم: ١٦٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٣٩، ومسلم: ٢٠٦٦، والترمذي: ٢٨٠٩، والنسائي: ١٩٣٩ و ٣٧٧٨ و ٥٣٠٩.

(٣) ضعيف.

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی صەفوان ﷺ یان صەفوانی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی قورەشیی ﷺ دەڵێ: لەو کاتەدا کە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە بوو باوکی هێنا، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پشکێک لە پەیمانی کۆچکردن دابنێ بۆ باوکم (واتە: پەیمانی کۆچکردنی پێبدە)، فەرمووی: بێگومان لێرە بەدوا پەیمانی کۆچکردن نیە، ئەویش ڕۆیشت و چوو بۆ لای عەبباس، جا گوتی: منت ناسییەوە؟ وتی: بەڵێ، پاشان عەبباس بە کراسێکەوە کە عەبای بەسەردا لەبەر نەکردبوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان فڵان کەس دەناسی، وە ئەوەشی کە لە نێوان ئێمە و ئەودا هەیە، جا باوکی هێناوە بۆ ئەوەی پەیمانی کۆچکردنی پێبدەی، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان لەمەودوا پەیمانی کۆچکردن نیە، ئنجا عەبباس گوتی: سوێندم دای، پێغەمبەر ﷺ دەستی درێژکرد و تەوقەی لەگەڵدا کرد (لەگەڵ باوکی ئەو کەسە، کە پەیمانی کۆچکردن بە تۆقەکردن بووە)، جا فەرمووی: سوێندی مامم بەجێ گەیاند، وە کۆچکردن (لە ڕاستیدا) لەمەودوا نیە (چونکە مەککە ئێستا بەشێکە لە خاکی ئیسلام).

**٢١١٦م**- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ الرَّبِيعِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ إِدْرِيسَ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، بِإِسْنَادِهِ، نَحْوَهُ قَالَ يَزِيدُ بْنُ أَبِي زِيَادٍ: «يَعْنِي لَا هِجْرَةَ مِنْ دَارٍ قَدْ أَسْلَمَ أَهْلُهَا»[١].

واتە: یەزیدی کوڕی ئەبو زیاد گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوەیە، شوێنێک خەڵکەکەی مسوڵمان بووبێ، کۆچی لێوە ناکرێ بۆ شوێنێکی دیکە.

## بابەت: قەدەغەکردن لەوە بگوترێ:
## ئەگەر خوا بیەوێ و تۆش بتەوێ

**٢١١٧**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا حَلَفَ أَحَدُكُمْ فَلَا يَقُلْ: مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ شِئْتَ»[٢].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح لغيره.

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان سوێندی خوارد با نەڵێ: ئەگەر خوا بیەوێ و تۆش بتەوێ، بەڵکو با بڵێ: ئەگەر خوا بیەوێ، پاشانیش تۆ بتەوێ (واتە: وشەی «ثُمَّ»ـی لەگەڵ بخات).

**٢١١٨-** عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﵁، أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَأَى فِي النَّوْمِ أَنَّهُ لَقِيَ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَقَالَ: نِعْمَ الْقَوْمُ أَنْتُمْ لَوْلَا أَنَّكُمْ تُشْرِكُونَ، تَقُولُونَ: مَا شَاءَ اللَّهُ وَشَاءَ مُحَمَّدٌ، وَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «أَمَا وَاللَّهِ، إِنْ كُنْتُ لَأَعْرِفُهَا لَكُمْ، قُولُوا: مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ شَاءَ مُحَمَّدٌ»[1].

واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان ﵁ دەگێڕێتەوە: کە پیاوێک لە مسوڵمانان لە خەویدا بینی کە گەیشت بە پیاوێک لە ئەهلی کیتاب، جا گوتی: ئێوە باشترین گەل و هۆزن، ئەگەر هاتبا و هاوبەشیدانانتان نەکردبا و نەتان گوتبا: ئەگەر خوا بیەوێ و موحەممەدیش ﷺ بیەوێ، جا ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرا، ئەویش فەرمووی: سوێند بە خوا نەمزانیوە کە ئەو وشەیە ئاوا بەکاردێنن، (لەمەودوا) بڵێن: ئەگەر خوا بیەوێ، پاشانیش موحەممەد ﷺ بیەوێ.

**٢١١٨م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ أَبِي الشَّوَارِبِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ، عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنِ الطُّفَيْلِ بْنِ سَخْبَرَةَ، أَخِي عَائِشَةَ لِأُمِّهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ[2].

واتە: ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: ئەو کەسەی لە سوێند خواردندا نیەتی دەشارێتەوە

**٢١١٩-** عَنْ سُوَيْدِ بْنِ حَنْظَلَةَ ﵁، قَالَ: خَرَجْنَا نُرِيدُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَمَعَنَا وَائِلُ بْنُ حُجْرٍ فَأَخَذَهُ عَدُوٌّ لَهُ، فَتَحَرَّجَ النَّاسُ أَنْ يَحْلِفُوا، فَحَلَفْتُ أَنَا أَنَّهُ أَخِي، فَخَلَّى سَبِيلَهُ، فَأَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّ الْقَوْمَ تَحَرَّجُوا أَنْ يَحْلِفُوا وَحَلَفْتُ أَنَا أَنَّهُ أَخِي، فَقَالَ: «صَدَقْتَ، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٥٦.

واتە: سوەیدی کوڕی حەنزەڵە ﷺ دەڵێ: دەرچووین کە بڕۆین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، وائیلی کوڕی حوجریشمان لەگەڵ بوو، جا دوژمنێکی خۆی تووشی بوو، خەڵکەکەش بەلایانەوە قورس بوو کە سوێند بخۆن (بۆ ڕزگارکردنی وائیل لە شەڕی دوژمنەکەی)، بۆیە من سوێندم خوارد کە ئەو برای منە، دوژمنەکەی وازی لێهێنا، پاشان کە هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی ئەوەم پێدا کە خەڵکەکە لەلایان قورس بووە سوێند بخۆن، بۆیە من سوێندم خوارد کە ئەو برای منە، ئەویش فەرمووی: ڕاستت گوتووە، مسوڵمان برای مسوڵمانە.

**٢١٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی سوێند خواردن بە گوێرەی نیەتی ئەو کەسەیە کە داوای سوێند خواردنەکە دەکات (نەک ئەو کەسەی کە سوێندەکە دەخوات).

**٢١٢١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ بِهِ صَاحِبُكَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند خواردنی تۆ بە گوێرەی نیەتی هاوڕێیەکەتە، کە داوای سوێند خواردنت لێدەکات و بەهۆیەوە بە ڕاستت دەزانێ.

## بابەت: قەدەغەکردنی نەزرکردن

**٢١٢٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّذْرِ، وَقَالَ: «إِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ اللَّئِيمِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەزرکردنی قەدەغە کردوە، فەرموویەتی: تەنها چرووکەکان نەزر دەکەن (مەبەستی لەوانەیە کە فەرمانبەرداریی ناکەن تەنها لە بەرانبەر داخوازییەکەیاندا نەبێ).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٥٣، وأبو داود: ٣٢٥٥، والترمذي: ١٣٥٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٥٣، وأبو داود: ٣٢٥٥ و ١٣٥٤.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٠٨، ومسلم: ١٦٣٩، وأبو داود: ٣٢٨٧، والنسائي: ٣٨٠١_٣٨٠٣.

**٢١٢٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ النَّذْرَ لَا يَأْتِي ابْنَ آدَمَ بِشَيْءٍ إِلَّا مَا قُدِّرَ لَهُ، وَلَكِنْ يَغْلِبُهُ الْقَدَرُ مَا قُدِّرَ لَهُ، فَيُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ فَيُيَسَّرُ عَلَيْهِ مَا لَمْ يَكُنْ يُيَسَّرُ عَلَيْهِ مِنْ قَبْلِ ذَلِكَ، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ: أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی نەزرکردن هیچ شتێک بە ئادەمیزاد نابەخشێ، تەنها ئەوە نەبێ کە بۆی دیاری کراوە، بەڵام بەدەستهێنانی ئەو شتەی کە بۆی دیاری کراوە لەسەری قورسە، جا نەزر ئەوانە پێی هەڵدەستن کە چرووکن، ئنجا ئەو شتەی کە پێشتر بۆیان ئاسان نەبوو لەسەریان ئاسان دەبێ، وە بێگومانیش خوا فەرموویەتی: ببەخشە، پێت دەبەخشم.

## بابەت: نەزرکردن لە تاوانباریدا

**٢١٢٤-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَلَا نَذْرَ فِيمَا لَا يَمْلِكُ ابْنُ آدَمَ»[٢].

**واتە:** عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە گوناهو سەرپێچیدا نەزرکردن نیە، وە هەروەها نەزرکردن لە شتێکدا نیە کە لە توانای ئادەمیزاددا نەبێ.

**٢١٢٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ»[٣].

**واتە:** عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەزرکردن لە گوناهو سەرپێچیدا نیە، کەفارەتەکەشی وەکو کەفارەتی سوێند خواردنە.

**٢١٢٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللَّهَ فَلَا يَعْصِهِ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٩٤، ومسلم: ١٦٤٠، وأبو داود: ٣٢٨٨، والترمذي: ١٥٣٨، والنسائي: ٣٨٠٤ و ٣٨٠٥.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٤١، وأبو داود: ٣٣١٦، والنسائي: ٣٨١٢ و ٣٨٥١.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٢٨٩_٣٢٩٢، والترمذي: ١٥٢٤ و ١٥٢٥، والنسائي: ٣٨٣٣_٣٨٣٩.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٦٩٦، وأبو داود: ٣٢٨٩، والترمذي: ١٥٢٦، والنسائي: ٣٨٠٦_٣٨٠٨.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس نەزری کرد کە گوێڕایەڵی خوا بکات، با گوێڕایەڵی بکات، هەر کەس نەزری کرد کە سەرپێچی خوا بکات، با سەرپێچی نەکات (واتە: ئەگە نەزرەکە خێر و چاکە بوو با جێبەجێی بکات، ئەگەر تاوانیش بوو با نەیکات).

## بابەت: کەسێک کە نەزرێک بکات و دیاری نەکات

**٢١٢٧-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَذَرَ نَذْرًا وَلَمْ يُسَمِّهِ، فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ»(١).

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﵁، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نەزرێک بکات و دیاری نەکات، کەفارەتی نەزرەکەی وەکو کەفارەتی سوێند خواردنە.

**٢١٢٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ نَذَرَ نَذْرًا وَلَمْ يُسَمِّهِ، فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ، وَمَنْ نَذَرَ نَذْرًا لَمْ يُطِقْهُ، فَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ، وَمَنْ نَذَرَ نَذْرًا أَطَاقَهُ، فَلْيَفِ بِهِ»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نەزرێک بکات و دیاری نەکات، کەفارەتەکەی وەکو کەفارەتی سوێند خواردنە، وە هەر کەسێک نەزرێک بکات کە لە توانایدا نەبێت جێبەجێی بکات، کەفارەتەکەی وەکو کەفارەتی سوێند خواردنە، هەر کەسێک نەزرێک بکات کە لە توانایدا بێت جێبەجێی بکات، با جێبەجێی بکات (بە مەرجێک گوناهو سەرپێچی خوا نەبێ).

## بابەت: جێبەجێ کردنی نەزر

**٢١٢٩-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، قَالَ: «نَذَرْتُ نَذْرًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ بَعْدَ مَا أَسْلَمْتُ، فَأَمَرَنِي أَنْ أُوفِيَ بِنَذْرِي»(٣).

---

(١) صحيح دون قوله: «وَلَمْ يُسَمِّهِ». أخرجه مسلم: ١٦٤٥، وأبو داود: ٣٣٢٣، والترمذي: ١٥٢٨، والنسائي: ٣٨٣٢.

(٢) ضعيف جداً. أخرجه أبو داود: ٣٣٢٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٣٢، ومسلم: ١٦٥٦/٢٧، وأبو داود: ٣٣٢٥، والترمذي: ١٥٣٩، والنسائي: ٣٨٢٠_٣٨٢٢.

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی نەفامیدا نەزرێکم کرد، جا دوای ئەوەی کە مسوڵمان بووم، پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی، ئەویش فەرمانی پێکردم کە نەزرەکەم جێبەجێ بکەم (دیارە نەزرەکە سەرپێچی کردنی فەرمانی خوای تێدا نەبووە).

**٢١٣٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَنْحَرَ بِبُوَانَةَ، فَقَالَ: «فِي نَفْسِكَ شَيْءٌ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «أَوْفِ بِنَذْرِكَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی من نەزرم کردوە کە لە بووانە (شوێنێکە لە دامێنی مەککە) ئاژەڵێک سەرببڕم، ئەویش فەرمووی: ئایا هیچ شتێکی سەردەمی نەفامیت لە ناخدا ماوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: نەزرەکەت جێبەجێ بکە.

**٢١٣١-** عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ كَرْدَمٍ الْيَسَارِيَّةِ ﷺ، أَنَّ أَبَاهَا لَقِيَ النَّبِيَّ ﷺ وَهِيَ رَدِيفَةٌ لَهُ، فَقَالَ: إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَنْحَرَ بِبُوَانَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَلْ بِهَا وَثَنٌ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «أَوْفِ بِنَذْرِكَ»[٢].

واتە: مەیمونەی کچی کەڕدەمی یەسارییە ﷺ دەگێڕێتەوە، باوکی گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ وە ئەویش لەگەڵی بوو، جا باوکی گوتی: بەڕاستی من نەزرم کردوە کە لە بووانە ئاژەڵێک سەرببڕم، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەو شوێنە هیچ بتێکی لێیە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: نەزرەکەت جێبەجێ بکە.

**٢١٣١م-** حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ دُكَيْنٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ مِقْسَمٍ، عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ كَرْدَمٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ[٣].

واتە: ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٣١٤ مطولًا.

(٣) صحيح.

## بابەت: ئەو کەسەی کە وەفات دەکات و نەزریشی لەسەرە

**٢١٣٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ، اسْتَفْتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، تُوُفِّيَتْ وَلَمْ تَقْضِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْضِهِ عَنْهَا»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، سەعدی کوڕی عوبادە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی نەزرێک کە دایکی کردوویەتی، وەفاتی کردووەو نەزرەکەی جێبەجێ نەکردوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە بری ئەو جێبەجێی بکە.

**٢١٣٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرُ صِيَامٍ، فَتُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِيَصُمْ عَنْهَا الْوَلِيُّ»[2].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: لە ڕاستیدا دایکم وەفاتی کردوە و ڕۆژوویەکی نەزری لەسەر بوو، پێش ئەوەی جێبەجێی بکات وەفاتی کرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با وەلییەکەی لە بری ئەو ڕۆژووەکە بگرێتەوە.

ولي: لێرە بە مانای کەسێکی نزیکیەتی، جا منداڵە، خوشکە، برایە، باوکە، دایکە... هتد.

## بابەت: ئەو کەسەی نەزری کردوە بە پێ بڕوات بۆ حەج کردن

**٢١٣٤-** عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﵁، أَنَّ أُخْتَهُ نَذَرَتْ أَنْ تَمْشِيَ حَافِيَةً، غَيْرَ مُخْتَمِرَةٍ، وَأَنَّهُ ذَكَرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مُرْهَا فَلْتَرْكَبْ، وَلْتَخْتَمِرْ، وَلْتَصُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ»[3].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﵁ دەگێڕێتەوە، خوشکەکەی نەزری کردبوو، بە پێی پەتی و بەسەری ڕووتەوە حەج بکات، ئەویش ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: (لەلایەن منەوە) فەرمانی پێبکە با بە سواری وڵاخ و بە سەری داپۆشراوەوە حەج بکات، وە با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ (لە کەفارەتی نەزرەکەیدا).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٦١، ومسلم: ١٦٣٨، وأبو داود: ٣٣٠٧، والترمذي: ١٥٤٦، والنسائي: ٣٦٥٧_٣٦٦٣ و ٣٨١٧_٣٨١٩.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٢٩٣ و ٣٢٩٤، والترمذي: ١٥٤٤، والنسائي: ٣٨١٥.

**٢١٣٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ ﷺ شَيْخًا يَمْشِي بَيْنَ ابْنَيْهِ، فَقَالَ: «مَا شَأْنُ هَذَا؟» قَالَ ابْنَاهُ: نَذْرٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «ارْكَبْ أَيُّهَا الشَّيْخُ، فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكَ وَعَنْ نَذْرِكَ»(١).

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بە تەمەنی بینی کە دوو کوڕی چووبوونە ژێر باڵی و لە نێوانیاندا ڕێی دەکرد، جا فەرمووی: ئەوە حاڵی بۆ ئاوایە؟ کوڕەکانی گوتیان: ئەوە نەزرە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (نەزری کردوە کە بە پێ بڕوات بۆ حەج)، فەرمووی: ئەی پیرە پیاو سواری وڵاخ بە، بەڕاستی خوای گەورە بێ نیازە لە خۆت و لە نەزرەکەشت.

## بابەت: ئەوەی کە لە نەزرەکەیدا فەرمانبەرداری و سەرپێچی تێکەڵ دەکات

**٢١٣٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِرَجُلٍ بِمَكَّةَ وَهُوَ قَائِمٌ فِي الشَّمْسِ، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» قَالُوا: نَذَرَ أَنْ يَصُومَ وَلَا يَسْتَظِلَّ إِلَى اللَّيْلِ، وَلَا يَتَكَلَّمَ، وَلَا يَزَالُ قَائِمًا، قَالَ: «لِيَتَكَلَّمْ، وَلْيَسْتَظِلَّ، وَلْيَجْلِسْ، وَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ»(٢).

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە بەلای پیاوێکدا تێپەڕی کە لەبەر هەتاو (خۆر) بە پێوە وەستا بوو، جا فەرمووی: ئەوە چییە؟! گوتیان: نەزری کردوە کە بەڕۆژوو بێ و تاوەکو شەو نەچێتە ژێر سێبەر و قسەش نەکات، تا ئێستاش هەر بە پێوەیە، فەرمووی: با قسە بکات و بچێتە ژێر سێبەرو داشبنیشێ، وە با ڕۆژووەکەی تەواو بکات.

**٢١٣٦م-** حَدَّثَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ شَنْبَةَ الْوَاسِطِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا الْعَلَاءُ بْنُ عَبْدِ الْجَبَّارِ، عَنْ وُهَيْبٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ وَاللَّهُ أَعْلَمُ(٣).

**واتە:** ئەم فەرمووده بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە، خواش زاناترە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٤٣.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

## بابەت: هاندان لەسەر کارکردن

**٢١٣٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ، وَإِنَّ وَلَدَهُ مِنْ كَسْبِهِ»[١].

**واتە:** عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان پاکترین شتێک کە پیاو دەیخوات بەرهەمی کار و ئیشی (دەستی) خۆیەتی، وە بێگومان منداڵیش بەشێکن لە بەر وبومی مرۆڤ.

**٢١٣٨-** عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ الزُّبَيْدِيِّ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَا كَسَبَ الرَّجُلُ كَسْبًا أَطْيَبَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ، وَمَا أَنْفَقَ الرَّجُلُ عَلَى نَفْسِهِ وَأَهْلِهِ وَوَلَدِهِ وَخَادِمِهِ، فَهُوَ صَدَقَةٌ»[٢].

**واتە:** میقدامی کوڕی مەعدیکەریبی زوبەیدیی ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ بەرهەمێک باشتر نیە بۆ پیاو لە بەرهەمی دەستی خۆی، وە ئەوەی کە پیاو (پەیدای دەکات) دەیکاتە بژێوی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی و منداڵەکانی و خزمەتکارەکەی، ئەوە بۆی بە چاکە و خێر دەنووسرێ.

**٢١٣٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «التَّاجِرُ الْأَمِينُ الصَّدُوقُ الْمُسْلِمُ مَعَ الشُّهَدَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بازرگانی دەست پاک و ڕاستگۆ و مسوڵمان لەگەڵ شەهیدانە لە ڕۆژی قیامەتدا.

**٢١٤٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «السَّاعِي عَلَى الْأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَكَالَّذِي يَقُومُ اللَّيْلَ وَيَصُومُ النَّهَارَ»[٤].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٥٢٨ و ٣٥٢٩، والترمذي: ١٣٥٨، والنسائي: ٤٤٤٩_٤٤٥٢.

(٢) صحيح. انظر البخاري: ٢٠٧٢.

(٣) حسن.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٥٣، ومسلم: ٢٩٨٢، والترمذي بإثر: ١٩٦٩، والنسائي: ٢٥٧٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە هەوڵی بژێوی ژیانی بێوەژن و هەژار دەدات، وەکو موجاهیدێک وایە کە لە ڕێگای خوا دەجەنگێ، وە وەکو ئەو کەسە وایە کە بە شەو شەونوێژ دەکات و ڕۆژیش بەڕۆژووە.

**٢١٤١-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خُبَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا فِي مَجْلِسٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ وَعَلَى رَأْسِهِ أَثَرُ مَاءٍ، فَقَالَ لَهُ بَعْضُنَا: نَرَاكَ الْيَوْمَ طَيِّبَ النَّفْسِ، فَقَالَ: «أَجَلْ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ» ثُمَّ أَفَاضَ الْقَوْمُ فِي ذِكْرِ الْغِنَى، فَقَالَ: «لَا بَأْسَ بِالْغِنَى لِمَنِ اتَّقَى، وَالصِّحَّةُ لِمَنِ اتَّقَى خَيْرٌ مِنَ الْغِنَى، وَطِيبُ النَّفْسِ مِنَ النَّعِيمِ»[١].

واتە: موعازی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی خوبەیب لە باوکییەوە لە مامیەوە ﷺ، دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە لە مەجلیسێک بووین، پێغەمبەر ﷺ هات و شوێنەواری ئاو بە سەریەوە دیار بوو، ئنجا هەندێکمان پێیان گوت: ئەمڕۆ دەتبینین کە دڵخۆشی، فەرمووی: بەڵێ سوپاس بۆ خوا، پاشان زۆر باسی دەوڵەمەندیان کرد، فەرمووی: دەوڵەمەندی بۆ کەسی پارێزکار هیچ کێشە و زەرەرێکی نیە، وە تەندرووستی جەستە بۆ کەسی پارێزکار باشترە لە دەوڵەمەندی، وە دەروونی ئارام و ڕازی (بە بەشی خۆی) یەکێکە لە نیعمەتەکان.

## بابەت: مامناوەندی لە بەدەستهێنانی بژێوی ژیاندا

**٢١٤٢-** عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَجْمِلُوا فِي طَلَبِ الدُّنْيَا، فَإِنَّ كُلًّا مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ»[٢].

واتە: ئەبو حومەیدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە داواکردنی خۆشیەکانی دونیادا میانگیر بن (زێدەڕۆیی مەکەن و خۆتان زیاد لە پێویست ماندوو مەکەن)، چونکە هەموو کەس ئەو شتەی کە بۆی دانراوە (لە قەدەردا ڕێگای بە دەست هێنانیشی) بۆی ئاسان کراوە.

---

(١) حسن.

(٢) صحيح.

**٢١٤٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَعْظَمُ النَّاسِ هَمًّا الْمُؤْمِنُ، الَّذِي يَهْتَمُّ بِأَمْرِ دُنْيَاهُ وَأَمْرِ آخِرَتِهِ» قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: «هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ تَفَرَّدَ بِهِ إِسْمَاعِيلُ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خاوەن گەورەترین عەم لەناو خەڵکی بڕوادارە، کە گرنگی بە کار وباری دنیا و دواڕۆژی دەدات. ئەبو عەبدوڵڵا دەڵێ: ئەو فەرموودەیە غەریبە و تەنها ئیسماعیل گێڕاویەتەوە.**

**٢١٤٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا اللَّهَ وَأَجْمِلُوا فِي الطَّلَبِ، فَإِنَّ نَفْسًا لَنْ تَمُوتَ حَتَّى تَسْتَوْفِيَ رِزْقَهَا وَإِنْ أَبْطَأَ عَنْهَا، فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَجْمِلُوا فِي الطَّلَبِ، خُذُوا مَا حَلَّ، وَدَعُوا مَا حَرُمَ»[٢].

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە پارێزکاربن (سنورەکانی خوا مەبەزێنن) و لە داواکردنی ڕزقدا میانگیربن (پەلە پەل و هەڵە هەڵ مەکەن)، چونکە بێگومان هیچ کەسێک نامرێت تاکو هەموو ڕزق و ڕۆزی خۆی تەواو نەکات، هەرچەند ئەگەر بە درەنگیشەوە پێی بگات، پارێزکاربن و لە داواکردندا مامناوەند و هێمن بن، ئەوەی حەڵاڵە بە دەستی بێنن، ئەوەی حەڕامە وازی لێ بێنن.**

## بابەت: خۆ بواردن و خۆ پاراستن لە بازرگانیدا

**٢١٤٥-** عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نُسَمَّى فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ السَّمَاسِرَةَ، فَمَرَّ بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هُوَ أَحْسَنُ مِنْهُ، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ إِنَّ الْبَيْعَ يَحْضُرُهُ الْحَلِفُ وَاللَّغْوُ، فَشُوبُوهُ بِالصَّدَقَةِ»[٣].

**واتە: قەیسی کوڕی ئەبو غەرەزە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پێیان دەگوتین: دەڵاڵ، ئنجا جارێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەلاماندا تێپەڕی و بە ناوێک ناوی ناین کە جوانتر و چاکتر بوو (لە ناوی دەڵاڵ)، ئنجا فەرمووی: ئەی کۆمەڵی**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٢٦ و ٣٣٢٧، والترمذي: ١٢٠٨، والنسائي: ٣٧٩٧ و ٣٧٩٨.

بازرگانان لە ڕاستیدا کڕین و فرۆشتن و بازرگانی سوێند خواردن و قسەی پووچی لەگەڵ تێکەڵ دەبێ، بۆیە (ماڵەکەتان) بە خێر و بەخشین پاک بکەنەوە.

**٢١٤٦-** عَنْ رِفَاعَةَ ﷺ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَإِذَا النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ بُكْرَةً، فَنَادَاهُمْ: يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ فَلَمَّا رَفَعُوا أَبْصَارَهُمْ وَمَدُّوا أَعْنَاقَهُمْ، قَالَ: «إِنَّ التُّجَّارَ يُبْعَثُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فُجَّارًا، إِلَّا مَنِ اتَّقَى اللَّهَ وَبَرَّ وَصَدَقَ»[١].

واتە: ڕیفاعە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەرچووین لەو کاتەدا خەڵکی لە بەیانیاندا کڕین و فرۆشتنیان دەکرد، ئنجا بانگی کردن: ئەی کۆمەڵی بازرگانان! جا کاتێک چاویان هەڵبڕی و سەریان بەرز کردەوە، فەرمووی: بێگومان بازرگانەکان لە ڕۆژی دواییدا بە بەدکار و تاوانبار زیندوو دەکرێنەوە (چونکە ئەوکات بە زۆری فێڵیان کردوە، بەڵام باشەکان و لە خوا ترسەکانی هەڵاواردوە، وەک دەفەرموێ:) جگە لەوانەی لە خواترس و چاکەکار و ڕاستگۆن.

## بابەت: کەسێک کە هۆکاری ڕزق و ڕۆزی دەستخستنی دەستکەوت با پابەند بێ پێیەوە

**٢١٤٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَصَابَ مِنْ شَيْءٍ فَلْيَلْزَمْهُ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شتێکی بۆ هاتە پێش و بە دەستی کەوت (لە هۆکارەکانی ڕزق و ڕۆزی) با پابەند بێ پێیەوە (چونکە هەر هۆکارە و بۆ کەسێک و هەر کەسە و بۆ هۆکارێک گونجاوە).

**٢١٤٨-** عَنْ نَافِعٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ أُجَهِّزُ إِلَى الشَّامِ وَإِلَى مِصْرَ، فَجَهَّزْتُ إِلَى الْعِرَاقِ، فَأَتَيْتُ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، فَقُلْتُ لَهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ كُنْتُ أُجَهِّزُ إِلَى الشَّامِ، فَجَهَّزْتُ إِلَى الْعِرَاقِ، فَقَالَتْ: لَا تَفْعَلْ، مَا لَكَ وَلِمَتْجَرِكَ؟ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِذَا سَبَّبَ اللَّهُ لِأَحَدِكُمْ رِزْقًا مِنْ وَجْهٍ، فَلَا يَدَعْهُ حَتَّى يَتَغَيَّرَ لَهُ، أَوْ يَتَنَكَّرَ لَهُ»[٣].

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٢١٠.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.




واتە: نافیع ﷺ دەڵێ: (لە عادەتی من بوو) کە شتومەکم بۆ شام و میسر دەنارد، جا (جارێکیان) ئامادەکاریم کرد بۆ عێراق، ئنجا هاتمە خزمەتی دایکی بڕواداران عائیشە، پێم گوت: ئەی دایکی بڕواداران من شتومەکی بازرگانیم بۆ شام دەنارد، ئێستاش بۆ عێراقی دەنێرم، گوتی: کاری وا مەکە، خۆت و شوێنی بازرگانیت چ کێشەیەکی هەیە؟ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر خوا هۆکارێکی ڕزق و ڕۆزی بۆ یەکێکتان ڕەخساند لە ڕێگایەکەوە، با وازی لێ نەهێنێ تاکو لێی نەگۆڕێ، یان بۆی نەگونجاو نەبێ.

## بابەت: پیشەسازی

**٢١٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا بَعَثَ اللَّهُ نَبِيًّا إِلَّا رَاعِيَ غَنَمٍ» قَالَ لَهُ أَصْحَابُهُ: وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَأَنَا كُنْتُ أَرْعَاهَا لِأَهْلِ مَكَّةَ بِالْقَرَارِيطِ» قَالَ سُوَيْدٌ: «يَعْنِي كُلُّ شَاةٍ بِقِيرَاطٍ»[١].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پێغەمبەرێک کە خوا ڕەوانەی کردبێ، ئەوا شوانی مەڕ و ماڵاتی کردوە، هاوەڵەکانی پێیان گوت: ئەتۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ فەرمووی: منیش بۆ خەڵکی مەککە ماڵاتم دەلەوەڕاند بە چەند قیراتێک، سووەید دەڵێ: واتە: هەر مەڕێک بە قیراتێک.

**قیراط:** جۆرێکە لە پارەی ئەو سەردەم، کە نیوەی دەیەکی دینارێکی ئەوکاتەی دەکرد.

**٢١٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «كَانَ زَكَرِيَّا نَجَّارًا»[٢].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەکەریا ﷺ دارتاش بووە.

**٢١٥١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ أَصْحَابَ الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يُقَالُ لَهُمْ: أَحْيُوا مَا خَلَقْتُمْ»[٣].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٣٧٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٥٥٧، ومسلم: ٢١٠٧، والنسائي: ٥٣٦٢.

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دروستکاری پەیکەری گیانلەبەران لە ڕۆژی دواییدا سزا دەدرێن، پێیان دەگوترێ: ئەو شتەی کە دروستتان کردوە گیانی بە بەردا بێنن (کە ناشتوانن ئەوە بکەن).

تێبینی: ئەم فەرموودەیە ئاوا بە ڕەهایی وەرناگیرێ، بەڵکو پێویستە هەموو فەرموودە پەیوەندیدارەکان کۆبکرێنەوە، کەسی شارەزا لێ وردبوونەوەیان بۆ بکات و مانای مەبەست لە وێنە و کارەکە ڕوون بکاتەوە!!!

**٢١٥٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكْذَبُ النَّاسِ الصَّبَّاغُونَ وَالصَّوَّاغُونَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: درۆزنترینی خەڵک ئەوانەن کە جل و بەرگ ڕەنگ دەکەن لەگەڵ ئەوانەی کە خشڵ دروست دەکەن، (چونکە بە گشتی ئەوانە ناتوانن لە دیاری کردنی بەڵێندا ڕاستگۆ بن، مانایەکی دیکەی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە کە زانایان دەڵێن: مەبەست لەو کەسانەیە کە قسە دەگۆڕن و درۆ دەکەن بە ڕاست و هەوڵ دەدەن بیگونجێنن).

## بابەت: پاوانکاری و بازرگانی

**٢١٥٣-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْجَالِبُ مَرْزُوقٌ، وَالْمُحْتَكِرُ مَلْعُونٌ»[٢].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بازرگان خوا ڕزقی فراوان دەکات، بەڵام ئەو کەسەی پاوانکارە (قۆرخکارە) دوورە لە بەزەیی خوا.

تێبینی: بازرگانێک کە کار ئاسانی بۆ خەڵک دەکات، بە نرخی ڕۆژ و گونجاو بە خەڵکی دەفرۆشێ، وەبەر ئەو دوعا بۆ کردنە دەکەوێ، ڕزقی فراوان دەبێ، بەڵام ئەو کەسەی پاوانکاری دەکات و دەست بەسەر بازاڕدا دەگرێ، تاکو شتومەک گران بێت لەسەر خەڵک، دوورە لە ڕەحمەتی خوا و بەر ئەو دوعا لێکردنە دەکەوێ).

---

(١) موضوع.

(٢) ضعیف.

**محتكر:** ئەو كەسەیە كە دەست بەسەر بازاڕدا دەگرێ بۆ ئەوەی شتومەك لەسەر خەڵكی گران بێ، بۆ خۆی سوودی مادی ببینێ لەسەر حیسابی خەڵكی.

**٢١٥٤-** عَنْ مَعْمَرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ نَضْلَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحْتَكِرُ إِلَّا خَاطِئٌ»[١].

واتە: مەعمەری كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی نەزلە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تەنها كەسی تاوانبار و یاخی پاوانكاری دەكات. (واتە: پاوانكاری «احتكار» پیشەی ئەو كەسانەیە كە تاوانبار و یاخی و لادەرن).

**٢١٥٥-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنِ احْتَكَرَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ طَعَامَهُمْ، ضَرَبَهُ اللَّهُ بِالْجُذَامِ وَالْإِفْلَاسِ»[٢].

واتە: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر كەسێک پاوانكاری لەسەرخواردن و خۆراكی مسوڵمانان بكات، خوا تۆڵەی لێدەكاتەوە بەوەی دووچاری گەڕی دەكات و مایەپووچیش دەبێ.

## بابەت: كرێ وەرگرتن لەسەر دوعاكردن (روقیە)

**٢١٥٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثِينَ رَاكِبًا فِي سَرِيَّةٍ، فَنَزَلْنَا بِقَوْمٍ، فَسَأَلْنَاهُمْ أَنْ يَقْرُونَا فَأَبَوْا، فَلُدِغَ سَيِّدُهُمْ، فَأَتَوْنَا، فَقَالُوا: أَفِيكُمْ أَحَدٌ يَرْقِي مِنَ الْعَقْرَبِ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، أَنَا، وَلَكِنْ لَا أَرْقِيهِ حَتَّى تُعْطُونَا غَنَمًا، قَالُوا: فَإِنَّا نُعْطِيكُمْ ثَلَاثِينَ شَاةً، فَقَبِلْنَاهَا، فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ الْحَمْدُ سَبْعَ مَرَّاتٍ فَبَرِئَ، وَقَبَضْنَا الْغَنَمَ، فَعَرَضَ فِي أَنْفُسِنَا مِنْهَا شَيْءٌ، فَقُلْنَا: لَا تَعْجَلُوا حَتَّى نَأْتِيَ النَّبِيَّ ﷺ. فَلَمَّا قَدِمْنَا ذَكَرْتُ لَهُ الَّذِي صَنَعْتُ، فَقَالَ: «أَوَمَا عَلِمْتَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟ اقْتَسِمُوهَا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ سَهْمًا»[٣].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سی سواری ناردین لە سیریەیەكدا، ئێمەش لای هۆزێک دابەزین و داوامان لێكردن كە میوانداریمان بكەن، بەڵام نەیانكرد، ئنجا گەورەكەیان (دووپشک) پێوەیدا، جا هاتن بۆلای ئێمە و گوتیان:

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٠٥، وأبو داود: ٣٤٤٧، والترمذي: ١٢٦٧.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٧٦، ومسلم: ٢٢٠١، وأبو داود: ٣٤١٨ و ٣٩٠٠، والترمذي: ٢٠٦٣.

ئایا کەسێکتان لەگەڵە کە دوعای چاک بوونەوە بکات بۆ کەسێک کە دووپشک پێوەی دابێ؟ (ڕاوی دەڵێ:) گوتم: بەڵێ، بەڵام دوعای بۆ ناکەم تاکو مەڕێکمان پێنەدەن، ئەوانیش گوتیان: ئێمە سی سەر مەڕتان پێدەدەین، ئێمەش ڕازی بووین، ئنجا حەوت جار سوورەتی فاتیحەم لەسەر خوێند و خوا شیفایدا، ئنجا ئێمەش مەڕەکانمان وەرگرتن، بەڵام شتێک لە دەروونماندا دروست بوو (کە ئایا دروستە ئەو مەڕانەمان وەرگرتووە یان نا)، گوتمان: پەلە مەکەن تاکو دەچینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا کاتێک هاتینەوە ئەو کارەی کە کردبووم بۆم باسکرد، ئەویش فەرمووی: چۆنت زانی کە بۆ دوعا (دوعای ژەهر) دەبێ؟ (مەڕەکان) بەش بکەن و لەگەڵ خۆتان بەشێکم بۆ دابنێن.

**٢١٥٦م-** حَدَّثَنَا أَبُو كُرَيْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ، وحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ أَبِي بِشْرٍ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ. قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: «وَالصَّوَابُ هُوَ أَبُو الْمُتَوَكِّلِ»[١].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە. ئەبو عەبدوڵڵا دەڵێ: ڕاستتر ئەوەیە کە ئەبو موتەوەکیلە.

## بابەت: کرێ وەرگرتن لەسەر فێرکردنی قورئان

**٢١٥٧-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: عَلَّمْتُ نَاسًا مِنْ أَهْلِ الصُّفَّةِ الْقُرْآنَ وَالْكِتَابَةَ، فَأَهْدَى إِلَيَّ رَجُلٌ مِنْهُمْ قَوْسًا، فَقُلْتُ: لَيْسَتْ بِمَالٍ، وَأَرْمِي عَنْهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْهَا، فَقَالَ: «إِنْ سَرَّكَ أَنْ تُطَوَّقَ بِهَا طَوْقًا مِنْ نَارٍ فَاقْبَلْهَا»[٢].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: هەندێ خەڵکم لە ئەهلی صوفە فێری قورئان خوێندن و نووسین کرد، پیاوێکیان کەوانێکی بە دیاری پێدام، منیش گوتم: (کەوان) وەکو پارە نیە و لە پێناو خوادا پێی دەجەنگم (قبوڵم کرد)، پرسیارم لە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٧٦، ومسلم: ٢٢٠١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤١٦ و ٣٤١٧.

پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەوبارەوە، فەرمووی: ئەگەر پێت خۆشە بکرێتە تەوقێکی ئاگرین و پێی تەوق بکرێی وەریبگرە. (واتە: وەرگرتنی کەوانەکەی لەسەر فێرکردنی قورئان و نووسین بە قەدەغە و حەرام دانا).

**٢١٥٨-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: عَلَّمْتُ رَجُلًا الْقُرْآنَ، فَأَهْدَى إِلَيَّ قَوْسًا، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «إِنْ أَخَذْتَهَا أَخَذْتَ قَوْسًا مِنْ نَارٍ» فَرَدَدْتُهَا[١].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پیاوێکم فێری قورئان کرد، ئەویش کەوانێکی بە دیاری پێدام، بۆ پێغەمبەری خوان ﷺ باسکرد، فەرمووی: ئەوە کەوانێکی ئاگرینە وەری بگری، جا ڕەتم کردەوە.

## بابەت: قەدەغە کردنی وەرگرتنی کرێ و نرخی سەگ و زینای ئافرەت و کوڵەنانی فاڵ گرەوە و کەڵگرتن

**٢١٥٩-** عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ»[٢].

واتە: ئەبو مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ وەرگرتنی نرخ و بەهای سەگ و زینای ئافرەت و پارەو شیرینی جادووگەری قەدەغە کردوە.

**٢١٦٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَعَسْبِ الْفَحْلِ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتنی نرخ و بەهای سەگ و بەهای پەڕاندنی ئاژەڵی نێری قەدەغە کردوە.

**٢١٦١-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ ثَمَنِ السِّنَّوْرِ»[٤].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەرگرتنی نرخ و بەهای پشیلەی قەدەغە کردوە (بە مانای خۆ لێ دوورگرتن، نەک حەرام).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٣٧، ومسلم: ١٥٦٧، وأبو داود: ٣٤٢٨ و ٣٤٨١، والترمذي: ١١٣٣ و ١٢٧٥ و ١٢٧١، والنسائي: ٤٢٩٢ و ٤٦٦٦.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٦٧٣.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٦٩، وأبو داود: ٣٤٧٩ و ٣٤٨٠، والترمذي: ١٢٧٩، والنسائي: ٤٢٩٥ و ٤٦٦٨.

## بابەت: پیشەی کەڵەشاخ گرتن

**٢١٦٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، احْتَجَمَ وَأَعْطَاهُ أَجْرَهُ» «تَفَرَّدَ بِهِ ابْنُ أَبِي عُمَرَ ﷺ وَحْدَهُ» قَالَهُ ابْنُ مَاجَةَ[1].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی گرت و کرێکەشی دا بە کەڵەشاخ گرەکە. ئیبنو ماجە گوتوویەتی: تەنها ئیبنو ئەبو عومەر ﷺ باسی کردوە.

**٢١٦٣- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: «احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَأَمَرَنِي فَأَعْطَيْتُ الْحَجَّامَ أَجْرَهُ»[2].**

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی گرت و فەرمانی پێکردم (کە کرێکەی بدەم)، منیش کرێکەم بە کەڵەشاخگرەکەدا.

**٢١٦٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ وَأَعْطَى الْحَجَّامَ أَجْرَهُ»[3].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی گرت و کرێکەشی دا بە کەڵەشاخ گرەکە.

**٢١٦٥- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ عُقْبَةَ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ كَسْبِ الْحَجَّامِ»[4].**

واتە: ئەبو مەسعوود عوقبەی کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیشەی کەڵەشاخ گرتنی قەدەغە کردوە.

**٢١٦٦- عَنْ حَرَامِ بْنِ مُحَيِّصَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ، عَنْ كَسْبِ الْحَجَّامِ، فَنَهَاهُ عَنْهُ، فَذَكَرَ لَهُ الْحَاجَةَ، فَقَالَ: «اعْلِفْهُ نَوَاضِحَكَ»[5].**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٠٣ و ٢٢٧٨، ومسلم: ١٢٠٢.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٠٢ و ٢٢١٠، ومسلم: ١٥٧٧، وأبو داود: ٣٤٢٤، والترمذي: ١٢٧٨.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٢٢، والترمذي: ١٢٧٨.

واتە: حەرامی کوڕی موحەیصە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردوە دەربارەی پیشەی کەڵەشاخ گرتن، پێغەمبەریش ﷺ لێی قەدەغە کرد، ئەویش باسی ئەوەی کرد کە پێویستی پێیەتی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: کرێکە بکە بە خۆراکی وشترەئ ئاوکێشەکەت.

## بابەت: ئەو شتانەی فرۆشتنیان حەڵاڵ نیە

**٢١٦٧-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ وَهُوَ بِمَكَّةَ: «إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ، وَالْمَيْتَةِ، وَالْخِنْزِيرِ، وَالْأَصْنَامِ» فَقِيلَ لَهُ عِنْدَ ذَلِكَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ؟ فَإِنَّهُ يُدْهَنُ بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ، قَالَ: «لَا، هُنَّ حَرَامٌ» ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ، إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْهِمُ الشُّحُومَ فَأَجْمَلُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ساڵی ڕزگارکردنی مەککە لە کە لە مەککە بوو فەرمووی: بێگومان خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی عارەق و مردارەوەبو و بەراز و بتیان حەڕام و قەدەغە کردوە، لەو کاتەدا گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی دەربارەی چەوری مردارەوەبوو چی دەفەرمووی کە لە ڕاستیدا کەشتی پێ چەور دەکرێ و پێستەی پێ خۆش و چەور دەکرێ و خەڵکی بۆ ڕوناکی لە چراکاندا دایدەگیرسێنن؟ فەرمووی: نەخێر (دروست نیە) ئەوانە حەڕامن، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا جوولەکەکان لە ناو بەرێ، چونکە بەڕاستی خوا چەوری (ماڵاتی) لەسەر حەڕام کردن، ئەوانیش دەهاتن دەیان تواندەوەو پاشان دەیان فرۆشت و نرخ و بەهاکەیان وەردەگرت و دەیان خوارد.

**٢١٦٨-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْمُغَنِّيَاتِ، وَعَنْ شِرَائِهِنَّ، وَعَنْ كَسْبِهِنَّ، وَعَنْ أَكْلِ أَثْمَانِهِنَّ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٣٦، ومسلم: ١٥٨١، وأبو داود: ٣٤٨٦، والترمذي: ١٢٩٧، والنسائي: ٤٢٥٦ و ٤٦٦٩.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٣٢٨ و ٣١٩٥.

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی کەنیزەکی گۆرانی بێژ و کڕینی و داهاتەکەشی قەدەغە کردوە، وە خواردنی پارەی ئەوانەشی کە پەیدایان کردوە قەدەغە کردوە.

## بابەت: قەدەغە کردنی فرۆشتنی
## بە فڕێدان یان بە دەست لێدان

**٢١٦٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعَتَيْنِ، عَنِ الْمُلَامَسَةِ، وَالْمُنَابَذَةِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە دوو جۆر کڕین و فرۆشتن: دەست لێدان، فڕێدان (هەڵدان).

**الملابسة:** واتە: کڕیار یان فرۆشیار بڵێ: هەرکات دەستت لە شتەکە دا، ببێتە ماڵی تۆ پێش ئەوەی بیبینێ.

**المنابذة:** واتە: فرۆشیار بڵێ: هەرکات ئەو شتەم بۆ هەڵدای، ئەو کاتە کڕینەکەی دادەمەزرێ، پێش ئەوەی بەجوانی سەیری بکات.

لەو دوو مامەڵەیەشدا پەشیمان بوونەوە نەبێ دوای ئەوەی کە کڕیار دەبینێ و بە دڵی نابێ، ئەو دوو جۆرە مامەڵەیە هەردووکیان حەڕامن.

**٢١٧٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «نَهَى عَنِ الْمُلَامَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ» زَادَ سَهْلٌ، قَالَ سُفْيَانُ: «الْمُلَامَسَةُ: أَنْ يَلْمِسَ الرَّجُلُ بِيَدِهِ الشَّيْءَ وَلَا يَرَاهُ، وَالْمُنَابَذَةُ: أَنْ يَقُولَ أَلْقِ إِلَيَّ مَا مَعَكَ وَأُلْقِي إِلَيْكَ مَا مَعِي»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە مامەڵەی بە دەست لێدان یان بۆ هەڵدان، سەهل ئەوەشی بۆ زیاد کردوە: سوفیان گوتی: مولامەسە ئەوەیە کە ئەو پیاوە کڕیارە دەست لە شتەکە بدات و نەیبینێ، مونابەزەش ئەوەیە کە بڵێ: ئەوەی خۆتم بۆ هەڵبدە و منیش ئەوەی خۆم بۆ تۆ هەڵدەدەم.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤٦، ومسلم: ١٥١١، والترمذي: ١٣١٠، والنسائي: ٤٥٠٩ و ٤٥١٣ و ٤٥١٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤٤ و ٥٨٢٠، ومسلم: ١٥١٢، وأبو داود: ٣٣٧٨، والنسائي: ٤٥١٢ و ٤٥١٥.

## بابەت: دروست نیە پیاو کڕین و فرۆشتن بکات بەسەر براکەیدا

**٢١٧١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا يَبِيعُ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر ﭭ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕین و فرۆشتن بەسەر یەکتردا مەکەن (واتە: بەسەر مامەڵەی یەکتر هەڵمەوەستن).

**٢١٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا يَبِيعُ الرَّجُلُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلَا يَسُومُ عَلَى سَوْمِ أَخِيهِ»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پیاو نابێ بەسەر کڕین و فرۆشتنی براکەیدا کڕین و فرۆشتن بکات، وە نابێ مامەڵە بەسەر مامەڵەی براکەیدا بکات.

## بابەت: ڕێگری کردنی زیادکردنی نرخ لەسەر شت بۆ تەفرەدانی کڕیار

**٢١٧٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، نَهَى عَنِ النَّجْشِ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر ﭭ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە زیادکردنی نرخ لەسەر شت (واتە: بە فێڵ نرخی شتومەک زیاد بکات، بۆ ئەوەی کڕیار تەفرە بدات و بۆ خۆی بەو نرخەی نەوێ و هەر بە نیازیش نەبێ کە ئەو شتە بکڕێ، بەڵکو لەگەڵ فرۆشیارەکە ڕێک کەوتبێ بۆ ئەوەی نرخی شتومەکەکە زیاد بکات).

**٢١٧٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا تَنَاجَشُوا»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٣٩ و ٥١٤٢، ومسلم: ١٤١٢، وأبو داود: ٢٠٨١، والترمذي: ١٢٩٢، والنسائي: ٣٢٣٨ و ٣٢٤٣.

(٢) صحيح. انظر البخاري: ٢١٤٠، ومسلم: ١٥١٥. وتخريج الحديث المتقدم (١٨٦٧): البخاري: ٢١٤٠، ومسلم: ١٤١٣، وأبو داود: ٢٠٨٠، والترمذي: ١١٣٤، والنسائي: ٣٢٣٩ و ٣٢٤٠ و ٣٢٤٢ و ٤٥٠٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤٢ و ٦٩٦٣، ومسلم: ١٥١٦، والنسائي: ٤٥٠٥.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤٠، ومسلم: ١٤١٣ و ١٥١٥، والترمذي: ١٣٠٤، والنسائي: ٣٢٣٩ و ٤٤٩٦ و ٤٥٠٢ و ٤٥٠٦ و ٤٥٠٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە فێڵ و تەفرەدان نرخی شتومەک زیاد مەکەن (بۆ تەفرەدانی کڕیار).

## بابەت: ڕێگری کردن لە فرۆشتنی شارنشین بە خەڵکی لادێ

**٢١٧٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کابرای شاری نابێ شتومەک بۆ کابرای لادێی بفرۆشێ (چونکە ئەگەر لادێییەکە بۆ خۆی بیفرۆشێ هەرزانتری دەدات و خەڵکی هەژار گرانیان لەسەر ناکەوێ).

**٢١٧٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «لَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ، دَعُوا النَّاسَ يَرْزُقُ اللَّهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با شاری شتومەک بۆ لادێ نشین نەفرۆشێ، واز لە خەڵکی بهێنن خوا ڕزق و ڕۆزی هەندێکیان بە هۆی هەندێکیانەوە دەدات.

**٢١٧٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ» قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: مَا قَوْلُهُ حَاضِرٌ لِبَادٍ؟ قَالَ: «لَا يَكُونُ لَهُ سِمْسَارًا»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە کە بابای شار نشین شتومەک بفرۆشێ بۆ بابای لادێ نشین، ڕاوی دەڵێ: گوتم: مەبەستی چی بووە لە شاری و لادێی؟ گوتی: واتە: با شارییەکە نەبێتە دەلاڵی لادێ نشینەکە.

---

(١) صحيح. انظر البخاري: ٢١٤٠، ومسلم: ١٥١٥. وتخريج الحديث المتقدم (١٨٦٧): البخاري: ٢١٤٠، ومسلم: ١٤١٣، وأبو داود: ٢٠٨٠، والترمذي: ١١٣٤، والنسائي: ٣٢٣٩ و ٣٢٤٠ و ٣٢٤٢ و ٤٥٠٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٢٢، وأبو داود: ٣٤٤٢، والترمذي: ١٢٢٣، والنسائي: ٤٤٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٥٨، ومسلم: ١٥٢١، وأبو داود: ٣٤٣٩، والنسائي: ٥٤٠٠.

## بابەت: ڕێگری کردن
## لە بەدەمەوەچوونی ئەوانەی کاڵا دێنن بۆ بازاڕ

**٢١٧٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَلَقَّوُا الْأَجْلَابَ، فَمَنْ تَلَقَّى مِنْهُ شَيْئًا فَاشْتَرَى، فَصَاحِبُهُ بِالْخِيَارِ إِذَا أَتَى السُّوقَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە پیر ئەوانەوە مەچۆن (بۆ دەرەوەی بازاڕ)، کەل و پەل و کاڵا دێنن، جا ئەگەر کەسێک بەرە و ڕوویان چو و لێی کڕین، ئەوە هاوەڵەکەی (فرۆشیارەکەی لە دەرەوە هاتووە) کاتێک هاتە ناو بازاڕ سەرپشکە لەوەی کە مامەڵەکە هەڵدەوەشێنێتەوە یان جێبەجێی دەکات.

**٢١٧٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَلَقِّي الْجَلَبِ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە بەرەو ڕووچوونی ئەوانەی کە لە دەرەوەی بازاڕ شتومەک دێنن بۆ ناو بازاڕ.

**٢١٨٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَلَقِّي الْبُيُوعِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە بەرەو ڕووچوونی ئەوانەی کە کڕین و فرۆشتن دەکەن.

## بابەت: کڕیار و فرۆشیار هەلی پەشیمان بوونەوەیان هەیە
## هەتا لە یەکتر جیادەبنەوە

**٢١٨١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِذَا تَبَايَعَ الرَّجُلَانِ فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَفْتَرِقَا وَكَانَا جَمِيعًا، أَوْ يُخَيِّرُ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ، فَإِنْ خَيَّرَ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ فَتَبَايَعَا عَلَى ذَلِكَ، فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ، وَإِنْ تَفَرَّقَا بَعْدَ أَنْ تَبَايَعَا، وَلَمْ يَتْرُكْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا الْبَيْعَ، فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥١٩، وأبو داود: ٣٤٣٧، والترمذي: ١٢٢١، والنسائي: ٤٥٠١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٦٥، ومسلم: ١٥١٧، والنسائي: ٤٤٩٨ و ٤٤٩٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٦٤، ومسلم: ١٥١٨، والترمذي: ١٢٢٠.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٠٧، ومسلم: ١٥٣١، وأبو داود: ٣٤٥٤، والترمذي: ١٢٤٥، والنسائي: ٤٤٦٥_٤٤٨٠.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دوو پیاو مامەڵەیان کرد بەیەکەوە، هەر یەکێکیان مافی سەرپشک بوونی هەیە (بۆ هەڵوەشاندنەوە مامەڵەکە)، مادام لە یەک جیانەبووبنەوە، یان ئەگەر یەکێکیان ئەویتری سەرپشک کرد، جا ئەگەر یەکێکیان ئەویتری سەرپشک کرد و مامەڵەکەیان لەسەر ئەوە کرد، مامەڵەکە دادەمەزرێ (مافی نامێنێ)، خۆ ئەگەر لە دوای ئەوەی مامەڵەکەیان کرد و ئەوجار لە یەک جیابوونەوە و هیچیان مامەڵەکەیان واز لێ نەهێنا، بێگومان مامەڵەکە دادەمەزرێ (دەرفەتی پەشیمانی تێدا نامێنێ).

٢١٨٢- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا»[1].

واتە: ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن (لە هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەکەیان)، مادام لە یەکتر جیانەبووبێتنەوە.

٢١٨٣- عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا»[2].

واتە: سەمورە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن مادام لە یەکتر جیانەبووبنەوە.

## بابەت: کڕین و فرۆشتن بە ڕەزامەندیە

٢١٨٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: اشْتَرَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ رَجُلٍ مِنَ الْأَعْرَابِ حِمْلَ خَبَطٍ، فَلَمَّا وَجَبَ الْبَيْعُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اخْتَرْ» فَقَالَ: الْأَعْرَابِيُّ: عَمْرَكَ اللَّهَ بَيِّعًا[3].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئالیکی وشتری لە پیاوێکی دەشتەکی کڕی، جا کاتێک مامەڵەکەیان دامەزراند پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەرپشک بە، دەشتەکیەکەش گوتی: خوا تەمەنت درێژ بکات مامەڵەکەمان بوو (واتە: بە مامەڵەکە ڕازی بوو).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٥٧.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه النسائي: ٤٤٨١ و ٤٤٨٢.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ١٢٤٩.




٢١٨٥- عَنْ دَاوُدَ بْنِ صَالِحٍ الْمَدَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الْبَيْعُ عَنْ تَرَاضٍ»[١].

واتە: داودی کوڕی صاڵحی مەدەنیی لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوێم لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ بوو کە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان کڕین و فرۆشتن دەبێ بە ڕەزامەندی هەردوو لا بێت.

## بابەت: تێکگیران و ناکۆکی کڕیار و فرۆشیار

٢١٨٦- عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، بَاعَ مِنَ الْأَشْعَثِ بْنِ قَيْسٍ رَقِيقًا مِنْ رَقِيقِ الْإِمَارَةِ، فَاخْتَلَفَا فِي الثَّمَنِ، فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: بِعْتُكَ بِعِشْرِينَ أَلْفًا، وَقَالَ الْأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ: إِنَّمَا اشْتَرَيْتُ مِنْكَ بِعَشَرَةِ آلَافٍ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: إِنْ شِئْتَ حَدَّثْتُكَ بِحَدِيثٍ سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: هَاتِهِ، قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِذَا اخْتَلَفَ الْبَيِّعَانِ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا بَيِّنَةٌ، وَالْبَيْعُ قَائِمٌ بِعَيْنِهِ، فَالْقَوْلُ مَا قَالَ الْبَائِعُ، أَوْ يَتَرَادَّانِ الْبَيْعَ» قَالَ: فَإِنِّي أَرَى أَنْ أَرُدَّ الْبَيْعَ، فَرَدَّهُ[٢].

واتە: لە قاسمی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە لە باوکییەوە دەگێڕنەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ بەندەیەکی لە بەندەکانی کاربەدەستی وڵات بە ئەشعەسی کوڕی قەیس فرۆشت، ئنجا لەسەر نرخەکەی جیاوازیان تێکەوت، جا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ گوتی: من بە بیست هەزار پێم فرۆشتووی، ئەشعەسیش ﷺ گوتی: بە دە هەزار لێم کڕیوی، ئنجا عەبدوڵڵا گوتی: ئەگەر پێت خۆش بێ فەرموودەیەکت بۆ دەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومە، گوتی: بیهێنە، گوتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر کڕیار و فرۆشیار کێشەیان لێ پەیدا بو و شایەدیش لە نێوانیاندا نەبوو، وە فرۆشراوەکەش مابوو، ئەوە قسە قسەی فرۆشیارە یان با فرۆشراوەکە بگێڕنەوە، ئەویش گوتی: من وای بە باش دەزانم کە فرۆشراوەکە بگێڕمەوە، ئنجا بۆی گێڕایەوە.

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٥١١، والترمذي: ١٢٧٠، والنسائي: ٤٦٤٨ و ٤٦٤٩.

## بابەت: ڕێگری کردن لە فرۆشتنی شتێک لەلات نەبێ و قازانجێک کە مسۆگەر نەبێ

**٢١٨٧-** عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الرَّجُلُ يَسْأَلُنِي الْبَيْعَ وَلَيْسَ عِنْدِي، أَفَأَبِيعُهُ؟ قَالَ: «لَا تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ»[١].

واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاو هەیە داوای فرۆشتنی شتێکم لێدەکات کە ئەو شتە لەو کاتەدا لەلام نیە، جا ئایا پێی بفرۆشم؟ فەرمووی: شتێک مەفرۆشە کە لەلای خۆت نیە.

**٢١٨٨-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحِلُّ بَيْعُ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ، وَلَا رِبْحُ مَا لَمْ يُضْمَنْ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ، دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فرۆشتنی شتێک کە لەلات نەبێ (نەتوانی بیدەیە کڕیار) ڕەواو دروست نیە، وە قازانجێک مسۆگەر نەکرابێ (وەک ئەوەی شتێک بفرۆشی ئێستا بە دەست خۆت نەگەیشتووە کە کڕیوتە) ڕەوا نیە.

**٢١٨٩-** عَنْ عَتَّابِ بْنِ أَسِيدٍ ﷺ، قَالَ: «لَمَّا بَعَثَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى مَكَّةَ، نَهَاهُ عَنْ شِفِّ مَا لَمْ يُضْمَنْ»[٣].

واتە: عەتتابی کوڕی ئەسید ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ مەککە نەهی کرد لە قازانجێک کە مسۆگەر نەبێ.

## بابەت: کاتێک دوو کەس مامەڵەیان بە شتێک کرد، بۆ یەکەمیانە

**٢١٩٠-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَوْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «أَيُّمَا رَجُلٍ بَاعَ بَيْعًا مِنْ رَجُلَيْنِ فَهُوَ لِلْأَوَّلِ مِنْهُمَا»[٤].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٥٠٣، والترمذي: ١٢٣٢ و ١٢٣٥، والنسائي: ٤٦١٣.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٥٠٤، والترمذي: ١٢٣٤، والنسائي: ٤٦١١.

(٣) صحيح.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠٨٨، والترمذي: ١١١٠، والنسائي: ٤٦٨٢.

واتە: عوقبەی کوڕی عامر ﷺ یان سەموڕەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێک شتێکی فرۆشت بە دوو کەس، شتەکە بۆ کەسی یەکەمە کە مامەڵەکەی لەگەڵ کراوە.

**٢١٩١-** عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا بَاعَ الْمُجِيزَانِ فَهُوَ لِلْأَوَّلِ»[١].

واتە: سەموڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شتێک دوو کەس فرۆشتیان، مامەڵەی کەسی یەکەم هەژمار دەکرێ.

## بابەت: مامەڵەی عوربان

**٢١٩٢-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، نَهَى عَنْ بَيْعِ الْعُرْبَانِ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب ﷺ لە باوکییەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی پێشەکی پێدانی قەدەغە کردوە.

**عربان:** واتە: کاتێ کڕیار هەندێ پارە دەدات بە فرۆشیار و دەڵێ: ئەگەر مامەڵەکەمان بوو، ئەو پارەیە لەگەڵ نرخەکەیە، ئەگەر شتەکەشم نەویست ئەو پارەیە بۆ خۆت، لای ئێمە لە کوردەواریی پێی دەڵێن: بەعی، یان بیعی.

**٢١٩٣-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، نَهَى عَنْ بَيْعِ الْعُرْبَانِ». قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: الْعُرْبَانُ أَنْ يَشْتَرِيَ الرَّجُلُ دَابَّةً بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَيُعْطِيَهُ دِينَارَيْنِ عُرْبُونًا، فَيَقُولُ إِنْ لَمْ أَشْتَرِ الدَّابَّةَ فَالدِّينَارَانِ لَكَ، وَقِيلَ: يَعْنِي وَاللَّهُ أَعْلَمُ، أَنْ يَشْتَرِيَ الرَّجُلُ الشَّيْءَ فَيَدْفَعَ إِلَى الْبَائِعِ دِرْهَمًا، أَوْ أَقَلَّ، أَوْ أَكْثَرَ، وَيَقُولَ: إِنْ أَخَذْتُهُ وَإِلَّا فَالدِّرْهَمُ لَكَ[٣].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی پێشەکی پێدانی قەدەغە کردوە، ئەبو عەبدوڵڵا گوتی: عوربان بریتیە لەوەی کە کەسێک ئاژەڵێک بکڕێ بە سەد دینار، ئنجا لە پێشەکی دوو دینار بدات (بە فرۆشیار)و بڵێ: ئەگەر من ئەو ئاژەڵەم لێت نەکڕی، دوو دینارەکە بۆ خۆت.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠٨٨، والترمذي: ١١١٠، والنسائي: ٤٦٨٢

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٥٠٢.

(٣) ضعيف.




**گوتراویشە:** هەرچەند خوا زاناترە، وە یان بە مانای ئەوەیە کە کەسێک شتێک بکڕێ، ئنجا درهەمێک یان کەمتر یان زیاتر بداتە فرۆشیار و بڵێ: ئەگەر کڕیم باشە، ئەگەرنا درهەمەکە بۆ تۆ.

## بابەت: قەدەغە کردنی ئەو جۆرە مامەڵانەی کە خەڵەتاندنیان تێدایە

**٢١٩٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ، وَعَنْ بَيْعِ الْحَصَاةِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە مامەڵەیەک کە هەڵخەڵەتاندنی تێدا بێ (وەک فرۆشتنی باڵندە بە ئاسمانەوە یان ماسی لە دەریادا، یان شیر لە گوانی ئاژەڵەکەدا)، وە ڕێگری کردوە لە فرۆشتنێک کە بە بەرد هەڵدان فرۆشراوەکە دیاری بکرێ (وەک ئەوەی بڵێ: ئەو بەردە هەڵدەدەم گەیشتە کوێ تا ئەوێ بە تۆ دەفرۆشم، یان بەر هەر شتێک کەوت پێت دەفرۆشم).

**٢١٩٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە مامەڵە و کڕین و فرۆشتنێک کە هەڵخەڵەتاندنی تێدا بێ.

## بابەت: ڕێگری کردن لە فرۆشتنی بەچکەی ناو سکی ئاژەڵ و ئەوەی لە گوانی دایە، ئەوەی مەلەوان دەیدۆزێتەوە لە دەریادا

**٢١٩٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ شِرَاءِ مَا فِي بُطُونِ الْأَنْعَامِ حَتَّى تَضَعَ، وَعَمَّا فِي ضُرُوعِهَا إِلَّا بِكَيْلٍ، وَعَنْ شِرَاءِ الْعَبْدِ وَهُوَ آبِقٌ، وَعَنْ شِرَاءِ الْمَغَانِمِ حَتَّى تُقْسَمَ، وَعَنْ شِرَاءِ الصَّدَقَاتِ حَتَّى تُقْبَضَ، وَعَنْ ضَرْبَةِ الْغَائِصِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥١٣، وأبو داود: ٣٣٧٦، والترمذي: ١٢٣٠، والنسائي: ٤٥١٨.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١٥٦٣ مختصراً علي النهي عن شراء الغنائم.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە فرۆشتنی ئەو بێچوەی کە لە سکی ئاژەڵدایە تاکو دێتە سەر دنیا، وە (نەهی کردوە لە فرۆشتنی) ئەوەی لە گوانی دایە مەگەر بە پێوانە بێ، وە فرۆشتنی بەندەیەکی هەڵهاتووی قەدەغە کردوە، هەروەها لە کڕینی دەستکەوتی جەنگ تاکو دابەش دەکرێ و فرۆشتنی زەکاتی صەدەقە تاکو وەردەگیرێ، هەروەها (ڕێگری کردوە لە فرۆشتنی) ئەوەی کە مەلەوان بڵێ: مەلەیەک دەکەم جا هەرچی دەستم کەوت لە ناو دەریادا ئەوە پێم فرۆشتی.

**٢١٩٧-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، نَهَى عَنْ بَيْعِ حَبَلِ الْحَبَلَةِ»[(١)].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە فرۆشتنی بێچووەی ناو سکی ئاژەڵ، کە هێشتا لە دایک نەبووە (واتە: بەو مەرجە بیفرۆشێ یان بیکڕێ کە بێچووی بێچووەکەی ئاوس ببێ).

## بابەت: زیادکردنی نرخی شتومەک

**٢١٩٨-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ، جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَسْأَلُهُ، فَقَالَ: لَكَ فِي بَيْتِكَ شَيْءٌ؟ قَالَ: بَلَى، حِلْسٌ نَلْبَسُ بَعْضَهُ، وَنَبْسُطُ بَعْضَهُ، وَقَدَحٌ نَشْرَبُ فِيهِ الْمَاءَ، قَالَ: «ائْتِنِي بِهِمَا» قَالَ: فَأَتَاهُ بِهِمَا، فَأَخَذَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ يَشْتَرِي هَذَيْنِ؟» فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا آخُذُهُمَا بِدِرْهَمٍ، قَالَ: «مَنْ يَزِيدُ عَلَى دِرْهَمٍ؟» مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، قَالَ رَجُلٌ: أَنَا آخُذُهُمَا بِدِرْهَمَيْنِ، فَأَعْطَاهُمَا إِيَّاهُ وَأَخَذَ الدِّرْهَمَيْنِ، فَأَعْطَاهُمَا الْأَنْصَارِيَّ، وَقَالَ: «اشْتَرِ بِأَحَدِهِمَا طَعَامًا فَانْبِذْهُ إِلَى أَهْلِكَ، وَاشْتَرِ بِالْآخَرِ قَدُومًا، فَأْتِنِي بِهِ» فَفَعَلَ، فَأَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَشَدَّ فِيهِ عُودًا بِيَدِهِ، وَقَالَ: «اذْهَبْ فَاحْتَطِبْ وَلَا أَرَاكَ خَمْسَةَ عَشَرَ يَوْمًا» فَجَعَلَ يَحْتَطِبُ وَيَبِيعُ، فَجَاءَ وَقَدْ أَصَابَ عَشَرَةَ دَرَاهِمَ، فَقَالَ: «اشْتَرِ بِبَعْضِهَا طَعَامًا وَبِبَعْضِهَا ثَوْبًا» ثُمَّ قَالَ: «هَذَا خَيْرٌ لَكَ مِنْ أَنْ تَجِيءَ وَالْمَسْأَلَةُ نُكْتَةٌ فِي وَجْهِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لَا تَصْلُحُ إِلَّا لِذِي فَقْرٍ مُدْقِعٍ، أَوْ لِذِي غُرْمٍ مُفْظِعٍ، أَوْ دَمٍ مُوجِعٍ»[(٢)].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤٣، ومسلم: ١٥١٤، وأبو داود: ٣٣٨٠، والنسائي: ٤٦٢٣_٤٦٢٥.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ١٦٤١، والترمذي: ١٢١٨، والنسائي: ٤٥٠٨.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێکی ئەنصاڕی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای لێکرد کە شتێکی پێبدات، ئەویش فەرمووی: هیچ شتێکت هەیە لە ماڵەوە؟ گوتی: بەڵێ، پارچە جلێک یان بەڕێک کە بەشێکی بە خۆماندا دەدەین و بەشێکیشی ڕادەخەین، وە دەفرێکیشمان هەیە ئاوی تێدا دەخۆینەوە، فەرمووی: هەردووکیانم بۆ بێنە، ئەویش هەردووکی هێنانە خزمەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی وەریگرتن، پاشان فەرمووی: کێ ئەو دووانەم لێ دەکڕێ؟ پیاوێک گوتی: من بە درهەمێک دەمەوێن، دوو جار یان سێ جار فەرمووی: کێ لە درهەمێک زیاتری پێدەدات؟ پیاوێک گوتی: من بە دوو درهەم دەمەوێن، ئنجا هەردووکی دانە پیاوەکە و دوو درهەمەکەی لێ وەرگرتن و بە پیاوە ئەنصارییەکەی دان و فەرمووی: بە یەکێکیان خواردن بکڕە و بیبەوە بۆ ماڵەوەتان، وە بە درهەمەکەی تر تەورێک بکڕە و بۆ منی بێنەوە، ئەویش ئەوەی کرد (کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو بوو)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لێی وەرگرت و بە دەستی خۆی کلکە تەورێکی لە تەورەکە کرد و فەرمووی: بڕۆ دار بێنە و بیفرۆشە تاکو پانزە ڕۆژی تر نەتبینمەوە، ئنجا کابرا دەستی کرد بە دار فرۆشتن و هاتەوە و دە درهەمی پەیدا کردبوو، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ ) پێی فەرموو: بە بەشێکی خواردن بکڕە و بە بەشەکەی تر جلوبەرگ بکڕە، پاشان پێی فەرموو: ئەو ئیشە باشترە بۆ تۆ لەوەی کە بێی داوای یارمەتی بکەی کە دەبێتە پەڵەیەک بە نێو چاوانتەوە لە ڕۆژی دواییدا، چونکە سواڵکردن گونجاو نیە تەنها بۆ کەسێکی زۆر هەژار نەبێ یان کەسێکی زۆر قەرزدار نەبێ یان کەس کە خوێنێکی لە ئەستۆ بێ (کە ئەگەر نەیداتەوە، لە بری خوێنەکە دەکوژرێتەوە و ئازاری پێدەگات).

## بابەت: قبووڵکردنی پەشیمان بوونەوە لە مامەڵە

**٢١٩٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَقَالَ مُسْلِمًا، أَقَالَهُ اللَّهُ عَثْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٦٠.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک چاوپۆشی بکات لە هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەی مسوڵمانێک، لە ڕۆژی دواییدا خوا چاوپۆشی لە گوناهەکانی دەکات.

## بابەت: ئەوەی نرخ دانانی لەلا ناپەسندە

**٢٢٠٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: غَلَا السِّعْرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ غَلَا السِّعْرُ فَسَعِّرْ لَنَا، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمُسَعِّرُ، الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الرَّازِقُ، إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أَلْقَى رَبِّي وَلَيْسَ أَحَدٌ يَطْلُبُنِي بِمَظْلِمَةٍ فِي دَمٍ وَلَا مَالٍ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: نرخی شتومەک بەرز بۆوە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نرخ زۆر بەرز بۆتەوە، ئەگەر نرخت دیاری کردبا (بۆ شتەکان)، ئەویش فەرمووی: خوا خۆی نرخ دانەرە و ڕزق دەگرێتەوە و زیادی دەکا و هەر ئەو ڕزق و ڕۆزی دەرە، بێگومان من ئومێد دەکەم کە کاتێ بە پەروەردگارم دەگەم هیچ یەکێک نەبێ، کە داواکاری ستەم لێکردنی خوێن و ماڵی لەسەرم هەبێ.

**٢٢٠١-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: غَلَا السِّعْرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: لَوْ قَوَّمْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أُفَارِقَكُمْ وَلَا يَطْلُبَنِي أَحَدٌ مِنْكُمْ بِمَظْلِمَةٍ ظَلَمْتُهُ»[2].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ نرخی کەل و پەل زیاد هەڵکشا، جا عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نرخت دیاری کردبا، فەرمووی: لە ڕاستیدا من ئومێدم وایە کاتێ لێتان جیادەبمەوە هیچ یەکێک لە ئێوە نەبێ کە داواکاری هەقێکی لەسەر من هەبێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٥١، والترمذي: ١٣١٤.

(٢) صحيح لغيره.

## بابەت: ئاسانکاری و چاوپۆشی لە کڕین و فرۆشتن

٢٢٠٢- عَنْ عَطَاءِ بْنِ فَرُّوخَ، قَالَ: قَالَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَدْخَلَ اللَّهُ الْجَنَّةَ رَجُلًا كَانَ سَهْلًا بَائِعًا وَمُشْتَرِيًا»(١).

واتە: عەتائی کوڕی فەڕوخ دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا پیاوێکی (بازرگانی) خستە نێو بەهەشتەوە بە هۆی ئەوەی ئاسانکار بەە لە کڕین و فرۆشتندا.

٢٢٠٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَحِمَ اللَّهُ عَبْدًا سَمْحًا إِذَا بَاعَ، سَمْحًا إِذَا اشْتَرَى، سَمْحًا إِذَا اقْتَضَى»(٢).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لە بەندەیەک بێ ئاسانکارە و چاوپۆشی دەکات لە فرۆشتن و لە کڕیندا، وە کاتێکیش کە داوای ماڵەکەی لە خەڵکی دەکات.

## بابەت: زیاد تێبەستن لە مامەڵەدا (هەڵدا و پێدا)

٢٢٠٤- عَنْ قَيْلَةَ أُمِّ بَنِي أَنْمَارٍ ﷺ، قَالَتْ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ عُمَرِهِ عِنْدَ الْمَرْوَةِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي امْرَأَةٌ أَبِيعُ وَأَشْتَرِي، فَإِذَا أَرَدْتُ أَنْ أَبْتَاعَ الشَّيْءَ، سُمْتُ بِهِ أَقَلَّ مِمَّا أُرِيدُ، ثُمَّ زِدْتُ، حَتَّى أَبْلُغَ الَّذِي أُرِيدُ، وَإِذَا أَرَدْتُ أَنْ أَبِيعَ الشَّيْءَ، سُمْتُ بِهِ أَكْثَرَ مِنَ الَّذِي أُرِيدُ، ثُمَّ وَضَعْتُ حَتَّى أَبْلُغَ الَّذِي أُرِيدُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَفْعَلِي يَا قَيْلَةُ إِذَا أَرَدْتِ أَنْ تَبْتَاعِي شَيْئًا، فَاسْتَامِي بِهِ الَّذِي تُرِيدِينَ، أُعْطِيتِ أَوْ مُنِعْتِ، وَإِذَا أَرَدْتِ أَنْ تَبِيعِي شَيْئًا، فَاسْتَامِي بِهِ الَّذِي تُرِيدِينَ، أَعْطَيْتِ أَوْ مَنَعْتِ»(٣).

واتە: قەیلەی دایکی بەنو ئەنمار ﷺ دەڵێ: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێک لە عومرەکانیدا لەلای مەڕوە، ئنجا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئافرەتێکم دەکڕم و دەفرۆشم (مامەڵە دەکەم)، جا کاتێک بمەوێ شتێک بکڕم نرخێکی

---

(١) حسن. أخرجه النسائي: ٤٦٩٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٧٦، والترمذي: ١٣٢٠.

(٣) ضعيف.

لەسەر دادەنێم کەمتر لەوەی کە خۆم دەمەوێ، پاشان وردە وردە زیادی دەکەم تا دەگاتە ئەو نرخەی خۆم دەمەوێ، وە کاتێک دەمەوێ شتێک بفرۆشم زیاتری تێدەبەستم لەوەی کە شتومەکەکانم دەیهێنێ، ئنجا نرخەکەی دادەبەزێنم تا دەگاتە ئەو نرخەی خۆم دەمەوێ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو کارە مەکە، ئەی قەیلە، ئەگەر ویستت شتێک بکڕی، ئەو نرخەی لەسەر دابنێ کە دەتەوێ، پێت بدەن یان نا، وە ئەگەر ویستت شتێک بفرۆشی ئەو نرخەی لەسەر دابنێ کە خۆت مەبەستتە، جا بەو نرخە بیدەی یان نەیدەی.

٢٢٠٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَزْوَةٍ، فَقَالَ لِي: «أَتَبِيعُ نَاضِحَكَ هَذَا بِدِينَارٍ وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَكَ؟» قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هُوَ نَاضِحُكُمْ إِذَا أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ، قَالَ: «فَتَبِيعُهُ بِدِينَارَيْنِ وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَكَ» قَالَ: فَمَا زَالَ يَزِيدُنِي دِينَارًا دِينَارًا، وَيَقُولُ مَكَانَ كُلِّ دِينَارٍ: «وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَكَ» حَتَّى بَلَغَ عِشْرِينَ دِينَارًا، فَلَمَّا أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ أَخَذْتُ بِرَأْسِ النَّاضِحِ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «يَا بِلَالُ أَعْطِهِ مِنَ الْغَنِيمَةِ عِشْرِينَ دِينَارًا» وَقَالَ: «انْطَلِقْ بِنَاضِحِكَ فَاذْهَبْ بِهِ إِلَى أَهْلِكَ»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: لە یەکێک لە غەزاکاندا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم، پێی فەرمووم: ئایا ئەو وشترەت نافرۆشی بە دینارێک، خوا لێت خۆش دەبێ؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وشتری خۆتانە هەرکات هاتمەوە بۆ مەدینە، فەرمووی: دەی دەیفرۆشی بە دوو دینار، خوا لێت خۆش دەبێ؟ گوتی: بەردەوام زیادی پێدەدام دینار بە دینار زیادی دەکرد، وە لەگەڵ هەر دینارێکدا (کە زیادی دەکرد) دەیفەرموو: خوا لێت خۆش دەبێ، تاکو گەیشتە بیست دینار، جا کاتێک چوومەوە مەدینە وشترەکەم گرت و بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ئەی بیلال، لە دەستکەوتی جەنگ بیست دیناری بدەیە، وە (بە منیشی) فەرموو: وشترەکە بەرەوە و بڕۆ بیبە بۆ خانەوادەکەت.

٢٢٠٦- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ السَّوْمِ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وَعَنْ ذَبْحِ ذَوَاتِ الدَّرِّ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧١٨، ومسلم بإثر: ١٥٩٩، وأبو داود بنحوه: ٣٥٠٥، والنسائي: ٤٦٤١.

(٢) ضعيف. لكن جملة الدَّرِّ عند مسلم نحوه.




واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە مامەڵە و نرخ دیاری کردن لە پێش خۆرهەڵاتندا (یان لەوەڕاندنی وشتر لەوکاتەدا چونکە هۆکارە بۆ تووش بوون بە نەخۆشی)، وە ڕێگری کردوە لە کوشتنەوەی ئاژەڵی شیردەر.

## بابەت: ناپەسەندی سوێند خواردن لە کڕین و فرۆشتندا

**٢٢٠٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِالْفَلَاةِ يَمْنَعُهُ ابْنَ السَّبِيلِ، وَرَجُلٌ بَايَعَ رَجُلًا سِلْعَةً بَعْدَ الْعَصْرِ فَحَلَفَ بِاللَّهِ لَأَخَذَهَا بِكَذَا وَكَذَا فَصَدَّقَهُ، وَهُوَ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ، وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لَا يُبَايِعُهُ إِلَّا لِدُنْيَا، فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا وَفَى لَهُ، وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ مِنْهَا لَمْ يَفِ لَهُ»[(١)].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ تاقم هەن کە لە ڕۆژی دواییدا خوا قسەیان لەگەڵ ناکات و ڕوویان تێناکات و لە تاوان پاکیان ناکاتەوە و سزایەکی بە ئێشیشیان بۆ هەیە: پیاوێک کە لە سەحرایەک خاوەنی ئاوی زیادەیە و ڕێبوارانی لێ بێ بەش دەکات، وە پیاوێک کە شتومەک دوای عەسر بە کەسێک دەفرۆشێ و سوێندی لەسەر دەخوات بە ئەوەندە و ئەوەندە کڕیویەتی و ئەویش بڕوای پێدەکات و شتەکەش وانیە (ڕاست ناکات)، وە کەسێکیش کە پەیمان بە پێشەوایەک بدات کە تەنها لەبەر بەرژەوەندی دونیایی پەیمانی پێ دەدات، جا ئەگەر پێویستی دونیای بۆ مسۆگەر کرد، وەفا بە پەیمانەکە دەکات، خۆ ئەگەر دونیای پێ نەدا، وەفادار نابێ بە پەیمانەکە.

**٢٢٠٨-** عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ» فَقُلْتُ: مَنْ هُمْ؟ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَدْ خَابُوا وَخَسِرُوا، قَالَ: «الْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَالْمَنَّانُ عَطَاءَهُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ»[(٢)].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٥٨، ومسلم: ١٠٨، وأبو داود: ٣٤٧٤ و ٣٤٧٥، والترمذي: ١٥٩٥، والنسائي مختصراً: ٤٤٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٦، وأبو داود: ٤٠٨٧، والترمذي: ١٢١١، والنسائي: ٢٥٦٣ و ٢٥٦٤ و ٤٤٥٨ و ٤٤٥٩ و ٥٣٣٣.

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ تاقم هەن کە لە ڕۆژی دواییدا خوا نایاندوێنێ و سەیریان ناکات و پاکیان ناکاتەوەو سزایەکی بە ئازاریشیان هەیە، گوتم: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا، چونکە بەڕاستی ڕەنج بە خەساربوون، فەرمووی: ئەو کەسەی کە پۆشاکەکەی درێژە (لە کاتی ڕۆیشتندا بە زەوی دەخشێ)، وە ئەو کەسەی لە بەخشینەکانیدا منەت دەکات، وە کەسێک (کە بازرگانە) بە سوێندی بە درۆ کاڵاکەی دەفرشێ

**٢٢٠٩-** عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالْحَلِفَ فِي الْبَيْعِ، فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ، ثُمَّ يَمْحَقُ»[١].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە سوێند خواردن لەکاتی مامەڵەدا، چونکە شتەکە ساغ دەکاتەوەو دەفرشێ، بەڵام بێ بەرەکەتی دەکات.

## بابەت: ئەو کەسەی خورمای چاککراو و بەندەی خاوەن ماڵ دەفرۆشێ

**٢٢١٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «مَنِ اشْتَرَى نَخْلًا قَدْ أُبِّرَتْ، فَثَمَرَتُهَا لِلْبَائِعِ إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک باخ، یان دار خورمایەک بکڕێ کە نێرە و مێیەی پێ کرابێ (موتوربە)، بەرهەمی (ئەو ساڵەی) بۆ فرۆشیارە، مەگەر کڕیار (لە کاتی کڕینەکەدا) کردبێتیە مەرج (کە بۆ کڕیارەکە بێ).

**٢٢١٠م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ رُمْحٍ قَالَ: أَنْبَأَنَا اللَّيْثُ بْنُ سَعْدٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ[٣].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٠٧، والنسائي: ٤٤٦٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٠٤، ومسلم: ١٥٤٣، وأبو داود: ٣٤٣٣، والترمذي: ١٢٤٤، والنسائي: ٤٦٣٥ و ٤٦٣٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٠٤، ومسلم: ١٥٤٣، وأبو داود: ٣٤٣٣، والترمذي: ١٢٤٤، والنسائي: ٤٦٣٥ و ٤٦٣٦.

٢٢١١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ بَاعَ نَخْلًا قَدْ أُبِّرَتْ، فَثَمَرَتُهَا لِلَّذِي بَاعَهَا، إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ، وَمَنِ ابْتَاعَ عَبْدًا وَلَهُ مَالٌ، فَمَالُهُ لِلَّذِي بَاعَهُ، إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دار خورمایەک بفرۆشێ کە نێرە و مێیەی پێ کرابێ، بەرهەمەکەی بۆ فرۆشیارە، مەگەر کڕیار بە مەرجی دانابێ (کە بۆ ئەو بێت)، وە هەر کەس بەندەیەک بفرۆشێ کە خاوەن سەروەت و سامان بێ، سامانەکەی بۆ فرۆشیارە، مەگەر کڕیار بە مەرجی گرتبێ (کە بە ماڵ و سامانەوە بیکڕێ).

٢٢١٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ بَاعَ نَخْلًا وَبَاعَ عَبْدًا جَمَعَهُمَا جَمِيعًا»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس داری خورمای فرۆشت وە بەندەی فرۆشت، (پێغەمبەر ﷺ) هەردووکیانی ئاوا کۆکردەوە بە یەکەوە (واتە: باسی دار خورما و بەندەی بە یەکەوە باس کردوە، کە دار خورمای نێرە و مێیە پێکراو بەرهەمەکەی بۆ فرۆشیارە، هەروەها سامانی بەندەش هەر بۆ فرۆشیارە).

٢٢١٣- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: «قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِثَمَرِ النَّخْلِ لِمَنْ أَبَّرَهَا، إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ، وَأَنَّ مَالَ الْمَمْلُوكِ لِمَنْ بَاعَهُ، إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ»[٣].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری داوە بەوەی کە بەرهەمی دار خورما بۆ ئەو کەسەیە کە نێر و مێی پێکردوە، مەگەر کڕیار بە مەرجی بگرێ، وە سامانی بەندەش بۆ ئەو کەسەیە کە دەیفرۆشێ، مەگەر کڕیار بە مەرجی بگرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٠٤، ومسلم: ١٥٤٣، وأبو داود: ٣٤٣٣، والترمذي: ١٢٤٤، والنسائي: ٤٦٣٥ و ٤٦٣٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح لغيره.

## بابەت: ڕێگری کردن لە فرۆشتنی میوەجات پێش ئەوەی پێگەیشتنی لێ بە دیاربکەوێ

**٢٢١٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا تَبِيعُوا الثَّمَرَةَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهَا» نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ[١].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: میوە مەفرۆشن تاکو پێگەیشتنی لێ بەدەردەکەوێ، ڕێگری لە فرۆشیار و کڕیار کردوە (لەو جۆرە مامەڵەیە).

**يَبْدُوَ صَلَاحُهَا:** واتە: ئەو میوەی بە دارەوەیە لە ئافات دەرچێ و ئەوەی لێ بەدەرکەوێ، کە دەگونجێ ئەو میوەیە پێبگات و هەڵنەوەرێ، زیان بە کڕیار نەگات.

**٢٢١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَبِيعُوا الثَّمَرَ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ»[٢].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: میوەجات مەفرۆشن هەتاکو پێگەیشتنی لێ بە دەردەکەوێ.

**٢٢١٦- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ»[٣].**

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە فرۆشتنی میوە هەتاکو پێگەیشتنی لێ بە دەردەکەوێ.

**٢٢١٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى عَنْ بَيْعِ الثَّمَرَةِ حَتَّى تَزْهُوَ، وَعَنْ بَيْعِ الْعِنَبِ حَتَّى يَسْوَدَّ، وَعَنْ بَيْعِ الْحَبِّ حَتَّى يَشْتَدَّ»[٤].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە فرۆشتنی بەروبووم تاکو پێگەیشتنی دەردەکەوێ، وە (ڕێگری کردوە) لە فرۆشتنی ترێ تاکو ڕەش دەبێ، وە لە فرۆشتنی دانەوێڵە تاکو توند و ڕەق دەبێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٩٤، ومسلم: ١٥٣٤، وأبو داود: ٣٣٦٧، والترمذي بنحوه: ١٢٢٦ و ١٢٢٧، والنسائي: ٤٥١٩.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٣٨، والنسائي: ٤٥٢١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٨٧، ومسلم: ١٥٣٦، وأبو داود بنحوه: ٣٣٧٠، والنسائي: ٣٩٢١ و ٤٥٢٣.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٧١، والترمذي: ١٢٢٨.

## بابەت: فرۆشتنی بەروبووم و باخ بۆ چەند ساڵێک و، ئەوەی تووشی لەناوچوون بووە

**٢٢١٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى عَنْ بَيْعِ السِّنِينَ»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی میوەجاتی باخی بۆ چەند ساڵێک قەدەغە کردوە (واتە: فرۆشتنی میوەی باخێک بە جۆرێ فرۆشیار بڵێ: بەرهەمی ئەو باخەم فرۆشتە تۆ بۆ چوار ساڵ، ئەو مامەڵەیە حەڕامە، چونکە فرۆشتنی شتێکە لە کاتی فرۆشتنەکەدا بوونی نیە).

**٢٢١٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ بَاعَ ثَمَرًا فَأَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ، فَلَا يَأْخُذْ مِنْ مَالِ أَخِيهِ شَيْئًا، عَلَامَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مَالَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ؟»[2].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک میوەی باخێک بفرۆشێ و ئافات لێی بدات، نابێ (فرۆشیار) لە بەرانبەردا هیچ لە براکەی وەربگرێ، ئاخر لەسەر چی یەکێک لە ئێوە بەو حاڵە پارە لە برا مسوڵمانەکەی وەردەگرێ؟! (واتە: کە باخەکە ئافات لێی بدات، دەی لە بەرانبەر چی پارەکە وەردەگرێ؟!).

## بابەت: کێشانە کردن بە سەنگەوە

**٢٢٢٠-** عَنْ سُوَيْدِ بْنِ قَيْسٍ ﵁، قَالَ: جَلَبْتُ أَنَا وَمَخْرَفَةُ الْعَبْدِيُّ بَزًّا مِنْ هَجَرَ، فَجَاءَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَاوَمَنَا سَرَاوِيلَ، وَعِنْدَنَا وَزَّانٌ يَزِنُ بِالْأَجْرِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا وَزَّانُ زِنْ وَأَرْجِحْ»[3].

واتە: سوەیدی کوڕی قەیس ﵁ دەڵێ: لەگەڵ مەخرەفەی عەبدی لە هەجەڕەوە قوماشمان هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ سەودای شەڕواڵێکی لێکردین، وە کەسێکمان لا بوو بە کرێ کەلوپەلی دەکێشا، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەی ئەو کەسەی دەکێشی، بکێشە بە سەنگەوە (واتە: گران بکێشەو بە زیادەوە بیدەرێ).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٣٦/١٠١، وأبو داود: ٣٣٧٤ بزيادة أو وضع الجوائح، والنسائي: ٤٥٣١.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٥٤، وأبو داود: ٣٤٧٠، والنسائي: ٤٥٢٨.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٣٦، والترمذي: ١٣٠٥، والنسائي: ٤٥٩٢.

٢٢٢١- عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ مَالِكًا أَبَا صَفْوَانَ بْنَ عُمَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «بِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رِجْلَ سَرَاوِيلَ قَبْلَ الْهِجْرَةِ، فَوَزَنَ لِي، فَأَرْجَحَ لِي»[١].

واتە: سیماکی کوڕی حەڕب دەڵێ: گوێم لە مالیکی کوڕی صەفوانی کوڕی عومەیرە ﷺ بوو، دەیگوت: شەڕواڵێکم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کڕی پێش کۆچکردن (بۆ مەدینە)، ئەویش بۆی کێشام بە گرانەوە.

٢٢٢٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا وَزَنْتُمْ فَأَرْجِحُوا»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکاتێک شتتان کێشا بە سەنگەوە بیکێشن.

## بابەت: پارێزکردن لە پێوانە و کێشانەدا

٢٢٢٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ كَانُوا مِنْ أَخْبَثِ النَّاسِ كَيْلًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ۝١﴾ المطففين، فَأَحْسَنُوا الْكَيْلَ بَعْدَ ذَلِكَ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە خەڵکی مەدینە خراپترینی خەڵکی بوون لە پێوانەکردندا (واتە: فێڵیان تێدا دەکرد)، جا کاتێک خوای پاک و بێگەرد ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ۝١﴾ المطففين، واتە: هاوارو تیاچوون بۆ تەرازوو بازان، لەدوای ئەوە کێشانە و پێوانەیان چاککرد.

## بابەت: قەدەغە کردنی فێڵ و گزی کردن

٢٢٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِرَجُلٍ يَبِيعُ طَعَامًا، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهِ فَإِذَا هُوَ مَغْشُوشٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ غَشَّ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٣٦، والترمذي: ١٣٠٥، والنسائي: ٤٥٩٢.

(٢) صحيح.

(٣) حسن.

(٤) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٢، وأبو داود: ٣٤٥٢، والترمذي: ١٣١٥.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای پیاوێکدا تێپەڕی کە خواردەمەنی دەفرۆشت، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) دەستی خستە ناویەوە بینی کە فێڵی تێدا کراوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو کەسەی فێڵ و گزی بکات لە ئێمە نیە.

٢٢٢٥- عَنْ أَبِي الْحَمْرَاءِ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِجَنَبَاتِ رَجُلٍ عِنْدَهُ طَعَامٌ فِي وِعَاءٍ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهِ، فَقَالَ: «لَعَلَّكَ غَشَشْتَ، مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا»[١].

واتە: ئەبو حەمراء ﷺ دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەوری پیاوێکدا تێپەڕی کە خواردەمەنی لەلا بوو لە کیسێکدا (بۆ فرۆشتن)، (پێغەمبەر ﷺ) دەستی خستە ناوی و فەرمووی: پێدەچێ گزیت تێدا کردبێ، هەر کەس گزیمان لێبکات لەسەر ڕێبازی ئێمە نیە.

## بابەت: ناڕەوایی فرۆشتنی خواردەمەنی پێش ئەوەی دەست بە دەست وەربگیرێ

٢٢٢٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلَا يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خۆراکێکی کڕی با نەیفرۆشێتەوە هەتاکو بە تەواوی وەریدەگرێ.

٢٢٢٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلَا يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ» قَالَ أَبُو عَوَانَةَ فِي حَدِيثِهِ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَحْسِبُ كُلَّ شَيْءٍ مِثْلَ الطَّعَامِ[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خۆراکێکی کڕی با نەیفرۆشێتەوە بە کەسێکیتر تاکو بە تەواوی وەریدەگرێ، ئەبو عەوانە لەو فەرموودەیەی کە ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: ئیبنو عەبباس گوتی: وا دەزانم هەموو شتێک حوکمی وەک خۆراک وایە.

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٢٦، ومسلم: ١٥٢٦، وأبو داود: ٣٤٩٢، والنسائي: ٤٥٩٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٣٢، ومسلم: ١٥٢٥، وأبو داود: ٣٤٩٦ و ٣٤٩٧، والترمذي: ١٢٩١، والنسائي: ٤٥٩٧ و ٤٥٩٩ و ٤٦٠٠ و ٥٧٥٨.

**٢٢٢٨- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الطَّعَامِ حَتَّى يَجْرِيَ فِيهِ الصَّاعَانِ، صَاعُ الْبَائِعِ، وَصَاعُ الْمُشْتَرِي»[١].**

**واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە فرۆشتنی خۆراک هەتا دوو پێوانە، یان کێشانە دەکرێ، پێوانەیەکی فرۆشیار و پێوانەیەکی کڕیار (واتە: ئەگەر ئەو شتە بە پێوانە بوو نابێ کڕیار بڵێ: مادام فرۆشیار جاری یەکەم پێوانەی کردوە، ئیتر من ئێستا کە لێی دەکڕم نایپێومەوە! بەڵکو دەبێ ئەویش پێوانەی بکاتەوە).**

## بابەت: فرۆشتنی بێ پێوانە و کێشانە (لە گۆترە)

**٢٢٢٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نَشْتَرِي الطَّعَامَ مِنَ الرُّكْبَانِ جِزَافًا، فَنَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَبِيعَهُ حَتَّى نَنْقُلَهُ مِنْ مَكَانِهِ»[٢].**

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: ئێمە بە گۆترە خۆراکمان لەو کەسانە دەکڕی کە لە دەرەوەی شار دەیانهێنا، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی قەدەغە کردین کە بیفرۆشینەوە هەتا لە شوێنی خۆی دەیگوازینەوە (واتە: بۆ ئەوەی بوو، گواستنەوەکە بە تەواوی دەستا و دەستی پێ بکرێ).**

**٢٢٣٠- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ أَبِيعُ التَّمْرَ فِي السُّوقِ، فَأَقُولُ: كِلْتُ فِي وَسْقِي هَذَا كَذَا، فَأَدْفَعُ أَوْسَاقَ التَّمْرِ بِكَيْلِهِ، وَآخُذُ شِفِّي، فَدَخَلَنِي مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «إِذَا سَمَّيْتَ الْكَيْلَ فَكِلْهُ»[٣].**

**واتە: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێ: لە بازاڕ خورمام دەفرۆشت، جا (بە کڕیارم) دەگوت: پێوانەم کردوە و ئەوەندەیە، ئەو ئەندازە دیاریکراوەی کە پێوانەم کردبوو بە هەمان پێوانە دەمدایە کڕیار، وە قازانجی خۆم وەردەگرت، ئیتر منیش گومانم بۆ دروست بوو لەو کارە (کە بە پێوانەی خۆم کە کڕیبووم دەمفرۆشتەوە)، بۆیە پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، فەرمووی: کاتێ پێوانەکەت دیاری کرد، بە قورس بیپێوە.**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٢٣ و ٢١٦٧، ومسلم: ١٥٢٧، وأبو داود: ٣٤٩٣ و ٣٤٩٤ و ٣٤٩٨، والنسائي: ٤٦٠٥_٤٦٠٧.

(٣) صحيح.

## بابەت: ئومێدی پیت و بەرەکەت لە پێوانەو کێشانی خۆراکدا

**٢٢٣١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ الْمَازِنِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كِيلُوا طَعَامَكُمْ يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ»[١].

**واتە** عەبدوڵڵای کوڕی بوسری مازینیی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: (لە کاتی کڕین و فرۆشتندا) خۆراکەکانتان بپێون بەرەکەتی تێدەکەوێ بۆتان.

**٢٢٣٢-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «كِيلُوا طَعَامَكُمْ يُبَارَكْ فِيهِ»[٢].

**واتە:** ئەبو ئەیوب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆراکەکانتان بپێون دەبێتە مایەی بەرەکەت بۆتان.

## بابەت: بازاڕ و چوونە بازاڕ

**٢٢٣٣-** عَنْ أَبِي أَسِيدٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا أَسِيدٍ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، ذَهَبَ إِلَى سُوقِ النَّبِيطِ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: «لَيْسَ هَذَا لَكُمْ بِسُوقٍ» ثُمَّ ذَهَبَ إِلَى سُوقٍ فَنَظَرَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: «لَيْسَ هَذَا لَكُمْ بِسُوقٍ» ثُمَّ رَجَعَ إِلَى هَذَا السُّوقِ فَطَافَ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: «هَذَا سُوقُكُمْ، فَلَا يُنْتَقَصَنَّ، وَلَا يُضْرَبَنَّ عَلَيْهِ خَرَاجٌ»[٣].

**واتە:** ئەبو ئەسید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ بازاڕی «نبیط» (ناوی شوێنێکە)، جا تەماشایەکی کرد و فەرمووی: ئەو بازاڕە شیاو نیە بۆ ئێوە، پاشان ڕۆیشت بۆ بازاڕ و تەماشای کردەوە (جاری دووەم) فەرمووی: ئەوە بازاڕێکی شیاو نیە بۆ ئێوە، پاشان گەڕایەوە بۆ ئەو بازاڕە و دەورەیەکی پێدا لێدا، پاشان فەرمووی: ئەوە بازاڕی شیاوی ئێوەیە، با فێڵ و غەشی تێدا نەبێ (لە کێشان و پێوانە و کڕین و فرۆشتندا)، وە باجی لەسەر وەرنەگیرێ (چونکە بازاڕ موڵکی گشتییە).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٢٨ عن المقدام بن معدي كرب.

(٣) ضعيف.

**تێبینی: جاری یەکەم و دووەم کە فەرمووی: بازاڕێکی شیاو نیە، ئەوە لەبەر ئەوەی کە فێڵ و غەشی تێدا کراوە.**

**٢٢٣٤-** عَنْ سَلْمَانَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ غَدَا إِلَى صَلَاةِ الصُّبْحِ غَدَا بِرَايَةِ الْإِيمَانِ، وَمَنْ غَدَا إِلَى السُّوقِ غَدَا بِرَايَةِ إِبْلِيسَ»[1].

**واتە: سەلمان ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەیفەرموو: هەر کەسێک بەیانی بکاتەوە و بچێتە نوێژی بەیانی ئاڵای ئیمانی هەڵگرتووە، وە هەر کەس بەیانی زوو بکاتەوە و بچێتە بازاڕ، ئاڵای شەیتانی هەڵگرتووە.**

**٢٢٣٥-** عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﵃، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَ حِينَ يَدْخُلُ السُّوقَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ حَيٌّ لَا يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ كُلُّهُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ، وَمَحَا عَنْهُ أَلْفَ أَلْفِ سَيِّئَةٍ، وَبَنَى لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ»[2].

**واتە: سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کاتێک دەچێتە بازاڕ بڵێت: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ حَيٌّ لَا يَمُوتُ، بِيَدِهِ الْخَيْرُ كُلُّهُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ»، واتە: هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە زاتی (الله) بێ هاوەڵە هەموو شتێ موڵکی ئەوە و سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەوە، دەژیێنێ و دەمرێنێ، هەردەم زیندووە و نامرێ، هەموو خێر و چاکەیەک لەلای ئەوە و هەر ئەو دەسەڵاتدار و بە توانایە بەسەر هەموو شتەکاندا، (هەرکەس ئەوە بڵێ) خوا هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنوسێت و هەزار هەزار تاوانی لێ دەسڕێتەوە، وە ماڵێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشتدا.**

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٣٤٢٨.

## بابەت: بەرەكەت و پێزی بەیانیان زوو

٢٢٣٦- عَنْ صَخْرٍ الْغَامِدِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا» قَالَ: وَكَانَ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً، أَوْ جَيْشًا بَعَثَهُمْ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ، قَالَ: وَكَانَ صَخْرٌ رَجُلًا تَاجِرًا، فَكَانَ يَبْعَثُ تِجَارَتَهُ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ، فَأَثْرَى وَكَثُرَ مَالُهُ[1].

واتە: صەخری غامیدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە بەرەكەت و پێز بڕێژە بەسەر ئوممەتەكەمدا ئەوانەی كە لە سەرەتای ڕۆژ دەست بە كار دەبن، (ڕاوی) گوتی: جا كاتێک (پێغەمبەر ﷺ ) سریەیەک یان لەشكرێكی بناردبایە ئەوە لە سەرەتای ڕۆژدا دەینارد، (وە هەروەها ڕاوی) گوتی: صەخر پیاوێكی بازرگان بوو، هەموو جارێک (كاروانە) بازرگانییەكەی لە سەرەتای ڕۆژدا بەڕێدەكرد، ئیتر دەوڵەمەند بو و سەروەت و سامانی زۆر بوو.

٢٢٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا يَوْمَ الْخَمِيسِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوایە بەرەكەت و پێز بڕێژە بەسەر ئوممەتەكەمدا لە بەینیانی ڕۆژانی پێنج شەممەدا.

٢٢٣٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا»[3].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوایە بەرەكەت و پێز بڕێژە بەسەر ئوممەتەكەمدا لە سەرەتای ڕۆژدا.

---

(١) حسن لغيره. وقد صح المرفوع منه فقط. أخرجه أبو داود: ٢٦٠٦، والترمذي: ١٢١٢.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

## بابەت: فرۆشتنی ماڵاتی شیردەر کە شیرەکەی لە گوانیدا ڕابگیرێ و نەدۆشرێ بۆ هەڵخەڵەتاندنی کڕیار

**٢٢٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنِ ابْتَاعَ مُصَرَّاةً فَهُوَ بِالْخِيَارِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنْ رَدَّهَا رَدَّ مَعَهَا صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، لَا سَمْرَاءَ» يَعْنِي: الْحِنْطَةَ[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ئاژەڵێکی کڕی و شیرەکەی لە گوانیدا پەسمەندە کرابوو (بە فێڵ)، کڕیار سێ ڕۆژ مۆڵەتی هەیە، جا ئەگەر بۆ خاوەنەکەی گێڕایەوە، با مەنێک (صاعێک) خورمای لەگەڵ بنێرێتەوە، نەک گەنم (لە جیاتی ئەو شیرەی لێی خواردووە).

**سمراء:** واتە: گەنم، هەروەک لە دەقەکەشدا ڕوون کراوەتەوە.

**٢٢٤٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ بَاعَ مُحَفَّلَةً فَهُوَ بِالْخِيَارِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنْ رَدَّهَا رَدَّ مَعَهَا مِثْلَيْ لَبَنِهَا - أَوْ قَالَ - مِثْلَ لَبَنِهَا قَمْحًا»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە، هەر کەسێک ئاژەڵێکی کڕی کە شیریان لە گوانیدا ڕاگرتبوو، (کڕیار) تاکو سێ ڕۆژ سەرپشکە، جا ئەگەر گەڕاندیەوە بۆ خاوەنەکەی، با بە ئەندازەی دوو بەرانبەری شیرەکەی (کە لێی خواردووە) یان بە ئەندازەی شیرەکە، گەنمی لەگەڵدا بنێرێتەوە.

**٢٢٤١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁، أَنَّهُ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى الصَّادِقِ الْمَصْدُوقِ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ، أَنَّهُ حَدَّثَنَا، قَالَ: «بَيْعُ الْمُحَفَّلَاتِ خِلَابَةٌ، وَلَا تَحِلُّ الْخِلَابَةُ لِمُسْلِمٍ»[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ دەڵێ: گەواهی دەدەم کە ڕاستگۆی بەڕاستدانراو کە ئەبولقاسمە ﷺ (واتە: پێغەمبەر ﷺ) بێگومان پێی ڕاگەیاندووین و فەرموویەتی: فرۆشتنی ئاژەڵێک کە شیر لە گوانیدا ڕاگیرابێ فێڵکردنە (لە کڕیار)، وە فێڵ کردنیش بۆ مسوڵمان ڕەوا نیە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٢٤/٢٥، وأبو داود: ٣٣٤٤، والترمذي: ١٢٥٢، والنسائي: ٤٨٩، وعلقه البخاري: ٢١٤٨.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٤٤٦.

(٣) ضعيف.




## بابەت: ئەوەی کە سوود و قازانجی فرۆشراو بۆ کڕیارە پێش پەشیمان بوونەوە چونکە کڕیار پێش پەشیمان بوونەوە زامنە

**٢٢٤٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى أَنَّ خَرَاجَ الْعَبْدِ بِضَمَانِهِ»[١].

**واتە:** عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە و بڕیاری داوە سوودێک کە لە بەندە دەستدەکەوێ بۆ ئەو کەسەیە کە زەمانەتی ئەو بەندەیە دەکات.

**٢٢٤٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا اشْتَرَى عَبْدًا فَاسْتَغَلَّهُ، ثُمَّ وَجَدَ بِهِ عَيْبًا، فَرَدَّهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ قَدِ اسْتَغَلَّ غُلَامِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْخَرَاجُ بِالضَّمَانِ»[٢].

**واتە:** عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک بەندەیەکی کڕی و (کاری پێکرد و) سوود و قازانجی لێ بینی، ئنجا دواتر بینی عەیبدارە، جا گەڕاندییەوە (بۆ ئەو کەسەی لێی کڕیبوو)، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئەو (کڕیار) سود و قازانجی لە بەندەکەی من دەستکەوتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوود و قازانج بۆ ئەو کەسەیە کە زەمانەتەکەی دەکەوێتە سەر (واتە: بۆ کڕیارە، چونکە پێش پەشیمان بوونەوە زەمانەتی بەندەکەی لە ئەستۆ بووە).

## بابەت: دەرکەوتنی عەیبی بەندە (کۆیلە)

**٢٢٤٤-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُهْدَةُ الرَّقِيقِ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ»[٣].

**واتە:** سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەرکەوتنی عەیبی کۆیلە و پەشیمان بوونەوە (لە کڕینی) تا سێ ڕۆژە (واتە: ئەگەر عەیبێکی لێ دەرکەوت تا سێ ڕۆژ مۆڵەتی پەشیمان بوونەوەی هەیە).

**٢٢٤٥-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا عُهْدَةَ بَعْدَ أَرْبَعٍ»[٤].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٥٠٨ و ٣٥٠٩، والترمذي: ١٢٨٥، والنسائي: ٤٤٩٠.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٥١٠، والترمذي: ١٢٨٦.

(٣) ضعيف.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٥٠٦.




واتە: عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کڕیار لە دوای ڕۆژی چوارەمەوە مافی پەشیمان بوونەوەی نیە بە هۆی عەیبداری ئەو کۆیلەوە کە کڕیویەتی.

## بابەت: هەر کەسێک شتێکی عەیبداری فرۆشت پێویستە عەیبەکە باس دەکات

**٢٢٤٦-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ بَاعَ مِنْ أَخِيهِ بَيْعًا فِيهِ عَيْبٌ إِلَّا بَيَّنَهُ لَهُ»[١].

واتە: عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: مسوڵمان برای مسوڵمانە، ڕەوا و دروست نیە بۆ بابای مسوڵمان کە شتێکی عەیبدار بە براکەی بفرۆشێ بەبێ ڕوونکردنەوەی عەیبەکە.

**٢٢٤٧-** عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ بَاعَ عَيْبًا لَمْ يُبَيِّنْهُ، لَمْ يَزَلْ فِي مَقْتِ اللَّهِ، وَلَمْ تَزَلِ الْمَلَائِكَةُ تَلْعَنُهُ»[٢].

واتە: واسیلەی کوڕی ئەسقەع ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک شتێکی عەیبدار بفرۆشێ و (عەیبەکە) ئاشکرا نەکات، بەردەوام لە نێو تووڕەیی خوادایە و بەردەوامیش فریشتەکان نەفرەتی لێدەکەن.

## بابەت: ئەوەی کە ئەو کەسانەی کە لە جەنگ دەگیرێن و دەبنە کۆیلە نابێ لە یەک جیابکرێنەوە ئەگەر خزمایەتی نزیکیان هەبوو

**٢٢٤٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، «إِذَا أُتِيَ بِالسَّبْيِ، أَعْطَى أَهْلَ الْبَيْتِ جَمِيعًا، كَرَاهِيَةَ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَهُمْ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم بنحوه.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) ضعيف.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: ئەگەر دیلەکانی جەنگیان بهێنابا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەموو خانەوادەکەی دەدایە یەک کەس، چونکە پێی ناخۆش بوو کە لە یەکتریان دابڕێ (واتە: لە یەک نزیکەکانی دەدایە یەک کەس، وەکو: دایک و منداڵ یان دوو برا، وە هەروەها).

٢٢٤٩- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: وَهَبَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غُلَامَيْنِ أَخَوَيْنِ، فَبِعْتُ أَحَدَهُمَا، فَقَالَ: «مَا فَعَلَ الْغُلَامَانِ؟» قُلْتُ: بِعْتُ أَحَدَهُمَا، قَالَ: «رُدَّهُ»[1].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو خزمەتکاری پێدام کە برا بوون، منیش یەکێکیانم فرۆشت، ئنجا (دواتر) فەرمووی: دوو خزمەتکارەکە چیان کرد (چیان لێهات)؟ گوتم: دانەیەکم فرۆشت، فەرمووی: بیگەڕێنەوە (بۆ ئەوەی دوو براکە لە یەک دانەبڕێن).

٢٢٥٠- عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: «لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الْوَالِدَةِ وَوَلَدِهَا، وَبَيْنَ الْأَخِ وَبَيْنَ أَخِيهِ»[2].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لە کەسێک کە دایک لە منداڵەکەی جیا بکاتەوە، وە (کەسێک) برا لە برا جیا بکاتەوە.

## بابەت: کڕینی بەندە

٢٢٥١- عَبْدُ الْمَجِيدِ بْنُ وَهْبٍ، قَالَ: قَالَ لِي الْعَدَّاءُ بْنُ خَالِدِ بْنِ هَوْذَةَ ﷺ، أَلَا نُقْرِئُكَ كِتَابًا كَتَبَهُ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: قُلْتُ: بَلَى، فَأَخْرَجَ لِي كِتَابًا، فَإِذَا فِيهِ: «هَذَا مَا اشْتَرَى الْعَدَّاءُ بْنُ خَالِدِ بْنِ هَوْذَةَ مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، اشْتَرَى مِنْهُ عَبْدًا أَوْ أَمَةً، لَا دَاءَ، وَلَا غَائِلَةَ، وَلَا خِبْثَةَ، بَيْعَ الْمُسْلِمِ لِلْمُسْلِمِ»[3].

واتە: عەبدولمەجیدی کوڕی وەهب دەڵێ: عەدائی کوڕی خالیدی کوڕی هەوزە ﷺ پێی گوتم: ئایا ئەو نامەیەت بۆ نەخوێنمەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ منی نوسیوە؟

---

(١) ضعيف. لكن ثبت مختصراً بلفظ آخر عند أبي داود. أخرجه الترمذي: ١٢٨٤.

(٢) ضعيف.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ١٢١٦.

دەڵێ: گوتم: بەڵێ بۆم بخوێنەوە، ئنجا نامەیەکی بۆ دەرهێنام کە ئەوەی تێدابوو: عەدائی کوڕی خالیدی کوڕی هەوزە ئەوەی کڕیوە لە موحەممەد پێغەمبەری خوا ﷺ بەندەیەک یان کەنیزەکێکی لێ کڕیوە بێ نەخۆشی و بێ فێڵ و ماڵێکی حەرام و دزی نیە، بێ کەم و کورتییە لە جەستەو ڕەوشتدا، وەکو چۆن مسوڵمانێک شتێک بێ فرت و فێڵ بە مسوڵمانێک دەفرۆشێ ئاوا.

**٢٢٥٢-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اشْتَرَى أَحَدُكُمُ الْجَارِيَةَ، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ، وَلْيَدْعُ بِالْبَرَكَةِ، وَإِذَا اشْتَرَى أَحَدُكُمْ بَعِيرًا، فَلْيَأْخُذْ بِذِرْوَةِ سَنَامِهِ، وَلْيَدْعُ بِالْبَرَكَةِ، وَلْيَقُلْ مِثْلَ ذَلِكَ»[1].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ، دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان کەنیزەکێکی کڕی با بڵێ: خودایە لە تۆ داوای چاکەی ئەو دەکەم، وە ئەو چاکەی لە خو و ڕەوشتیدا هەیە، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕی ئەوو، ئەو شەڕەی کە لە خو و ڕەوشتیدا هەیە، وە با دوعای بەرەکەت و پێز بکات، وە ئەگەر یەکێکتان وشترێکی کڕی با کۆپارەکەی بگرێ و دوعای بەرەکەت و فەڕ بکات و وەکو ئەوە بڵێ (کە بۆ جاریەکە دەگوترێ).

## بابەت: پارە گۆڕینەوە و ئەوەی کە دروست نیە زیادەی بخرێتە سەر و دەبێ دەست بە دەست

**٢٢٥٣-** عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ رِبًا، إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا، إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا، إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا، إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ»[2].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەگێڕێتەوە: دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (گۆڕینەوەی) زێڕ بە زێڕ ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست بێ، وە گەنم بە گەنم ڕیبایە

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢١٦٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٣٤، ومسلم: ١٥٨٦، وأبو داود: ٣٣٤٨، والترمذي: ١٢٤٣، والنسائي: ٤٥٥٨.

مەگەر دەست بە دەست بێ، وە جۆ بە جۆ ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست بێ، وە خورما بە خورما ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست بێ (واتە: ئەوانەی باسکران دەبێ دەست بە دەست بێ و قەرز نەبن).

٢٢٥٤- عَنْ مُسْلِمَ بْنَ يَسَارٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُبَيْدٍ، حَدَّثَاهُ، قَالَا: جَمَعَ الْمَنْزِلُ بَيْنَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، وَمُعَاوِيَةَ ﭬ، إِمَّا فِي كَنِيسَةٍ وَإِمَّا فِي بِيعَةٍ، فَحَدَّثَهُمْ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، فَقَالَ: «نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْوَرِقِ بِالْوَرِقِ، وَالذَّهَبِ بِالذَّهَبِ، وَالْبُرِّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرِ بِالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرِ بِالتَّمْرِ - قَالَ أَحَدُهُمَا: وَالْمِلْحِ بِالْمِلْحِ، وَلَمْ يَقُلْهُ الْآخَرُ - وَأَمَرَنَا أَنْ نَبِيعَ الْبُرَّ بِالشَّعِيرِ، وَالشَّعِيرَ بِالْبُرِّ، يَدًا بِيَدٍ، كَيْفَ شِئْنَا»[1].

واتە: موسلیمی کوڕی یەسارو عەبدوڵلای کوڕی عوبەید گێڕاویانەتەوە کە گوتوویانە: عوبادەی کوڕی صامیت و موعاویە ﭬ لە کەنیسەیەک، یان لە پەرستگایەکی یەهودی بەیەکەوە بوون، جا عوبادە بۆی گێڕانەوەو گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووین لە فرۆشتنی زیو بە زیو، زێڕ بە زێڕ، گەنم بە گەنم، جۆ بە جۆ، خورما بە خورما، یەکێکیان گوتی: خوێ بە خوێ، بەڵام ئەویتر نەیگوت، وە فەرمانی پێکردین و مۆڵەتی داین کە گەنم بە جۆ و جۆ بە گەنم بفرۆشین هەرچۆنێک پێمان خۆش بێ (بە زیادە یان بە کەمتر بە مەرجێک) دەست بە دەست بێ (واتە: بە قەرز نەبێ).

٢٢٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «الْفِضَّةَ بِالْفِضَّةِ، وَالذَّهَبَ بِالذَّهَبِ، وَالشَّعِيرَ بِالشَّعِيرِ، وَالْحِنْطَةَ بِالْحِنْطَةِ مِثْلًا بِمِثْلٍ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﭬ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: زیو بە زیو، زێڕ بە زێڕ، جۆ بە جۆ، گەنم بە گەنم (دەبێ هەردوو لا) وەکو یەک بن.

٢٢٥٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﭬ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَرْزُقُنَا تَمْرًا مِنْ تَمْرِ الْجَمْعِ، فَنَسْتَبْدِلُ بِهِ تَمْرًا هُوَ أَطْيَبُ مِنْهُ وَنَزِيدُ فِي السِّعْرِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَصْلُحُ صَاعُ تَمْرٍ بِصَاعَيْنِ، وَلَا دِرْهَمٌ بِدِرْهَمَيْنِ، وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ وَالدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، وَلَا فَضْلَ بَيْنَهُمَا إِلَّا وَزْنًا»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٨٧، وأبو داود: ٣٣٤٩، والترمذي: ١٢٤٠، والنسائي: ٤٥٧٠_٤٥٦٤ و ٤٥٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٨٨، والنسائي: ٤٥٦٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٨٠، ومسلم مختصراً: ١٥٩٥/٩٨، والنسائي: ٤٥٥٥ و ٤٥٥٦.

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خورمای پێ دەداین تێکەڵە لە هەموو جۆرێک، ئێمەش بە خورمای باشتر دەمانگۆڕییەوە و نرخی زیاترمان پێدەدا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەنێک (صاعێک) خورما بە دوو مەن دروست نیە، درهەمێک بە دوو درهەم دروست نیە، درهەمێک بە درهەمێک و دینارێک بە دینارێک نابێ زیادەیان لە نێوندا بێ، مەگەر کێشیان جیاواز بێ، ئەوکاتە دەبێ زیادەکە بە جیا بفرۆشرێ، یان بکڕدرێ.

## بابەت: ئەو کەسەی دەڵێ: ڕیبا تەنها لە قەرزدایە!

**٢٢٥٧-** عَنْ أَبَا سعيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «الدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ، وَالدِّينَارُ بِالدِّينَارِ» فَقُلْتُ: إِنِّي سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، يَقُولُ غَيْرَ ذَلِكَ، قَالَ: أَمَا إِنِّي لَقِيتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ هَذَا الَّذِي تَقُولُ فِي الصَّرْفِ: أَشَيْءٌ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ أَمْ شَيْءٌ وَجَدْتَهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ فَقَالَ: مَا وَجَدْتُهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَلَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَكِنْ أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّمَا الرِّبَا فِي النَّسِيئَةِ»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: درهەم بە درهەم و دینار بە دینار (واتە: بە بێ زیادە)، منیش گوتم: ئیبنو عەبباس شتێکی جیاواز لەوە دەڵێ، ئەویش گوتی: بێگومان من بە ئیبنو عەبباس گەیشتم جا پێم گوت: دەربارەی ئەوەی کە دەیڵێی دەربارەی پارە گۆڕینەوە هەواڵم پێبدە، ئایا هیچ شتێکت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە یان هیچ شتێکت لە قورئان بینیوە؟ ئەویش گوتی: نەخێر لە قورئاندا هیچم لەو بارەوە نەدیوە و هیچیشم لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەبیستووە، بەڵام ئوسامەی کوڕی زەید پێی ڕاگەیاندم کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕیبا تەنها لە قەرزدایە.

**٢٢٥٨-** عَنْ أَبِي الْجَوْزَاءِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُهُ يَأْمُرُ بِالصَّرْفِ، يَعْنِي ابْنَ عَبَّاسٍ، وَيُحَدَّثُ ذَلِكَ عَنْهُ، ثُمَّ بَلَغَنِي أَنَّهُ رَجَعَ عَنْ ذَلِكَ، فَلَقِيتُهُ بِمَكَّةَ، فَقُلْتُ: إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ رَجَعْتَ، قَالَ: نَعَمْ، إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ رَأْيًا مِنِّي، وَهَذَا أَبُو سَعِيدٍ، يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، «أَنَّهُ نَهَى عَنِ الصَّرْفِ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٧٨ و ٢١٧٩، ومسلم: ١٥٩٦، والنسائي: ٤٥٨١.

(٢) صحيح.

واتە: ئەبو جەوزاء ﷺ دەڵێ: بیستبووم کە ڕێگای بە زیادە دابوو لە پارە گۆڕینەوەدا مەبەستی ئیبنو عەبباسە، وە ئەوەیان لێ دەگێڕایەوە (کە ڕێی پێداوە)، پاشان پێیان ڕاگەیاندم کە لەو بڕیار و ڕێپێدانە پەشیمان بۆتەوە، جا لە مەککە پێی گەیشتم و گوتم: بیستوومە کە پاشگەز بوویتەوە، گوتی: بەڵێ بێگومان ئەوە تەنها بۆچوونی خۆم بوو (کە ڕێم دابوو بە زیادە وەرگرتن لە گۆڕینەوەی پارەدا)، بەڵام ئەوە ئەبو سەعید لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە نەهی کردوە لە زیاد و کەمە لە پارە گۆڕینەوەدا.

## بابەت: گۆڕینەوەی زێڕ بە زیو

٢٢٥٩- عَنْ عُمَرَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الذَّهَبُ بِالْوَرِقِ رِبًا، إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ» قَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ: سَمِعْتُ سُفْيَانَ، يَقُولُ: «الذَّهَبُ بِالْوَرِقِ، احْفَظُوا»[١].

واتە: عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (گۆڕینەوەی) زێڕ بە زیو ڕیبایە ئەگەر دەست بە دەست نەبێ (واتە: نابێ قەرزی تێکەوێ)، ئەبو بەکری کوڕی ئەبو شەیبە گوتی: گوێم لە سوفیان بوو دەیگوت: زێڕ بە زیو، ئەوەتان لەبیر بێ و لەبەری بکەن.

٢٢٦٠- عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ ﷺ، قَالَ: أَقْبَلْتُ أَقُولُ: مَنْ يَصْطَرِفُ الدَّرَاهِمَ؟ فَقَالَ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ، وَهُوَ عِنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: أَرِنَا ذَهَبَكَ، ثُمَّ ائْتِنَا، إِذَا جَاءَ خَازِنُنَا، نُعْطِكَ وَرِقَكَ، فَقَالَ عُمَرُ: كَلَّا، وَاللَّهِ، لَتُعْطِيَنَّهُ وَرِقَهُ أَوْ لَتَرُدَّنَّ إِلَيْهِ ذَهَبَهُ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «الْوَرِقُ بِالذَّهَبِ رِبًا، إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ»[٢].

واتە: مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەسان ﷺ دەڵێ: ڕوم تێکرد و گوتم: کێ پارە دەگۆڕێتەوە؟ تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا کە لەلای عومەری کوڕی خەتتاب بوو گوتی: زێڕەکەتمان نیشاندە و دەمانەوێت، پاشان وەرەوە کە خزمەتکارەکەمان هاتەوە زیوەکەت پێدەدەین، ئنجا عومەر ﷺ گوتی: نەخێر هەرگیز! سوێند بە خوا یان

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٣٤، ومسلم: ١٥٨٦، وأبو داود: ٣٣٤٨، والترمذي: ١٢٤٣، والنسائي: ٤٥٥٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٣٤، ومسلم: ١٥٨٦، وأبو داود: ٣٣٤٨، والترمذي: ١٢٤٣، والنسائي: ٤٥٥٨.

دەبێ زیوەکەی پێبدەی یان زێڕەکەی پێبدەوە، چونکە لە ڕاستییدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زیو بە زێڕ ڕیبابە مەگەر دەست بە دەست بێ (واتە: نابێ قەرزی تێکەوێ، دەبێ لە یەک کاتدا بگۆڕدرێنەوە).

**٢٢٦١-** عَنْ عُمَرَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ، لَا فَضْلَ بَيْنَهُمَا، فَمَنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ بِوَرِقٍ فَلْيَصْطَرِفْهَا بِذَهَبٍ، وَمَنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ بِذَهَبٍ فَلْيَصْطَرِفْهَا بِالْوَرِقِ، وَالصَّرْفُ هَاءَ وَهَاءَ»[1].

واتە: عومەری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دینار بە دینار، درهەم بە درهەم نابێ زیادەیان لە نێواندا بێ، جا ئەگەر کەسێک پێویستی بە زیو بوو با بە زێڕ بیگۆڕێتەوە، وە کەسێک پێویستی بە زێڕ بوو با بە زیو بیگۆڕێتەوە، وە گۆڕینەوەکەش دەبێ دەست بە دەست بێ.

## بابەت: وەرگرتنی زێڕ لەبری زیو، وە وەرگرتنی زیو لەبری زێڕ

**٢٢٦٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ أَبِيعُ الْإِبِلَ، فَكُنْتُ آخُذُ الذَّهَبَ مِنَ الْفِضَّةِ، وَالْفِضَّةَ مِنَ الذَّهَبِ، وَالدَّنَانِيرَ مِنَ الدَّرَاهِمِ، وَالدَّرَاهِمَ مِنَ الدَّنَانِيرِ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «إِذَا أَخَذْتَ أَحَدَهُمَا، وَأَعْطَيْتَ الْآخَرَ، فَلَا تُفَارِقْ صَاحِبَكَ وَبَيْنَكَ وَبَيْنَهُ لَبْسٌ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: وشترم دەفرۆشت جا لە جیاتی زیو، زێڕم وەردەگرت (جاریش هەبوو) لە جیاتی زێڕ زیوم وەردەگرت، وە لە جیاتی درهەم دینارم وەردەگرت و لە جیاتی دینار درهەمم وەردەگرت، منیش پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرمووی: ئەگەر یەکێکیانت وەرگرت و ئەویترت پێدا، لە هاوڕێکەت جیامەبەوە تاکو هەموو شتێک هەڵدەبڕن و بێ توێکڵی دەکەن (واتە: هەر لەو دانیشتنە شتەکەی پێبدە و پارەکەی لێ وەرگرە).

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٣٥٤، والترمذي: ١٢٤٢، والنسائي: ٤٥٨٢ و ٤٥٨٣ و ٤٥٨٩.



**٢٢٦٢م-** حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَكِيمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِسْحَاقَ قَالَ: أَنْبَأَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[١].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێردراوەتەوە.

## بابەت: ڕێگری کردن لە شکاندنی درهەم و دینار

**٢٢٦٣-** عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ كَسْرِ سِكَّةِ الْمُسْلِمِينَ الْجَائِزَةِ بَيْنَهُمْ، إِلَّا مِنْ بَأْسٍ»[٢].

واتە: عەلقەمەی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردوە لە شکاندنی پارەی مسوڵمانان کە مامەڵەی پێدەکەن لە نێوان خۆیاندا، مەگەر ساختە بێت یان بە کەڵک نەمابێ (ئەو کات کێشەی نیە).

## بابەت: فرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشک

**٢٢٦٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ، مَوْلَى الْأَسْوَدِ بْنِ سُفْيَانَ، أَنَّ زَيْدًا أَبَا عَيَّاشٍ، مَوْلًى لِبَنِي زُهْرَةَ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَأَلَ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، عَنِ اشْتِرَاءِ الْبَيْضَاءِ بِالسُّلْتِ، فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ: أَيَّتُهُمَا أَفْضَلُ؟ قَالَ: الْبَيْضَاءُ، فَنَهَانِي عَنْهُ، وَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، سُئِلَ عَنِ اشْتِرَاءِ الرُّطَبِ بِالتَّمْرِ، فَقَالَ: «أَيَنْقُصُ الرُّطَبُ إِذَا يَبِسَ؟» قَالُوا: نَعَمْ، فَنَهَى عَنْ ذَلِكَ[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی یەزید مەولای ئەسوەدی کوڕی سوفیان دەگێڕێتەوە: کە زەیدی کوڕی عەیاش مەولایەکی بەنی زوهرە بۆی گێڕاوەتەوە کە پرسیاری لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ کردوە دەربارەی کڕینی «بیضاء» (جۆ، بە توێڵکەوە) بە «سلت» (جۆ، بە بێ توێکڵ)، ئنجا سەعد گوتی: کامەیان باشترە؟ گوتی: «بیضاء»، ئنجا (ئەو مامەڵەیەی) لێ قەدەغە کردم و گوتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە پرسیاری لێکرا دەربارەی کڕینی خورمای تەڕ بە خورمای وشک، ئەویش فەرمووی: ئایا خورما تەڕەکە کاتێک وشک دەبێ کەم دەکات؟ گوتیان: بەڵێ، ئیتر ئەو مامەڵەیەی قەدەغە کرد.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٣٥٤، والترمذي: ١٢٤٢، والنسائي: ٤٥٨٢ و ٤٥٨٣ و ٤٥٨٩.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٤٤٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٥٩، والترمذي: ١٢٢٥، والنسائي: ٤٥٤٥ و ٤٥٤٦.

## بابەت: فرۆشتنی خورما بەدارەوەو، پەڵە گەنم بە گەنم

**٢٢٦٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الْمُزَابَنَةِ، وَالْمُزَابَنَةُ: أَنْ يَبِيعَ الرَّجُلُ ثَمَرَ حَائِطِهِ إِنْ كَانَتْ نَخْلًا، بِتَمْرٍ كَيْلًا، وَإِنْ كَانَتْ كَرْمًا، أَنْ يَبِيعَهُ بِزَبِيبٍ كَيْلًا، وَإِنْ كَانَتْ زَرْعًا أَنْ يَبِيعَهُ بِكَيْلِ طَعَامٍ، نَهَى عَنْ ذَلِكَ كُلِّهِ»[(١)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە مامەڵەی موزابەنە، کە بریتیە لەوەی کە کەسێک باخە خورماکەی بفرۆشێ بەخورمای وشک و بەپێوانە، یان ڕەزی ترێیەکەی بفرۆشێ بە مێوژ و بە پێوانە، یان کشتوکاڵەکەی (گەنم و جۆ) بفرۆشێ بە خواردن بە پێوانە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) هەموو ئەوانەی قەدەغە کردوە.

**المزابنة:** واتە: فرۆشتنی خورما بەدارەوە، بە خورمای وشک و پێوانەکەی دیاری بکات.

**المحاقلة:** واتە: فرۆشتنی گەنم بە نمونە بە پەڵە (بەگوڵەوە)، واتە: هەر بەزەوی و پێش درووینەوەو پاککردن بە گەنمی پوختە بە پێوانە.

**٢٢٦٦-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ»[(٢)].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا  دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی موحاقەلەو موزابەنەی قەدەغە کردوە (هەردوو چەمکەکە لە فەرموودەی پێشوودا ڕوونکراونەوە).

**٢٢٦٧-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ»[(٣)].

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی فرۆشتنی گۆترەی باخ و کشتوکاڵی بە پێوانەی قەدەغە کردوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٠٥، ومسلم: ١٥٤٢، وأبو داود: ٣٣٦١، والنسائي: ٤٥٤٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٨١، ومسلم: ١٥٣٦، وأبو داود: ٣٣٦١، والترمذي: ١٢٩٠ و ١٣١٣، والنسائي: ٣٨٧٩ و ٣٨٨٠ و ٣٩٢٠ و ٤٥٢٣ و ٤٥٢٤ و ٤٥٥٠ و ٤٦٣٣ و ٤٦٣٤. البخاري وابن ماجه وبعض روايات النسائي ليس فيها «الثُّنْيَا».

(٣) صحيح. النسائي: ٣٨٨٤ و ٣٨٨٧ و ٤٥٣٥.

## بابەت: بەری دارخورما بە خەمڵاندن بە دارخورماوە

**٢٢٦٨-** عَنْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَخَّصَ فِي الْعَرَايَا»[1].

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای داوە بە فرۆشتنی بەری دارخورما بە خەمڵاندن (پێش چنینی).

**العرایا:** واتە: فرۆشتنی بەری دار خورما بە خەمڵاندن لەبەر پێویستی.

**٢٢٦٩-** عَنْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَرْخَصَ فِي بَيْعِ الْعَرِيَّةِ بِخَرْصِهَا تَمْرًا» قَالَ يَحْيَى: «الْعَرِيَّةُ: أَنْ يَشْتَرِيَ الرَّجُلُ ثَمَرَ النَّخَلَاتِ بِطَعَامِ أَهْلِهِ رُطَبًا، بِخَرْصِهَا تَمْرًا»[2].

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای داوە بە فرۆشتنی بەری دار خورما بەدارەوە کە بە خورمای وشک بخەمڵێنرێ، یەحیا دەڵێ: (العریة): ئەوەیە کەسێک بەروبوومی دارخورما بکڕێ بە خورمای وشک، کە بە خورمای وشک بخەمڵێنێ.

## بابەت: فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بە قەرز

**٢٢٧٠-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى عَنْ بَيْعِ الْحَيَوَانِ بِالْحَيَوَانِ نَسِيئَةً»[3].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵی بە قەرز قەدەغە کردوە.

**٢٢٧١-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا بَأْسَ بِالْحَيَوَانِ وَاحِدًا بِاثْنَيْنِ، يَدًا بِيَدٍ» وَكَرِهَهُ نَسِيئَةً[4].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٧٣ و ٢١٨٤، ومسلم: ١٥٣٩، وأبو داود: ٣٣٦٢، والنسائي: ٤٥٣٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٧٣، ومسلم: ١٥٣٩، وأبو داود: ٣٣٦٢، والترمذي: ١٣٠٢، والنسائي: ٤٥٣٨ و ٤٥٣٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٥٦، والترمذي: ١٢٣٧، والنسائي: ٤٦٢٠.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٢٣٨.




واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فرۆشتنی ئاژەڵێک بە دوو دانە ئاساییە، مادام دەست بە دەست بێ، بەڵام بە قەرزی پێ ناخۆش بوو (پێی ڕازی نەبوو).

### بابەت: فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ و بە زیادەوە دەست بە دەست

**٢٢٧٢-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اشْتَرَى صَفِيَّةَ بِسَبْعَةِ أَرْؤُسٍ» قَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: مِنْ دِحْيَةَ الْكَلْبِيِّ[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ صەفییەی کڕییەوە بە حەوت پشک، عەبدوڕڕەحمان (یەکێکە لە ڕاوییەکان) گوتوویەتی: واتە: لە دیـحیەی کەلبی کڕییەوە.

### بابەت: توندگیری لە سوو خۆری (ڕیبا)

**٢٢٧٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَيْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي عَلَى قَوْمٍ بُطُونُهُمْ كَالْبُيُوتِ، فِيهَا الْحَيَّاتُ تُرَى مِنْ خَارِجِ بُطُونِهِمْ، فَقُلْتُ: مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جِبْرَائِيلُ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ أَكَلَةُ الرِّبَا»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەو شەوەی کە شەوڕۆییم پێ کرا، بردیانم بۆ لای خەڵکانێک کە سکیان وەکو خانوویەک وابوو ماری تێدابێ، بە جۆرێک کە مارەکان لە دەرەوە دەبینران، گوتم: ئەی جیبرائیل ئەوانە کێن؟ گوتی: ئەوانە سووخۆرەکانن.

**٢٢٧٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الرِّبَا سَبْعُونَ حُوبًا، أَيْسَرُهَا أَنْ يَنْكِحَ الرَّجُلُ أُمَّهُ»[٣].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سووخۆری حەفتا جۆر گوناهی هەیە، کە هەرە سووکەکەیان وەکو ئەوە وایە کە مرۆڤ لەگەڵ دایکی خۆی کاری خراپە بکات.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٦٥ مطولًا.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

**٢٢٧٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «الرِّبَا ثَلَاثَةٌ وَسَبْعُونَ بَابًا»[١].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سووخۆری (ڕیبا خۆری) حەفتا و سێ جۆرە.

**٢٢٧٦-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ آخِرَ مَا نَزَلَتْ آيَةُ الرِّبَا، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُبِضَ وَلَمْ يُفَسِّرْهَا لَنَا، فَدَعُوا الرِّبَا وَالرِّيبَةَ»[٢].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: بەدڵنیایی کۆتا ئایەت (لە ئەحکامدا) دابەزی، ئەو ئایەتە بوو باسی سووخۆری (ڕیبا)ی تێدایە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و ئەو ئایەتەی بۆمان ڕوون نەکردەوە (چونکە ئایەتەکە ماناکەی ڕوون و ئاشکرایە)، کەواتە وازبێنن لە سوو خواردن و ئەو شتانەی گومانیان لێ دەکرێ.

**٢٢٧٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، لَعَنَ آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَشَاهِدِيهِ، وَكَاتِبَهُ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردوە لەو کەسەی کە سوو دەخوا و لەو کەسەش کە سوەکەو دەدات، لەوکەسەش کە دەبێتە شایەدی مامەڵەیەک کە سووی تێدابێ، وە ئەو کەسەش کە گرێبەستی مامەڵەکە دەنوسێ.

**٢٢٧٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيَأْتِيَنَّ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ لَا يَبْقَى مِنْهُمْ أَحَدٌ، إِلَّا آكِلُ الرِّبَا، فَمَنْ لَمْ يَأْكُلْ، أَصَابَهُ مِنْ غُبَارِهِ»[٤].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەمانێک بەسەر خەڵکیدا دێت کە هیچ کەسێک نامێنێ کە توشی سوو خۆری نەبێ، خۆ ئەگەر ڕاستەوخۆش سوو نەخوات ئەوا تۆز و خۆڵەکەی پێدەکەوێ و لێی دەنیشێ.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٩٧، وأبو داود: ٣٣٣٣، والترمذي: ١٢٠٦، والنسائي: ٣٤١٦.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٣٣١، والنسائي: ٤٤٥٥.

**٢٢٧٩-** عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا أَحَدٌ أَكْثَرَ مِنَ الرِّبَا، إِلَّا كَانَ عَاقِبَةُ أَمْرِهِ إِلَى قِلَّةٍ»[(١)].

**واتە: ئیبنو مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە هۆی سوو خۆری سامانی زیاد بکات، بێگومان لە کۆتاییدا هەر کەمیدەکاتەوە و نەبوو دەبێ.**

## بابەت: فرۆشتنی بە سەلەم
## دەبێ پێوانە و کێشانە و کاتی دیاری کراو بێ

**٢٢٨٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِي التَّمْرِ، السَّنَتَيْنِ وَالثَّلَاثَ، فَقَالَ: «مَنْ أَسْلَفَ فِي تَمْرٍ، فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ»[(٢)].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە خەڵکی خورمایان بۆ دوو ساڵ و سێ ساڵ سەلەم دەکرد، جا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێک سەلەم دەکات با پێوانە و کێشانە و کاتەکە دیاری بکات.**

**السلف: واتە: فرۆشتنی پێشوەخت، کە لە لای ئێمە بەو مامەڵەیە دەڵێن: سەلەم.**

**٢٢٨١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ بَنِي فُلَانٍ أَسْلَمُوا - لِقَوْمٍ مِنَ الْيَهُودِ - وَإِنَّهُمْ قَدْ جَاعُوا، فَأَخَافُ أَنْ يَرْتَدُّوا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ عِنْدَهُ؟» فَقَالَ: رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ: عِنْدِي كَذَا وَكَذَا - لِشَيْءٍ قَدْ سَمَّاهُ - أُرَاهُ قَالَ: ثَلَاثُمِائَةِ دِينَارٍ بِسِعْرِ كَذَا وَكَذَا مِنْ حَائِطِ بَنِي فُلَانٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بِسِعْرِ كَذَا وَكَذَا إِلَى أَجَلِ كَذَا وَكَذَا، وَلَيْسَ مِنْ حَائِطِ بَنِي فُلَانٍ»[(٣)].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: فڵان تاقم لە هۆزی جوولەکەکان مسوڵمان بوون، وە لەڕاستیدا ئەوان برسین و هەژارن، جا دەترسێم کە لە دین هەڵگەڕێنەوە (ئەگەر یارمەتییان نەدەین)،**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٣٩، ومسلم: ١٦٠٤، وأبو داود: ٣٤٦٣، والترمذي: ١٣١١، والنسائي: ٤٦١٦.

(٣) ضعيف.




پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کێ شتێکی پارە و پوڵ لایە؟ پیاوێک لە جوولەکەکان گوتی: ئەوەندەو ئەوەندەم لایەو ناوی بڕەکەی هێناو وابزانم گوتی: سێ سەد دینار کە نرخی باخی فڵان بێ، لە فڵان هۆز (واتە: پارەکە دەدەم کە بەروبومی باخی فڵان کەسم بدەنێ بە سەلەم)، ئنجا پێغەمەری خوا ﷺ فەرمووی: بەو نرخەو بۆ ئەو کاتە دیاری کراوە، بەڵام باخە خورمای فڵان کەس نا، (واتە: بە نرخەکەو کاتەکەو بڕەکە ڕازیبوو، بەڵام ڕەتیکردەوە باخەکە دیاری بکات، بەڵکو بەروبومی بە ئەندازەی ئەو پارە دیاری کرد جا لەهەر باخێکیتر بێ).

٢٢٨٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي الْمُجَالِدِ، قَالَ: امْتَرَى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ شَدَّادٍ، وَأَبُو بَرْزَةَ فِي السَّلَمِ، فَأَرْسَلُونِي إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: «كُنَّا نُسْلِمُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَعَهْدِ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ فِي الْحِنْطَةِ، وَالشَّعِيرِ، وَالزَّبِيبِ، وَالتَّمْرِ عِنْدَ قَوْمٍ مَا عِنْدَهُمْ» فَسَأَلْتُ ابْنَ أَبْزَى فَقَالَ: مِثْلَ ذَلِكَ[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو موجالید دەگێڕێتەوە عەبدوڵڵای کوڕی شەدداد و ئەبو بەرزە لەسەر سەلەم ڕاجیایان تێکەوت و منیان نارد بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ منیش پرسیارم لێکرد، ئەویش گوتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و سەردەمی ئەبو بەکر و عومەردا لە گەنم و جۆ و مێوژ و خورمادا سەلەمان دەکرد لەگەڵ کەسانێک کە لەو کاتەدا ئەو شتانەیان نەبوو، (واتە: پێش پێگەیشتنی ئەو شتانە ئێمە پێشوەختە لێیان دەکڕین)، ئنجا پرسیارم لە ئیبنو ئەبزا کرد، ئەویش هەمان شتی گوت.

## بابەت: ئەوەی کە شتێک سەلەم کرا
## نابێ شتەکە بگۆڕێ یان نابێ بدرێتە کەسێکی تر تا وەری نەگرێت

٢٢٨٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَسْلَمْتَ فِي شَيْءٍ، فَلَا تَصْرِفْهُ إِلَى غَيْرِهِ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکات سەلەمت کرد لە شتێکدا مەیگۆڕە بە شتێکیتر، یان شتەکە مەدە بە کەسێکیتر تا بۆ خۆت وەرینەگری.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٤٢ و ٢٢٤٣، وأبو داود: ٣٤٦٤ و ٣٤٦٥، والنسائي: ٤٦١٥.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٤٦٨.




**٢٢٨٣م**- حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُجَاعُ بْنُ الْوَلِيدِ، عَنْ زِيَادِ بْنِ خَيْثَمَةَ، عَنْ عَطِيَّةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَ مِثْلَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ سَعْدًا [1].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە. بەڵام باسی سەعد نەکراوە.

## بابەت: سەلەم کردن لە بەری دارخورمای دیاری کراو کە بەروبوومەکەی دەرنەکەوتبێ

**٢٢٨٤**- عَنِ النَّجْرَانِيِّ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ: أُسْلِمُ فِي نَخْلٍ، قَبْلَ أَنْ يُطْلِعَ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: لِمَ؟ قَالَ: إِنَّ رَجُلًا أَسْلَمَ فِي حَدِيقَةِ نَخْلٍ، فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَبْلَ أَنْ يُطْلِعَ النَّخْلُ، فَلَمْ يُطْلِعِ النَّخْلُ شَيْئًا ذَلِكَ الْعَامَ، فَقَالَ الْمُشْتَرِي: هُوَ لِي حَتَّى يُطْلِعَ، وَقَالَ الْبَائِعُ: إِنَّمَا بِعْتُكَ النَّخْلَ هَذِهِ السَّنَةَ، فَاخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لِلْبَائِعِ: «أَخَذَ مِنْ نَخْلِكَ شَيْئًا؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «فَبِمَ تَسْتَحِلُّ مَالَهُ؟ ارْدُدْ عَلَيْهِ مَا أَخَذْتَ مِنْهُ، وَلَا تُسْلِمُوا فِي نَخْلٍ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهُ»[2].

واتە: نەجرانیی دەڵێ: بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ﷺ گوت: من لە بەری دارخورمایەک کە بەروبوومی دەرنەکەوتووە سەلەم بکەم؟ گوتی: نەخێر نابێ، گوتم: بۆ؟ گوتی: پیاوێک باخە خورمایەکی (دیاری کراوی) سەلەم کردبوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی بەروبوومەکەی دەرکەوێ، ئیتر ئەو خورمایەش ئەو ساڵە هیچ بەری نەگرت، ئنجا (کێشە کەوتە نێوان کڕیارو فرۆشیار) کڕیار گوتی: نەخێر باخەکە بۆ منە تا بەر دەگرێ و فرۆشیاریش گوتی: من تەنها بەروبوومی ئەو ساڵم پێ فرۆشتووی، ئنجا کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش بە فرۆشیاری فەرموو: ئایا هیچی دەست کەوتووە لە خورماکانی تۆ، گوتی: نەخێر، فەرمووی: ئەی بە چ شتێک پارەی ئەو بۆ تۆ حەڵاڵە؟ پارەکەی بۆ بگێڕەوە ئەوەی کەلێت وەرگرتووە وە سەلەم مەکەن لە خورمایەک کە بەر وبوومی دەرنەکەوتبێ و خۆش نەبووبێ.

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٤٦٧.

## بابەت: سەلەمکردن لە ئاژەڵدا

**٢٢٨٥-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَسْلَفَ مِنْ رَجُلٍ بَكْرًا، وَقَالَ: «إِذَا جَاءَتْ إِبِلُ الصَّدَقَةِ قَضَيْنَاكَ» فَلَمَّا قَدِمَتْ، قَالَ: «يَا أَبَا رَافِعٍ اقْضِ هَذَا الرَّجُلَ بَكْرَهُ» فَلَمْ أَجِدْ إِلَّا رَبَاعِيًا فَصَاعِدًا، فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «أَعْطِهِ، فَإِنَّ خَيْرَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً»(١).

واتە: ئەبو ڕافیع ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ وشترێکی لە پیاوێک بە قەرز وەرگرت و فەرمووی: ئەگەر وشتری زەکات هات ئەوکاتە پێتی دەدەینەوە، جا کە زەکات هات فەرمووی: ئەی ئەبو ڕافیع وشترەکە بدەوە بەو پیاوە، منیش تەنها وشتری حەوت ساڵ و زیاترم دەستکەوت (کە لە هی خۆی چاکتر بوو)، منیش هەواڵم بە پێغەمبەردا ﷺ، ئەویش فەرمووی: پێی بدە، چونکە باشترین کەس ئەو کەسەیە کە بە چاکترین و باشترین شێوە قەرز بداتەوە.

**٢٢٨٦-** عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﷺ، يَقُولُ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ أَعْرَابِيٌّ: اقْضِنِي بَكْرِي، فَأَعْطَاهُ بَعِيرًا مُسِنًّا، فَقَالَ الْأَعْرَابِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا أَسَنُّ مِنْ بَعِيرِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ النَّاسِ خَيْرُهُمْ قَضَاءً»(٢).

واتە: عیربازی کوڕی ساریە ﷺ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووم، دەشتەکییەک گوتی: وشترەکەم بدەوە، (پێغەمبەریش ﷺ) وشترێکی گەورەتر لە هی خۆی پێدا، دەشتەکییەکەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو وشترە لە هی خۆم باشترە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باشترینی خەڵکی ئەوانەن کە بە باشترین شێوە قەرزەکانیان دەدەنەوە.

## بابەت: هاوبەشی لە ئیش و کاردا

**٢٢٨٧-** عَنِ السَّائِبِ ﷺ، قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: «كُنْتَ شَرِيكِي فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَكُنْتَ خَيْرَ شَرِيكٍ، لَا تُدَارِينِي، وَلَا تُمَارِينِي»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٠٠، وأبو داود: ٣٣٤٦.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٦١٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٨٣٦.

واتە: سائیب ﷺ دەگێڕێتەوە بە پێغەمبەری ﷺ گوت: تۆ لە سەردەمی پێش ئیسلامدا هاوبەشم بووی، وە تۆ باشترین هاوبەش بووی، هیچ کات کێشەو دەمەقاڵێت لەگەڵ نەدەکردم.

**المضاربة:** واتە: کەسێک پارەی هەیەو کەسێکیش دەستی کاری هەیە، بەڵام پارەی نیە، ئەو دوو کەسە دەبنە هاوبەش لە کارداو، لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی قازانجەکە ڕێکدەکەون.

**٢٢٨٨-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «اشْتَرَكْتُ أَنَا وَسَعْدٌ، وَعَمَّارٌ، يَوْمَ بَدْرٍ، فِيمَا نُصِيبُ، فَلَمْ أَجِئْ أَنَا وَلَا عَمَّارٌ بِشَيْءٍ، وَجَاءَ سَعْدٌ بِرَجُلَيْنِ»[١].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: من و سەعد و عەممار لە ڕۆژی بەدر بووین بە هاوبەش لە هەر شتێک کە بەدەستی بێنین، جا من و عەممار هیچمان دەست نەکەوت، لەکاتێکدا کە سەعد دوو پیاوی دەستگیر کردبوون.

**٢٢٨٩-** عَنْ صَالِحِ بْنِ صُهَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثٌ فِيهِنَّ الْبَرَكَةُ، الْبَيْعُ إِلَى أَجَلٍ، وَالْمُقَارَضَةُ، وَأَخْلَاطُ الْبُرِّ بِالشَّعِيرِ، لِلْبَيْتِ لَا لِلْبَيْعِ»[٢].

واتە: ساڵحی کوڕی سوهەیب لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ جۆر مامەڵە هەیە کە فەڕو بەرەکەتی تێدایە: فرۆشتن بۆ کاتێکی دیاری کراو و، قەرزدان و، تێکەڵکردنی گەنم و جۆ بۆ ماڵەوە نەک بۆ فرۆشتن.

**المقارضة:** واتە: پێدانی پارە بە کەسێک تا کاری پێوە بکات، لە بەرانبەردا هەندێک لە قازانجەکەی پێ بدرێ، کە لەسەری ڕێکدەکەون.

## بابەت: ئەو شتەی کە لە ماڵ و موڵکی مناڵ دەبێتە هی باوکی

**٢٢٩٠-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلْتُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ، وَإِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ»[٣].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٣٨٨، والنسائي: ٣٩٣٧ و ٤٦٩٧.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٢٨ و ٣٥٢٩، والترمذي: ١٢٥٨، والنسائي: ٤٤٤٩_٤٤٥٢.

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین و پاکترین شتێک کە لێی بخۆن ئەو شتەیە کە بۆ خۆتان (بەرەنجی شانتان) پەیدای دەکەن، وە بێگومان منالەکانتان بەشێکن لە هەوڵ و کۆششی خۆتان.

**٢٢٩١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي مَالًا وَوَلَدًا، وَإِنَّ أَبِي يُرِيدُ أَنْ يَجْتَاحَ مَالِي، فَقَالَ: «أَنْتَ وَمَالُكَ لِأَبِيكَ»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا من هەم ماڵ و هەم منداڵم هەیە، وە باوکیشم دەیەوێت ئەوەی هەمە ببیات بۆ خۆی (پێداویستییەکانی پێ جێبەجێ بکات)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: تۆش و سامانەکەشت هی باوکتن.

**٢٢٩٢-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ أَبِي اجْتَاحَ مَالِي، فَقَالَ: «أَنْتَ وَمَالُكَ لِأَبِيكَ» وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِكُمْ، فَكُلُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتی: لەڕاستیدا باوکم سامانە کەی منی بردووە بۆ پێداویستییەکانی خۆی، ئەویش فەرمووی: تۆش و سامانەکەشت هی باوکتن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان منداڵەکانتان باشترین بەرهەمی خۆتانن، جا بۆیە لە ماڵ و سامانیان بخۆن.

## بابەت: مافی ژن لە ماڵی مێردەکەی

**٢٢٩٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: جَاءَتْ هِنْدٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، لَا يُعْطِينِي مَا يَكْفِينِي وَوَلَدِي، إِلَّا مَا أَخَذْتُ مِنْ مَالِهِ، وَهُوَ لَا يَعْلَمُ، فَقَالَ: «خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٥٣٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٣٦٤، ومسلم: ١٧١٤، وأبو داود: ٣٥٣٢ و ٣٥٣٣، والنسائي: ٥٤٢٠.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: هیند (خێزانی ئەبو سوفیان) هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاستیدا ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە، بەشی ئەوەندەم ناداتێ کە بەشی خۆم و منداڵم بکات، مەگەر بێئەوەی ئەو بزانێ من لە ماڵ و سامانی ئەو هەڵگرم (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ئەوەندە ببە کە بەشی ماڵ و منداڵت دەکات بە گوێرەی عورف و عادەت (واتە: زێدەڕۆیی مەکە).

**٢٢٩٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ - وَقَالَ أَبِي فِي حَدِيثِهِ: إِذَا أَطْعَمَتِ الْمَرْأَةُ - مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا، غَيْرَ مُفْسِدَةٍ، كَانَ لَهَا أَجْرُهَا، وَلَهُ مِثْلُهُ بِمَا اكْتَسَبَ، وَلَهَا بِمَا أَنْفَقَتْ، وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ژن لە ماڵی مێردەکەی ببەخشێت، -ڕاوی دەڵێ: باوکم لە گێڕانەوەکەیدا گوتی: ئەگەر ژن لە ماڵی مێردەکەی خواردن بدات- ببەخشێ، بێ زێدەڕۆیی کردن، پاداشتی بۆ هەیە، وە بۆ پیاوەکەش وەکو ئەو پاداشت هەیە، چونکە ئەو پەیدای کردوە و ژنەکەش بەخشیویەتی، وە کلیل بەدەستیش بە هەمان شێوە، بێ ئەوەی کە لە پاداشتی هیچیان کەم ببێتەوە.

**٢٢٩٥-** عَنْ أَبَا أُمَامَةَ الْبَاهِلِيَّ ﵁، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَا تُنْفِقُ الْمَرْأَةُ مِنْ بَيْتِهَا شَيْئًا إِلَّا بِإِذْنِ زَوْجِهَا» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا الطَّعَامَ؟ قَالَ: «ذَلِكَ مِنْ أَفْضَلِ أَمْوَالِنَا»[2].

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلیی ﵁ دەگێڕێتە وە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئافرەت لە ماڵی مێردەکەی نابێ هیچ شتێک بەبێ مۆڵەتی مێردەکەی ببەخشێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنیش نابێ؟ فەرمووی: جا ئەوە لە باشترینی ماڵەکانمانە!

## بابەت: ئەوەی دەدرێ (بە بەندە) و دەیبەخشێ و دەیکات بە خێر

**٢٢٩٦-** عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﵁، يَقُولُ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يُجِيبُ دَعْوَةَ الْمَمْلُوكِ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٢٥، ومسلم: ١٠٢٤، وأبو داود: ١٦٨٥، والترمذي: ٦٧١ و ٦٧٢، والنسائي: ٢٥٣٩.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٥٦٥، والترمذي: ٦٧٠ و ٢١٢٠.

(٣) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٠١٧.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەم بانگهێشت و میوادداری بەندە (کۆیلە)وە دەچوو.

٢٢٩٧- عَنْ عُمَيْرٍ ﷺ، مَوْلَى آبِي اللَّحْمِ، قَالَ: كَانَ مَوْلَايَ يُعْطِينِي الشَّيْءَ فَأُطْعِمُ مِنْهُ، فَمَنَعَنِي - أَوْ قَالَ: فَضَرَبَنِي - فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ - أَوْ سَأَلَهُ - فَقُلْتُ: لَا أَنْتَهِي أَوْ لَا أَدَعُهُ، فَقَالَ: «الْأَجْرُ بَيْنَكُمَا»[1].

واتە: عومەیر ﷺ بەندەی ئەبو لەحم دەڵێ: گەورەکەم شتی پێدەدام و منیش دەمبەخشی، ئەویش ڕێگری کردم - یان گوتی: لێیدام - ئنجا منیش پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد - یان گەورەکەی پرسیاری کرد- منیش گوتم: وازناهێنم (لەوەی کە دەبەخشم)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هەردووکتان خاوەنی پاداشتن.

## بابەت: کەسێک کە بەلای مەڕ و ماڵات و باغ و باغاتی خەڵکێکدا تێدەپەڕێ ئایا بەشی پێوە هەیە؟

٢٢٩٨- عَنْ أَبِي بِشْرٍ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي إِيَاسٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبَّادَ بْنَ شُرَحْبِيلَ - رَجُلًا مِنْ بَنِي غُبَرَ - قَالَ: أَصَابَنَا عَامُ مَخْمَصَةٍ، فَأَتَيْتُ الْمَدِينَةَ، فَأَتَيْتُ حَائِطًا مِنْ حِيطَانِهَا، فَأَخَذْتُ سُنْبُلًا فَفَرَكْتُهُ وَأَكَلْتُهُ، وَجَعَلْتُهُ فِي كِسَائِي، فَجَاءَ صَاحِبُ الْحَائِطِ، فَضَرَبَنِي وَأَخَذَ ثَوْبِي، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ لِلرَّجُلِ «مَا أَطْعَمْتَهُ إِذْ كَانَ جَائِعًا، أَوْ سَاغِبًا، وَلَا عَلَّمْتَهُ إِذْ كَانَ جَاهِلًا» فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَرَدَّ إِلَيْهِ ثَوْبَهُ، وَأَمَرَ لَهُ بِوَسْقٍ مِنْ طَعَامٍ، أَوْ نِصْفِ وَسْقٍ[2].

واتە: ئەبو بیشر جەعفەری کوڕی ئەبو ئییاس ﷺ دەڵێ: گوێم لە عەبادی کوڕی شوڕەحبیل بوو -کە پیاوێک بوو لە هۆزی غوبەر- گوتی: ساڵێک تووشی قات و قڕی و برسیەتی بووین، منیش هاتم بۆ مەدینە و هاتمە ناو باخێک لە باخەکانی، ئنجا هەندێک گوڵە گەنمم هێنا تەکاندم و لێمخوارد، لە ناو (گیرفانی) کراسەکەشمدا هەڵمگرت، لەوکاتەدا خاوەنی باخەکە هات و لێیدام و پۆشاکەکەی لێسەندم، منیش هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺو بۆم گێڕایەوە، ئەویش بە پیاوەکەی فەرموو: ئایا تێرت

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٢٥، والنسائي: ٢٥٣٧.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٦٢٠ و ٢٦٢١، والنسائي: ٥٤٠٩.

نەکرد لە کاتێکدا کە برسی بوو، وە فێرت نەکرد لە کاتێکدا کە نەیدەزانی (واتە: نەیدەزانی کەماڵی کەس بۆ کەس حەڵاڵ نیە)، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد و پۆشاکەکەی بۆ گێڕایەوە و فەرمانیشی کرد کە وەسقێک یان نیو وەسقی پێبدرێ.

**الوسق:** جۆرە پێوانەیەکە، یەکسانە بە (١٨٠) کیلۆگرام.

**٢٢٩٩-** عَنِ ابْنِ أَبِي الْحَكَمِ الْغِفَارِيِّ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي جَدَّتِي، عَنْ عَمِّ أَبِيهَا رَافِعِ بْنِ عَمْرٍو الْغِفَارِيِّ، قَالَ: كُنْتُ وَأَنَا غُلَامٌ أَرْمِي نَخْلَنَا - أَوْ قَالَ: نَخْلَ الْأَنْصَارِ - فَأُتِيَ بِيَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «يَا غُلَامُ - وَقَالَ ابْنُ كَاسِبٍ: فَقَالَ يَا بُنَيَّ - لِمَ تَرْمِي النَّخْلَ؟» قَالَ: قُلْتُ: آكُلُ، قَالَ: «فَلَا تَرْمِ النَّخْلَ، وَكُلْ مِمَّا يَسْقُطُ فِي أَسَافِلِهَا» قَالَ: ثُمَّ مَسَحَ رَأْسِي، وَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَشْبِعْ بَطْنَهُ»[١].

واتە: کوڕی ئەبو حەکەمی غیفاریی ﷺ دەڵێ: داپیرەم لە مامێکی باوکییەوە ئەبو ڕافیعی کوڕی عەمڕی غیفاری بۆی گێڕامەوە و گوتی: لە کاتێکدا من مێرمنداڵێک بووم بەردم دەهاویشتە دارخورماکانی خۆمان، یان گوتی: دارخورمای ئەنصارییەکان، جا منیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئە ویش فەرمووی: ئەی لاو - ئیبنو کاسیب دەڵێ: فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم - بۆ بەرد دەهاوێژی بۆ دار خورماکان؟ گوتی: گوتم: دەیانخۆم، فەرمووی: بەردیان تێمەگرە لەوانە بخۆ کە بەربوونەتەوەو لە ژێر دار خورماکانن، گوتی: دەستی بەسەر سەرمدا هێناو فەرمووی: خوایە سکی تێر بکەی.

**٢٣٠٠-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا أَتَيْتَ عَلَى رَاعٍ، فَنَادِهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ، فَإِنْ أَجَابَكَ، وَإِلَّا فَاشْرَبْ فِي غَيْرِ أَنْ تُفْسِدَ، وَإِذَا أَتَيْتَ عَلَى حَائِطِ بُسْتَانٍ، فَنَادِ صَاحِبَ الْبُسْتَانِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَإِنْ أَجَابَكَ، وَإِلَّا فَكُلْ فِي أَنْ لَا تُفْسِدَ»[٢].

واتە: ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ڕێگات کەوتە لای شوانێک ئەوە سێ جار بانگی بکە، جا ئەگەر وەڵامی دایەوە باشە، ئەگەرنا ئەوە شیر بخۆ بەڵام زێدەڕۆیی مەکە، وە ئەگەر ڕێگات کەوتە باخێک ئەوە سێ جار بانگی خاوەنەکەی بکە، جا ئەگەر وەڵامی دایەوە باشە، ئەگەرنا لە باخەکە بخۆ بێ ئەوەی زێدەڕۆیی بکەی و زەرەری پێ بگەیەنی.

---

(١) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٦٢٢، والترمذي: ١٢٨٨.

(٢) صحيح.

**٢٣٠١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ بِحَائِطٍ فَلْيَأْكُلْ، وَلَا يَتَّخِذْ خُبْنَةً»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان بەلای باخێکدا تێپەڕین، لێی بخۆن بەڵام لە گیرفانتان مەکەن، (واتە: بەشی خواردنی خۆت بخۆ نەک بۆ ماڵیش بێنیەوە).

## بابەت: نابێ بێ پرسی خاوەنەکەی هیچ شتێک بخۆی

**٢٣٠٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَامَ، فَقَالَ: «لَا يَحْتَلِبَنَّ أَحَدُكُمْ مَاشِيَةَ رَجُلٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِ، أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تُؤْتَى مَشْرُبَتُهُ، فَيُكْسَرَ بَابُ خِزَانَتِهِ فَيُنْتَثَلَ طَعَامُهُ؟ فَإِنَّمَا تَخْزُنُ لَهُمْ ضُرُوعُ مَوَاشِيهِمْ أَطْعِمَاتِهِمْ، فَلَا يَحْتَلِبَنَّ أَحَدُكُمْ مَاشِيَةَ امْرِئٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساوە و فەرموویەتی: هیچ یەکێک لە ئێوە لە ماڵاتی یەکێکیتر نەدۆشێت بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی، ئایا یەکێک لە ئێوە پێی خۆشە کە ژووری خواردن و گەنجینەکەی بشکێنرێ و خواردنەکەی پەرت و بڵا و بکرێ و ببرێ؟ ئەو خەڵکەش گوانی ماڵاتەکەیان خواردنیان بۆ پاشەکەوت دەکات، بۆیە بێ مۆڵەتی خاوەنەکەیان مەیان دۆشن.

**٢٣٠٣-** عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، إِذْ رَأَيْنَا إِبِلًا مَصْرُورَةً بِعِضَاهِ الشَّجَرِ، فَثُبْنَا إِلَيْهَا، فَنَادَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَرَجَعْنَا إِلَيْهِ، فَقَالَ: «إِنَّ هَذِهِ الْإِبِلَ لِأَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ هُوَ قُوتُهُمْ، وَيُمْنُهُمْ بَعْدَ اللَّهِ، أَيَسُرُّكُمْ لَوْ رَجَعْتُمْ إِلَى مَزَاوِدِكُمْ فَوَجَدْتُمْ مَا فِيهَا قَدْ ذُهِبَ بِهِ أَتُرَوْنَ ذَلِكَ عَدْلًا؟» قَالُوا: لَا، قَالَ: «فَإِنَّ هَذَا كَذَلِكَ» قُلْنَا: أَفَرَأَيْتَ إِنِ احْتَجْنَا إِلَى الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ؟ فَقَالَ: «كُلْ وَلَا تَحْمِلْ، وَاشْرَبْ وَلَا تَحْمِلْ»[3].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ١٢٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٣٥، ومسلم: ١٧٢٦.

(٣) ضعيف.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا کە ئێمە لە گەشتێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، لەوکاتەدا وشترێکمان بینی کە گوانەکانی بەسترابوون بە شوڵە دارێک، ئێمەش بەرەورووی چووین و لێی کۆبووینەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردینەوە، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ خزمەتی، ئەویش فەرمووی: بێگومان ئەو وشترە هی خێزانیماڵێکە لە مسوڵمانان کە لەدوای خوا قوت و سەرچاوەی ژیانیانە، ئایا هەر یەکێک لە ئێوە خۆشحاڵ دەبێت کاتێک کە دەگەڕێتەوە دەبینێ کە هەرچی توێشوو خواردنە نەمابێ؟ ئایا ئا ئەوە بە دادپەروەری دەزانن؟ گوتیان: نەخێر، فەرمووی: دەی بێگومان ئەوەش ئاوایە، گوتمان: ئەی کاتێک کە پێویستیمان بە خواردن و خواردنەوە بێ فەرمانت بە چییە؟ ئەویش فەرمووی: بخۆو بخۆوە، بەڵام لێی هەڵمەگرە.

## بابەت: ڕاگرتنی مەڕ و ماڵات

٢٣٠٤- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ لَهَا: «اتَّخِذِي غَنَمًا فَإِنَّ فِيهَا بَرَكَةً»[١].

واتە: ئوممو هانیئ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: مەڕ بەخێو بکە چونکە مایەی خێر و بەرەکەتە.

٢٣٠٥- عَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ ﷺ، يَرْفَعُهُ، قَالَ: «الْإِبِلُ عِزٌّ لِأَهْلِهَا، وَالْغَنَمُ بَرَكَةٌ، وَالْخَيْرُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[٢].

واتە: عوروەی باریقیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وشتر مایەی شکۆیە بۆ خاوەنەکەی، وە مەڕ مایەی پیت و فەڕە، وە چاکەو خێر بەناوچاوانی ئەسپەوە گرێدراوە تاوەکو ڕۆژی قیامەت (چونکە بۆ جەنگ و جیهاد بەکاردەهێنرێ).

٢٣٠٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشَّاةُ مِنْ دَوَابِّ الْجَنَّةِ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مەڕو بزن لە ئاژەڵانی بەهەشتن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٥٠، ومسلم: ١٨٧٣، والترمذي: ١٦٩٤، والنسائي: ٣٥٧٤_٣٥٧٧.

(٣) صحيح.




**٢٣٠٧**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْأَغْنِيَاءَ بِاتِّخَاذِ الْغَنَمِ، وَأَمَرَ الْفُقَرَاءَ بِاتِّخَاذِ الدَّجَاجِ، وَقَالَ: «عِنْدَ اتِّخَاذِ الْأَغْنِيَاءِ الدَّجَاجَ، يَأْذَنُ اللَّهُ بِهَلَاكِ الْقُرَى»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە دەوڵەمەندەکان کرد مەڕ ڕابگرن، وە فەرمانی بە هەژارەکان کرد کە مریشک ڕابگرن، جا فەرمووی: کاتێ دەوڵەمەندەکان مریشکیان بە خێوکرد، خوا مۆڵەت دەدات بە لە ناوچونی ئەو ئاواییە.**

* * *

---

(١) موضوع.

## بابەت: باسی دادوەرەکان

**٢٣٠٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ جُعِلَ قَاضِيًا بَيْنَ النَّاسِ، فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک کرا بە دادوەر لە نێوان خەڵکیدا، بەبێ چەقۆ سەر براوە.

**٢٣٠٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَأَلَ الْقَضَاءَ وُكِلَ إِلَى نَفْسِهِ، وَمَنْ جُبِرَ عَلَيْهِ نَزَلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَسَدَّدَهُ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بۆ خۆی داوای دادوەری بکات دەدرێتە دەست خۆی (خوا یارمەتی نادات)، وە هەرکەسێکیش بە زۆر دایبنێن (واتە: خۆی داوا نەکات بەڵکو داوای لێبکەن کە بیکات) ئەوە فریشتەیەک دادەبەزێ بۆی و ڕێنیشاندەری دەبێ (مادام کەسێکی لێهاتوو بێت).

**٢٣١٠-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ تَبْعَثُنِي وَأَنَا شَابٌّ أَقْضِي بَيْنَهُمْ، وَلَا أَدْرِي مَا الْقَضَاءُ؟ قَالَ: فَضَرَبَ بِيَدِهِ فِي صَدْرِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اهْدِ قَلْبَهُ، وَثَبِّتْ لِسَانَهُ» قَالَ: فَمَا شَكَكْتُ بَعْدُ فِي قَضَاءٍ بَيْنَ اثْنَيْنِ[٣].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ یەمەن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا کە من گەنجم دەمنێری بۆ ئەوێ دادوەری لە نێوانیاندا بکەم، هیچیش لە دادوەری نازانم؟ گوتی: (پێغەمبەر ﷺ) بەدەستی خۆی لە سینگمیدا و پاشان فەرمووی: خوایە دڵی شارەزا و ڕێنمایی بکە و زمانی ڕابێنە و دایمەزرێنە، گوتی: لەمەودوا لە هیچ دادوەریەک کە لەنێوان دوو کەسدا کردوومە گومانم نەبووە.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٥٧١ و ٣٥٧٢، والترمذي: ١٣٢٥.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٥٧٨، والترمذي: ١٣٢٣ و ١٣٢٤.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٨٢ بنحوه، والترمذي: ١٣٣١.

## بابەت: هەڕەشە و توندگیری لە ستەم و ڕیشوە خواردندا

٢٣١١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ حَاكِمٍ يَحْكُمُ بَيْنَ النَّاسِ إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمَلَكٌ آخِذٌ بِقَفَاهُ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَإِنْ قَالَ: أَلْقِهِ، أَلْقَاهُ فِي مَهْوَاةٍ أَرْبَعِينَ خَرِيفًا»[١].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر دادوەرێک کە دادوەری لە نێوان خەڵکیدا دەکات بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و فریشتەیەک پشتە ملی دەگرێ، پاشان سەری بەرز دەکاتەوە بەرەو ئاسمان، جا هەرکات فەرمانی پێکرا کە فڕێی بدات، فڕێی دەداتە شوێنێک کە چل پاییز ڕێگایە (واتە: چل ساڵ بەرە و خوارەوە شۆڕ دەبێتەوە بە دۆزەخدا).

٢٣١٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ مَعَ الْقَاضِي مَا لَمْ يَجُرْ، فَإِذَا جَارَ وَكَلَهُ إِلَى نَفْسِهِ»[٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا لەگەڵ دادوەر دایە مادام ستەم ناکات (لە دادوەرییەکەدا)، جا هەرکات ستەمی کرد، دەدرێتە دەست خۆی (خوا پشتیوانی ناکات و فەرامۆشی دەکات).

٢٣١٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الرَّاشِي وَالْمُرْتَشِي»[٣].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەفرەتی خوا لەو کەسەی کە ڕیشوە دەدات و لەو کەسەش کە وەریدەگرێت.

## بابەت: دادوەرێک کە ئیجتیهاد دەکات و دەیپێکێت

٢٣١٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ فَأَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ»[٤].

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ١٣٣٠.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٨٠، والترمذي: ١٣٣٧.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٣٥٢، ومسلم: ١٧١٦، وأبو داود: ٣٥٧٤.

واتە: عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، دەیفەرموو: هەرکات دادوەر ئیجتیهادی کرد و بڕیاری دا و پێکای، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە (پاداشتی ئیجتیهاد و پێکانەکە)، وە ئەگەر ئیجتیهادی کرد و بڕیاری دا و نەیپێکا پاداشتێکی بۆ هەیە (پاداشتی ئیجتیهاد و خۆ ماندوو کردنەکە).

**٢٣١٥-** عَنْ أَبُو هَاشِمٍ، قَالَ: لَوْلَا حَدِيثُ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «الْقُضَاةُ ثَلَاثَةٌ، اثْنَانِ فِي النَّارِ، وَوَاحِدٌ فِي الْجَنَّةِ، رَجُلٌ عَلِمَ الْحَقَّ فَقَضَى بِهِ فَهُوَ فِي الْجَنَّةِ، وَرَجُلٌ قَضَى لِلنَّاسِ عَلَى جَهْلٍ فَهُوَ فِي النَّارِ، وَرَجُلٌ جَارَ فِي الْحُكْمِ فَهُوَ فِي النَّارِ»، لَقُلْنَا: إِنَّ الْقَاضِيَ إِذَا اجْتَهَدَ فَهُوَ فِي الْجَنَّةِ[١].

واتە: ئەبو هاشیم دەڵێ: ئەگەر فەرموودەکەی ئیبنو بوڕەیدە نەبایە کە لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دادوەرەکان سێ جۆرن: دوویان دەچنە دۆزەخ و یەکیان دەچێتە بەهەشت، پیاوێک هەقەکە دەزانێ و حوکمی پێدەکات لە بەهەشت دایە، وە پیاوێک بە نەزانی دادوەری بۆ خەڵک دەکات لە ئاگر دایە، هەروەها پیاوێکیش کە (هەقەکە دەزانێ بەڵام بەئەنقەست) ستەم دەکات لە بڕیارەکەیدا دەچێتە ناو ئاگر، (ڕاوی دەڵێ: ئەگەر ئەو فەرموودەیە نەبووایە) ئەوە دەمانگوت: هەر دادوەرێک ئیجتیهاد بکات دەچێتە بەهەشت.

## بابەت: نابێ دادوەر لە کاتی توڕەییدا بڕیار بدات

**٢٣١٦-** عَنْ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا يَقْضِي الْقَاضِي بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ» قَالَ هِشَامٌ فِي حَدِيثِهِ: لَا يَنْبَغِي لِلْحَاكِمِ أَنْ يَقْضِيَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نابێ دادوەر لە حاڵەتی توڕەییدا دادوەری لە نێوان دوو کەسدا بکات. هیشام لە گێڕانەوەکەیدا دەڵێ: پێویست نیە و نابێ دادوەر دادوەری لە نێوان دوو کەسدا بکات کاتێک کە تووڕەیە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٧٣، والترمذي: ١٣٢٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧١٥٨، ومسلم: ١٧١٧، وأبو داود: ٣٥٨٩، والترمذي: ١٣٣٤، والنسائي: ٥٤٠٦ و ٥٤٢١.

## بابەت: بە بڕیاری دادوەر حەڵاڵ حەرام نابێ و حەرام حەڵاڵ نابێ

٢٣١٧- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ وَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، وَإِنَّمَا أَقْضِي لَكُمْ عَلَى نَحْوٍ مِمَّا أَسْمَعُ مِنْكُمْ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا، فَلَا يَأْخُذْهُ فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ، يَأْتِي بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێوە کێشەکانتان دێنن بۆ لای من و منیش وەکو ئێوە مرۆڤم، لەوانەیە هەندێکتان زمان پاراوتربن لە بەڵگە هێنانەوە لە ئەوانیتر، وە منیش لەسەر ئەو شتەی کە دەیبیستم بڕیارتان بۆ دەدەم، جا هەرکات هەقی برایەکم دا بە ئەویتر ئەوا با وەرینەگرێت، چونکە بێگومان ئەوا پارچەیەک ئاگری دۆزەخم بۆ دابڕیوە، لە ڕۆژی قیامەت دێتەوە ڕێگای (واتە: بە بڕیارەکەی من بۆی حەڵاڵ نابێت ئەگەر لە ئەسڵدا حەرام بێت و بە زمان پاراوی خۆی سەلماندنی بۆ کردبێ).

٢٣١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، فَمَنْ قَطَعْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ قِطْعَةً، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان منیش وەکو ئێوە مرۆڤم، لەوانەیە هەندێکتان زمان پاراوتربن لە بەڵگە هێنانەوە لە ئەوانیتر، بۆیە ئەگەر لە هەقی براکەی شتێکم بۆ دابڕی (کە هەقی ئەو نەبوو)، بێگومان پارچەیەک ئاگرە بۆی دادەبڕم (نابێتە هەق بۆی مادام لە ئەصڵدا حەرام بێ).

## بابەت: کەسێ داوای شتێک بکات
## کە هی ئەو نەبێ و کێشەی لەسەر بکات

٢٣١٩- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنِ ادَّعَى مَا لَيْسَ لَهُ فَلَيْسَ مِنَّا، وَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٥٨، ومسلم: ١٧١٣، وأبو داود: ٣٥٨٣_٣٥٨٥، والترمذي: ١٣٣٩، والنسائي: ٥٤٠١ و ٥٤٢٢.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح. انظر البخاري: ٣٥٠٨، ومسلم: ٦١.

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: هەر کەسێک داوای شتێک بکات کە هی ئەو نەبێ، لە ئێمە نیە، وە با شوێنی خۆی لە ناو ئاگردا (لە دۆزەخ) دیاری بکات.

٢٣٢٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَعَانَ عَلَى خُصُومَةٍ بِظُلْمٍ، أَوْ يُعِينُ عَلَى ظُلْمٍ، لَمْ يَزَلْ فِي سَخَطِ اللَّهِ حَتَّى يَنْزِعَ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە ستەم کردن، یارمەتی کێشەیەک بدات و دەستی تێوەربدات، بەردەوام لەبەر خەشم و تووڕەیی خوا دایە تاکو وازدێنێ.

## بابەت: شایەد هێنان لەسەر داواکارەو سوێند خواردن لەسەر داوالێکراوە

٢٣٢١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ، ادَّعَى نَاسٌ دِمَاءَ رِجَالٍ وَأَمْوَالَهُمْ، وَلَكِنِ الْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خەڵکی تەنها بە داواکردن شتە داواکراوەکەیان پێ بدرابایە، خەڵکانێک داوای خوێن و ماڵی خەڵکیان دەکرد، بەڵام (لە کێشەیەکی ئاوادا) سوێند خواردن لەسەر ئەو کەسەیە کە داوای لەسەر تۆمار کراوە.

٢٣٢٢- عَنِ الْأَشْعَثِ بْنِ قَيْسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ أَرْضٌ، فَجَحَدَنِي، فَقَدَّمْتُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَلْ لَكَ بَيِّنَةٌ؟» قُلْتُ: لَا، قَالَ لِلْيَهُودِيِّ: «احْلِفْ» قُلْتُ: إِذًا يَحْلِفُ فِيهِ فَيَذْهَبُ بِمَالِي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران، إِلَخْ الْآيَةِ[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٩٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥١٤، ومسلم: ١٧١١، وأبو داود: ٣٦١٩، والترمذي: ١٣٤٢، والنسائي: ٥٤٢٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٤٩، ومسلم: ١٣٨، وأبو داود: ٣٢٤٣ و ٣٦٢١.

واتە: ئەشعەسی کوڕی قەیس ﷺ دەڵێ: لە نێوان من و پیاوێکی جوولەکەدا زەوییەک هەبوو (کێشەمان هەبوو لەسەر زەوییەکە)، پیاوە جوولەکەکەش نکووڵی لە مافەکەم دەکرد، منیش بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئایا شایەدت هەیە؟ گوتم: نەخێر، بە جوولەکەکەی فەرموو: سوێند بخۆ، گوتم: کەواتە سوێند دەخوات و موڵک و ماڵەکەم دەبات، لەوکاتەدا ئەو ئایەتە دابەزی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران، واتە: بێگومان ئەوانەی دەیفرۆشن پەیمانی خواو سوێندەکانی خۆیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن. تا کۆتایی ئایەتەکە.

## بابەت: ئەو کەسەی سوێندی بە درۆ دەخوات تاکو ماڵی کەسێکیتر دابڕێ

**٢٣٢٣-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَـمِينٍ، وَهُوَ فِيهَا فَاجِرٌ، يَقْتَطِعُ بِهَا مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ، لَقِيَ اللَّهَ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سوێند بخوات و لە سوێندەکەیدا درۆ بکات بۆ ئەوەی ماڵی کەسێکی مسوڵمان دابڕێ، لە کاتێکدا کە دەچێتەوە بەر بارەگای خوا، خوا لێی توڕەیە.

**٢٣٢٤-** عَنْ أَبَا أُمَامَةَ الْحَارِثِيِّ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَا يَقْتَطِعُ رَجُلٌ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ، إِلَّا حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ، وَأَوْجَبَ لَهُ النَّارَ»، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنْ كَانَ شَيْئًا يَسِيرًا؟ قَالَ: «وَإِنْ كَانَ سِوَاكًا مِنْ أَرَاكٍ»[٢].

واتە: ئەبو ئومامەی حاریسیی ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، فەرموویەتی: هیچ کەسێک مافی کەسێکی مسوڵمان بە هۆی سوێند خواردنەکەیەوە دانابڕێ، ئەگەر ئەوەی کرد، بێگومان خوا بەهەشتی لێ حەرام دەکات و دۆزەخی بۆ بڕیار دەدات، پیاوێک لە خەڵکەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر شتەکە کەمیش بێ؟ فەرمووی: ئەگەر دار سیواکێکی داری ئەراکیش بێت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥١٥، ومسلم: ١٣٨، وأبو داود: ٣٢٤٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٧، والنسائي: ٥٤١٩.

## بابەت: سوێند خواردن بۆ دابڕینی مافی خەڵکی (بە ناهەق)

**٢٣٢٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ بِيَمِينٍ آثِمَةٍ عِنْدَ مِنْبَرِي هَذَا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، وَلَوْ عَلَى سِوَاكٍ أَخْضَرَ»[١].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لەلای مینبەرەکەی من لەسەر شتێک سوێندی بە درۆ بخوات، ئەگەر ئەو شتە سیواکێکی تەڕیش بێت، با شوێنی خۆی لە ئاگردا دیاری بکات.

**٢٣٢٦-** عَنْ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحْلِفُ عِنْدَ هَذَا الْمِنْبَرِ عَبْدٌ وَلَا أَمَةٌ، عَلَى يَمِينٍ آثِمَةٍ، وَلَوْ عَلَى سِوَاكٍ رَطْبٍ، إِلَّا وَجَبَتْ لَهُ النَّارُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ بەندە یان کەنیزەکێک (پیاو یان ژنێک) لەلای ئەو مینبەرە سوێندی بە درۆ ناخۆن، ئەگەر لەسەر سیواکێکی تەڕیش بێت، (ئەوەی وا بکات) ئەوە بێگومان دۆزەخی بۆ پێویست دەبێ.

## بابەت: بە چی سوێندی خاوەن کیتابەکان دەدرێ (جوولەکە و مەسیحی)

**٢٣٢٧-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، دَعَا رَجُلًا مِنْ عُلَمَاءِ الْيَهُودِ، فَقَالَ: «أَنْشُدُكَ بِالَّذِي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى»[٣].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی لە زانایەکانی جوولەکەی بانگ کرد و پێی فەرموو: سوێندت دەدەم بەو زاتەی کە تەوڕاتی دابەزاند بۆ سەر موسا.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٢٤٦.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٠٠، وأبو داود: ٤٤٤٧ و ٤٤٤٨.

**٢٣٢٨-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِيَهُودِيَّيْنِ: «أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ الَّذِي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى ﷺ»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوو جوولەکەی فەرموو: سوێندتان دەدەم بەو خوایەی کە تەوڕاتی دابەزاند بۆ سەر موسا.

## بابەت: ئەوەی دوو پیاو لەسەر کەل و پەلێک کێشەیان بێت و شایەدیان نەبێ

**٢٣٢٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ ذَكَرَ أَنَّ رَجُلَيْنِ ادَّعَيَا دَابَّةً، وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا بَيِّنَةٌ، «فَأَمَرَهُمَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَسْتَهِمَا عَلَى الْيَمِينِ»[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، دوو پیاو لەسەر وڵاخێک لێیان بوو بە کێشە و هیچیشیان شایەدیان نەبوو، ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردن کە تیرو پشک بکەن لەسەر سوێند خواردنەکەیان.

**٢٣٣٠-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اخْتَصَمَ إِلَيْهِ رَجُلَانِ، بَيْنَهُمَا دَابَّةٌ، وَلَيْسَ لِوَاحِدٍ مِنْهُمَا بَيِّنَةٌ، فَجَعَلَهَا بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ»[3].

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە، دوو کەس کێشەکەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەسەر وڵاخێک، یان وشترێک لە نێوانیان بوو بە کێشە، هیچ یەکێکیشیان شایەدی نەبوو، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) وڵاخەکەی لە نێوانیاندا دابەشکرد (کامەیان هەڵی بگرێتەوە نیوەی قیمەتەکەی بداتە ئەویتر).

## بابەت: ئەو کەسەی شتێکی لێ بدزرێ و بە دەست پیاوێکی تر ببینێتەوە کە کڕیویەتی

**٢٣٣١-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا ضَاعَ لِلرَّجُلِ مَتَاعٌ، أَوْ سُرِقَ لَهُ مَتَاعٌ، فَوَجَدَهُ فِي يَدِ رَجُلٍ يَبِيعُهُ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ، وَيَرْجِعُ الْمُشْتَرِي عَلَى الْبَائِعِ بِالثَّمَنِ»[4].

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٤٥٢_٤٤٥٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٧٤ بنحوه، وأبو داود: ٣٦١٦ و ٣٦١٧.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٦١٣_٣٦١٥، والنسائي: ٥٤٢٤.

(٤) ضعيف.

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک شتێکی لێ ون بوو یان لێی دزرا، پاشان بە دەست کەسێکەوە بینی کە دەیفرۆشێ، خاوەنەکەی شایستەترە بەوەی کە بیکڕێتەوەو ئەو کەسەشی کە لەبەر دەستی دایە و کڕیویەتی دەبێ بچێتەوە پارەکەی لە فرۆشیارەکە وەربگرێتەوە.

## بابەت: ئەو زیانانەی کە ئاژەڵ دەیدات

٢٣٣٢- عَنِ ابْنِ مُحَيِّصَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ أَخْبَرَهُ، أَنَّ نَاقَةً لِلْبَرَاءِ كَانَتْ ضَارِيَةً، دَخَلَتْ فِي حَائِطِ قَوْمٍ، فَأَفْسَدَتْ فِيهِ، فَكُلِّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِيهَا، «فَقَضَى أَنَّ حِفْظَ الْأَمْوَالِ عَلَى أَهْلِهَا بِالنَّهَارِ، وَعَلَى أَهْلِ الْمَوَاشِي مَا أَصَابَتْ مَوَاشِيهِمْ بِاللَّيْلِ»[١].

واتە: ئیبنو موحەیصەی ئەنصاریی ﷺ دەگێڕێتەوە، بەڕاء وشترێکی هار وهاجی هەبوو، (وشترەکەی) ڕۆیشتبوو بۆ ناو باخی خەڵک، زەرەر و زیانی بە باخەکە گەیاندبوو، (ئنجا لەوبارەیەوە) قسە کرا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەریش ﷺ) بڕیاریدا کە پاراستنی موڵک و ماڵ بە ڕۆژ لەسەر خاوەن ماڵەکە خۆیەتی، وە بە شەوانیش لەسەر خاوەن ماڵاتەکانە، ئەگەر بە شەو زەرەریاندا لە ماڵاتەکان (دەبێ زەرەرەکە بژمێرن).

٢٣٣٢م- حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ عَفَّانَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عِيسَى، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حَرَامِ بْنِ مُحَيِّصَةَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، أَنَّ نَاقَةً لِآلِ الْبَرَاءِ أَفْسَدَتْ شَيْئًا، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِثْلِهِ[٢].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: حوکمی ئەو کەسەی شتێک دەشکێنێ

٢٣٣٣- عَنْ قَيْسِ بْنِ وَهْبٍ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي سُوَاءَةَ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﷺ: أَخْبِرِينِي عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: أَوَمَا تَقْرَأُ الْقُرْآنَ ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾ القلم؟ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَعَ أَصْحَابِهِ، فَصَنَعْتُ لَهُ طَعَامًا، وَصَنَعَتْ لَهُ حَفْصَةُ طَعَامًا، قَالَتْ: فَسَبَقَتْنِي

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٦٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٧٠.

حَفْصَةُ، فَقُلْتُ لِلْجَارِيَةِ: انْطَلِقِي فَأَكْفِئِي قَصْعَتَهَا، فَلَحِقَتْهَا، وَقَدْ هَمَّتْ أَنْ تَضَعَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَكْفَأَتْهَا فَانْكَسَرَتِ الْقَصْعَةُ، وَانْتَشَرَ الطَّعَامُ، قَالَتْ: فَجَمَعَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَا فِيهَا مِنَ الطَّعَامِ عَلَى النِّطَعِ، فَأَكَلُوا، ثُمَّ بَعَثَ بِقَصْعَتِي، فَدَفَعَهَا إِلَى حَفْصَةَ، فَقَالَ: «خُذُوا ظَرْفًا مَكَانَ ظَرْفِكُمْ، وَكُلُوا مَا فِيهَا» قَالَتْ: فَمَا رَأَيْتُ ذَلِكَ فِي وَجْهِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[1].

واتە: قەیسی کوڕی وەهب لە پیاوێکی هۆزی «سُوَاءَة» دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: بە عائیشەم ﵂ گوت: دەربارەی ڕەفتاری پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم پێبدە، ئەویش گوتی: ئایا قوڕئان ناخوێنیتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾ القلم؟ واتە: وە بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خویەکی ئێجگار بەرزو گەورەیت، عائیشە ﵂ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بوو، منیش خواردنم بۆ دروست کردن، هەروەها حەفصەش ﵂ خواردنی بۆ دروست کردن، گوتی: جا حەفصە ﵂ پێش من کەوت، منیش بە کەنیزەکەکەم گوت: بچۆ قاپە خواردنەکەی وەرگێڕە، جا کاتێک پێی گەیشت خەریک بوو لە بەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دایدەنا و کەنیزەکەکەش وەریگێڕا و قاپەکە شکا، خواردنەکەش ڕژا، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆی کردەوە و خواردنەکەشی تێکردەوە کە لەسەر سفرەکە بوو، ئنجا خواردیان، پاشان قاپەکەی منی بۆ حەفصە ناردەوە و فەرمووی: ئەو قاپە لەجێی قاپی خۆت وەربگرەوە و ئەوەی کە تێیدایە بیخۆ (چونکە عائیشە قاپەکەی ئەوی بە کەنیزەکەکە شکاندبوو)، جا عائیشە ﵂ دەڵێ: لەسەر ئەو هەڵوێستەی من هیچ شتێکی نامۆم لەسەر ڕوخساری پێغەمبەری خوا ﷺ نەدیت (واتە: زۆر نەرم و نیان بوو، توڕە نەبوو).

**٢٣٣٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ إِحْدَى أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ، فَأَرْسَلَتْ أُخْرَى بِقَصْعَةٍ فِيهَا طَعَامٌ، فَضَرَبَتْ يَدَ الرَّسُولِ، فَسَقَطَتِ الْقَصْعَةُ فَانْكَسَرَتْ، فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْكِسْرَتَيْنِ، فَضَمَّ إِحْدَاهُمَا إِلَى الْأُخْرَى، فَجَعَلَ يَجْمَعُ فِيهَا الطَّعَامَ، وَيَقُولُ: «غَارَتْ أُمُّكُمْ، كُلُوا» فَأَكَلُوا، حَتَّى جَاءَتْ بِقَصْعَتِهَا، الَّتِي فِي بَيْتِهَا، فَدَفَعَ الْقَصْعَةَ الصَّحِيحَةَ إِلَى الرَّسُولِ، وَتَرَكَ الْمَكْسُورَةَ فِي بَيْتِ الَّتِي كَسَرَتْهَا[2].

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٨١، وأبو داود: ٣٥٦٧، والترمذي: ١٣٥٩، والنسائي: ٣٩٥٥. زاد الترمذي قوله ﷺ: «طَعَامٌ بِطَعَامٍ، وَإِنَاءٌ بِإِنَاءٍ».

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەلای یەکێک لە دایکانی ئیمانداران بوو، یەکێکیتر (لە خێزانەکانی) لەگەڵ خزمەتکارێک (قاپێک) خواردنی نارد، ئەویش (ئەو خێزانەی کە لە ماڵی بوو) دای بە دەستی پێغەمبەردا ﷺو قاپەکە کەوتە سەر زەوی و شکا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستیکرد بە کۆکردنەوەی دوو لەتکە شکاوەکە و بە یەکی لکاندن، وە خەریک بوو خواردنەکەی کۆدەکردە ناوی و دەیفەرموو: دایکتان غیرەی کرد بخۆن، ئەوانیش خواردیان، هەتا ئەویش لەگەنە خواردنەکەی هێنا کە لە ماڵی ئەودا بوو، ئنجا لەگەنە ساغەکەی دایە ئەو کەسەی ناردبوویان (لەلای خێزانەکەی تریەوە)، لەگەنە شکاوەکەشی بۆ ئەوە دانا کە لە ماڵی ئەودا بوو (چونکە ئەویان هۆکاری شکاندنی لەگەنی ئەویتریان بوو).

## بابەت: دار خستنە سەر دیواری دراوسێ لە کاتی دارەڕێی خانوودا

**٢٣٣٥-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْأَعْرَجِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدَكُمْ جَارُهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً فِي جِدَارِهِ، فَلَا يَمْنَعْهُ» فَلَمَّا حَدَّثَهُمْ أَبُو هُرَيْرَةَ طَأْطَئُوا رُءُوسَهُمْ، فَلَمَّا رَآهُمْ، قَالَ: «مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ، وَاللَّهِ لَأَرْمِيَنَّ بِهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ»[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەعرەج ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕایەوە، فەرموویەتی: هەر کاتێک یەکێکتان مۆڵەتی خواست لە دراوسێکەی کە داری دارەڕێی خانووەکەی بخاتە سەر دیواری ئەو، با مۆڵەتی بدات و ڕێگری نەکات، جا کاتێک ئەبو هورەیرە ﷺ ئەو فەرموودەی بۆ گێڕانەوە سەریان دانەواند، ئەویش کە ئاوای بینین گوتی: چییە بۆ ئاوا پشت لە فەرموودەکە و بڕیارەکە دەکەن؟! سوێند بە خوا هەڵیدەدەمە سەر شانتان (واتە: لەسەرتان واجب دەکەم کە دەبێ ئیشی پێبکەن).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٦٣، ومسلم: ١٦٠٩، وأبو داود: ٣٦٣٤، والترمذي: ١٣٥٣.

**٢٣٣٦-** عَنْ عِكْرِمَةَ بْنَ سَلَمَةَ، أَنَّ أَخَوَيْنِ مِنْ بَلْمُغِيرَةِ أَعْتَقَ أَحَدُهُمَا أَنْ لَا يَغْرِزَ خَشَبًا فِي جِدَارِهِ، فَأَقْبَلَ مُجَمِّعُ بْنُ يَزِيدَ وَرِجَالٌ كَثِيرٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالُوا: نَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا يَمْنَعْ أَحَدُكُمْ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً فِي جِدَارِهِ» فَقَالَ: «يَا أَخِي إِنَّكَ مَقْضِيٌّ لَكَ عَلَيَّ، وَقَدْ حَلَفْتُ، فَاجْعَلْ أُسْطُوَانًا دُونَ حَائِطِي أَوْ جِدَارِي، فَاجْعَلْ عَلَيْهِ خَشَبَكَ»[١].

واتە: عیکریمەی کوڕی سەلەمە دەگێڕێتەوە، دوو برای لە هۆزی بەلموغیرە هەبوون، یەکێکیان سوێندی لەسەر ئازادکردنی کۆیلەکەی خوارد کە ناهێڵێ براکەی دار بخاتە سەر دیوارەکەی (واتە: سوێندی خوارد کە نەهێڵێ دار بخاتە سەر دیوارەکەی)، براکەشی ڕووی کردە موجەمیعی کوڕی یەزید و پیاوانێکی زۆر لە ئەنصار، ئەوانیش گوتیان: شایەدی دەدەین کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان دراوسێکەی قەدەغە نەکات لەوەی کە دار بخاتە سەر دیوارەکەی، ئنجا بە براکەی گوت: براکەم تۆ مافت بەسەرمەوەیە و هەق بە تۆ بوو، لە ڕاستیشدا من سوێندم خواردووە (بۆ ئەوەی سوێندەکەم نەکەوێت) کۆڵەکەیەک لە پاڵ دیوارەکەی من دابنێ و دارەڕێکەت بخە سەر ئەو.

**٢٣٣٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَمْنَعْ أَحَدُكُمْ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً عَلَى جِدَارِهِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان ڕێگری لە دراوسێکەی نەکات کە دار بخاتە سەر دیوارەکەی (لە کاتی دارەڕێکردنی خانووەکەیدا).

## بابەت: کێشە و دەمەقاڵێ لەسەر ئەندازەی ڕێگا

**٢٣٣٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اجْعَلُوا الطَّرِيقَ سَبْعَةَ أَذْرُعٍ»[٣].

واتە: ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕێگا شەقامەکانتان حەوت باڵ دابنێن.

---

(١) المرفوع حسن لغيره.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٧٣، ومسلم: ١٦١٣، وأبو داود: ٣٦٣٣، والترمذي: ١٣٥٥ و ١٣٥٦.

**٢٣٣٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اخْتَلَفْتُمْ فِي الطَّرِيقِ فَاجْعَلُوهُ سَبْعَةَ أَذْرُعٍ»[١].**

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لەسەر ئەندازەی ڕێگا کێشەتان لێ پەیدابوو، ئەندازەی ڕێگاکە حەوت باڵ دابنێن.**

## بابەت: کەسێک لە مافی خۆیدا خانوو دروست بکات، بەڵام زەرەری هەبێ بۆ دراوسێکەی

**٢٣٤٠- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَضَى أَنْ لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ»[٢].**

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری بەوە داوە کە: نە زەرەر بە کەس بگەیەنە و نە وەڵامی زەرەر بە زەرەر بدەوە.**

**٢٣٤١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ»[٣].**

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نە زەرەر بە کەس بگەیەنە و نە وەڵامی زەرەر بە زەرەر بدەوە.**

**٢٣٤٢- عَنْ أَبِي صِرْمَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ ضَارَّ أَضَرَّ اللَّهُ بِهِ، وَمَنْ شَاقَّ شَقَّ اللَّهُ عَلَيْهِ»[٤].**

**واتە: ئەبو صیرمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی زیان بگەیەنێ، خوا زیانی پێدەگەیەنێ، وە ئەو کەسەی باری سەر شانی کەسێکیتر قورس بکات، خوا کاروباری لەسەر قورس دەکات.**

---

**(١) صحيح.**

**(٢) صحيح لغيره.**

**(٣) صحيح لغيره.**

**(٤) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٦٣٥، والترمذي: ١٩٤٠.**

## بابەت: دوو کەس کە لەسەر کۆخ (خانوچکە) بکەونە کێشە

**٢٣٤٣-** عَنْ نِمْرَانَ بْنِ جَارِيَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ قَوْمًا اخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي خُصٍّ كَانَ بَيْنَهُمْ، فَبَعَثَ حُذَيْفَةَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ، فَقَضَى لِلَّذِينَ يَلِيهِمُ الْقِمْطُ، فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَهُ، فَقَالَ: «أَصَبْتَ وَأَحْسَنْتَ»[١].

واتە: نیمرانی کوڕی جاریيە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، خەڵکانێک لەسەر کۆخێک (خانوچکەیەک) لێیان بوو بە کێشەو هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ چارەسەری کێشەکەیان، پێغەمبەریش ﷺ حوزەیفەی نارد بۆ ئەوەی دادوەری بکات لە نێوانیاندا، جا کۆخەکەی دا بەو کەسەی کە خاوەنی ئەو پەتکە بوو کە شوڵ و پوشی سەربانی کۆخەکەی پێ بەسترابوو، جا کاتێک گەڕایەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەواڵەکەی پێ گەیاند، فەرمووی: بڕیارەکەت پێکاوەو بە باشی دادوەریت کردوە لە نێوانیاندا.

## بابەت: کەسێک کە تەسلیم کردن بە مەرج دابنێ

**٢٣٤٤-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «إِذَا بِيعَ الْبَيْعُ مِنْ رَجُلَيْنِ فَالْبَيْعُ لِلْأَوَّلِ» قَالَ أَبُو الْوَلِيدِ: «فِي هَذَا الْحَدِيثِ إِبْطَالُ الْخَلَاصِ»[٢].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شتێک بفرۆشرێتە دوو کەس، (خاوەن کاڵاکە، یان وەکیلەکەی) ئەوە شتە فرۆشراوەکە بۆ یەکەمیانە، ئەبو وەلید دەڵێ: لەو فەرموودەیەدا ئەوە دەردەکەوێ کە مەرجی تەسلیم کردن بۆ فرۆشیاری دووەم هەڵدەوەشێتەوە.

## بابەت: بڕیاردان بە تیر و پشک

**٢٣٤٥-** عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ «أَنَّ رَجُلًا كَانَ لَهُ سِتَّةُ مَمْلُوكِينَ، لَيْسَ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُمْ، فَأَعْتَقَهُمْ عِنْدَ مَوْتِهِ، فَجَزَّأَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَأَعْتَقَ اثْنَيْنِ، وَأَرَقَّ أَرْبَعَةً»[٣].

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٠٨٨، والترمذي: ١١١٠، والنسائي: ٤٦٨٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٦٨، وأبو داود: ٣٩٥٨ و ٣٩٥٩ و ٣٩٦١، والترمذي: ١٣٦٤، والنسائي: ١٩٥٨.

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک شەش بەندەی هەبوو، جگە لەو بەندانەش هیچ ماڵ و سامانی تری نەبوو، جا لە کاتی مردنیدا هەموویانی ئازاد کرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ دابەشی کردن و دوو دانەی لێ ئازاد کردن و چواری هێشتنەوە (واتە: تیروپشکی کرد لە نێوانیاندا، کە ئەوەش دەرکردنی وەسیەتە بە سێیەکی ماڵ).

**٢٣٤٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلَيْنِ تَدَارَءَا فِي بَيْعٍ لَيْسَ لِوَاحِدٍ مِنْهُمَا بَيِّنَةٌ، «فَأَمَرَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَسْتَهِمَا عَلَى الْيَمِينِ، أَحَبَّا ذَلِكَ أَمْ كَرِهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، دوو پیاو لە مامەڵەیەکدا کێشەیان لێ پەیدابوو، هیچ یەکێکیشیان شایەدی نەبوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن کە تیر و پشک بکەن لە نێوانیاندا بۆ سوێند خواردن، جا ئەوەیان پێ خۆش بێ، یان پێیان ناخۆش بێ.

**٢٣٤٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ إِذَا سَافَرَ أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێک گەشتی دەکرد، تیر و پشکی دەکرد لە نێوان خێزانەکانیدا (بۆ ئەوەی کامیان لەگەڵ خۆی ببات بۆ گەشتەکە).

**٢٣٤٨-** عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، قَالَ: أُتِيَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ وَهُوَ بِالْيَمَنِ، فِي ثَلَاثَةٍ قَدْ وَقَعُوا عَلَى امْرَأَةٍ فِي طُهْرٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلَ اثْنَيْنِ، فَقَالَ: «أَتُقِرَّانِ لِهَذَا بِالْوَلَدِ؟» فَقَالَا: لَا، ثُمَّ سَأَلَ اثْنَيْنِ، فَقَالَ: «أَتُقِرَّانِ لِهَذَا بِالْوَلَدِ؟» فَقَالَا: لَا، فَجَعَلَ كُلَّمَا سَأَلَ اثْنَيْنِ: «أَتُقِرَّانِ لِهَذَا بِالْوَلَدِ؟» قَالَا: لَا، «فَأَقْرَعَ بَيْنَهُمْ، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالَّذِي أَصَابَتْهُ الْقُرْعَةُ، وَجَعَلَ عَلَيْهِ ثُلُثَيِ الدِّيَةِ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ»[٣].

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: سێ کەس لە خەڵکی یەمەن هاتنە لای عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب کە هەرسێکیان لە یەک پاکیەتیدا چووبونە لای ئافرەتێک، ئنجا دوو دوو پرسیاری لێکردن، گوتی: ئایا ئێوە دان دەنێن بەوەدا کە ئەو منداڵە هی

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٢٣ و ٢١٦٧، ومسلم: ١٥٢٧، وأبو داود: ٣٤٩٣ و ٣٤٩٤ و ٣٤٩٨، والنسائي: ٤٦٠٥_٤٦٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٩٣، ومسلم: ٢٧٧٠ ضمن حديث طويل، والنسائي: ٣٩٤٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٧٠، والنسائي: ٣٤٨٨.

ئەویترتانە؟ گوتیان: نەخێر، ئنجا لە دووانی دیکەی پرسی: ئایا ئێوە دان دەنێن بەوەدا کە ئەو منداڵە هی ئەویترە؟ گوتیان: نەخێر، هەر جارێک لە دووانیانی دەپرسی کە ئایا دانی پێدا دەنێن کە منداڵەکە هی ئەویترە، ئەوان دەیانگوت: نەخێر، ئنجا تیر و پشکی لە نێوانیاندا کرد و منداڵەکەیدا بەو کەسەی کە تیروپشکەکەی بۆ دەرچوو، وە دوو سێیەکە خوێنی خستە سەر، ئنجا ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش ئەوەندە پێکەنی تا ددانەکانی پێشەوەی دەرکەوتن.

## بابەت: ڕەچەڵەکناسی (سەرناسی)

**٢٣٤٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ مَسْرُورًا وَهُوَ يَقُولُ: «يَا عَائِشَةُ أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزًا الْمُدْلِجِيَّ دَخَلَ عَلَيَّ فَرَأَى أُسَامَةَ، وَزَيْدًا، عَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ، قَدْ غَطَّيَا رُءُوسَهُمَا وَقَدْ بَدَتْ أَقْدَامُهُمَا، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ الْأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەکەم کە لەوکاتەدا دڵ خۆش بو و دەیفەرموو: ئەی عائیشە دەزانی موجەزیزی مودلەجی (کە سەر ناس و شێوە ناسێکی بەناوبانگ بوو) هات بۆلام، لەوکاتەدا ئوسامە و زەیدی بینین کە بەتانییەکیان بە سەرەوە بوو سەریانی داپۆشی بوو، لەوکاتەدا قاچەکانیان دەرکەوت، ئەویش گوتی: بەڕاستی ئەو قاچانە لە یەکترن (واتە: کوڕ و بابن).

**تێبینی:** بۆیە پێغەمبەر ﷺ دڵی خۆش بوو، چونکە مونافیقەکان تانەیان لە ڕەچەڵەکی ئوسامە دەدا، چونکە ئەو ڕەش بو و، زەیدیش سپی بوو، جا کاتێ ئەو شێوەناس و سەرناسە گوتی: کوڕ و باوکن، زۆر دڵخۆش بوو، چونکە گومانی ناو خەڵکی ڕەواندەوە، کە مونافیقەکان دروستیان کردبوو.

**٢٣٥٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، «أَنَّ قُرَيْشًا أَتَوُا امْرَأَةً كَاهِنَةً، فَقَالُوا لَهَا: أَخْبِرِينَا أَشْبَهَنَا أَثَرًا بِصَاحِبِ الْمَقَامِ، فَقَالَتْ: إِنْ أَنْتُمْ جَرَرْتُمْ كِسَاءً عَلَى هَذِهِ السَّهْلَةِ، ثُمَّ مَشَيْتُمْ عَلَيْهَا، أَنْبَأْتُكُمْ، قَالَ: فَجَرُّوا كِسَاءً، ثُمَّ مَشَى النَّاسُ عَلَيْهَا، فَأَبْصَرَتْ أَثَرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: هَذَا أَقْرَبُكُمْ إِلَيْهِ شَبَهًا، ثُمَّ مَكَثُوا بَعْدَ ذَلِكَ عِشْرِينَ سَنَةً، أَوْ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ بَعَثَ اللَّهُ مُحَمَّدًا ﷺ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: 3555، ومسلم: ١٤٥٩، وأبو داود: ٢٢٦٧، والترمذي: ٢١٢٩، والنسائي: ٣٤٩٣ و ٣٤٩٤.

(٢) منكر ضعيف.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، قوڕەیش هاتن بۆ لای ئافرەتێکی جادووگەر، جا پێیان گوت: پێمان بڵێ کاممان زیاتر بەو کەسە دەچین کە خاوەنی ئەم شوێنەوارەیە (مەبەستیان جێ پێیەکانی پێغەمبەر ئیبراهیم بوو ﷺ)، گوتی: ئەگەر عەبایەکتان بەسەر ئەو خۆڵەدا ڕاخستبایە، پاشان بەسەریدا ڕۆیشتبان، پێم دەگوتن، ڕاوی گوتی: جا عەبایەکەیان ڕاخست، پاشان خەڵکەکە بەسەریدا ڕۆیشتن، ئنجا ئافرەتەکە شوێن پێی پێغەمبەری خوای ﷺ بینی و گوتی: ئا ئەوە لە وێچوونەکەی لە هەمووان نزیکترە، لە دوای ئەوە بیست ساڵ مانەوە، یان ئەوەندەی کە خوا بیەوێ، پاشان خوا موحەممەدی ﷺ بە پێغەمبەر نارد.

### بابەت: سەرپشک کردنی منداڵ لە نێوان دایک و باوکیدا

**٢٣٥١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، خَيَّرَ غُلَامًا بَيْنَ أَبِيهِ وَأُمِّهِ، وَقَالَ: «يَا غُلَامُ هَذِهِ أُمُّكَ وَهَذَا أَبُوكَ»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ گەنجێکی سەرپشک کرد لە نێوان دایک و باوکی کامیان هەڵبژێرێ، فەرمووی: ئەی منداڵ ئەوە دایکتە و ئەوەش باوکتە (واتە: کامیانت پێ خۆشە ئەو هەڵبژێرە).

**٢٣٥٢-** عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ سَلَمَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ أَبَوَيْهِ اخْتَصَمَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، أَحَدُهُمَا كَافِرٌ وَالْآخَرُ مُسْلِمٌ، فَخَيَّرَهُ فَتَوَجَّهَ إِلَى الْكَافِرِ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اهْدِهِ» فَتَوَجَّهَ إِلَى الْمُسْلِمِ، فَقَضَى لَهُ بِهِ[٢].

واتە: عەبدولحەمیدی کوڕی سەلەمە ﷺ لە باوکییەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە: کە دایک و باوکی لێیان بوو بە کێشە لای پێغەمبەر ﷺ کە یەکێکیان کافر بوو ئەوی تریشیان مسوڵمان بوو، ئنجا سەرپشکی کرد، ئنجا منداڵەکە ڕووی کردە کافرەکە و (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: خوایە ڕێگای ڕاستی نیشان بدەی، ئنجا ڕووی کردە مسوڵمانەکە و ئیتر (پێغەمبەر ﷺ) بڕیارەکەی بۆ ئەویان دا (منداڵەکەی دا بە ئەو).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٧٧ مطولًا، والترمذي: ١٣٥٧، والنسائي: ٣٤٩٦.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٢٤٤، والنسائي: ٣٤٩٥.

## بابەت: ئاشتەوایی و ڕێککەوتن

**٢٣٥٣-** عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الصُّلْحُ جَائِزٌ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ، إِلَّا صُلْحًا حَرَّمَ حَلَالًا، أَوْ أَحَلَّ حَرَامًا»[١].

واتە: کەسیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عەوف لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئاشتەوایی و ڕێککەوتن ڕێپێدراوە لە نێوان مسوڵمانان‌دا، جگە لەو ڕێککەوتنە نەبێ کە حەڵاڵێک حەڕام بکات، یان حەڕامێک حەڵاڵ بکات.

## بابەت: ڕێگری کردنی کەسێک کە زیان بە ماڵەکەی خۆی دەگەیەنێ

**٢٣٥٤-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا كَانَ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي عُقْدَتِهِ ضَعْفٌ، وَكَانَ يُبَايِعُ، وَأَنَّ أَهْلَهُ أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ احْجُرْ عَلَيْهِ، فَدَعَاهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَنَهَاهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لَا أَصْبِرُ عَنِ الْبَيْعِ، فَقَالَ: «إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ: هَا، وَلَا خِلَابَةَ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بیرو زار کۆڵ بو و، مامەڵەشی دەکرد، خزمەکانی هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەکردنی لێ قەدەغە بکە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ بانگی کرد و مامەڵەکردنی لێ قەدەغە کرد، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئارام ناگرم ئەگەر مامەڵە نەکەم، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: هەرکات کڕین و فرۆشتنت کرد بڵێ: ها (دەست بە دەست)، وە (بڵێ) بەبێ فرت و فێڵ (بۆ ئەوەی ئەگەر فێڵی تێدا بوو دەرفەتی پەشیمان بوونەوەی هەبێ).

**٢٣٥٥-** عَنْ مُنْقِذ بْن عَمْرٍو وَكَانَ رَجُلًا قَدْ أَصَابَتْهُ آمَّةٌ فِي رَأْسِهِ فَكَسَرَتْ لِسَانَهُ، وَكَانَ لَا يَدَعُ عَلَى ذَلِكَ التِّجَارَةَ، وَكَانَ لَا يَزَالُ يُغْبَنُ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ لَهُ: «إِذَا أَنْتَ بَايَعْتَ، فَقُلْ: لَا خِلَابَةَ، ثُمَّ أَنْتَ فِي كُلِّ سِلْعَةٍ ابْتَعْتَهَا بِالْخِيَارِ ثَلَاثَ لَيَالٍ، فَإِنْ رَضِيتَ فَأَمْسِكْ، وَإِنْ سَخِطْتَ فَارْدُدْهَا عَلَى صَاحِبِهَا»[٣].

---

(١) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١٣٥٢.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٠١، والترمذي: ١٢٥٠، والنسائي: ٤٤٨٥.

(٣) حسن.

واتە: لە مونقیزی کوڕی عەمرِ دەگێڕنەوە، پیاوێک بوو شتێک بەر سەری کەوتبوو، زمانی شکابوو، بەو حاڵەش وازی لە مامەڵە و بازرگانی نەدەهێنا، بەردەوامیش فێڵی لێدەکرا، ئنجا هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئەو حاڵەی خۆی بۆ باسکرد، (پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرموو: هەر کاتێک مامەڵەت کرد بڵێ: فێڵم لێ مەکە، پاشان تۆ هەر شتێک بکڕی هەتاکو سێ ڕۆژ مۆڵەتی پەشیمان بوونەوەت هەیە، جا ئەگەر (پاشی ئەو سێ ڕۆژە) بە مامەڵەکە ڕازی بووی ئەوە مامەڵەکە بکە و شتەکە وەرگرە، خۆ ئەگەر بە دڵت نەبوو، شتەکە بگێڕەوە بۆ خاوەنەکەی (پارەی خۆت وەرگرەوە).

## بابەت: مایەپووچ بوونی کەسی نەبوو،
## فرۆشتنی کەل و پەلەکانی بۆ خاوەن قەرزەکان

**٢٣٥٦-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا، فَكَثُرَ دَيْنُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ»، فَتَصَدَّقَ النَّاسُ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ، وَلَيْسَ لَكُمْ إِلَّا ذَلِكَ»، يَعْنِي الْغُرَمَاءَ[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوێک بەر وبووم و میوەی کڕی و تووشی زەرەو زیات بوو، قەرزەکانی لەسەر زۆر بوون، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خێر و زەکاتی پێبدەن، خەڵکەکەش خێر و زەکاتیان پێدا و نەگەیشتە ئەندازەی قەرزەکانی، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە خاوەن قەرزەکانی فەرموو: ئەوەی لەبەر دەستیدایە لێی وەربگرن، جگە لەوە (لەوکاتەدا) هیچی دیکەتان ناکەوێ.

**٢٣٥٧-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، خَلَعَ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ مِنْ غُرَمَائِهِ، ثُمَّ اسْتَعْمَلَهُ عَلَى الْيَمَنِ» فَقَالَ مُعَاذٌ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اسْتَخْلَصَنِي بِمَالِي، ثُمَّ اسْتَعْمَلَنِي[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ موعازی کوڕی جەبەلی لە قەرزارەکانی ڕزگار کرد، پاشان کردیە کاربەدەست بەسەر یەمەنەوە، بۆیە موعاز گوتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ بە ماڵ و سامانەکەی خۆم لە قەرزداری ڕزگاری کردم، پاشان منی کردە کاربەدەست.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٥٦، وأبو داود: ٣٤٦٩، والترمذي: ٦٥٥، والنسائي: ٤٥٣٠ و ٤٦٧٨.

(٢) ضعيف.

## بابەت: کەسێک کەل و پەلی خۆی لەلای پیاوێکی مایە پووچ ببینێتەوە

**٢٣٥٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ وَجَدَ مَتَاعَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ رَجُلٍ قَدْ أَفْلَسَ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ مِنْ غَيْرِهِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کەل و پەلی لە لای کەسێکی مایە پووچ دەستکەوتەوە (کە پێی فرۆشتبوو، بەڵام پارەکەی وەرنەگرتبوو)، ئەو کەسە لە هەموو خاوەن قەرزەکانی دیکە لە پێشترە بۆ ئەوەی کەل و پەلەکەی خۆی هەڵگرێتەوە (لە بری قەرزەکە).

**٢٣٥٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «أَيُّمَا رَجُلٍ بَاعَ سِلْعَةً، فَأَدْرَكَ سِلْعَتَهُ بِعَيْنِهَا عِنْدَ رَجُلٍ، وَقَدْ أَفْلَسَ، وَلَمْ يَكُنْ قَبَضَ مِنْ ثَمَنِهَا شَيْئًا، فَهِيَ لَهُ، وَإِنْ كَانَ قَبَضَ مِنْ ثَمَنِهَا شَيْئًا، فَهُوَ أُسْوَةُ الْغُرَمَاءِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێک شتومەکی فرۆشت و خودی شتومەکەکەی خۆی بە دەست کەوتەوە لەلای ئەو کەسەی کە پێی فرۆشتووە و مایە پووچ بووە، وە پارەکەشی هیچ وەرنەگرتبوو، شتومەکەکە هی ئەوە (بۆ خاوەن قەرزەکانی دیکە نیە)، ئەگەر کەمێکیش پارەی وەرگرتبوو، وەک خاوەن قەرزەکانی دیکە یەکسانە لەو شتومەکە (و تەنها مافی ئەو نیە).

**٢٣٦٠-** عَنِ ابْنِ خَلْدَةَ الزُّرَقِيِّ ﷺ، وَكَانَ قَاضِيًا بِالْمَدِينَةِ، قَالَ: جِئْنَا أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ فِي صَاحِبٍ لَنَا قَدْ أَفْلَسَ، فَقَالَ: هَذَا الَّذِي قَضَى فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ «أَيُّمَا رَجُلٍ مَاتَ أَوْ أَفْلَسَ، فَصَاحِبُ الْمَتَاعِ أَحَقُّ بِمَتَاعِهِ إِذَا وَجَدَهُ بِعَيْنِهِ»[3].

واتە: ئیبنو خەلدەی زورەقیی کە دادوەر بووە لە مەدینە دەڵێ: چووین بۆ لای ئەبو هورەیرە ﷺ دەربارەی (کێشەی) هاوڕێیەکمان کە مایە پووچ ببوو، ئەویش گوتی:

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٠٢، ومسلم: ١٥٥٩، وأبو داود: ٣٥١٩_٣٥٢٢، والترمذي: ١٢٦٢، والنسائي: ٤٦٧٦ و ٤٦٧٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٠٢، ومسلم: ١٥٥٩، وأبو داود: ٣٥١٩_٣٥٢٢، والترمذي: ١٢٦٢، والنسائي: ٤٦٧٦ و ٤٦٧٧.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٥٢٣.

ئەوەی پێتان دەڵێم ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری لەسەر داوە: هەر پیاوێک بمرێ، یان مایە پووچ بێ، خاوەنی شتومەکەکە لە پێشترە بۆ شتومەکەکەی خۆی (هەڵیبگرێتەوە)، مادام خودی کەل و پەلەکە مابێ.

**٢٣٦١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا امْرِئٍ مَاتَ وَعِنْدَهُ مَالُ امْرِئٍ بِعَيْنِهِ، اقْتَضَى مِنْهُ شَيْئًا، أَوْ لَمْ يَقْتَضِ، فَهُوَ أُسْوَةُ الْغُرَمَاءِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک مرد و شتومەکی کەسێکی لەلا بوو وەکو خۆی، جا هیچ لە نرخەکەی پێ دابێ، یان پێی نەدابێ، وەکوخاوەن قەرزەکانی دیکە وایە و یەکسانە بۆ ئەو شتومەکە.

## بابەت: ناپەسندی شایەدی دانی کەسێک پێش ئەوەی داوای شایەدی دانی لێ بکرێ

**٢٣٦٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ تَبْدُرُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە باشترینی خەڵکی کێن؟ فەرمووی: ئەوانەی ڕۆژگاری منن، پاشان ئەوانەی دوای ئەو دێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەو دێن، پاشان خەڵکانێک دێن کە شایەدی دانیان پێش سوێند خواردن دەکەوێ و، سوێند خواردنیان پێش شایەدی دانیان دەکەوێ (واتە: شایەدی دانی بە درۆ زۆر دەبێ و خەڵکی گوێ بە شایەدی و سوێند خواردن نادەن و بە شتێکی ئاسایی دەزانن).

**٢٣٦٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: خَطَبَنَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ بِالْجَابِيَةِ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ فِينَا مِثْلَ مُقَامِي فِيكُمْ، فَقَالَ: «احْفَظُونِي فِي أَصْحَابِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَفْشُو الْكَذِبُ حَتَّى يَشْهَدَ الرَّجُلُ وَمَا يُسْتَشْهَدُ، وَيَحْلِفَ وَمَا يُسْتَحْلَفُ»[3].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٥٢، ومسلم: ٢٥٣٣، والترمذي: ٣٨٥٩.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٦٥ عن ابن عمر.

واتە: جابیری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب لە جابیە وتاری بۆ داین و گوتی: لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان لەناومان هەستا وەکو چۆن من ئاوا لەنێو ئێوەدا هەستاوم و ئنجا فەرمووی: هەبوونی من لەناو هاوەڵاندا لە بەرچاو بگرن (واتە: بوونی من لەناو ئەواندا بە خێر و بێر بزانن و ڕێزی ئەو هەبوونەی من لەناویاندا بزانن و بە ڕێزەوە تەماشایان بکەن)، پاشان ئەو جیلەی دوای ئەوان، پاشان ئەو جیلەی دواتر، پاشان درۆ زۆر بڵاو دەبێتەوە و باوی دەبێ، بە جۆرێک کە پیاو هەیە شایەدی دەدات لەکاتێکدا داوای شایەدی لێ ناکرێ، وە سوێند دەخوا لەکاتێکدا داوای سوێند خواردنی لێ ناکرێ.

## بابەت: پیاوێک کە شایەدییەکی لەلایە و هاوەڵەکەی نایزانێ

٢٣٦٤- عَنْ عَبْد الرَّحْمَنِ بْن أَبِي عَمْرَةَ الْأَنْصَارِيُّ، أَنَّهُ سَمِعَ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الْجُهَنِيَّ ﷺ، يَقُولُ: إِنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «خَيْرُ الشُّهُودِ، مَنْ أَدَّى شَهَادَتَهُ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا»[1].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو عەمرەی ئەنصاریی دەگێڕێتەوە، گوێی لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ بووە کە دەیگوت: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: باشترینی شایەدەکان ئەو کەسەیە کە شایەدییەکەی بدات پێش ئەوەی داوای لێ بکرێ.

## بابەت: شایەدی گرتن لەسەر قەرز

٢٣٦٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: «تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ ﴾ البقرة، حَتَّى بَلَغَ ﴿ فَإِنۡ أَمِنَ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا ﴿٢٨٣﴾ ﴾ البقرة، فَقَالَ: هَذِهِ نَسَخَتْ مَا قَبْلَهَا»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ ﴾ البقرة، واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە (بە خوا) لە خوا بترسن وە دەست هەڵگرن لەو

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧١٩، وأبو داود: ٣٥٩٦، والترمذي: ٢٢٩٥.

(٢) حسن.




سودەی کە لای خەڵک ماوتانە ئەگەر ئێوە بڕوادارن، هەتا گەیشتە: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا ﴿٢٨٣﴾﴾ البقرة، واتە: جا ئەگەر هەندێکتان لە هەندێکتان دڵنیا بوون، ئنجا گوتی: ئەو ئایەتە، ئایەتەکەی پێش خۆی نەسخ کردۆتەوە.

## بابەت: ئەو کەسەی شایەدی دروست نیە

**٢٣٦٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَجُوزُ شَهَادَةُ خَائِنٍ، وَلَا خَائِنَةٍ، وَلَا مَحْدُودٍ فِي الْإِسْلَامِ، وَلَا ذِي غِمْرٍ عَلَى أَخِيهِ»[١].

واتە: عەمڕی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی ناپاک پیاو بێ، یان ئافرەت شایەدی لێ وەرناگیرێ، وە ئەو کەسەش کە سزایەک لە سزا شەرعیەکانی لێ دەرکرابێ، شایەدی لێ وەرناگیرێ، وە کەسێکیش کە ڕق و قینی لە دڵدا بێ بەرانبەر برای مسوڵمانی (ئەویش شایەدی وەرناگیرێ).

**٢٣٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «لَا تَجُوزُ شَهَادَةُ بَدَوِيٍّ عَلَى صَاحِبِ قَرْيَةٍ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: شایەدی دانی کۆچەری لەسەر خەڵکی دێهات و شارییەکان وەرناگیرێ (چونکە کاتی خۆی کۆچەرییەکان یاساو ڕێسای شایەدی دانیان نەزانیوە).

## بابەت: حوکم کردن بە شایەد و سوێند خواردن

**٢٣٦٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَضَى بِالْيَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە سوێند خواردن لەگەڵ شایەدێک بڕیاری داوە.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٦٠١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٠٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦١٠، والترمذي: ١٣٤٣ وذكر حديث سعد بن عبادة.




**٢٣٦٩-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَضَى بِالْيَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ»[١].

**واتە:** جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە سوێند خواردن لەگەڵ شایەدێک بڕیاری داوە.

**٢٣٧٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِالشَّاهِدِ وَالْيَمِينِ»[٢].

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە شایەدێک و سوێند خواردن بڕیاری داوە.

**٢٣٧١-** عَنْ سُرَّقٍ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، أَجَازَ شَهَادَةَ الرَّجُلِ، وَيَمِينَ الطَّالِبِ»[٣].

**واتە:** سووڕەق ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ ڕێگای داوە بە شایەدی پیاو لەگەڵ سوێندی داواکار.

## بابەت: شایەدی دانی بە درۆ

**٢٣٧٢-** عَنْ خُرَيْمِ بْنِ فَاتِكٍ الْأَسَدِيِّ ﷺ، قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الصُّبْحَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَامَ قَائِمًا، فَقَالَ: «عُدِلَتْ شَهَادَةُ الزُّورِ بِالْإِشْرَاكِ بِاللَّهِ» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ ﴿وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ﴿٣١﴾﴾ الحج[٤].

**واتە:** خوڕەیمی کوڕی فاتیکی ئەسەدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی کردو کاتێک لە نوێژ تەواو بوو، هەڵسایە سەر پێ و سێ جار فەرمووی: شایەدی دانی بە درۆ بەرانبەر کراوە بە هاوبەشی دانان بۆ خوا، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ﴿٣١﴾﴾ الحج، واتە: هەروەها خۆتان بپارێزن لەقسەی درۆو ناڕەوا ﴿٣٠﴾ گەردن کەچ بن بۆ خوا (خۆتان لە هەموو بیرو باوەڕێکی لار دووربگرن) هاوبەش بڕیاردەر مەبن بۆ خوا ﴿٣١﴾.

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٣٤٤.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧١٢، وأبو داود: ٣٦٠٨.

(٣) صحيح بما قبله.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٩٩، والترمذي: ٢٢٩٩.

**٢٣٧٣-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَنْ تَزُولَ قَدَمُ شَاهِدِ الزُّورِ حَتَّى يُوجِبَ اللَّهُ لَهُ النَّارَ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو پێی شایەدی درۆزن لە شوێنی خۆی ناجوڵێ (لە قیامەت) تاکو خوا ئاگری دۆزەخی بۆ پێویست دەکات.

## بابەت: شایەدی دانی خاوەن کتێبیی ئاسمانی لەسەر یەکتری

**٢٣٧٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَجَازَ شَهَادَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ بَعْضِهِمْ عَلَى بَعْضٍ»(٢).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای داوە بە شایەدی دانی خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان لەسەر یەکتری.



---

(١) موضوع.

(٢) ضعيف.

## بابەت: پیاو شتێک وەک دیاری دەدات بە منداڵەکەی

٢٣٧٥- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، قَالَ: انْطَلَقَ بِهِ أَبُوهُ يَحْمِلُهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: اشْهَدْ أَنِّي قَدْ نَحَلْتُ النُّعْمَانَ مِنْ مَالِي كَذَا وَكَذَا، قَالَ: «فَكُلَّ بَنِيكَ نَحَلْتَ مِثْلَ الَّذِي نَحَلْتَ النُّعْمَانَ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «فَأَشْهِدْ عَلَى هَذَا غَيْرِي» قَالَ: «أَلَيْسَ يَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا لَكَ فِي الْبِرِّ سَوَاءً؟» قَالَ: بَلَى، قَالَ: «فَلَا، إِذًا»(١).

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێ: باوکی هەڵی گرتووە و بردوویەتی بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا گوتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) شایەد بە کە من لە سەروەت و سامانی خۆم ئەوە و ئەوەم بەخشی بە نوعمان، فەرمووی: ئایا بە هەمان شێوە بەشی کوڕەکانی تریشت داوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: کەواتە کەسێکی تر بکە بە شایەد لەسەری، وە فەرمووی: ئایا پێت خۆش نیە هەموویان لە چاکەکردن و بەزەییدا بەرانبەرت یەکسان بن؟! گوتی: بەڵێ، بێگومان پێم خۆشە، فەرمووی: کەواتە جیاوازییان پێ مەکە.

٢٣٧٦- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ نَحَلَهُ غُلَامًا، وَأَنَّهُ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يُشْهِدُهُ، فَقَالَ: «أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَهُ؟» قَالَ: لَا، قَالَ: «فَارْدُدْهُ»(٢).

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە، باوکی خزمەتکارێکی پێ بەخشی، ئنجا (باوکی) هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی لەسەر ئەوە شایەدی بۆ بدا، جا فەرمووی: ئایا بە هەمان شێوە بە هەموو منداڵەکانت بەخشیوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: کەواتە بیگێڕەوە (لێی وەرگرەوە).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٨٦، ومسلم: ١١٦٢٣، وأبو داود: ٣٥٤٢_٣٥٤٤، والترمذي: ١٣٦٧، والنسائي: ٣٦٧٢_٣٦٨٣ و ٣٦٨٥_٣٦٨٧ و ٥٧٥٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٨٦، ومسلم: ١١٦٢٣، وأبو داود: ٣٥٤٢_٣٥٤٤، والترمذي: ١٣٦٧، والنسائي: ٣٦٧٢_٣٦٨٣ و ٣٦٨٥_٣٦٨٧ و ٥٧٥٨.

## بابەت: ئەو کەسەی شتێک بە منداڵەکەی دەبەخشێ و پاشان پەشیمان دەبێتەوە

**٢٣٧٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَابْنِ عُمَرَ ﭭ، يَرْفَعَانِ الْحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ أَنْ يُعْطِيَ الْعَطِيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعَ فِيهَا، إِلَّا الْوَالِدَ فِيمَا يُعْطِي وَلَدَهُ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس و ئیبنو عومەر ﭭ دەگێڕنەوەو فەرموودەکە بەرز دەکەنەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ڕەوا نیە بۆ هیچ کەسێک کە شتێک ببەخشێ و پاشان لێی پەشیمان ببێتەوە، تەنها باوک نەبێ لەوەدا کە بە منداڵەکەی دەبەخشێ (چونکە خۆیشی هەر موڵکی باوکییەتی).

**٢٣٧٨-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﭬ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا يَرْجِعْ أَحَدُكُمْ فِي هِبَتِهِ، إِلَّا الْوَالِدَ مِنْ وَلَدِهِ»[٢].

واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﭬ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان پەشیمان نەبێتەوە لە بەخشینەکەی، جگە لە باوک منداڵەکەی.

## بابەت: بەخشین بە درێژایی تەمەن

**٢٣٧٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا عُمْرَى، فَمَنْ أُعْمِرَ شَيْئًا فَهُوَ لَهُ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﭬ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەخشین بە درێژایی تەمەن نیە (دروست نیە)، خۆ ئەگەر کەسێک بە درێژایی تەمەن شتێکی پێ بەخشرا، ئەوا ئەو شتە بۆ خۆیەتی (واتە: دەبێتە موڵکی خۆی و لەدوای مردنیشی بۆ میراتگرەکانیەتی).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٣٩، والترمذي: ١٢٩٩ و ٢١٣٢، والنسائي: ٣٦٩٠ و ٣٧٠٣.

(٢) حسن صحيح. أخرجه النسائي: ٣٦٨٩.

(٣) حسن صحيح. أخرجه النسائي: ٣٧٥٢ و ٣٧٥٣. وانظر البخاري: ٢٦٢٦، ومسلم: ١٦٢٦.

٢٣٨٠- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ أَعْمَرَ رَجُلًا عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ، فَقَدْ قَطَعَ قَوْلُهُ حَقَّهُ فِيهَا، فَهِيَ لِمَنْ أُعْمِرَ وَلِعَقِبِهِ»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک شتێک ببەخشێ بە کەسێکی تر بە درێژایی تەمەن، دەبێتە موڵکی ئەو کەسە کە پێی بەخشراوە، لە دوای خۆی بۆ میراتگرەکانیەتی، بەڕاستی کەسی بەخشەر بەو قسەیەی کە دەیکات هیچ مافێکی لەو شتەدا نامێنێ، وە ئەو شتە دەبێتە موڵکی پێ بەخشراوەکە و لە دوای خۆی دەبێتە موڵکی میراتگرەکانی پێ بەخشراوەکە.

٢٣٨١- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، جَعَلَ الْعُمْرَى لِلْوَارِثِ»[٢].

واتە: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەو شتەی کە بە درێژایی تەمەن بەخشراوە داویەتی بە میراتگر (واتە: میراتگری کەسی پێ بەخشراو).

## بابەت: بەخشین بە چاوەڕوانی

٢٣٨٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا رُقْبَى، فَمَنْ أُرْقِبَ شَيْئًا فَهُوَ لَهُ، حَيَاتَهُ وَمَمَاتَهُ» قَالَ: «وَالرُّقْبَى: أَنْ يَقُولَ هُوَ لِلْآخَرِ: مِنِّي وَمِنْكَ مَوْتًا»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەخشین بە چاوەڕوانی نیە (دروست نیە)، جا بۆیە هەر کەس شتێکی بە چاوەڕوانی پێ بەخشرا، دەبێتە موڵکی ئەو لە ژیانیدا و لە دوای مردنیشی (واتە: بۆ میراتگرەکانیەتی). (ڕاوی) دەڵێ: بەخشین بە چاوەڕوانی ئەوەیە کە یەکێک بە یەکێک بڵێ: مردن لە نێوانی من و تۆدایە (واتە: ئەگەر من مردم با بۆ تۆ بێ، وە ئەگەر تۆ مردی با هەر بۆ خۆم بێ).

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٢٥، ومسلم: ١٦٢٥، وأبو داود: ٣٥٥٠_٣٥٥٤، والترمذي: ١٣٥٠، والنسائي: ٣٧٣٥_٣٧٣٧ و ٣٧٤٠_٣٧٤٢ و ٣٧٤٤ و ٣٧٤٩ بنحوه.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٥٩ بنحوه، والنسائي: ٣٧١٥_٣٧١٦ و ٣٧١٨_٣٧١٩ و ٣٧٢١_٣٧٢٢.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٧٣٢_٣٧٣٤.

٢٣٨٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعُمْرَى جَائِزَةٌ لِمَنْ أُعْمِرَهَا، وَالرُّقْبَى جَائِزَةٌ لِمَنْ أُرْقِبَهَا»[1].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەخشین بە درێژایی تەمەن دەبێتە دیاری بۆ ئەو کەسەی کە پێی بەخشراوە، هەروەها بەخشین بە چاوەڕوانی دەبێتە دیاری بۆ ئەو کەسەی کە پێی بەخشراوە.

## بابەت: پەشیمان بوونەوە لە دیاری بەخشین

٢٣٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مَثَلَ الَّذِي يَعُودُ فِي عَطِيَّتِهِ، كَمَثَلِ الْكَلْبِ أَكَلَ، حَتَّى إِذَا شَبِعَ قَاءَ، ثُمَّ عَادَ فِي قَيْئِهِ، فَأَكَلَهُ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی نمونەی ئەو کەسەی کە لە بەخشینەکەی پەشیمان دەبێتەوە، وەکو نمونەی ئەو سەگە وایە کە دەخوات تاکو تێر دەبێ و دەڕشێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی و دەیخواتەوە.

٢٣٨٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ، كَالْعَائِدِ فِي قَيْئِهِ»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان دەبێتەوە، وەکو ئەو کەسە وایە کە دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەی خۆی (واتە: ڕشانەوەی خۆی دەخواتەوە).

٢٣٨٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ»[4].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٥٨، والترمذي: ١٣٥١، والنسائي: ٣٧٣٩ واقتصر البخاري: ٢٦٢٦، ومسلم: ١٦٢٥، والنسائي: ٣٧٢٧ و ٣٧٢٩ و ٣٧٥٥ علي الشطر الأول من الحديث.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٨٩، ومسلم: ١٦٢٢، وأبو داود: ٣٥٣٨، والترمذي: ١٢٩٨، والنسائي: ٣٦٩٠ و ٣٦٩١ و ٣٦٩٦_٣٧٠٣ و ٣٧١٠.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٣١.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی لە بەخشینەکەی پەشیمان دەبێتەوە، وەکو ئەو سەگە وایە کە دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی.

## بابەت: ئەو کەسەی کە شتێک دەبەخشێ و چاوەڕێی پاداشتە

**٢٣٨٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الرَّجُلُ أَحَقُّ بِهِبَتِهِ مَا لَمْ يُثَبْ مِنْهَا»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شتێک ببەخشێ هەر ئەو زیاتر مافی لە بەخشراوەکەدا هەیە، مادام پاداشتی نەدرێتەوە، بۆی هەیە بیگێڕێتەوە بۆ خۆی.

## بابەت: بەخشینی ئافرەت بەبێ مۆڵەتدانی هاوسەرەکەی

**٢٣٨٨-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ فِي خُطْبَةٍ خَطَبَهَا: «لَا يَجُوزُ لِامْرَأَةٍ فِي مَالِهَا، إِلَّا بِإِذْنِ زَوْجِهَا، إِذَا هُوَ مَلَكَ عِصْمَتَهَا»[٢].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە وتارێکدا کاتێ وتاری دەفەرموو، فەرموویەتی: هیچ ئافرەتێک بۆی نیە لە ماڵەکەی ببەخشێ بەبێ مۆڵەتی هاوسەرەکەی (واتە: لەوەی لەژێر دەستی ئەو دایە لە ماڵی مێردەکەی، مەگەر بە ڕەزامەندی مێردەکەی بێ)، ئەگەر پیاوەکەی خاوەنی پەیوەندی ژن و مێردایەتی بێ.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٤٦، والنسائي: ٣٧٥٦.

**٢٣٨٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَحْيَى ﷺ، رَجُلٌ مِنْ وَلَدِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ جَدَّتَهُ خَيْرَةَ، امْرَأَةَ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِحُلِيٍّ لَهَا، فَقَالَتْ: إِنِّي تَصَدَّقْتُ بِهَذَا، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَجُوزُ لِلْمَرْأَةِ فِي مَالِهَا إِلَّا بِإِذْنِ زَوْجِهَا، فَهَلِ اسْتَأْذَنْتِ كَعْبًا؟» قَالَتْ: نَعَمْ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ، فَقَالَ: «هَلْ أَذِنْتَ لِخَيْرَةَ أَنْ تَتَصَدَّقَ بِحُلِيِّهَا؟» فَقَالَ: نَعَمْ، فَقَبِلَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْهَا[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی یەحیا کە پیاوێکە لە نەوەکانی کەعبی کوڕی مالیکە، لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە خەیرەی داپیرەی کە خێزانی کەعبی کوڕی مالیک بووە، بە خشڵەکەیەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا گوتی: لە ڕاستیدا ئەوەم کردوە بە خێر و صەدەقە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئافرەت بۆی نیە لە ماڵەکەی ببەخشێ بە بێ مۆڵەتی هاوسەرەکەی، ئایا پرست بە کەعب کردوە؟ گوتی: بەڵێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە دوای کەعبی کوڕی مالیکدا و پێی فەرموو: ئایا مۆڵەتی خەیرەت داوە کە خشڵەکەی بکاتە خێر و صەدەقە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، ئەوجار پێغەمبەری خوا ﷺ لێی قبووڵ کردو لێی وەرگرت.

* * *

---

(١) صحيح لغيره.



# پەرتووکی

# خێرکردن



---

كِتَابُ الصَّدَقَاتِ.

## بابەت: پەشیمان بوونەوە لە خێرکردن

**٢٣٩٠-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ»(١).

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە بەخشینەکەتدا پاشگەز مەبەوە.

**٢٣٩١-** عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْعَبَّاسِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الَّذِي يَتَصَدَّقُ، ثُمَّ يَرْجِعُ فِي صَدَقَتِهِ، مَثَلُ الْكَلْبِ يَقِيءُ، ثُمَّ يَرْجِعُ فَيَأْكُلُ قَيْئَهُ»(٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نموونەی ئەو کەسەی کە دەبەخشێت و دواتر پاشگەز دەبێتەوە لە بەخشینەکەی، وەکو ئەو سەگە وایە کە دەڕشێتەوە، دواتر دەگەڕێتەوە و ڕشانەوەکەی خۆی دەخوات.

## بابەت: ئەو کەسەی کە شتێک دەکاتە خێر، پاشان دەبینێ ئەو شتە دەفرۆشرێتەوە، ئایا دەتوانێ بیکڕێتەوە

**٢٣٩٢-** عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، يَعْنِي عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ تَصَدَّقَ بِفَرَسٍ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَبْصَرَ صَاحِبَهَا يَبِيعُهَا بِكَسْرٍ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «لَا تَبْتَعْ صَدَقَتَكَ»(٣).

واتە: عومەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر واتە لە باوکییەوە لە عومەری باپیرەیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەسپێکی بەخشی، دواتر بینی کە خاوەنی ئەسپەکە بە نرخێکی کەم دەیفرۆشێتەوە، بۆیە (عومەر ﷺ) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، دەربارەی ئەوە پرسیاری لێکرد، ئەویش فەرمووی: بەخشینەکەی خۆت مەکڕەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٣٦ و ١٦٢١، وأبو داود: ١٥٩٣، والترمذي: ٦٦٨، والنسائي: ٢٦١٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٨٩، ومسلم: ١٦٢٢، وأبو داود: ٣٥٣٨، والترمذي: ١٢٩٨، والنسائي: ٣٦٩٠ و ٣٦٩١ و ٣٦٩٦_٣٧٠٣ و ٣٧١٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٣٦، ومسلم: ١٦٢١، والنسائي: ١٦١٥.

**٢٣٩٣-** عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ﷺ، «أَنَّهُ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ يُقَالُ لَهُ غَمْرٌ أَوْ غَمْرَةٌ، فَرَأَى مُهْرًا، أَوْ مُهْرَةً مِنْ أَفْلَائِهَا يُبَاعُ، يُنْسَبُ إِلَى فَرَسِهِ، فَنُهِيَ عَنْهَا»[١].

واتە: زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەسپێکی بەخشی کە پێیان دەگوت: غەمر یان غەمرە (ئەسپی خێراو تیژڕەو)، دواتر یەکێک لە بێچووەکانی کە نێر بوو، یان مێ بوو کە لە ڕەچەڵەکی ئەو ئەسپە بوو کە ئەو بەخشیبووی بینی دەفرۆشرا، ئەویش ڕێگری لێکرا کە بیکڕێتەوە.

## بابەت: ئەو کەسەی کە شتێک دەکاتە خێر و دواتر دەبێتە میرات بۆی

**٢٣٩٤-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي تَصَدَّقْتُ عَلَى أُمِّي بِجَارِيَةٍ، وَإِنَّهَا مَاتَتْ، فَقَالَ: «آجَرَكِ اللَّهُ، وَرَدَّ عَلَيْكِ الْمِيرَاثَ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدە لە باوکییەوە ﷺ، دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من جارییەیەکم بەخشی بە دایکم، وە ئێستا دایکم وەفاتی کردوە، ئەویش فەرمووی: خوا پاداشتی بەخشینەکەت دەداتەوە، بەخشینەکەشتی بە میرات گێڕایەوە بۆت.

**٢٣٩٥-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي أَعْطَيْتُ أُمِّي حَدِيقَةً لِي وَإِنَّهَا مَاتَتْ وَلَمْ تَتْرُكْ وَارِثًا غَيْرِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَجَبَتْ صَدَقَتُكَ، وَرَجَعَتْ إِلَيْكَ حَدِيقَتُكَ»[٣].

واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو گوتی: من باخچەیەکی خۆم بەخشی بە دایکم، ئێستا ئەو وەفاتی کردووەو، لە دوای خۆی هیچ میراتگرێکی نیە جگە لە من، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەخشینەکەت و چاکەکەت وەرگیراوە و باخچەکەشت وەکو میرات بۆ گەڕایەوە (واتە: دروستە بەخشینەکەی خۆت کە بوو بە میرات وەریبگری).

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. صحيح. أخرجه مسلم: ١١٤٩، وأبو داود: ١٦٥٦ و ٢٨٧٧ و ٣٣٠٩، والترمذي: ٦٦٧ و ٩٢٩.

(٣) حسن صحيح.

## بابەت: ئەو كەسەی كە وەقف دەكات

٢٣٩٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: أَصَابَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ أَرْضًا بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَاسْتَأْمَرَهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَصَبْتُ مَالًا بِخَيْبَرَ، لَمْ أُصِبْ مَالًا قَطُّ هُوَ أَنْفَسُ عِنْدِي مِنْهُ، فَمَا تَأْمُرُنِي بِهِ؟ فَقَالَ: «إِنْ شِئْتَ حَبَّسْتَ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْتَ بِهَا» قَالَ: «فَعَمِلَ بِهَا عُمَرُ، عَلَى أَنْ لَا يُبَاعَ أَصْلُهَا، وَلَا يُوهَبَ، وَلَا يُورَثَ، تَصَدَّقَ بِهَا لِلْفُقَرَاءِ، وَفِي الْقُرْبَى، وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لَا جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقًا، غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: عومەری كوڕی خەتتاب لە خەیبەر زەوییەكی دەستكەوت، جا هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ڕاوێژ كردن، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەر زەوییەكم دەستكەوتووە كە هەرگیزماڵی ئەوەندە نایاب و بە نرخم دەست نەكەوتووە لەوە بەنرختر بێ لەلام، جا فەرمانم بە چی پێدەكەی؟ فەرمووی: ئەگەر دەتەوێت زەوییەكە وەقف بكە و داهات و دەرامەتەكەی بكە بە خێر، گوتی: ئنجا عومەر بە قسەی كرد و زەوییەكەی بەخشی، بە مەرجێك كە نەفرۆشرێ و نەبەخشرێ و بە میرات نەبرێ، بەڵكو داهاتەكەی بۆ هەژاران و خزمان و ئازاد كردنی كۆیلە و لە جیهاد ڕێگەی خوا و بۆ ڕێبواران و میوان سەرف بكرێ، وە ئەو كەسەش كە سەرپەرشتی ئەو وەقفە دەكات گوناهی ناگات ئەگەر بە چاكی و بێ زیادەڕەوی لێی بخوات، یان دەرخواردی هاوڕێی خۆی بدات، بەڵام لێی پاشەكەوت نەكات و لێی لانەدات و نەیكاتە موڵكی خۆی.

٢٣٩٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْمِائَةَ سَهْمٍ الَّتِي بِخَيْبَرَ، لَمْ أُصِبْ مَالًا قَطُّ هُوَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهَا، وَقَدْ أَرَدْتُ أَنْ أَتَصَدَّقَ بِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «احْبِسْ أَصْلَهَا، وَسَبِّلْ ثَمَرَتَهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: عومەری كوڕی خەتتاب گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی ئەو سەد بەشەی كە لە خەیبەرە هەرگیز ماڵێكی لەوە نایابتر و بە نرخترم دەست نەكەوتووە كە ئەوەندە لەلام خۆشەویست بێ، ویستم كە بیبەخشم، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زەوییەكە وەقف بكە و داهات و دەرامەتەكەی لە پێناوی خوادا ببەخشە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٣٧، ومسلم: ١٦٣٢، وأبو داود: ٢٨٧٨، والترمذي: ٣٧٥، والنسائي: ٣٦٠٣ و ٣٦٠٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٣٧، ومسلم: ١٦٣٢، وأبو داود: ٢٨٧٨، والترمذي: ٣٧٥، والنسائي: ٣٦٠٣ و ٣٦٠٤.

## بابەت: خواستن

**٢٣٩٨-** عَنْ شُرَحْبِيلِ بْنِ مُسْلِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْعَارِيَةُ مُؤَدَّاةٌ، وَالْمِنْحَةُ مَرْدُودَةٌ»(١).

واتە: شوڕەحبیلی کوڕی موسلیم دەڵێ: گوێم لە ئەبو ئومامە ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەیفەرموو: شتی خوازراو دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، وە شتێکیش کە بۆ سوود لێوەرگرتن بەر وبومەکەی دراوە بە کەسێک دەبێ خودی شتەکە (نەک بەر وبومەکەی) بدرێتەوە بە خاوەنەکەی.

**عارية:** ئەو شتەیە کە خۆت وەری دەگری و، سوود لە خودی شتەکە دەبینی، وەکو: کتێب.

**منحة:** ئەو شتەیە کە پێت دەدرێ بۆ سوود وەرگرتن لە بەر وبومەکەی، کە کاتی خۆی زیاتر بۆ وشتر بەکارهاتوە بۆ ئەوەی کەسەکە سوود لە بەر وبومی وشترەکە وەربگرێ، بە نمونە: شیرەکەی.

**٢٣٩٩-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الْعَارِيَةُ مُؤَدَّاةٌ، وَالْمِنْحَةُ مَرْدُودَةٌ»(٢).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە دەیفەرموو: شتی خوازراو دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنەکەی، وە شتێکیش کە بۆ سوود لێوەرگرتن لە بەر وبومەکەی دراوە بە کەسێک دەبێ خودی شتەکە (نەک بەر وبومەکەی) بدرێتەوە بە خاوەنەکەی.

**٢٤٠٠-** عَنْ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «عَلَى الْيَدِ مَا أَخَذَتْ حَتَّى تُؤَدِّيَهُ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٦٥، والترمذي: ١٢٦٥.

(٢) صحيح.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٥٦١، والترمذي: ١٢٦٦.

واتە: سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە بە دەست شتێک دەخوازێ، کەسی وەرگر زامنە هەتاوەکو دەیگێڕێتەوە (دەستی خاوەنەکەی).

## بابەت: پێ سپاردن

٢٤٠١- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أُودِعَ وَدِيعَةً فَلَا ضَمَانَ عَلَيْهِ»[1].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک شتێکی سپارد بە کەسێکی تر، کەسی پێ سپێردراو زەمانەتی لەسەر نیە (ئەگەر بە ئەنقەست نەیفەوتێنێ).

## بابەت: کەسی دەستپاک کە مامەڵە بەو شتە دەکات کە بە ئەمانەت لای دانراوە و قازانجی تێدا دەکات

٢٤٠٢- عَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَعْطَاهُ دِينَارًا يَشْتَرِي لَهُ شَاةً، فَاشْتَرَى لَهُ شَاتَيْنِ، فَبَاعَ إِحْدَاهُمَا بِدِينَارٍ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ بِدِينَارٍ وَشَاةٍ «فَدَعَا لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْبَرَكَةِ»، قَالَ: فَكَانَ لَوِ اشْتَرَى التُّرَابَ لَرَبِحَ فِيهِ[2].

واتە: عوروەی باریقیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دینارێکی پێداوە بۆ ئەوەی مەڕێکی بۆ بکڕێ، ئەویش دوو مەڕی بۆ کڕی و یەکێکیانی بە دینارێک فرۆشتەوە، جا کە هاتەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ مەڕێک و دینارێکی بۆ هێنایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای خێر و فەڕی بۆ کرد. (ڕاوی) گوتی: (عوروەی باریقیی ﷺ دەگێڕێتەوە) ئەگەر خۆڵیشی کڕیبا قازانجی تێدا دەکرد.

٢٤٠٢م- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ الْبَارِقِيِّ ﷺ، قَالَ: قَدِمَ جَلَبٌ، فَأَعْطَانِي النَّبِيُّ ﷺ دِينَارًا، فَذَكَرَ نَحْوَهُ[3].

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦٤٢، وأبو داود: ٣٣٨٤، والترمذي: ١٢٥٨.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٨٥، والترمذي: ١٢٥٨.

واتە: عوڕوەی کوڕی ئەبو جەعدی باریقیی ﷺ (بە سەنەدێکی تر هاتوە) گوتوویەتی: جەڵەبە مەڕێک هات، جا پێغەمبەر ﷺ دینارێکی پێدام، وەکو فەرموودەکەی پێشتر گێڕایەوە.

## بابەت: حەواڵە (ناردن)

٢٤٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الظُّلْمُ مَطْلُ الْغَنِيِّ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ، فَلْيَتْبَعْ»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسێک قەرزی کەسێکی بەلاوە بێ، وە دەسەڵاتی هەبێ بیداتەوە بەڵام نەیداتەوە ئەوە ستەمە، وە هەرکاتێ یەکێ لە ئێوە ڕەوانەی لای کەسێکی دەوڵەمەند کرا، با بچێ (بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکە).

٢٤٠٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُحِلْتَ عَلَى مَلِيءٍ، فَاتْبَعْهُ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسێ قەرزی کەسێکی بەلاوە بێ، وە دەسەڵاتی هەبێ بیداتەوە بەڵام نەیداتەوە ئەوە ستەمە، وە هەرکاتێ یەکێ لە ئێوە ڕەوانەی لای کەسێکی دەوڵەمەند کرا، با بچێ بۆ لای.

## بابەت: کەفالەت

٢٤٠٥- عَنْ شُرَحْبِيلُ بْنُ مُسْلِمٍ الْخَوْلَانِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ الْبَاهِلِيَّ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «الزَّعِيمُ غَارِمٌ، وَالدَّيْنُ مَقْضِيٌّ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٨٧، ومسلم: ١٥٦٤، وأبو داود: ٣٣٤٥، والترمذي: ١٣٠٨، والنسائي: ٤٦٨٨ و ٤٦٩١.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ١٣٠٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥٦٥، والترمذي: ١٢٦٥.

واتە: شورەحبیلی کوڕی موسلیمی خەولانیی دەڵێ: گوێم لە ئەبو ئومامەی باهلی ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەستەبەر پێویستە ببژێردرێ، و قەرزیش پێویستە بدرێتەوە.

**٢٤٠٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا لَزِمَ غَرِيمًا لَهُ بِعَشَرَةِ دَنَانِيرَ، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ أُعْطِيكَهُ، فَقَالَ: لَا وَاللَّهِ لَا أُفَارِقُكَ حَتَّى تَقْضِيَنِي أَوْ تَأْتِيَنِي بِحَمِيلٍ، فَجَرَّهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «كَمْ تَسْتَنْظِرُهُ؟» فَقَالَ: شَهْرًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَأَنَا أَحْمِلُ لَهُ» فَجَاءَهُ فِي الْوَقْتِ الَّذِي قَالَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «مِنْ أَيْنَ أَصَبْتَ هَذَا؟» قَالَ: مِنْ مَعْدِنٍ، قَالَ: «لَا خَيْرَ فِيهَا» وَقَضَاهَا عَنْهُ[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوێک دە دیناری کابرایەک قەرزدار بوو، گوتی: هیچ شتێکم نیە کە پێتی بدەمەوە، ئەویش (خاوەن قەرزەکە) گوتی: سوێند بە خوا جێت ناهێڵم و لێت جیانابمەوە تاوەکو قەرزەکەم نەدەیتەوە، یان کەسێک نەکەی بە کەفیلت، ئەویش بردی بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: چەند چاوەڕێی دەکەی؟ گوتی: مانگێک، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەواتە من دەبم بە کەفیلی، جا (قەرزدارەکە) لەوکاتەدا کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو بوو هاتەوە خزمەتی، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەوەت لە کوێ دەست کەوت؟ گوتی: لە کانێکی کانزا، فەرمووی: خێری پێوە نیە، وە خۆی لە بری ئەو قەرزەکەی بژارد.

**٢٤٠٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِجَنَازَةٍ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: «صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ، فَإِنَّ عَلَيْهِ دَيْنًا» فَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ: أَنَا أَتَكَفَّلُ بِهِ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «بِالْوَفَاءِ؟» قَالَ: بِالْوَفَاءِ، وَكَانَ الَّذِي عَلَيْهِ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ، أَوْ تِسْعَةَ عَشَرَ دِرْهَمًا[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، جەنازەیەکیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات، ئەویش فەرمووی: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن بەڕاستی ئەو قەرزێکی لەسەرە (واتە: پێغەمبەر ﷺ خۆی

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٦٩، والنسائي: ١٩٦٠ و ٤٦٩٢.

نوێژی لەسەر کەسی قەرزدار نەدەکرد)، جا ئەبو قەتادە ﷺ گوتی: من قەرزەکەی لە ئەستۆ دەگرم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە دانەوەی قەرزەکە؟ گوتی: (بەڵێ) بە دانەوەی قەرزەکە، وە ئەو کەسە (کە وەفاتی کردبوو) هەژدە، یان نۆزدە درهەم قەرزدار بوو.

## بابەت: ئەو کەسەی قەرز وەردەگرێ و نیازی دانەوەی هەیە

**٢٤٠٨-** عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ مَيْمُونَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَتْ تَدَّانُ دَيْنًا، فَقَالَ لَهَا بَعْضُ أَهْلِهَا: لَا تَفْعَلِي، وَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهَا، قَالَتْ: بَلَى، إِنِّي سَمِعْتُ نَبِيِّي وَخَلِيلِي ﷺ، يَقُولُ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدَّانُ دَيْنًا، يَعْلَمُ اللَّهُ مِنْهُ أَنَّهُ يُرِيدُ أَدَاءَهُ، إِلَّا أَدَّاهُ اللَّهُ عَنْهُ فِي الدُّنْيَا»[1].

واتە: دایکی ئیمانداران مەیمونە ﷺ دەگێڕێتەوە: قەرزی دەکرد، بۆیە یەکێک لە کەس و کارەکەی پێی گوت: ئەم کارە مەکە وە سەرکۆنەی کرد لەسەر ئەو کارە، ئەویش گوتی: بۆنا دەبێ، بێگومان من لە پێغەمبەر ﷺو دڵسۆز و خۆشەویستەکەم بیست کە دەیفەرموو: هیچ مسوڵمانێک نیە کە قەرزێک بکات و خوا بزانێ کە نیەتی دانەوەی قەرزەکەی هەیە، بێگومان خوا لە دونیادا قەرزەکەی بۆ دەداتەوە.

**٢٤٠٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ مَعَ الدَّائِنِ حَتَّى يَقْضِيَ دَيْنَهُ، مَا لَمْ يَكُنْ فِيمَا يَكْرَهُ اللَّهُ» قَالَ: فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ يَقُولُ لِخَازِنِهِ: «اذْهَبْ فَخُذْ لِي بِدَيْنٍ، فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ أَبِيتَ لَيْلَةً إِلَّا وَاللَّهُ مَعِي، بَعْدَ الَّذِي سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا لەگەڵ قەرزدارە تاوەکو قەرزەکەی دەداتەوە مادام قەرزەکەی لە شتێکدا نیە کە خوا پێی ناخۆشە. (ڕاوی) گوتی: جا عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر بە خەزێنەدارەکەی دەگوت: بڕۆ قەرزێکم بۆ وەرگرە، چونکە بەڕاستی من حەزناکەم شەوێکم بەسەردا تێپەڕێ و خوا لەگەڵم نەبێ، لە دوای ئەوەی کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوومە.

---

(١) صحيح دون قوله: «فِي الدُّنْيَا». أخرجه النسائي: ٤٦٨٦.

(٢) صحيح.

## بابەت: کەسێک کە قەرز وەردەگرێ و نیەتی دانەوەی نیە

**٢٤١٠- صُهَيْبُ الْخَيْرِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «أَيُّمَا رَجُلٍ تَدَيَّنَ دَيْنًا، وَهُوَ مُجْمِعٌ أَنْ لَا يُوَفِّيَهُ إِيَّاهُ، لَقِيَ اللَّهَ سَارِقًا»[١].**

واتە: صوهەیبی خەیریی ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێک قەرز وەربگرێ و سوور بێ لەسەر ئەوەی کە قەرزەکەی نەداتەوە، وەکو دز بە خوا دەگاتەوە.

**٢٤١٠م- حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ الْحِزَامِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا يُوسُفُ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ صَيْفِيٍّ، عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ صُهَيْبٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[٢].**

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٢٤١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ أَخَذَ أَمْوَالَ النَّاسِ يُرِيدُ إِتْلَافَهَا، أَتْلَفَهُ اللَّهُ»[٣].**

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک سەروەت و ماڵی خەڵکی وەربگرێ (بە قەرز)، بیەوێ بە هەدەری بدات، خوا بێ دەست مایەی دەکات.

## بابەت: هەڕەشە و توندگیری لە قەرزکردندا

**٢٤١٢- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ فَارَقَ الرُّوحُ الْجَسَدَ وَهُوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلَاثٍ، دَخَلَ الْجَنَّةَ: مِنَ الْكَنْزِ، وَالْغُلُولِ، وَالدَّيْنِ»[٤].**

واتە: سەوبانی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک گیان لە لاشەی دەربچێ و لە سێ شت بە دوور بێ، دەچێتە بەهەشتەوە: لە خۆ بە گەورە زانین و لە خیانەت کردن لە دەست کەوتەکانی جەنگ و لە قەرز.

---

(١) حسن صحيح.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٨٧.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٥٧٢.

**تێبینی:** لە هەندێک گێڕانەوەدا (الکبر) بە (الكنز) هاتوە، ئەو کات ماناکەی بەو جۆرەیە: کەسێک ماڵی کۆ نەکردبێتەوەو زەکاتی لێنەدابێ.

**٢٤١٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەفسی بڕوادار بە هۆی قەرزدارییەکەیەوە ڕێگری لێ دەکرێ لە چوونە بەهەشتەوە، تاوەکو قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە.

**٢٤١٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ دِينَارٌ أَوْ دِرْهَمٌ قُضِيَ مِنْ حَسَنَاتِهِ، لَيْسَ ثَمَّ دِينَارٌ وَلَا دِرْهَمٌ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک وەفاتی کردو، دینارێک یان درهەمێک قەرزدار بوو، لە (کردەوە) چاکەکانی قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە، چونکە لە قیامەت دینار و درهەم بوونی نیە.

## بابەت: کەسێک بمرێ و قەرزو خێزانێکی کەم دەرامەت جێبهێڵێ، قەرزدانەوەکەی لەسەر خوا و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ

**٢٤١٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، كَانَ يَقُولُ: إِذَا تُوُفِّيَ الْمُؤْمِنُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهِ الدَّيْنُ، فَيَسْأَلُ: «هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ مِنْ قَضَاءٍ؟» فَإِنْ قَالُوا: نَعَمْ، صَلَّى عَلَيْهِ، وَإِنْ قَالُوا: لَا، قَالَ: «صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ» فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ ﷺ الْفُتُوحَ، قَالَ: «أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالًا فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ کاتێ قەرزدارێک دەمرد، پرسیاری دەکرد: ئایا هیچ شتێکی بۆ دانەوەی قەرزەکەی بەجێهێشتووە؟ ئەگەر گوتبایان: بەڵێ، نوێژی لەسەر دەکرد،

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٧٨.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٩٨، ومسلم: ١٦١٩، وأبو داود: ٢٩٥٥، والترمذي: ١٠٧٣، والنسائي: ١٩٦٣.

ئەگەر گوتبایان: نەخێر، دەیفەرموو: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن، جا کاتێ خوا فتوحاتی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد، فەرمووی: من بۆ بڕواداران لە خۆیان لە پێشترم، جا بۆیە هەر کەس وەفاتی کرد و لە دوای خۆی قەرزی جێهێشت، من بۆی دەبژێرم، وە هەر کەس لە دوای خۆی سەروەت و سامانی جێهێشت، بۆ میراتگرەکانیەتی.

**٢٤١٦- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَرَكَ مَالًا فَلِوَرَثَتِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَعَلَيَّ وَإِلَيَّ، وَأَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ»**(١).

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بمرێ و ماڵی لە پاش بەجێ بمێنێ ئەوە بۆ میراتگرەکانیەتی، وە ئەگەر قەرزی لەسەر بوو قەرزەکەی لەسەر منە و خۆم بۆی دەبژێرم، ئەگەر خێزانی هەژار و بێ داڵدەی لە پاش بەجێما گوزەرانیان لەسەر خۆمە، وە من بۆ هەموو بڕواداران لەخۆیان لە پێشترم.

## بابەت: مۆڵەتدانی کەسی دەست کورت

**٢٤١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ»**(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کارئاسانی بکات بۆ دەستکورتێک، خوا لە دونیا و دوارۆژدا کارئاسانی بۆ دەکات.

**٢٤١٨- عَنْ بُرَيْدَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِرًا كَانَ لَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ صَدَقَةٌ، وَمَنْ أَنْظَرَهُ بَعْدَ حِلِّهِ كَانَ لَهُ مِثْلُهُ، فِي كُلِّ يَوْمٍ صَدَقَةٌ»**(٣).

واتە: بورەیدەی ئەسلەمیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ماوە بدات بە دەست کورتێک، بۆ هەر ڕۆژێک چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ، وە هەر کەسێک ماوە بدات دوای ئەوەی کە کاتی دانەوەی قەرزەکەی هاتوە، بۆ هەر ڕۆژێک کە مۆڵەتی دەدات بە ئەندازەی بڕی قەرزەکە خێر و چاکەی بۆ دەنووسرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٨٦٧ مطولًا، وأبو داود: ٢٩٥٤.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

**٢٤١٩-** عَنْ أَبِي الْيَسَرِ ﷺ، صَاحِبِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُظِلَّهُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ، فَلْيُنْظِرْ مُعْسِرًا، أَوْ لِيَضَعْ عَنْهُ»[١].

**واتە:** ئەبو یەسەری ﷺ هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پێی خۆشە خوا بیخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، با مۆڵەتی دەستکورتی قەرزار بدات، یان لێی خۆش بێ.

**٢٤٢٠-** عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، «أَنَّ رَجُلًا مَاتَ، فَقِيلَ لَهُ: مَا عَمِلْتَ؟ فَإِمَّا ذَكَرَ أَوْ ذُكِّرَ، قَالَ: إِنِّي كُنْتُ أَتَجَوَّزُ فِي السِّكَّةِ وَالنَّقْدِ، وَأُنْظِرُ الْمُعْسِرَ، فَغَفَرَ اللَّهُ لَهُ»[٢]. قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: أَنَا قَدْ سَمِعْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ[٣].

**واتە:** حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: پیاوێک وەفاتی کرد، جا پێی گوترا: چیت کردوە (لە دونیادا)؟ خۆی بیری هاتەوە، یان بیریان هێنایەوە و گوتی: چاوپۆشیم دەکرد لە پارەو پوول و مافی خۆم و کارئاسانیم دەکرد، وە چاوپۆشیم لە دەستکورت دەکرد، بەو هۆیەوە خوا لێی خۆش بوو. ئەبو مەسعوود گوتی: بێگومان من ئەوەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێ لێبووە.

## بابەت: جوان داواکردن و وەرگرتنەوەی ماف بە پاکی

**٢٤٢١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَعَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَنْ طَلَبَ حَقًّا فَلْيَطْلُبْهُ فِي عَفَافٍ وَافٍ، أَوْ غَيْرِ وَافٍ»[٤].

**واتە:** ئیبنو عومەر و عائیشە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک داوای مافی خۆی بکاتەوە ئەوا با بە شێوازێکی جوان و دوور لە تاوان داوای بکاتەوە، جا مافەکەی بە تەواوی بە دەست بێنێتەوە یان بە ناتەواوی.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٧٧، ومسلم: ١٥٦٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٦١.

(٤) صحيح.

**٢٤٢٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِصَاحِبِ الْحَقِّ: «خُذْ حَقَّكَ فِي عَفَافٍ وَافٍ، أَوْ غَيْرِ وَافٍ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە خاوەن مافێکی فەرمووە: مافی خۆت وەربگرەوە بە شێوازێکی جوان و دوور لە تاوان، جا مافەکەت بە تەواوی بە دەست بێنیەوە یان بە ناتەواوی.**

## بابەت: قەرزدانەوە بە شێوازێکی جوان و باش

**٢٤٢٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ خَيْرَكُمْ - أَوْ مِنْ خَيْرِكُمْ - أَحَاسِنُكُمْ قَضَاءً»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی باشترینتان یان لە باشترینی ئێوە ئەو کەسانەن کە بە باشترین و جوانترین شێواز قەرزەکانیان دەدەنەوە.**

**٢٤٢٤-** عَنْ إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ الْمَخْزُومِيُّ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَسْلَفَ مِنْهُ، حِينَ غَزَا حُنَيْنًا ثَلَاثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ أَلْفًا، فَلَمَّا قَدِمَ قَضَاهَا إِيَّاهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِي أَهْلِكَ وَمَالِكَ، إِنَّمَا جَزَاءُ السَّلَفِ الْوَفَاءُ وَالْحَمْدُ»[٣].

**واتە: ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعەی مەخزومیی ﷺ لە باوکییەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ غەزای حونەینی کرد سی یان چل هەزاری بە قەرز لێوەرگرت، جا کاتێ گەڕایەوە قەرزەکەی پێدایەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: خوای گەورە خێر و فەڕ بخاتە ماڵ و مناڵتەوە، بەڕاستی پاداشتی قەرزوەرگرتن دانەوەی قەرزەکەیە لە کاتی خۆیدا و سوپاس گوزار بوونە.**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٠٥، ومسلم: ١٦٠١، والترمذي: ١٣١٦ و ١٣١٧، والنسائي: ٤٦١٨_٤٦٩٣.

(٣) حسن. أخرجه النسائي: ٤٦٨٣.

## بابەت: ئەوەی کە خاوەن قەرز مافی هەیە

٢٤٢٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ يَطْلُبُ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ بِدَيْنٍ، أَوْ بِحَقٍّ، فَتَكَلَّمَ بِبَعْضِ الْكَلَامِ، فَهَمَّ صَحَابَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَهْ، إِنَّ صَاحِبَ الدَّيْنِ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى صَاحِبِهِ حَتَّى يَقْضِيَهُ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای قەرز یان مافێکی خۆی لێدەکرد، جا هەندێ قسەی نەشیاوی کرد، بۆیە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی تورە بوون و ویستیان ئازاری بدەن، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وازی لێ بهێنن، بەڕاستی خاوەن قەرز دەسەڵاتی هەیە بەسەر هاوڕێکەیدا تاوەکو قەرزەکەی پێ دەداتەوە.

٢٤٢٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَتَقَاضَاهُ دَيْنًا كَانَ عَلَيْهِ، فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ، حَتَّى قَالَ لَهُ: أُحَرِّجُ عَلَيْكَ إِلَّا قَضَيْتَنِي، فَانْتَهَرَهُ أَصْحَابُهُ، وَقَالُوا: وَيْحَكَ تَدْرِي مَنْ تُكَلِّمُ؟ قَالَ: إِنِّي أَطْلُبُ حَقِّي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَلَّا مَعَ صَاحِبِ الْحَقِّ كُنْتُمْ؟» ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى خَوْلَةَ بِنْتِ قَيْسٍ فَقَالَ لَهَا: «إِنْ كَانَ عِنْدَكِ تَمْرٌ فَأَقْرِضِينَا حَتَّى يَأْتِيَنَا تَمْرُنَا فَنَقْضِيَكِ» فَقَالَتْ: نَعَمْ، بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَأَقْرَضَتْهُ، فَقَضَى الْأَعْرَابِيَّ وَأَطْعَمَهُ، فَقَالَ: أَوْفَيْتَ، أَوْفَى اللَّهُ لَكَ، فَقَالَ: «أُولَئِكَ خِيَارُ النَّاسِ، إِنَّهُ لَا قُدِّسَتْ أُمَّةٌ لَا يَأْخُذُ الضَّعِيفُ فِيهَا حَقَّهُ غَيْرَ مُتَعْتَعٍ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: دەشتەکییەک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای قەرزێکی لێ دەکردەوە کە (پێغەمبەر ﷺ) قەرزداری بوو، جا زۆر توندگیری لەسەری کرد، تاوەکو پێی گوت: سەغڵەتت دەکەم ئەگەر قەرزەکەم پێنەدەیتەوە، جا هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لێی تورە بوون و پێیدا هەڵشاخان، گوتیان: ڕەنجەڕۆ بی ئایا دەزانی قسە لەگەڵ کێدا دەکەی؟! ئەویش گوتی: من داوای مافی خۆم دەکەم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەبوو پشتگیری لە خاوەن مافەکە بکەن و یارمەتی بدەن، پاشان ناردی بە دوای خەولەی کچی قەیسدا، جا پێی فەرموو: ئەگەر خورمات هەبێ بە قەرز پێمانی بدەی تاوەکو خورمای خۆمان پێدەگات و قەرزەکەت دەدەینەوە، ئەویش گوتی: زۆر

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح.

باشە بەسەر چاو بە باوکمەوە بە فیدات بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، (ڕاوی) گوتی: جا قەرزەکەی پێدا، ئەویش (پێغەمبەر ﷺ) قەرزی دەشتەکییەکەی دایەوە و خواردنیشی پێدا، ئنجا (دەشتەکییەکە) گوتی: وەفاداربووی بە پەیمانەکەت خوا پێویستییەکانت بۆ جێبەجێ بکات، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەوانە باشترینی خەڵکن، خوا ئوممەتێک پاک ناکاتەوە لە تاوان ئەگەر لاواز نەتوانێ بێ ماندووبوون مافی خۆی وەربگرێتەوە.

## بابەت: بەندکردنی قەرزار و لەلای خۆ هێشتنەوەی

**٢٤٢٧-** عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ» قَالَ عَلِيٌّ الطَّنَافِسِيُّ: «يَعْنِي عِرْضَهُ شِكَايَتَهُ، وَعُقُوبَتَهُ سِجْنَهُ»[١].

واتە: عەمری کوڕی شەرید لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قەرز کوێری دەوڵەمەند، ئابڕووچوون و سزادانی ڕەوا دەکات. عەلی تەنافیسی گوتی: مەبەستی پێ لە قسە پێگوتنی سکاڵا لەسەر کردنیەتی، وە لە سزادانی بەند کردنیەتی.

**٢٤٢٨-** عَنِ الْهِرْمَاسِ بْنِ حَبِيبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِغَرِيمٍ لِي، فَقَالَ لِي: «الْزَمْهُ» ثُمَّ مَرَّ بِي آخِرَ النَّهَارِ، فَقَالَ: «مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ يَا أَخَا بَنِي تَمِيمٍ؟»[٢].

واتە: هیرماسی کوڕی حەبیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: قەرزارێکی خۆی هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێمی فەرموو: لای خۆت بیهێڵەوە، دواتر لە کۆتایی ڕۆژەکەدا پێم گەیشت و فەرمووی: ئەی برای بەنو تەمیم دیلەکەت چی کرد؟ (واتە: ئایا قەرزەکەی پێت دایەوە یاخود نا؟).

**٢٤٢٩-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا لَهُ عَلَيْهِ فِي الْمَسْجِدِ، حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا، حَتَّى سَمِعَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا فَنَادَى كَعْبًا، فَقَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «دَعْ مِنْ دَيْنِكَ هَذَا» وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى الشَّطْرِ، فَقَالَ: قَدْ فَعَلْتُ، قَالَ: «قُمْ فَاقْضِهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٢٨، والنسائي: ٤٦٨٩ و ٤٦٩٠.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٦٢٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٧، ومسلم: ١٥٥٨، وأبو داود: ٣٥٩٥، والنسائي: ٥٤٠٨ و ٥٤٠٩.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیک ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە: کە قەرزێکی لەلای کوڕی ئەبو حەدرەد بوو لە مزگەوت داوای لێکردەوە، بەهۆیەوە دەنگیان بەرز بوویەوە هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی خۆیەوە گوێی لە دەنگیان بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لایان و بانگی کەعبی کرد، جا کەعب گوتی: لە خزمەتدام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەندە لە قەرزەکەت خۆش بە وە بە دەستی ئاماژەی بە نیوە کرد، ئەویش گوتی: ئەوا ئەو کارە دەکەم، (پێغەمبەر ﷺ بە حەدرەدی) فەرموو: تۆش هەڵسە بڕۆ نیوەی قەرزەکەی بدەوە.

## بابەت: قەرز

٢٤٣٠- عَنْ قَيْسِ بْنِ رُومِيٍّ، قَالَ: كَانَ سُلَيْمَانُ بْنُ أُذُنَانٍ يُقْرِضُ عَلْقَمَةَ أَلْفَ دِرْهَمٍ إِلَى عَطَائِهِ، فَلَمَّا خَرَجَ عَطَاؤُهُ تَقَاضَاهَا مِنْهُ وَاشْتَدَّ عَلَيْهِ، فَقَضَاهُ، فَكَأَنَّ عَلْقَمَةَ غَضِبَ، فَمَكَثَ أَشْهُرًا ثُمَّ أَتَاهُ، فَقَالَ: أَقْرِضْنِي أَلْفَ دِرْهَمٍ إِلَى عَطَائِي، قَالَ: نَعَمْ، وَكَرَامَةً، يَا أُمَّ عُتْبَةَ هَلُمِّي تِلْكَ الْخَرِيطَةَ الْمَخْتُومَةَ الَّتِي عِنْدَكِ، فَجَاءَتْ بِهَا، فَقَالَ: أَمَا وَاللَّهِ إِنَّهَا لَدَرَاهِمُكَ الَّتِي قَضَيْتَنِي، مَا حَرَّكْتُ مِنْهَا دِرْهَمًا وَاحِدًا، قَالَ: فَلِلَّهِ أَبُوكَ مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا فَعَلْتَ بِي؟ قَالَ: مَا سَمِعْتُ مِنْكَ، قَالَ: مَا سَمِعْتَ مِنِّي؟ قَالَ: سَمِعْتُكَ تَذْكُرُ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُقْرِضُ مُسْلِمًا قَرْضًا مَرَّتَيْنِ إِلَّا كَانَ كَصَدَقَتِهَا مَرَّةً» قَالَ: كَذَلِكَ أَنْبَأَنِي ابْنُ مَسْعُودٍ[١].

واتە: قەیسی کوڕی ڕومیی دەڵێ: سولەیمانی کوڕی ئوزونان هەزار درهەمی بە قەزردا بە عەلقەمە تا ئەو کاتەی موچەی پێ دەدرێ، جا کاتێ موچەی وەرگرت (سولەیمان) داوای قەرزەکەی لێکردەوە و تینی بۆ هێنا، ئەویش قەرزەکەی پێدایەوە، عەلقەمە وەکو ئەوە وابوو کە توڕە بووبێ و چەند مانگێک بە بێدەنگی مایەوە، پاشان هاتەوە لایی و گوتی: هەزار درهەمم بە قەرز پێبدە تاکو موچەکەم وەردەگرم، ئەویش گوتی: بەڵێ بەڕێزەوە، دادەی ئومو عوتبە ئەو کیسە سەرمۆر کراوەی لای خۆتم بۆ بهێنە، ئەویش هێنای، ئنجا (سولەیمان) گوتی: ئەها سوێند بە خوا ئەوە ئەو درهەمانی خۆتە کە لەبری قەرزەکە پێتدامەوە دەستم لە یەک درهەمیشی نەداوە، (عەلقەمە) گوتی: ئەی ڕەحمەت لە باوکت، چی وای لێکردی ئەم کارەم لەگەڵ بکەی؟! ئەویش گوتی:

---

(١) ضعيف إلا المرفوع منه، فحسن.

ئەوەیە کە لە تۆم بیستووە، گوتی: چیت لە منت بیستووە؟! گوتی: لە تۆم بیستووە کە لە ئیبنو مەسعوود دەتگێڕایەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێک دوو جار قەرز بدا بە مسوڵمانێک، جاری دووەم وەکو ئەوە وایە کە پێی بەخشیبێ، (عەلقەمە) گوتی: بەو شێوەیە ئیبنو مەسعوود هەواڵی پێدام.

**إعطاء:** ئەو بڕە پارەیە بوو کە لە کاتێکی دیاریکراودا دەدرا بە خەڵک لە بەیتولـماڵ.

**لله أبوك:** وشەیەکە لە ناو عەرەبدا بۆ ستایش کردن بەکارهاتوە، وەکو ئەوەی کە لە کوردیدا دەگوترێ: ڕەحمەت لەو باوکەی کە تۆی لێ وەپاش کەوتووە.

**٢٤٣١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَأَيْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ مَكْتُوبًا: الصَّدَقَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، وَالْقَرْضُ بِثَمَانِيَةَ عَشَرَ، فَقُلْتُ: يَا جِبْرِيلُ مَا بَالُ الْقَرْضِ أَفْضَلُ مِنَ الصَّدَقَةِ؟ قَالَ: لِأَنَّ السَّائِلَ يَسْأَلُ وَعِنْدَهُ، وَالْمُسْتَقْرِضُ لَا يَسْتَقْرِضُ إِلَّا مِنْ حَاجَةٍ»[1].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەو شەوەی کە شەوڕۆییم پێکرا، بینیم لەسەر دەرگای بەهەشت نووسرا بوو خێر و چاکە یەک بە دەیە، وە قەرزیش یەک بە هەژدەیە، جا بۆیە گوتم: ئەی جیبریل قەرز بۆ ئاوایە فەزڵی لە خێر و چاکە زیاترە؟! گوتی: لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی کە داوا دەکات هەشیەتی و داواش دەکات، بەڵام ئەوەی کە قەرز وەردەگرێ تەنیا لە کاتی پێویستی و نەبوونیدا قەرز دەکات.

**٢٤٣٢- عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي إِسْحَاقَ الْهُنَائِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ: الرَّجُلُ مِنَّا يُقْرِضُ أَخَاهُ الْمَالَ فَيُهْدِي لَهُ؟ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَقْرَضَ أَحَدُكُمْ قَرْضًا، فَأَهْدَى لَهُ، أَوْ حَمَلَهُ عَلَى الدَّابَّةِ، فَلَا يَرْكَبْهَا وَلَا يَقْبَلْهُ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ جَرَى بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ قَبْلَ ذَلِكَ»[2].**

واتە: یەحیای کوڕی ئەبو ئیسحاقی هونائیی دەڵێ: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ کرد: پیاوێک لە ئێمە قەرز دەدات بە براکەی، وە کابرا (لەگەڵ ئەوەی کە قەرزەکەی پێدەداتەوە) دیاریشی بۆ دەبات، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە قەرزێکی دا و دواتر (لەگەڵ قەرزەکە) دیاری

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

پێدرا یان وڵاخێکی سواری پێدرا، با سواری نەبێت و وەری نەگرێت، مەگەر پێشتر لە نێوانیاندا ئەو شتە کرابێ (واتە: هۆکارەکەی تەنها قەرز لێکردنەکە نەبێت و پێشتریش هەدیە بەیەکدانیان لە نێواندا هەبووبێت).

## بابەت: دانەوەی قەرز لەبری مردوو

**٢٤٣٣-** عَنْ سَعْدِ بْنِ الْأَطْوَلِ ﷺ، أَنَّ أَخَاهُ مَاتَ وَتَرَكَ ثَلَاثَمِائَةِ دِرْهَمٍ، وَتَرَكَ عِيَالًا، فَأَرَدْتُ أَنْ أُنْفِقَهَا عَلَى عِيَالِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ أَخَاكَ مُحْتَبَسٌ بِدَيْنِهِ، فَاقْضِ عَنْهُ» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ أَدَّيْتُ عَنْهُ إِلَّا دِينَارَيْنِ، ادَّعَتْهُمَا امْرَأَةٌ وَلَيْسَ لَهَا بَيِّنَةٌ، قَالَ: «فَأَعْطِهَا فَإِنَّهَا مُحِقَّةٌ»[(١)].

واتە: سەعدی کوڕی ئەتوەل ﷺ دەگێڕێتەوە: کە برایەکەی وەفاتی کرد و لەدوای خۆی سێ سەد درهەم و خاوخێزانێکی بەجێهێشت، جا منیش ویستم پارەکە بدەم بە خاوخێزانەکەی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی براکەت بەهۆی قەرزدارییەکەیەوە ڕێگری چوونە ناو بەهەشتی لێ دەکرێ، بۆیە قەرزەکەی بدەوە، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قەرزەکەم لەبری دایەوە تەنها دوو دینار نەبێ کە ژنێک داوای دەکات و هیچ شایەدێکیشی نیە، فەرمووی: پێی بدە، چونکە بەڕاستی شایستەو هەقە.

**٢٤٣٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ تُوُفِّيَ وَتَرَكَ عَلَيْهِ ثَلَاثِينَ وَسْقًا لِرَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ، فَاسْتَنْظَرَهُ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، فَأَبَى أَنْ يُنْظِرَهُ: فَكَلَّمَ جَابِرٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِيَشْفَعَ لَهُ إِلَيْهِ، فَجَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَكَلَّمَ الْيَهُودِيَّ لِيَأْخُذَ ثَمَرَ نَخْلِهِ بِالَّذِي لَهُ عَلَيْهِ، فَأَبَى عَلَيْهِ، فَكَلَّمَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَبَى أَنْ يُنْظِرَهُ، فَدَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّخْلَ، فَمَشَى فِيهَا، ثُمَّ قَالَ لِجَابِرٍ: «جُدَّ لَهُ فَأَوْفِهِ الَّذِي لَهُ» فَجَدَّ لَهُ بَعْدَ مَا رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثِينَ وَسْقًا، وَفَضَلَ لَهُ اثْنَا عَشَرَ وَسْقًا، فَجَاءَ جَابِرٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِيُخْبِرَهُ بِالَّذِي كَانَ، فَوَجَدَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ غَائِبًا، فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَاءَهُ فَأَخْبَرَهُ أَنَّهُ قَدْ أَوْفَاهُ، وَأَخْبَرَهُ بِالْفَضْلِ الَّذِي فَضَلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَخْبِرْ بِذَلِكَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ» فَذَهَبَ جَابِرٌ إِلَى عُمَرَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ عَلِمْتُ حِينَ مَشَى فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، لَيُبَارِكَنَّ اللَّهُ فِيهَا[(٢)].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٩٦، وأبو داود: ٢٨٨٤ مختصراً، والنسائي: ٣٦٤٠.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، باوکی وەفاتی کرد قەرزێکی بۆ بەجێهێشت کە سی وەسق خورمای پیاوێکی جوولەکە بوو، جا (جابیر) داوای لە پیاوە جولەکەکە کرد کە قەرزەکەی دوابخات و مۆڵەتی بدات، بەڵام جولەکەکە قبوڵی نەکرد، بۆیە جابیر قسەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە لەلای ئەو تکای بۆ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لای و لەگەڵ پیاوە جولەکەکە قسەی کرد بەرهەمی باخە خورماکەی ببات لەبری قەرزەکەی، بەڵام قبوڵی نەکرد (چونکە بەری خورماکەی بە کەم زانیوە لەچاو قەرزەکە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵ کرد قەرزەکەی دوابخات و مۆڵەتی بدات، هەر قبوڵی نەکرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ناو باخە خورماکە و بە ناویدا ڕۆیشت، پاشان بە جابیری فەرموو: بەشی خۆی بۆ بچنە و قەرزەکەی بدەوە، ئەویش دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە سی وەسقی بۆ چنی و دوازدە ویسقیشی لێ مایەوە (واتە: زیادە بوو)، دواتر جابیر هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی هەواڵی ئەوەی پێبدات، بەڵام بینی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ نیە، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە جابیر هاتەوە خزمەتی و هەواڵی پێدا کە قەرزەکەی داوەتەوە و باسی ئەوەشی بۆ کرد کە زیاد بوو بو و لەبەری مابوویەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو هەواڵە بە عومەری کوڕی خەتتاب بگەیەنە، بۆیە جابیر ڕۆیشت بۆ لای عومەر و ئەو هەواڵەی پێدا، بۆیە عومەریش پێی گوت: بێگومان خۆم دەمزانی کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ناویدا ڕۆیشت خوا خێردارو بەرەکەتداری دەکات.

## بابەت: سێ جۆرە کەس هەن قەرز بکەن، خوا قەرزەکەیان بۆ دەداتەوە

**٢٤٣٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الدَّيْنَ يُقْضَى مِنْ صَاحِبِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِذَا مَاتَ، إِلَّا مَنْ تَدَيَّنَ فِي ثَلَاثِ خِلَالٍ: الرَّجُلُ تَضْعُفُ قُوَّتُهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَسْتَدِينُ يَتَقَوَّى بِهِ لِعَدُوِّ اللَّهِ وَعَدُوِّهِ، وَرَجُلٌ يَمُوتُ عِنْدَهُ مُسْلِمٌ لَا يَجِدُ مَا يُكَفِّنُهُ وَيُوَارِيهِ إِلَّا بِدَيْنٍ، وَرَجُلٌ خَافَ اللَّهَ عَلَى نَفْسِهِ الْعُزْبَةَ، فَيَنْكِحُ خَشْيَةً عَلَى دِينِهِ، فَإِنَّ اللَّهَ يَقْضِي عَنْ هَؤُلَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].

---

(١) ضعيف.





واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەسی قەرزدار کاتێ وەفات دەکات لە ڕۆژی دواییدا داوای قەرزەکەی لێ دەکرێتەوە، تەنها کەسێک نەبێ کە لە یەکێک لەو حاڵەتانەدا قەرزدار دەبێ: پیاوێک کە لە پێناوی خوادا هێز و دەسەڵاتی نەمابێ، جا قەرز دەکات بۆ ئەوەی بەرانبەری دوژمنی خوا و دوژمنەکەی خۆی بوەستێتەوە و بەهێز بێ، وە هەروەها کەسێک کە مسوڵمانێک لەلای وەفات دەکات، هیچی دەست ناکەوێت کە پێی کفن بکات و بیشارێتەوە (بینێژێ) تەنها بە قەرزکردن نەبێ، وە پیاوێکیش کە ترساوە لە دینەکەی کە بە ڕەبەنی بمێنێتەوە، بۆیە هاوسەرگیری دەکات، بۆیە خوا بە زاتی خۆی لە ڕۆژی دواییدا قەرزی ئەو جۆرە کەسانە دەداتەوە.






## بابەت: ئەو فەرموودەیەی كە ئەبو بەكری كوڕی شەیبە دەیگێڕێتەوە

**٢٤٣٦-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، اشْتَرَى مِنْ يَهُودِيٍّ طَعَامًا إِلَى أَجَلٍ، وَرَهَنَهُ دِرْعَهُ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ خواردن و خۆراكی لە جوولەكەیەک كڕی بە قەرز بۆ ماوەیەكی دیاریكراو، لە بری ئەوە زرێكەی لە بارمتەدا دانا.

**٢٤٣٧-** عَنْ أَنَسٍ ﵁، قَالَ: «لَقَدْ رَهَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِرْعَهُ عِنْدَ يَهُودِيٍّ بِالْمَدِينَةِ، فَأَخَذَ لِأَهْلِهِ مِنْهُ شَعِيرًا»[٢].

واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زرێكەی لەلای جوولەكەیەک بە بارمتە دانا لە مەدینە، ئنجا لە بری زرێكە جۆی لە جوولەكەكە كڕی بۆ ماڵ و منداڵەكەی.

**٢٤٣٨-** عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ ﵂ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، تُوُفِّيَ وَدِرْعُهُ مَرْهُونَةٌ عِنْدَ يَهُودِيٍّ بِطَعَامٍ»[٣].

واتە: ئەسمائی كچی یەزید ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ كاتێ وەفاتی كرد، زرێكەی لە بری خواردن لەلای جوولەكەیەک بارمتە بوو.

**٢٤٣٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، مَاتَ وَدِرْعُهُ رَهْنٌ عِنْدَ يَهُودِيٍّ بِثَلَاثِينَ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ»[٤].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ وەفاتی كرد، زرێكەی لە بری سی صاع جۆ لەلای جوولەكەیەک بارمتەكراو بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٦٨، ومسلم: ١٦٠٣، والنسائي: ٤٦٠٩ و ٤٦٥٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٠٦٩، والترمذي: ١٢١٥، والنسائي: ٤٦١٠.

(٣) صحيح لغيره.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٢١٤، والنسائي: ٤٦٥١.

## بابەت: بارمتەی وڵاخی سواری و ماڵاتی دۆشراو(١)

٢٤٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الظَّهْرُ يُرْكَبُ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا، وَلَبَنُ الدَّرِّ يُشْرَبُ إِذَا كَانَ مَرْهُونًا، وَعَلَى الَّذِي يَرْكَبُ وَيَشْرَبُ نَفَقَتُهُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر وڵاخی سواری بارمتە کرابوو، سوارییەکەی دروستە (بۆ ئەو کەسەی بە بارمتە وەری گرتوە)، وە ماڵاتی شیردەر ئەگەر لە بارمتەدا دانرا دروستە شیرەکەی بخورێتەوە، بەڵام بەخێوکردنی وڵاخەکە و ماڵاتەکە لەسەر ئەو کەسەیە کە سواری وڵاخەکە دەبێ و شیری ماڵاتەکە دەخواتەوە (لە بری سواربوونی و شیر خواردنەکە).

## بابەت: بارمتەکراو قەدەغە ناکرێ لە بارمتەدەرەکە

٢٤٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا يَغْلَقُ الرَّهْنُ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو شتەی کە بە بارمتە دانراوە لە بارمتە دەرەکە قەدەغە ناکرێ (نابێ بارمتە وەرگرەکە دەستی بەسەر دابگرێ و نەهێڵێ بارمتەدەر سوودی لێ وەربگرێ، بۆ نمونە: ئەگەر عومەر خانوو بە بارمتە بدات بە خالید، خالید نابێ ڕێگر بێ لەوەی کە عومەر سوود لە خانوەکە ببینێ، بەڵکو ئەوە خالیدە کە نابێ بە هیچ جۆرێک سوود لە خانوەکە ببینێ).

## بابەت: کرێی کرێکار

٢٤٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ كُنْتُ خَصْمَهُ خَصَمْتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَعْطَى بِي، ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا، فَاسْتَوْفَى مِنْهُ وَلَمْ يُوفِهِ أَجْرَهُ»[٤].

---

(١) وڵاخی بارمتە کراو دەکرێ بەکاربهێنرێ وە ماڵاتی شیردەر دەکرێ بدۆشرێ.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥١١، وأبو داود: ٣٥٢٦، والترمذي: ١٢٥٤.

(٣) ضعيف.

(٤) حسن. أخرجه البخاري: ٢٢٢٧ و ٢٢٧٠.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کۆمەڵ هەن کە لە ڕۆژی قیامەتدا من بەرەو ڕوویان دەبمەوە، هەر کەسێکیش من بەرەو ڕووی ببمەوە بە سەریدا سەردەکەوم و زاڵ دەبم بەسەریدا، (یەکێک لەو کەسانە) پیاوێک بە هۆی ناوی منەوە پەیمانێک بدات و دواتر بیشکێنێ، وە پیاوێک کەسێکی ئازاد بفرۆشێ و پارەکەشی بخوات، وە کەسێک کرێکارێک بە کرێ بگرێ و کارەکەی پێبکات و کرێیەکەی پێ نەدات.

**٢٤٤٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَعْطُوا الْأَجِيرَ أَجْرَهُ، قَبْلَ أَنْ يَجِفَّ عَرَقُهُ»[١].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کرێی کرێکار بدەن پێش ئەوەی ئارەقەکەی وشک بێتەوە.

## بابەت: بەکرێگرتنی کرێکار لەسەر نان پێدان

**٢٤٤٤- عَنْ عُلَيِّ بْنِ رَبَاحٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عُتْبَةَ بْنَ النُّدَّرِ ﷺ، يَقُولُ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَرَأَ: ﴿ طسم ﴾ حَتَّى إِذَا بَلَغَ قِصَّةَ مُوسَى، قَالَ: «إِنَّ مُوسَى ﷺ أَجَرَ نَفْسَهُ ثَمَانِيَ سِنِينَ، أَوْ عَشْرًا، عَلَى عِفَّةِ فَرْجِهِ، وَطَعَامِ بَطْنِهِ»[٢].**

واتە: عولەی کوڕی ڕەباح دەڵێ: گوێم لە عوتبەی کوڕی نودەر ﷺ بوو دەیگوت: ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە سەرەتای سوورەتی ﴿ طسم ﴾ـی خوێند تا گەیشتە بەسەرهاتی موسا، فەرمووی: لە ڕاستیدا موسا خۆی کرد بە کرێکار هەشت ساڵ، یان دە ساڵ بۆ پاراستنی داوێنی خۆی و تێرکردنی سکی.

**٢٤٤٥- عَنْ سَلِيمُ بْنُ حَيَّانَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: «نَشَأْتُ يَتِيمًا، وَهَاجَرْتُ مِسْكِينًا، وَكُنْتُ أَجِيرًا لِابْنَةِ غَزْوَانَ بِطَعَامِ بَطْنِي، وَعُقْبَةِ رِجْلِي، أَحْطِبُ لَهُمْ إِذَا نَزَلُوا، وَأَحْدُو لَهُمْ إِذَا رَكِبُوا، فَالْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ الدِّينَ قِوَامًا، وَجَعَلَ أَبَا هُرَيْرَةَ إِمَامًا»[٣].**

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح.

واتە: سەلیمی کوڕی حەیان دەڵێ: گوێم لە باوکم بوو دەیگوت: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو، دەیگوت: بە هەتیوی پێگەیشتم، وە بە هەژاری کۆچم کرد و بووم بە کرێکار لای ئیبنو غەزوان بە نانە سک و بە نۆرە سواری، جا ئەگەر دادەبەزین دار و چیلکەم بۆ کۆدەکردنەوەو، ئەگەر ڕۆیشتبان وشترەکانم بۆ لێ دەخوڕین، بۆیە سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە دینی کردە مایەی بەهێزی و ئەبو هورەیرەی کردە پێشەوا.

## بابەت: ئاودانی داری خورما
## بە دەنکە خورما و بە مەرجی خورمای چاک

**٢٤٤٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «أَصَابَ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ خَصَاصَةٌ، فَبَلَغَ ذَلِكَ عَلِيًّا ﷺ، فَخَرَجَ يَلْتَمِسُ عَمَلًا يُصِيبُ فِيهِ شَيْئًا لِيُقِيتَ بِهِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَتَى بُسْتَانًا لِرَجُلٍ مِنَ الْيَهُودِ، فَاسْتَقَى لَهُ سَبْعَةَ عَشَرَ دَلْوًا، كُلُّ دَلْوٍ بِتَمْرَةٍ، فَخَيَّرَهُ الْيَهُودِيُّ مِنْ تَمْرِهِ، سَبْعَ عَشَرَةَ عَجْوَةً، فَجَاءَ بِهَا إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستی بە خۆراک بوو، ئەمە بە عەلی ﷺ گەیشت، ئەویش دەرچوو بۆ ئەوەی کارێک پەیدا بکات تاکو قوتێکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پێ پەیدا بکات، جا هاتە باخە خورمایەکی پیاوێکی جوولەکە، بە حەڤدە سەتڵ خورمای بۆ ئاودا، هەر سەتڵێک و دەنکە خورمایەک، ئنجا جوولەکەکەی سەرپشکی کرد بۆ حەڤدە خورمای عەجوە (کە باشترین جۆری خورمایە)، (عەلیش) خورماکانی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ.

**٢٤٤٧-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: «كُنْتُ أَدْلُو الدَّلْوَ بِتَمْرَةٍ، وَأَشْتَرِطُ أَنَّهَا جَلْدَةٌ»[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: ئەمن بە سەتڵ خورمام ئاو دەدا، بۆ هەر سەتڵێک دەنکە خورمایەک، وە بە مەرجیشم دەکرد کە خورمای چاک بێ.

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) ضعيف. أخرجه االترمذي: ٢٤٧٣ مطولًا.

٢٤٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لِي أَرَى لَوْنَكَ مُنْكَفِئًا؟ قَالَ: «الْخَمْصُ» فَانْطَلَقَ الْأَنْصَارِيُّ إِلَى رَحْلِهِ، فَلَمْ يَجِدْ فِي رَحْلِهِ شَيْئًا، فَخَرَجَ يَطْلُبُ، فَإِذَا هُوَ بِيَهُودِيٍّ يَسْقِي نَخْلًا، فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّ لِلْيَهُودِيِّ: أَسْقِي نَخْلَكَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: كُلُّ دَلْوٍ بِتَمْرَةٍ، وَاشْتَرَطَ الْأَنْصَارِيُّ أَنْ لَا يَأْخُذَ خَدِرَةً، وَلَا تَارِزَةً، وَلَا حَشَفَةً، وَلَا يَأْخُذَ إِلَّا جَلْدَةً، فَاسْتَقَى بِنَحْوٍ مِنْ صَاعَيْنِ، فَجَاءَ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە ئەنصارِ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چییە بۆ دەتبینم ڕەنگت گۆڕاوە؟ فەرمووی: لە برسان، جا ئەنصارییەکە ڕۆیشت بەرەو ماڵەکەی، وە لە ماڵەکەیدا هیچ شتێکی بۆ خواردن دەست نەکەوت، ئنجا دەرچوو بەدوای کاردا گەڕا، لەوکاتەدا جوولەکەیەکی بینی کە خورما ئاو دەدات، ئەنصارییەکەش بە یەهودییەکەی گوت: خورماکانت بۆ ئاو بدەم؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: لە بری هەر ستڵێک خورمایەک، وە ئەنصارییەکەش کردیە مەرج کە خورمای ڕەش بو و خراپ و وشک وەرناگرێ، مەگەر باشترین نەبێ وەری ناگرێ، ئنجا بە بەهای نزیکەی دوو صاع بۆی ئاودا، دواتر هێنانی بۆ پێغەمبەر ﷺ.

## بابەت: کشتوکاڵ کردن بە سێیەک و چواریەک

٢٤٤٩- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ، وَقَالَ: «إِنَّمَا يَزْرَعُ ثَلَاثَةٌ: رَجُلٌ لَهُ أَرْضٌ، فَهُوَ يَزْرَعُهَا، وَرَجُلٌ مُنِحَ أَرْضًا، فَهُوَ يَزْرَعُ مَا مُنِحَ، وَرَجُلٌ اسْتَكْرَى أَرْضًا بِذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ»[٢].

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی فرۆشتنی گۆترەی باغ و کشتوکاڵی بە پێوانە قەدەغە کردوە. فەرموویەتی: سێ کەس کشتوکاڵ دەکەن: کەسێک کە بۆ خۆی زەوی هەبێ، کشتوکاڵی لێدەکات، وە کەسێک زەوییەکی پێدەدرێ و دەیکات بە کشتوکاڵ، وە کەسێک زەوییەک بە کرێ بگرێ بە دینارو دەرهەم (واتە: بە پارە).

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٠٠، والنسائي: ٣٨٩٠. وانظر البخاري: ٢٣٨٣_٢٣٨٤، ومسلم: ١٥٤٠/٧٠.

**٢٤٥٠-** عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ، يَقُولُ: كُنَّا نُخَابِرُ وَلَا نَرَى بِذَلِكَ بَأْسًا، حَتَّى سَمِعْنَا رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ، يَقُولُ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْهُ» فَتَرَكْنَاهُ لِقَوْلِهِ[١].

**واتە: عەمری کوڕی دینار دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عومەر ﷺ بوو دەیگوت: ئێمە کشتوکاڵمان بە نیوەیی و سێیەک و ئەوانە دەکرد، پێمان وابوو هیچ کێشەیەکی نیە، هەتاکو لە ڕافیعی کوڕی خەدیجمان بیست کە دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارەی قەدەغە کردوە، ئیتر ئێمەش لەبەر قسەکەی ئەو وازمان هێنا.**

**٢٤٥١-** عَنْ عَطَاءٌ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، يَقُولُ: كَانَتْ لِرِجَالٍ مِنَّا فُضُولُ أَرَضِينَ يُؤَاجِرُونَهَا عَلَى الثُّلُثِ وَالرُّبُعِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ فُضُولُ أَرَضِينَ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ لِيُزْرِعْهَا أَخَاهُ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُمْسِكْ أَرْضَهُ»[٢].

**واتە: عەتاء ﷺ دەڵێ: گوێم لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا بوو دەیگوت: هەندێ لە پیاوانی ئێمە زەوی زیادەیان هەبوو، جا بە کرێیان دەدا بە سێیەک و چواریەک، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک زەوی زیادەی هەبوو با کشتوکاڵی لێبکات، یان بیدات بە براکەی بیکاتە کشتوکاڵ، ئەگەر نەیکرد با زەوییکە ڕابگرێ.**

**٢٤٥٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ لِيَمْنَحْهَا أَخَاهُ، فَإِنْ أَبَى، فَلْيُمْسِكْ أَرْضَهُ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک زەوی هەیە با بەکاری بینێ، یان بیداتە براکەی، خۆ ئەگەر نەیکرد، با زەوییەکە ڕابگرێ (بە بەیاری).**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٤٧، وأبو داود: ٣٣٨٩، والنسائي: ٣٩١٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٤٠ و ٢٦٣٢، ومسلم: ٣٦٨٩، والنسائي: ٣٨٧٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٤١ معلقاً، ومسلم: ١٥٤٤.

## بابەت: بە کرێدانی زەوی

**٢٤٥٣-** عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يُكْرِي أَرْضًا لَهُ مَزَارِعًا، فَأَتَاهُ إِنْسَانٌ فَأَخْبَرَهُ عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ»، فَذَهَبَ ابْنُ عُمَرَ، وَذَهَبْتُ مَعَهُ حَتَّى أَتَاهُ بِالْبَلَاطِ، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ، فَأَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «نَهَى عَنْ كِرَاءِ الْمَزَارِعِ» فَتَرَكَ عَبْدُ اللَّهِ كِرَاءَهَا[١].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﷺ زەوییەکی هەبوو بە کرێی دەدا بۆ کشتوکاڵ، کەسێک هات لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە ﷺ بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زەوی بە کرێدانی قەدەغە کردوە، ئنجا ئیبنو عومەر ڕۆیشت و منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم هەتا لە «بلاط» پێی گەیشت، ئنجا پرسیاری لەوبارەیەوە لێکرد(ڕافیع)یش، ئەویش هەواڵی پێدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە بەکرێدانی زەوی، ئیتر عەبدوڵڵا وازی لە بەکرێدان هێنا.

**٢٤٥٤-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَزْرَعْهَا، أَوْ لِيُزْرِعْهَا، وَلَا يُؤَاجِرْهَا»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: هەر کەسێک زەوی هەیە، با خۆی بیکاتە کشتوکاڵ، یان بیداتە کەسێک بۆ کشتوکاڵ وە بە کرێی نەدات.

**٢٤٥٥-** عَنْ أَبَا سعيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنِ الْمُحَاقَلَةِ» وَالْمُحَاقَلَةُ: اسْتِكْرَاءُ الْأَرْضِ[٣].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە: دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە موحاقەلە. موحاقەلەش واتە: بە کرێدانی زەوی.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٤٤، ومسلم: ١٥٤٧، وأبو داود: ٣٣٩٤ تعليقاً، والنسائي: ٣٩١١_٣٩١٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٤٠، ومسلم: ١٥٤٣، والنسائي: ٣٨٧٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٨٦، ومسلم: ١٥٤٦، والنسائي: ٣٨٨٥.




## بابەت: ڕێپێدان بۆ بە کرێدانی زەوی سپی بە زێڕ و زیو

٢٤٥٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّهُ لَمَّا سَمِعَ إِكْثَارَ النَّاسِ فِي كِرَاءِ الْأَرْضِ، قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا مَنَحَهَا أَحَدُكُمْ أَخَاهُ» وَلَمْ يَنْهَ عَنْ كِرَائِهَا[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، کاتێک بیستی بە کرێدانی زەوی لەنێو خەڵکیدا زیادی کردوە گوتی: پاک و بێگەردی بۆ خوا لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەدەکرا هەر یەکێکتان (زەوییە زیادەکەی) بدابایە بە براکەی، وە نەهی نەکردوە لە بە کرێدانیشی.

٢٤٥٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَأَنْ يَمْنَحَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ أَرْضَهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا كَذَا وَكَذَا» لِشَيْءٍ مَعْلُومٍ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: «وَهُوَ الْحَقْلُ، وَهُوَ بِلِسَانِ الْأَنْصَارِ الْمُحَاقَلَةُ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە زەوییەکەی (کە زیادە لە خۆی) بدات بە براکەی باشترە بۆی لەوەی کە ئەوە و ئەوەی لەسەر وەرگرێ. واتە: شتێکی دیاریکراو. ئیبنو عەبباس گوتی: مەبەستی پێ حەقلە، ئەویش بە زمانی ئەنصارییەکان واتە: موحاقەلە (زەوی بە کرێدان).

٢٤٥٨- عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ قَيْسٍ، قَالَ: سَأَلْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نُكْرِي الْأَرْضَ عَلَى أَنَّ لَكَ مَا أَخْرَجَتْ هَذِهِ، وَلِي مَا أَخْرَجَتْ هَذِهِ، فَنُهِينَا أَنْ نُكْرِيَهَا بِمَا أَخْرَجَتْ، وَلَمْ نُنْهَ أَنْ نُكْرِيَ الْأَرْضَ بِالْوَرِقِ»[٣].

واتە: حەنزەڵەی کوڕی قەیس ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ کرد، گوتی: ئێمە زەویمان ئاوا بە کرێدەدا دەمانگوت: ئەوە چەندی بەرهەم هێنا بۆ تۆ، ئەمەش چەندی بەرهەم هێنا بۆ من، بەڵام لەو جۆرەی کە بە کرێی بدەین لەسەر ئەو

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٣٠، ومسلم: ١٥٥٠، وأبو داود: ٣٣٨٩، والترمذي: ١٣٨٥، والنسائي: ٣٨٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٥٠/١٢٢. وانظر الذي قبله.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٢٧ و ٢٧٢٢، ومسلم: ١٥٤٧/١١٧، وأبو داود: ٣٣٩٢ و ٣٣٩٣، والنسائي: ٣٨٩٨_٣٩٠١.

کشتوکاڵەی بەرهەمی دەهێنێ نەهیان لێکرا و لێیان قەدەغە کرا، بەڵام ئەوەمان لێ قەدەغە نەکرا کە زەوی بە کرێ بگرین بە زیو (بە پارە).

## بابەت: ئەو جۆرە کشتوکاڵ کردنەی کە ناپەسندە

**٢٤٥٩-** عَنْ ظُهَيْرٍ ﷺ، قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا رَافِقًا، فَقُلْتُ: مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَهُوَ حَقٌّ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَصْنَعُونَ بِمَحَاقِلِكُمْ؟» قُلْنَا: نُؤَاجِرُهَا عَلَى الثُّلُثِ، وَالرُّبُعِ، وَالْأَوْسُقِ مِنَ الْبُرِّ وَالشَّعِيرِ، فَقَالَ: «فَلَا تَفْعَلُوا، ازْرَعُوهَا، أَوْ أَزْرِعُوهَا»[1].

واتە: زوهەیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کارێک قەدەغەی کردین کە ئاسانکاری بۆ ئێمە تێدابو و پێمان باش بوو، منیش گوتم: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیفەرمووێ ئەوەیان هەقە، ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: زەوییەکانتان چۆن بەکاردێنن؟ گوتمان: بە سێیەک و چواریەک و پێوانەیەکی دیاریکراو لە گەنم و جۆ بە کرێیان دەدەین، فەرمووی: ئەو کارە مەکەن، یان بۆ خۆتان بیکەنە شینایی، یان کەسێکیتر بیکاتە شینایی.

**٢٤٦٠-** عَنْ أُسَيْدِ بْنِ ظُهَيْرٍ ﷺ، ابْنِ أَخِي رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، قَالَ: كَانَ أَحَدُنَا إِذَا اسْتَغْنَى عَنْ أَرْضِهِ أَعْطَاهَا بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ وَالنِّصْفِ، وَيَشْتَرِطُ ثَلَاثَ جَدَاوِلَ، وَالْقُصَارَةَ، وَمَا سَقَى الرَّبِيعُ، وَكَانَ الْعَيْشُ إِذْ ذَاكَ شَدِيدًا، وَكَانَ يَعْمَلُ فِيهَا بِالْحَدِيدِ، وَبِمَا شَاءَ اللَّهُ، وَيُصِيبُ مِنْهَا مَنْفَعَةً، فَأَتَانَا رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَاكُمْ عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَكُمْ نَافِعًا، وَطَاعَةُ اللَّهِ وَطَاعَةُ رَسُولِهِ أَنْفَعُ لَكُمْ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْهَاكُمْ عَنِ الْحَقْلِ، وَيَقُولُ: «مَنِ اسْتَغْنَى عَنْ أَرْضِهِ فَلْيَمْنَحْهَا أَخَاهُ، أَوْ لِيَدَعْ»[2].

واتە: ئوسەیدی کوڕی زوهەیر ﷺ کە برازای ڕافیعی کوڕی خەدیج بووە دەگێڕنەوە کە لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە گێڕاویەتەوە کە گوتوویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێمە زەوییەکی لێ زیاد بووایە، بە سێیەک و چواریەک و نیوەیی بە کرێی دەدا، وە سێ بەشیشی بە مەرج دادەنا لەوەی کە لە دەوری جۆگاکان شین دەبو و ئەوەشی لە ناو

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٣٩، ومسلم: ١٥٤٨، والنسائي: ٣٩٢٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٤٨، وأبو داود: ٣٣٩٨، والنسائي: ٣٨٦٤_٣٨٦٦.

گوڵە گەنمەکاندا دەمایەوە و ئەوەشی کە بە باران پێدەگەیشت، ژیانیش ئەوکات سەخت بوو، بە قورسی کاریان تێدا دەکرد و ئەوەی خوا ویستی لێبایە، ئەوجار قازانجێکیان دەست دەکەوت، جا ڕافیعی کوڕی خەدیج هات، گوتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارەی کە (بە ڕواڵەت) سوودی هەیە بۆتان قەدەغە کردوە، وە فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ سوودی زیاترە بۆتان، بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە زەوی بە بەشی دیاریکراو بەکرێ بدرێ، وە فەرموویەتی: هەر کەسێک زەوییەکەی لێ زیادە با بیدا بە براکەی، یان وازی لێبێنێ.

٢٤٦١- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، قَالَ: قَالَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ: يَغْفِرُ اللَّهُ لِرَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ أَنَا وَاللَّهِ، أَعْلَمُ بِالْحَدِيثِ مِنْهُ، إِنَّمَا أَتَى رَجُلَانِ النَّبِيَّ ﷺ، وَقَدِ اقْتَتَلَا، فَقَالَ: «إِنْ كَانَ هَذَا شَأْنُكُمْ فَلَا تُكْرُوا الْمَزَارِعَ» فَسَمِعَ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ قَوْلَهُ: «فَلَا تُكْرُوا الْمَزَارِعَ»[1].

واتە: عوڕوەی کوڕی زوبەیر ﷺ دەڵێ: زەیدی کوڕی سابیت ﷺ گوتی: خوا لە ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ خۆش بێت، سوێند بە خوا من لە ئەو زیاتر زاناتر بووم بە فەرموودەکە، (ڕووداوەکە بەو جۆرە بوو) دوو پیاو هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کێشەیان هەبوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەگەر حاڵتان ئاوایە زەوییەکانتان بە کرێ مەدەن، جا ڕافیعی کوڕی خەدیج تەنها ئەوەی بیست کە فەرمووی: جا زەوییەکانتان بە کرێ مەدەن.

## بابەت: مۆڵەتدان بە بە کرێدانی زەوی بە سێیەک و چواریەک

٢٤٦٢- عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، قَالَ: قُلْتُ لِطَاوُسٍ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ لَوْ تَرَكْتَ هَذِهِ الْمُخَابَرَةَ، فَإِنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْهُ، فَقَالَ: أَيْ عَمْرُو إِنِّي أُعِينُهُمْ وَأُعْطِيهِمْ، وَإِنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ أَخَذَ النَّاسَ عَلَيْهَا عِنْدَنَا، وَإِنَّ أَعْلَمَهُمْ، يَعْنِي ابْنَ عَبَّاسٍ، أَخْبَرَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَنْهَ عَنْهَا، وَلَكِنْ قَالَ: «لَأَنْ يَمْنَحَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا أَجْرًا مَعْلُومًا»[2].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٣٩٠، والنسائي: ٣٩٢٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٣٠، ومسلم: ١٥٥٠، وأبو داود: ٣٣٨٩، والترمذي: ١٣٨٥، والنسائي: ٣٨٧٣.

واتە: عەمرِی کوڕی دینار دەڵێ: بە تاوسم گوت: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان خۆزگە ئەو جۆرە زەوی بە کرێدانەت بە بەش وازلێهێنابا، چونکە خەڵکی پێیان وایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە، عەمرِ گوتی: من یارمەتییان دەدەم و پێشیان دەدەم، وە موعازی کوڕی جەبەل ﷺ خەڵکی هان دەدا بۆ ئەو جۆرە مامەڵەیە یان ڕێگای پێدەدان، وە زاناتریان کە ئیبنو عەبباسە پێی گوتووم پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارەی قەدەغە نەکردوە، بەڵکو فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە زەوییەکەی بداتە براکەی بۆی باشترە، لەوەی کە کرێیەکی دیاریکراوی لێوەربگرێ.

**٢٤٦٣-** عَنْ طَاوُسٍ، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ ﷺ، «أَكْرَى الْأَرْضَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، عَلَى الثُّلُثِ وَالرُّبُعِ فَهُوَ يُعْمَلُ بِهِ إِلَى يَوْمِكَ هَذَا»[١].

واتە: تاوس دەگێڕێتەوە، موعازی کوڕی جەبەل ﷺ لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان لەسەر سێیەک و چواریەک زەوی بە کرێ دەدا، وە ئەو جۆرە کارە ئیشی پێدەکرێ (لەوکاتەوە) تا ئەو ڕۆژەی تۆی تێدایی.

**٢٤٦٤-** عَنْ طَاوُسٍ، قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: إِنَّمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَأَنْ يَمْنَحَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ الْأَرْضَ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ خَرَاجًا مَعْلُومًا»[٢].

واتە: تاوس ﷺ دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ گوتوویەتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە زەوییەکەی بداتە براکەی (بۆ کشتوکاڵ)، بۆی باشترە لەوەی کە کرێ و خەڕاجی دیاریکراوی لێوەربگرێت.

## بابەت: بە کرێ دانی زەوی بە خواردن و خۆراک

**٢٤٦٥-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نُحَاقِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَزَعَمَ أَنَّ بَعْضَ عُمُومَتِهِ أَتَاهُمْ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ، فَلَا يُكْرِيهَا بِطَعَامٍ مُسَمًّى»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٣٠، ومسلم: ١٥٥٠، وأبو داود: ٣٣٨٩، والترمذي: ١٣٨٥، والنسائي: ٣٨٧٣.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٣٩٥ و ٣٣٩٦، والنسائي: ٣٣٩٥.

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ، دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ زەویمان بە خواردن و خۆراک (موحاقەلە) بە کرێ دەدا، بەڵام پێی وایە کە یەکێک لە مامەکانی هاتووە بۆ لایان و گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک زەوی هەیە با بە کرێی نەدات بە خواردن و خۆراکی دیاریکراو.

## بابەت: ئەو کەسەی زەوی خەڵکانێکی چاندووە و مۆڵەتی لێ وەرنەگرتوون

٢٤٦٦- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ زَرَعَ فِي أَرْضِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ، فَلَيْسَ لَهُ مِنَ الزَّرْعِ شَيْءٌ، وَتُرَدُّ عَلَيْهِ نَفَقَتُهُ»[1].

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە زەوی خەڵکێکدا کشتوکاڵ بکات بێ مۆڵەتی خاوەنەکەی، هیچ بەشی بە کشتوکاڵەکەوە نیە و ئەوەی لێی خەرج کردوە (لە داچاندن و پێگەیاندن) بۆی دەگەڕێنرێتەوە (بەروبومەکەش هی خاوەنی ئەصلی زەوییەکەیە).

## بابەت: مامەڵەکردن بە باخی خورما و ترێوە

٢٤٦٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَامَلَ أَهْلَ خَيْبَرَ بِالشَّطْرِ مِمَّا يَخْرُجُ مِنْ ثَمَرٍ، أَوْ زَرْعٍ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خەڵکی خەیبەر مامەڵەی کرد لەسەر نیوەیی میوەو شینایی زەوییەکان.

٢٤٦٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أَعْطَى خَيْبَرَ أَهْلَهَا عَلَى النِّصْفِ نَخْلِهَا وَأَرْضِهَا»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٠٣، والترمذي: ١٣٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٨٥، ومسلم: ١٥٥١، وأبو داود: ٣٠٠٨ و ٣٤٠٨ و ٣٤٠٩، والترمذي: ١٣٨٣، والنسائي: ٣٩٢٩ و ٣٩٣٠.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٣٤١٠_٣٤١٢

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ خەیبەری دایەوە بە خەڵکەکەی بە نیوەیی، هەم خورماکانی و هەم ئەوەی لە زەویدا دەچێنرێ.

٢٤٦٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «لَمَّا افْتَتَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَيْبَرَ، أَعْطَاهَا عَلَى النِّصْفِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ خەیبەری ئازاد کرد، خەیبەری دایەوە خەڵکەکەی بە نیوەیی.

## بابەت: پیتاندنی خورما (نێرەو مێیە پێکردن)

٢٤٧٠- عَنْ مُوسَى بْنَ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: مَرَرْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي نَخْلٍ، فَرَأَى قَوْمًا يُلَقِّحُونَ النَّخْلَ، فَقَالَ: «مَا يَصْنَعُ هَؤُلَاءِ؟» قَالُوا: يَأْخُذُونَ مِنَ الذَّكَرِ فَيَجْعَلُونَهُ فِي الْأُنْثَى، قَالَ: «مَا أَظُنُّ ذَلِكَ يُغْنِي شَيْئًا» فَبَلَغَهُمْ، فَتَرَكُوهُ، فَنَزَلُوا عَنْهَا، فَبَلَغَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّمَا هُوَ الظَّنُّ، إِنْ كَانَ يُغْنِي شَيْئًا فَاصْنَعُوهُ، فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ، وَإِنَّ الظَّنَّ يُخْطِئُ وَيُصِيبُ، وَلَكِنْ مَا قُلْتُ لَكُمْ: قَالَ اللَّهُ، فَلَنْ أَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ»[2].

واتە: موسای کوڕی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای باخە خورمایەکدا تێپەڕین، بینی خەڵکێک سەرقاڵی پیتاندنی خورماکانن، فەرمووی: ئەوانە چی دەکەن؟ گوتیان: (تۆوی) نێرەی دارخورماکە هەڵدەگرن و دەیخەنە سەر مێیەکە، فەرمووی: پێم وانیە ئەوە هیچ سوودی هەبێ، ئنجا خەڵکەکە ئەوەیان پێگەیشت و وازیان هیناو لەدارەکان هاتنە خوارەوە، ئەو واز لێهێنانەیان بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە، ئەویش فەرمووی: ئەوەی من گوتم گومان بوو، ئەگەر کارەکەتان سوودی هەیە ئەنجامی بدەن، لەڕاستیدا منیش وەکو ئێوە مرۆڤێکم گومانیش جار هەیە هەڵەیە دەردەچێ هەندێ جاریش ڕاست دەردەچێ، بەڵام هەرکات پێم گوتن: خوا فەرموویەتی، هەرگیز بە ناوی خواوە بە ناڕاست قسە ناکەم.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٣٦١.

**٢٤٧١-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَمِعَ أَصْوَاتًا، فَقَالَ: «مَا هَذَا الصَّوْتُ؟» قَالُوا: النَّخْلُ يَأْبِرُونَهُ، فَقَالَ: «لَوْ لَمْ يَفْعَلُوا لَصَلَحَ» فَلَمْ يُؤَبِّرُوا عَامَئِذٍ، فَصَارَ شِيصًا، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنْ كَانَ شَيْئًا مِنْ أَمْرِ دُنْيَاكُمْ، فَشَأْنُكُمْ بِهِ، وَإِنْ كَانَ شَيْئًا مِنْ أَمْرِ دِينِكُمْ، فَإِلَيَّ»[1].

**واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەنگێک بوو، ئنجا فەرمووی: ئەو دەنگە چییە؟ گوتیان: ئەوە خورما نێرەو مێیە پێدەکەنن، فەرمووی: ئەگەر ئەوەش نەکەن (خورماکە) دەبێ، ئیتر ئەو ساڵە موتوربەیان نەکرد، لە ئەنجامدا خورماکان کرچ و کاڵ دەرچوون، ئەوەشیان بۆ پێغەمبەر ﷺ باسکرد، فەرمووی: ئەگەر شتێک لە کارو باری دنیایی خۆتان بوو، ئیشی خۆتانە (خۆتان لێی شارەزان) خۆ ئەگەر لە کاروباری دینیش بوو، ئەوە ئیشی منە.**

## بابەت: مسوڵمانان لە سێ شتدا هاوبەشن

**٢٤٧٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُسْلِمُونَ شُرَكَاءُ فِي ثَلَاثٍ: فِي الْمَاءِ، وَالْكَلَإِ، وَالنَّارِ، وَثَمَنُهُ حَرَامٌ» قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: «يَعْنِي الْمَاءَ الْجَارِيَ»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمانان لە سێ شتدا هاوبەشن: ئاو، لەوەڕگا، ئاگر، وە پارەکەشی حەڕامە. ئەبو سەعید گوتی: مەبەستی ئاوی جاریە (کانیاو سەرچاوە و ڕووبار).**

**٢٤٧٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «ثَلَاثٌ لَا يُمْنَعْنَ: الْمَاءُ، وَالْكَلَأُ، وَالنَّارُ»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ شت هەیە کەسیان لێ قەدەغە ناکرێ: ئاوو لەوەڕگاو ئاگر.**

**٢٤٧٤-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الشَّيْءُ الَّذِي لَا يَحِلُّ مَنْعُهُ؟ قَالَ: «الْمَاءُ، وَالْمِلْحُ، وَالنَّارُ» قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا الْمَاءُ قَدْ عَرَفْنَاهُ، فَمَا بَالُ الْمِلْحِ وَالنَّارِ؟ قَالَ: «يَا حُمَيْرَاءُ مَنْ أَعْطَى نَارًا، فَكَأَنَّمَا تَصَدَّقَ بِجَمِيعِ مَا أَنْضَجَتْ تِلْكَ النَّارُ، وَمَنْ أَعْطَى مِلْحًا، فَكَأَنَّمَا

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٣٦٣.

(٢) صحيح دون «وَثَمَنُهُ حَرَامٌ».

(٣) صحيح.

تَصَدَّقَ بِجَمِيعِ مَا طَيَّبَ ذَلِكَ الْمِلْحُ، وَمَنْ سَقَى مُسْلِمًا شَرْبَةً مِنْ مَاءٍ، حَيْثُ يُوجَدُ الْمَاءُ، فَكَأَنَّمَا أَعْتَقَ رَقَبَةً، وَمَنْ سَقَى مُسْلِمًا شَرْبَةً مِنْ مَاءٍ، حَيْثُ لَا يُوجَدُ الْمَاءُ، فَكَأَنَّمَا أَحْيَاهَا»[١].

**واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شتە چییە کە قەدەغە کردنی حەڵاڵ نیە؟ فەمووی: ئاو و خوێ و ئاگر، گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ئاو زانیان بەڵام خوێ و ئاگر لەبەرچی؟ فەرمووی: ئەی سوورکەڵە، ئەوەی ئاگر بداتە کەسێک بە چاکە، وەکو ئەوەیە هەرچی بەو ئاگرە سازدەکرێ کردبیە خێرو چاکە، وە ئەوەی خوێ ببەخشێ وەکو ئەوەیە هەرچی خوێکەی تێکراوە ببەخشێ بە چاکە، وە هەر کەسێک قومە ئاوێک بداتە مسوڵمانێک دەستکەوتنی ئاسان بێ، وەکو ئەوەیە بەندەیەکی ئازادکردبێ، وە ئەگەر کەسێک قومە ئاوێک بداتە مسوڵمانێک کە لەو شوێنە ئاو دەستنەکەوێ، وەک ئەوە وایە کە زیندووی کردبێتەوە.**

## بابەت: دابڕین و پێدانی ڕووبارو سەرچاوەکان

**٢٤٧٥-** عَنْ أَبْيَضَ بْنِ حَمَّالٍ ﵁، أَنَّهُ اسْتَقْطَعَ الْمِلْحَ الَّذِي يُقَالُ لَهُ: مِلْحُ شَذَّا بِمَأْرِبٍ، فَأَقْطَعَهُ لَهُ، ثُمَّ إِنَّ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ التَّمِيمِيَّ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ وَرَدْتُ الْمِلْحَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَهُوَ بِأَرْضٍ لَيْسَ بِهَا مَاءٌ، وَمَنْ وَرَدَهُ أَخَذَهُ، وَهُوَ مِثْلُ الْمَاءِ الْعِدِّ، فَاسْتَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبْيَضَ بْنَ حَمَّالٍ فِي قَطِيعَتِهِ فِي الْمِلْحِ، فَقَالَ: قَدْ أَقَلْتُكَ مِنْهُ عَلَى أَنْ تَجْعَلَهُ مِنِّي صَدَقَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هُوَ مِنْكَ صَدَقَةٌ، وَهُوَ مِثْلُ الْمَاءِ الْعِدِّ، مَنْ وَرَدَهُ أَخَذَهُ» قَالَ فَرَجٌ: «وَهُوَ الْيَوْمَ عَلَى ذَلِكَ، مَنْ وَرَدَهُ أَخَذَهُ قَالَ: فَقَطَعَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَرْضًا وَنَخْلًا، بِالْجَوْفِ جَوْفِ مُرَادٍ مَكَانَهُ حِينَ أَقَالَهُ مِنْهُ»[٢].

**واتە: ئەبیەزی کوڕی حەممال ﵁ دەگێڕێتەوە، داوای دابڕینی خوێی شوێنێکی کرد بۆ خۆی کە پێی دەگوترا: خوێی شەزی مەئریب (لە یەمەن)، (بۆی دابڕی و پێیدا)، پاشان ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە سەردەمی نەفامیدا چووم بۆ شوێنی ئەو خوێیە کە لە زەوییەک دایە هیچ ئاوی پێوە نیە، هەر کەسێک بچێ بۆ ئەو شوێنە دەتوانێ خوێیەکە**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٠٦٤ و ٣٠٦٦، والترمذي: ١٣٨٠.

هەڵبگرێتەوە وەکو ئاوێکی نەوەستاو و ڕۆیشتوو وایە (واتە: هیچ ماندووبوونی ناوێ بۆ دەرهێنانی، چونکە هەر بۆخۆی ئامادەیە هەر کەسێک بەلایدا تێپەڕێ بەبێ ماندووبوون دەتوانێ بەکاریبێنێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە ئەبیەزی کوڕی حەمال کرد کە دەستبەرداری ئەو خوێیە ببێ کە بۆی دابڕیوە، ئەویش گوتی: وازی لێ دێنم بە مەرجێک وەکو سەدەقەیەک بێ لە منەوە (واتە: نەدرێ بە هیچ کەسێک)، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوێیەکە وەکو سەدەقەیەک وابێ لە تۆوە، وە وەکو ئاوی ڕۆیشتبوو وابێ، هەر کەس بۆی چوو بتوانێ لێی بەکاربێنێ. فەرەج گوتی: تاوەکو ئەمڕۆش ئەو شوێنە هەر ئاوایە، هەر کەسێک بۆی بچێ دەتوانێ لێی هەڵبگرێ، گوتی: جا پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێک کە پێیان دەگوت: جەوفی موراد، زەوییەکی بۆ دابڕی بە خورماوە لە بری ئەو شوێنەی کە لێی وەرگرتەوە.

## بابەت: ڕێگری کردن لە فرۆشتنی ئاو

**٢٤٧٦-** عَنْ أَبِي الْمِنْهَالِ ﷺ، سَمِعْتُ إِيَاسَ بْنَ عَبْدٍ الْمُزَنِيَّ، وَرَأَى نَاسًا يَبِيعُونَ الْمَاءَ، فَقَالَ: لَا تَبِيعُوا الْمَاءَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «نَهَى أَنْ يُبَاعَ الْمَاءُ»[1].

واتە: ئەبولـمینهال ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە ئییاسی کوڕی عەبدی موزەنی بووە، کاتێ بینیویەتی خەڵکانێک ئاو دەفرۆشن، ئنجا گوتوویەتی: ئاو مەفرۆشن، بە دڵنیایی گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە نەهی کرد لەوەی ئاو بفرۆشرێ.

**٢٤٧٧-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ فَضْلِ الْمَاءِ»[2].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهیکردوە لە فرۆشتنی ئەو ئاوەی کە زیادەیە (مادام خەڵکی دیکە پێویستی پێیەتی).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٤٧٨، والترمذي: ١٢٧١، والنسائي: ٤٦٦١_٤٦٦٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٥٦٥، والنسائي: ٤٦٦٠ و ٤٦٧٠.

## بابەت: ڕێگری کردن لە بەکارهێنانی
## ئاوی زیاد بۆ پاراستنی لەوەڕ (گژو گیا)

**٢٤٧٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَمْنَعْ أَحَدُكُمْ فَضْلَ مَاءٍ، لِيَمْنَعَ بِهِ الْكَلَأَ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان ئاوی زیاد لە خەڵکی قەدەغە نەکات، بۆ ئەوەی لەوەڕی (دەوروبەری ئاوەکە) قەدەغە بکات.

**٢٤٧٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ، وَلَا يُمْنَعُ نَقْعُ الْبِئْرِ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاوی زیادە قەدەغە ناکرێ (لە خەڵک)، وە ئاوی داوەستاوو زیادەی بیریش قەدەغە ناکرێ (لە خەڵک).

## بابەت: ئاودانی باخ بە ئاوی
## شیو و سەرچاوەکان و گلداناوەی ئاو

**٢٤٨٠-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ خَاصَمَ الزُّبَيْرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي شِرَاجِ الْحَرَّةِ الَّتِي يَسْقُونَ بِهَا النَّخْلَ، فَقَالَ الْأَنْصَارِيُّ: سَرِّحِ الْمَاءَ يَمُرَّ، فَأَبَى عَلَيْهِ، فَاخْتَصَمَا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْقِ يَا زُبَيْرُ ثُمَّ أَرْسِلِ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ» فَغَضِبَ الْأَنْصَارِيُّ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ؟ فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «يَا زُبَيْرُ اسْقِ، ثُمَّ احْبِسِ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ» قَالَ: فَقَالَ الزُّبَيْرُ: وَاللَّهِ إِنِّي لَأَحْسِبُ هَذِهِ الْآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٥٣، ومسلم: ١٥٦٦، وأبو داود: ٣٤٧٣، والترمذي: ١٢٧٢.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٦٠، ومسلم: ٢٣٥٧، وأبو داود: ٣٦٣٧، والترمذي: ١٣٦٣ و ٣٠٢٧، والنسائي: ٥٤٠٧ و ٥٤١٦.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک لە ئەنصارِ لەگەڵ زوبەیر کێشەیان کەوتە نێوان لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئاوەڕۆ (جۆگا)ی ئاوداشتنی باخی خورما، ئەنصارِییەکە گوتی: لێ گەڕێ با ئاوەکە بڕوات، (زوبەیریش) ڕازی نەبوو، بۆیە کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی زوبەیر! ئاوداشتنەکەت تەواو بکەو، دواتر ئاوەکە بەردەوە بۆ دراوسێیەکەت (بەری پێ مەگرە)، ئەنصارِییەکە (بەو بڕیارە) تووڕە بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە کوڕی پورتە ئاوا بڕیارتدا؟ (پێی وابووە دژی بەرژەوەندی ئەو بڕیاری داوە!! نەیزانی کە بڕیارەکەی پێغەمبەر ﷺ زیاتر لە بەرژەوەندی ئەو دایە، نەوەک زوبەیر)، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی گۆڕا (لە توڕەییدا) پاشان فەرمووی: ئەی زوبەیر ئاوداشتنەکەت بکە، پاشان ئاوەکە گل بدەوە، تاوەکو بگەڕێتەوە بۆ ڕەگی درەختەکان (یان تاوەکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شورەو بەربەستەی کە لە باخەکەدایە، چونکە ئەوە هەقی زوبەیر بوو، بڕیاری یەکەمجار بە چاوپۆشی و لێبوردەیی بوو، بەڵام ئەنصارِییەکە ڕازی نەبوو!) دواتر دەڵێ: زوبەیر گوتی: سوێند بە خوا وادەزانم کە ئەو ئایەتە بەم هۆیەوە دابەزی: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء، واتە: نەخێر (وانیە کەخۆیان بە باوەڕدار نیشیان دەدەن) سوێند بەپەروەردگارت بڕوا دارنین تا تۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوەو دووبەرەکیەکی نێوانیان دا لە پاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بەهیچ بێزارییەک لەو بڕیارەی تۆ داوتەو مل کەچ نەبن بەملکەچیەکی تەواو.

**شـراج:** جۆگا، ئەو شوێنەی ئاوی پێدا دەڕوات بۆ ناو زەوی و باغ.

**حـرة:** زەوی بەردەڵان.

**تێبینی:** ئەو فەرموودەیە ئەوەمان پێدەڵێ: کە لە کاتی چارەسەرکردنی کێشە لە نێوان خەڵکیدا پێویستە ڕەچاوی بەرژەوەندی هەردوولا بکرێ وەکو یەک، نەک بەرژەوەندی یەکێک لەبەرچاو بگیرێ لەسەر حیسابی بەرژەوەندی ئەویتر، هەروەها ئەوەشیان پێدەڵێ: کە دەبێ ئەوپەڕی ئەدەب و ڕێزمان هەبێ بەرانبەر بەو کەسانەی

کە هەڵدەستن بە چارەسەرکردنی کێشەکامان، خۆ ئەگەر بێ ئەدەبیەک کرا لەلایەن یەکێکیانەوە ئەوە دەکرێ تەمبێ بکرێ بە جۆرێک کە شیاوو گونجاو بێ، هەروەک پێغەمبەر ﷺ ئەنصارییەکەی تەمبێ کرد، بەوەی کە زیادە چاوپۆشیەکەی لێسەندەوە.

**٢٤٨١-** عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ أَبِي مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَيْلِ مَهْزُورٍ، الْأَعْلَى فَوْقَ الْأَسْفَلِ، يَسْقِي الْأَعْلَى إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ يُرْسِلُ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلُ مِنْهُ»[1].

واتە: سەعلەبەی کوڕی ئەبو مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەمەهزور (کە شیوێکی هی بەنو قوریزە بوو) بڕیاریدا کە ئەو باغانەی لەسەرەوەن پێش ئەوانەی خوارەوە خۆیان ئاودەدرێن، ئاوەکە ڕادەگیرێ تادەگاتە قولەپێیەکان، ئەوجا بەردەدرێتەوە بۆ ئەوانەی خوارخۆیان.

**٢٤٨٢-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «قَضَى فِي سَيْلِ مَهْزُورٍ، أَنْ يُمْسِكَ حَتَّى يَبْلُغَ الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ يُرْسِلَ الْمَاءَ»[2].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێڕەوی ئاوی مەهزور بڕیاریدا ئاوەکە گل بدرێتەوە تا دەگاتە قولەپێیەکان، پاشان ئاوەکە بەربدرێتەوە.

**٢٤٨٣-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «قَضَى فِي شُرْبِ النَّخْلِ مِنَ السَّيْلِ، أَنَّ الْأَعْلَى فَالْأَعْلَى يَشْرَبُ قَبْلَ الْأَسْفَلِ، وَيُتْرَكُ الْمَاءُ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ يُرْسَلُ الْمَاءُ إِلَى الْأَسْفَلِ الَّذِي يَلِيهِ، وَكَذَلِكَ، حَتَّى تَنْقَضِيَ الْحَوَائِطُ، أَوْ يَفْنَى الْمَاءُ»[3].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئاودانی باخی خورما بە ئاوی شیو و دۆڵەکان بڕیاریدا کە پێشتر کامیان لە سەرەوەترە ئەویان ئاوبدرێ، ئنجا ئەوەی دوای ئەو پێش ئەوانەی خوارەوە ئاوەکەش گل دەدرێتەوە تاکو دەگاتە قولەپێیەکان، پاشان بەردەدرێتەوە بۆ ئەوەی دوای خۆی، ئنجا بەوجۆرە تاباخەکان تەواودەبن یان ئاوەکە دەبڕێ و کۆتایی پێدێ.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٦٣٨ مطولًا.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٦٣٩.

(٣) صحيح لغيره.

## بابەت: دابەشكردنی ئاو

**٢٤٨٤-** عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُبَدَّأُ الْخَيْلُ يَوْمَ وِرْدِهَا»(١).

واته: کەسیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عەوفی موزەنیی لە باوکیەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە کاتی ئاودانی ئاژەڵدا ئەسپەکان پێش دەخرێن.

**٢٤٨٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ قَسْمٍ قُسِمَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَهُوَ عَلَى مَا قُسِمَ، وَكُلُّ قَسْمٍ أَدْرَكَهُ الْإِسْلَامُ، فَهُوَ عَلَى قَسْمِ الْإِسْلَامِ»(٢).

واته: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر دابەشکردنێ لە سەردەمی نەفامیدا (پێش ئیسلام) کرابێ، بەو جۆرە دەمێنێتەوە کە دابەشکراوە، هەر دابەشکردنێکیش لەسەردەمی ئیسلامدا بکرێ، بەپێی بڕیارەکانی ئیسلام دەبێ.

## بابەت: سنووری بیری ئاو

**٢٤٨٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «مَنْ حَفَرَ بِئْرًا فَلَهُ أَرْبَعُونَ ذِرَاعًا عَطَنًا لِمَاشِيَتِهِ»(٣).

واته: عەبدوڵڵای کوڕی موغەفەل ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بیرێک هەڵکەنێ (بە چواردەوری خۆیدا) چل باڵ هی خۆیەتی بۆ مۆڵگەی ماڵاتەکەی.

**٢٤٨٧-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حَرِيمُ الْبِئْرِ مَدُّ رِشَائِهَا»(٤).

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٩١٤.

(٣) حسن لغيره.

(٤) ضعيف.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سنووری بیری ئاو بە ئەندازەی درێژی ئەو پەتکەیە کە ئاوی پێ هەڵدێنجرێت لە هەر چوار لاوە.

## بابەت: سنووری دارو درەخت

٢٤٨٨- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى فِي النَّخْلَةِ وَالنَّخْلَتَيْنِ وَالثَّلَاثَةِ لِلرَّجُلِ فِي النَّخْلِ، فَيَخْتَلِفُونَ فِي حُقُوقِ ذَلِكَ، «فَقَضَى أَنَّ لِكُلِّ نَخْلَةٍ مِنْ أُولَئِكَ مِنَ الْأَسْفَلِ، مَبْلَغُ جَرِيدِهَا حَرِيمٌ لَهَا»[١].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سنووری دارخورمایەک، یان دوو، یان سێ دانە لە ناو باخە خورمادا کە هی کەسێک بێت و کێشەیان لەسەر هەبێ، بڕیاریداوە کە ئەندازەی سنووری هەرداریک لەلای خوارەوەی بە ئەندازەی پەلکەکەیەتی (واتە: گەڵاکانی بە بازنەیی).

٢٤٨٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حَرِيمُ النَّخْلَةِ مَدُّ جَرِيدِهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سنووری دارخورما بە ئەندازەی پەلکەکەیەتی (واتە: گەڵاکانی بە بازنەیی).

## بابەت: کەسێک کە خانوو دەفرۆشێ نرخی بە شتێکی وەک خۆی نەداتەوە

٢٤٩٠- عَنْ سَعِيدِ بْنِ حُرَيْثٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ بَاعَ دَارًا أَوْ عَقَارًا فَلَمْ يَجْعَلْ ثَمَنَهُ فِي مِثْلِهِ، كَانَ قَمِنًا أَنْ لَا يُبَارَكَ فِيهِ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) حسن.

**واتە: سەعیدی کوڕی حورەیس ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەسێک خانوو، یان زەوی فرۆشت و پارەکەی بە شتێکی وەک خۆی نەداتەوە، شایستەی ئەوەیە ئەو پارەیە بێ بەرەکەت بێ.**

**٢٤٩٠م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الْمَجِيدِ قَالَ: حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مُهَاجِرٍ، عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَخِيهِ سَعِيدِ بْنِ حُرَيْثٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ [١].

**واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.**

**٢٤٩١-** عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ بَاعَ دَارًا وَلَمْ يَجْعَلْ ثَمَنَهَا فِي مِثْلِهَا، لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهَا» [٢].

**واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خانوویەک بفرۆشێت و پارەکەی بە خانوویەکی وەک خۆی نەداتەوە (یان شتێک کە وەک خانووەکە بە نرخ بێ)، ئەو پارەیە بێ پیزو بەرەکەت بێ.**

* * *

---

(١) حسن.

(٢) صحیح.



# پەرتووکی

# شوفعة

# (مافی هەڵگرتنەوەو کڕینەوە)



---

كِتَابُ الشُّفْعَةِ.

## بابەت: فرۆشتنی خانوو یان زەوی و پرسکردن بە هاوبەش

**٢٤٩٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ نَخْلٌ أَوْ أَرْضٌ فَلَا يَبِعْهَا، حَتَّى يَعْرِضَهَا عَلَى شَرِيكِهِ»(١).

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک باخە خورما، یان زەویەکی هەبوو، با نەیفرۆشێ هەتا بۆ هاوبەشەکەی پێشنیار نەکات.

**٢٤٩٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَأَرَادَ بَيْعَهَا، فَلْيَعْرِضْهَا عَلَى جَارِهِ»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک زەوییەکی هەبو و ویستی بیفرۆشێ، با بۆ دراوسێیەکەی پێشنیار بکات (سەرەتا بە دراوسێکەی بڵێ).

## بابەت: کڕینەوەو هەڵگرتنەوەی ماڵی دراوسێ

**٢٤٩٤-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْجَارُ أَحَقُّ بِشُفْعَةِ جَارِهِ، يَنْتَظِرُ بِهَا إِنْ كَانَ غَائِبًا، إِذَا كَانَ طَرِيقُهُمَا وَاحِدًا»(٣).

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەموویەتی: دراوسێ لە پێشترو شایستەترە بۆ دراوسێکەی، جا با چاوەڕێ بکات، ئەگەر ئامادەش نەبێت و دیار نەبێت مادام ڕێگایان یەکە (واتە: مادام هەردووکیان یەک ڕێگا بۆ ئەو شوێنە بەکاردێنن و نێوان و سێوانیان جیانەکراوەتەوە).

**٢٤٩٥-** عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْجَارُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ»(٤).

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٧٠٠. وانظر مسلم: ١٦٠٨.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥١٨، والترمذي: ١٣٦٩.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٥٨ و ٦٩٧٧ و ٦٩٧٨ و ٦٩٨٠ و ٦٩٨١، وأبو داود: ٣٥١٦، والنسائي: ٤٧٠٢.

واتە: ئەبو ڕافیع ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دراوسێ لە پێشترە بە هۆی نزیکیەوە (واتە: لەلا تەنیشتەکانی خۆی کامیان دراوسێیەتی ئەو لە پێشترە).

٢٤٩٦- عَنِ الشَّرِيدِ بْنِ سُوَيْدٍ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرْضٌ لَيْسَ فِيهَا لِأَحَدٍ قِسْمٌ وَلَا شِرْكٌ، إِلَّا الْجِوَارُ، قَالَ: «الْجَارُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ»[١].

واتە: شەریدی کوڕی سوەید ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زەوییەک هەیە کەس بەشی تێدا نیە و هاوبەشی نیە تەنها دراوسێی هەیە (حوکمەکەی چیە؟)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: دراوسێ لەوانیتر لە پێشترە.

## بابەت: هەر شتێک ئەگەر سنوورەکانی دیاری نەکرابێ مافی شوفعەی تێدا نامێنێ

٢٤٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «قَضَى بِالشُّفْعَةِ، فِيمَا لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ فَلَا شُفْعَةَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری شوفعەی داوە بۆ شتێک کە دابەش نەکرابێ، جا هەرکات سنوورەکان دیاری کران (دابەشکرا) ئەوە هەقی شوفعە نامێنێ.

٢٤٩٧م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَمَّادٍ الطِّهْرَانِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَاصِمٍ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ ﷺ، وَأَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ قَالَ: أَبُو عَاصِمٍ: «سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيِّبِ مُرْسَلٌ، وَأَبُو سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، مُتَّصِلٌ»[٣].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٢٤٩٨- عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشَّرِيكُ أَحَقُّ بِسَقَبِهِ مَا كَانَ»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٧٠٣.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥١٥.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٥١٥.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٥٨ و ٦٩٧٧ و ٦٩٧٨ و ٦٩٨٠ و ٦٩٨١، وأبو داود: ٣٥١٦، والنسائي: ٤٧٠٢.




واتە: ئەبو ڕافیع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوبەش لە ئەوانی دیکە لە پێشترە.

**٢٤٩٩-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الشُّفْعَةَ فِي كُلِّ مَا لَمْ يُقْسَمْ، فَإِذَا وَقَعَتِ الْحُدُودُ وَصُرِّفَتِ الطُّرُقُ فَلَا شُفْعَةَ»(١).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ مافی شوفعەی تەنها لە شتێک دیاری کردوە کە دابەش نەکرابێ، جا هەرکات سنوورەکان دیاریکران و ڕێگایان گۆڕان (ڕێگایان جیاوازبوو)، مافی شوفعەی نامێنێ.

## بابەت: داواکردنی مافی شوفعە

**٢٥٠٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشُّفْعَةُ كَحَلِّ الْعِقَالِ»(٢).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مافی شوفعە وەکو ئەوە وایە وشترێکی هار ڕەشمەکەی لێ بکەیەوە (واتە: ئەو کەسەی مافی شوفعەی هەیە، دەبێ بە زووترین کات داوابکات، ئەگەرنا مافی نامێنێ).

**٢٥٠١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا شُفْعَةَ لِشَرِيكٍ عَلَى شَرِيكٍ، إِذَا سَبَقَهُ بِالشِّرَاءِ، وَلَا لِصَغِيرٍ، وَلَا لِغَائِبٍ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوبەش بەسەر هاوبەشەکەی دیکەوە مافی شوفعەی نیە، مادام ئەوەیان پێش ئەو کەوت لە کڕینەکەیدا، گچکەکەش مافی نیەو ئەو کەسەی نادیارە ئەویش مافی نیە.



---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢١٣، ومسلم: ١٦٠٨، وأبو داود: ٣٥١٤، والترمذي: ١٣٧٠.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) ضعيف جداً.



# پەرتووكی

# (شتی) دۆزراوە



---

كِتَابُ اللُّقَطَةِ.

## بابەت: وشترو مانگاو مەڕی ونبوو

**٢٥٠٢-** عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ضَالَّةُ الْمُسْلِمِ حَرَقُ النَّارِ»(١).

**واتە: موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخخیر لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شتی ونبووی مسوڵمان وەکو کڵپەی ئاگر وایە (واتە: کەسێک شتێک ببینێتەوە و نیازی دانەوەی نەبێ ئەوە بۆی دەبێتە هۆی چوونە دۆزەخ).**

**٢٥٠٣-** عَنِ الْمُنْذِرِ بْنِ جَرِيرٍ ﷺ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ أَبِي بِالْبَوَازِيجِ، فَرَاحَتِ الْبَقَرُ، فَرَأَى بَقَرَةً أَنْكَرَهَا، فَقَالَ: مَا هَذِهِ؟ قَالُوا: بَقَرَةٌ لَحِقَتْ بِالْبَقَرِ، قَالَ: فَأَمَرَ فَطُرِدَتْ حَتَّى تَوَارَتْ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يُؤْوِي الضَّالَّةَ، إِلَّا ضَالٌّ»(٢).

**واتە: مونزیری کوڕی جەریر ﷺ دەڵێ: من لەگەڵ باوکم بووم لە بەوازیج (ناوی شوێنێکە لە نزیک دیجلە)، گاڕانێک مۆڵا بوو، جا بینی مانگایەک ناچێتە ناو گاڕانەکە، گوتی: ئەوە چییە بۆ وایە؟ گوتیان: ئەوە مانگایەکە لەگەڵ گاڕانەکە کەوتووە، ئنجا فەرمانی کرد دەریبکەن و دەریانکرد تاکو ون بوو، پاشان گوتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هیچ کەسێک شتی ون بوو تێکەڵی ماڵی خۆی ناکات، مەگەر سەر لێشێواو بێ.**

**٢٥٠٤-** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: سُئِلَ عَنْ ضَالَّةِ الْإِبِلِ، فَغَضِبَ وَاحْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ فَقَالَ: «مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا الْحِذَاءُ وَالسِّقَاءُ، تَرِدُ الْمَاءَ وَتَأْكُلُ الشَّجَرَ، حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا». وَسُئِلَ عَنْ ضَالَّةِ الْغَنَمِ، فَقَالَ: «خُذْهَا، فَإِنَّمَا هِيَ لَكَ أَوْ لِأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ». وَسُئِلَ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: «اعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا وَعَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنِ اعْتُرِفَتْ، وَإِلَّا فَاخْلِطْهَا بِمَالِكَ»(٣).

---

(١) صحيح.

(٢) ضعيف. والمرفوع صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٢٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٩١، ومسلم: ١٧٢٢، وأبو داود: ١٧٠٤ و ١٧٠٦ و ١٧٠٧، والترمذي: ١٣٧٢ و ١٣٧٣.

واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی وشتری ونبوو (کەسێک بیگرێتەوە)، پێغەمبەریش ﷺ ڕوخساری سوور هەڵگەڕا و تووڕە بوو، ئنجا فەرمووی: چ ئیشێکت پێیە خواردن و خواردنەوەی خۆی پێیە، بۆ خۆی دەچێتە شوێنی ئاو خواردنەوەو لەوەڕ دەخوات تاکو خاوەنەکەی پێیدەگاتەوە، وە پرسیاری لێکرا دەربارەی مەڕی ونبوو؟ فەرمووی: بیگرەوە، یان بۆ تۆیە یان بۆ براکەتە یان بۆ گورگە (واتە: ناتوانێ خۆی بپارێزێ)، ئنجا پرسیاری لێکرا دەربارەی شتی دۆزراوە؟ فەرمووی: تورەکەو ئەوداوەی تورەکەکەی پێی بەستراوە نیشانەی بکەو ساڵێک بانگەوازی بۆ بکە، جا ئەگەر خاوەنی لێ پەیدابوو باشە، ئەگەرنا تێکەڵی بکە لەگەڵ ماڵی خۆت.

## بابەت: شتی دۆزراوە

٢٥٠٥- عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ وَجَدَ لُقَطَةً فَلْيُشْهِدْ ذَا عَدْلٍ أَوْ ذَوَيْ عَدْلٍ، ثُمَّ لَا يُغَيِّرْهُ وَلَا يَكْتُمْ، فَإِنْ جَاءَ رَبُّهَا، فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا، وَإِلَّا فَهُوَ مَالُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ»[1].

واتە: عیازی کوڕی حیمار ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک شتێکی دۆزییەوە با کەسێکی دادپەروەر، یان دوو کەسی دادپەروەر بکاتە شایەد، پاشان با نەیگۆڕێ و نەیشارێتەوە، جا ئەگەر خاوەنەکەی هاتەوە بۆی، بێگومان لە هەموو کەس شایستەترە پێی، ئەگەرنا، موڵکی خوایە و کێی پێ خۆشبێ دەیدات بە ئەو (واتە: با بۆخۆی بیخوات، مادام خاوەنی لێ پەیدانەبێتەوە).

٢٥٠٦- عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ ﷺ، قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ زَيْدِ بْنِ صُوحَانَ وَسَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْعُذَيْبِ، الْتَقَطْتُ سَوْطًا، فَقَالَا لِي: أَلْقِهِ، فَأَبَيْتُ، فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ أَتَيْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: أَصَبْتَ، الْتَقَطْتُ مِائَةَ دِينَارٍ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: «عَرِّفْهَا سَنَةً» فَعَرَّفْتُهَا، فَلَمْ أَجِدْ أَحَدًا يَعْرِفُهَا، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: «عَرِّفْهَا» فَعَرَّفْتُهَا، فَلَمْ أَجِدْ أَحَدًا يَعْرِفُهَا، فَقَالَ: «اعْرِفْ وِعَاءَهَا وَوِكَاءَهَا وَعَدَدَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ مَنْ يَعْرِفُهَا، وَإِلَّا، فَهِيَ كَسَبِيلِ مَالِكَ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ١٧٠٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٢٦، ومسلم: ١٧٢٣، وأبو داود: ١٧٠١_١٧٠٣، والترمذي: ١٣٧٤.

واتە: سوەیدی کوڕی غەفەلە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ زەیدی کوڕی صوحان و سەلمانی کوڕی ڕەبیعە دەرچووم تا گەیشتینە ئەلعەزیب (شوێنی ئاوێکە لە نزیک کوفە)، جا من قامچییەکم دیتەوە، ئەوانیش پێیان گوتم: فڕێی بدەوە، منیش بە قسەم نەکردن، کاتێک هاتینە مەدینە چوومە لای ئوبەی کوڕی کەعب و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی: پێکاوتە (لە بڕیارەکەتدا)، گوتی: منیش لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ سەد دینارم دۆزیەوە، پرسیارم کرد (لە پێغەمبەر ﷺ)، فەرمووی: یەک ساڵ بانگەوازی بۆ بکە منیش بانگەوازم بۆ کرد کەس نەبوو بە خاوەنی، ئەوجاریش پرسارم لێکردو فەرمووی: جاڕی بۆ بدە، منیش بانگەوازم بۆ کردو کەس خۆی نەکرد بە خاوەنی، ئنجا فەرمووی: تورەکەو داوی زاری تورەکەکەو ژمارەی پارەکە نیشانە بکە، پاشان ساڵێک بانگەوازی بۆ بکە، جا ئەگەر کەس هات و خۆی کرد بە خاوەنی باشە، ئەگەرنا وەک ماڵی خۆت حیسابی بۆ بکە.

**٢٥٠٧-** عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ اللُّقَطَةِ، فَقَالَ: «عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنِ اعْتُرِفَتْ فَأَدِّهَا، فَإِنْ لَمْ تُعْتَرَفْ، فَاعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِعَاءَهَا، ثُمَّ كُلْهَا، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا فَأَدِّهَا إِلَيْهِ»[1].

واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی شتێکی دۆزراوە (چی لێ بکرێ)، فەرمووی: ساڵێک جاڕی بۆ بدە، ئەگەر خاوەنی بۆ پەیدابوو بیدەوە، ئەگەریش خاوەنی پەیدا نەبوو تەماشا بکە تورەکە و دەم بەستەکە و ئەوەی تێیدایە چۆنە، پاشان بیخۆ، ئەگەر خاوەنی لێ پەیدابوو، پێی بدەوە (بۆی قەرەبوو بکەوە).

### بابەت: دۆزینەوەی ونبوویەک کە جرج لە کونێک دەریهێناوە

**٢٥٠٨-** عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّهُ خَرَجَ ذَاتَ يَوْمٍ إِلَى الْبَقِيعِ، وَهُوَ الْمَقْبَرَةُ لِحَاجَتِهِ، وَكَانَ النَّاسُ لَا يَذْهَبُ أَحَدُهُمْ فِي حَاجَتِهِ إِلَّا فِي الْيَوْمَيْنِ وَالثَّلَاثَةِ، فَإِنَّمَا يَبْعَرُ كَمَا تَبْعَرُ الْإِبِلُ، ثُمَّ دَخَلَ خَرِبَةً، فَبَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ لِحَاجَتِهِ، إِذْ رَأَى جُرَذًا أَخْرَجَ مِنْ جُحْرٍ دِينَارًا، ثُمَّ دَخَلَ فَأَخْرَجَ آخَرَ، حَتَّى أَخْرَجَ سَبْعَةَ عَشَرَ دِينَارًا، ثُمَّ أَخْرَجَ طَرَفَ خِرْقَةٍ حَمْرَاءَ، قَالَ الْمِقْدَادُ: فَسَلَلْتُ الْخِرْقَةَ

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٩١، ومسلم: ١٧٢٢، وأبو داود: ١٧٠٤ و ١٧٠٦ و ١٧٠٧، والترمذي: ١٣٧٢ و ١٣٧٣.




فَوَجَدْتُ فِيهَا دِينَارًا، فَتَمَّتْ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ دِينَارًا، فَخَرَجْتُ بِهَا حَتَّى أَتَيْتُ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْبَرْتُهُ خَبَرَهَا، فَقُلْتُ خُذْ صَدَقَتَهَا، يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «ارْجِعْ بِهَا، لَا صَدَقَةَ فِيهَا، بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا» ثُمَّ قَالَ: «لَعَلَّكَ أَتْبَعْتَ يَدَكَ فِي الْجُحْرِ؟» قُلْتُ: لَا وَالَّذِي أَكْرَمَكَ بِالْحَقِّ، قَالَ: فَلَمْ يَفْنَ آخِرُهَا حَتَّى مَاتَ[1].

واتە: میقدادی کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە، ڕۆژێک بۆ پێویستییەکی خۆی دەچێتە بەقیع کە گۆڕستانە، خەڵکیش بە دوو ڕۆژ، یان سێ ڕۆژ جارێک نەبووایە نەدەچوونە سەرئاو (لەبەر کەم خۆری و کەم چەوری)، چۆن حوشتر قشپل دادەنێ ئەوانیش ئاوا بوون، پاشان لە کەلاوەیەک دانیشت بۆ جێبەجێ کردنی پێداویستییەکەی، لەناکاو بینی جرجێک لە کونێک دینارێکی دەرهێناو ڕۆیشتەوە ناکونەکەو دانەیەکی دیکەی دەرهێنا، تاکو حەڤدە دیناری دەرهێنا، پاشان گوێچکی پارچە پەڕۆیەکی سوری دەرهێنا، میقداد گوتی: منیش پەڕۆکەم تەکاندو تەماشام کرد دینارێکی تێدابوو، ئیتر بوونە هەژدە دینار، منیش هەڵمگرتن و بردمن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵەکەم بۆگێڕایەوەو گوتم: فەرموو زەکاتەکەی بگێڕەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: هەڵیگرەوە ئەوە زەکاتی تێدانیە، خوا بەرەکەتی تێبخات بۆت، پاشان فەرمووی: لەوانەیە دەستت بردبێتە ناو کونەکە و خۆت دەرت هێنابێت، گوتم: نەخێر سوێند بەو زاتەی بە هەق ڕێزی لێگرتووی. (ڕاوی) دەڵێ: هەتا مردیش ئەوپارانە کۆتاییان نەهات (لەبەر گەورەیی دوعاکەی پێغەمبەر ﷺ).

## بابەت: کەسێک گەنجینەیەکی شاراوەی ژێر زەوی بدۆزێتەوە

**٢٥٠٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «فِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ»[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کانزایانەی کە لەکۆندا شاراونەتەوە (ڕیکاز)، ئەوە زەکاتەکەیان پێنج یەکە (واتە: لە هەر پێنج بەش بەشێک زەکاتە).

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٠٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٩، ومسلم: ١٧١٠، وأبو داود: ٣٠٨٥، والترمذي: ٦٤٢ و ١٣٧٧، والنسائي: ٢٤٩٧ و ٢٤٩٧.




٢٥١٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەلوپەلە گرانبەهایانەی کە لەکۆندا شاراونەتەوە (ڕیکاز)، ئەوە زەکاتەکەیان پێنج یەکە (واتە: لە هەر پێنج بەش بەشێک زەکاتە).

٢٥١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ اشْتَرَى عَقَارًا، فَوَجَدَ فِيهَا جَرَّةً مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ: اشْتَرَيْتُ مِنْكَ الْأَرْضَ، وَلَمْ أَشْتَرِ مِنْكَ الذَّهَبَ، فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنَّمَا بِعْتُكَ الْأَرْضَ بِمَا فِيهَا فَتَحَاكَمَا إِلَى رَجُلٍ، فَقَالَ: أَلَكُمَا وَلَدٌ؟ فَقَالَ أَحَدُهُمَا: لِي غُلَامٌ، وَقَالَ الْآخَرُ: لِي جَارِيَةٌ، قَالَ: فَأَنْكِحَا الْغُلَامَ الْجَارِيَةَ، وَلْيُنْفِقَا عَلَى أَنْفُسِهِمَا مِنْهُ، وَلْيَتَصَدَّقَا»(٢).

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە پێش ئێوەدا پیاوێک زەوییەکی کڕی، لەو شوێنەدا کوپەیەک زێڕی دۆزیەوە، ئەویش گوتی: من زەویەکەم لە تۆ کڕیوە و ئەو زێڕەم لە تۆ نەکڕیوە، پیاوەکەی دیکەش گوتی: من زەویەکەم بە هەموو شتێکەوە پێت فرۆشتووە، ئنجا چوونە لای پیاوێک تاکو بڕیارێک لە نێوانیاندا بدات، پیاوەکەش گوتی: منداڵتان هەیە؟ یەکیان گوتی: من کوڕێکم هەیە، ئەویدیکەش گوتی: من کچێکم هەیە، گوتی: کوڕ و کچەکە لە یەکتر مارە ببڕن و با لەو کوپە زێڕە بۆ خۆیان خەرجی بکەن.



(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٧٢، ومسلم: ١٧٢١.



# پەرتووکی

# ئازادکردنی کۆیلە



---

کِتَابُ الْعِتْقِ.




## بابەت: ئازادکردنی کۆیلە لە دوای مردنی خاوەنەکەی (خاوەنەکەی بڵێ: کە من مردم تۆ ئازاد بی)

**٢٥١٢-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «بَاعَ الْمُدَبَّرِ»[١].

واتە: جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەندەیەکی (بۆ خاوەنەکەی) فرۆشت، کە ئەو بەندەیە مودەبەڕ بوو (واتە: خاوەنەکەی داینابوو کە لە دوای مردنی خۆی بەندەکە ئازاد بێ).

**٢٥١٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: دَبَّرَ رَجُلٌ مِنَّا غُلَامًا، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ، «فَبَاعَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَاشْتَرَاهُ ابْنُ النَّحَّامِ، رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَدِيٍّ»[٢].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە ئێمە کۆیلەکەی ئازاد کردبوو لە دوای مردنی، بەڵام ئەو پیاوە جگە لەو کۆیلەیە هیچی دیکەی نەبوو، پێداویستیشی هات بۆ پێش، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کۆیلەکەی فرۆشت، ئیبنو نەحام کڕیتی کە پیاوێک بوو لە هۆزی بەنو عەدی.

**٢٥١٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْمُدَبَّرُ مِنَ الثُّلُثِ» قَالَ ابْنُ مَاجَةَ: سَمِعْتُ عُثْمَانَ يَعْنِي ابْنَ أَبِي شَيْبَةَ، يَقُولُ: هَذَا خَطَأٌ. يَعْنِي حَدِيثَ «الْمُدَبَّرُ مِنَ الثُّلُثِ» قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: «لَيْسَ لَهُ أَصْلٌ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کۆیلەی مودەبەڕ بەشێکە لە سێیەک (واتە: وەکو وەسیەت کردن وایە و نابێ لە سێیەکی ماڵ تێپەڕێ). ئیبنو ماجە دەڵێ: گوێم لە عوسمان واتە: ئیبنو ئەبی شەیبە بوو دەیگوت: ئەو گێڕانەوەیە هەڵەیە کە باسی ئەوە دەکات: کۆیلە بەشێکە لە سێیەک. وە ئەبو عەبدوڵڵا گوتی: ئەو گێڕانەوەیە هیچ ئەسڵێکی نیە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٣٠، ومسلم: ٩٩٧، وأبو داود: ٣٩٥٥ مطولًا، والنسائي: ٤٦٥٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٤١، ومسلم: ٩٩٧، وأبو داود: ٣٩٥٧، والترمذي: ١٢١٩، والنسائي: ٤٦٥٢_٤٦٥٤ و ٥٤١٨.

(٣) موضوع.



## بابەت: ئەو کەنیزەکانەی دەبنە دایک لە پیاوی ئازاد

٢٥١٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا رَجُلٍ وَلَدَتْ أَمَتُهُ مِنْهُ، فَهِيَ مُعْتَقَةٌ عَنْ دُبُرٍ مِنْهُ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێک کەنیزەکەکەی منداڵی لێی ببێ، ئەو کەنیزەکە لە دوای مردنی پیاوەکە ئازاد دەبێ.

٢٥١٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: ذُكِرَتْ أُمُّ إِبْرَاهِيمَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَعْتَقَهَا وَلَدُهَا»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: باسی دایکی ئیبراهیم (کوڕی پێغەمبەر ﷺ) کرا لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: (دایکی ئیبراهیم) بە هۆی منداڵەکەی (کە ئیبراهیمە) ئازاد بوو.

٢٥١٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ يَقُولُ: «كُنَّا نَبِيعُ سَرَارِيَّنَا وَأُمَّهَاتِ أَوْلَادِنَا، وَالنَّبِيُّ ﷺ فِينَا حَيٌّ. لَا نَرَى بِذَلِكَ بَأْسًا»[٣].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: ئێمە ئەو کەنیزەکانەی کە دەبوونە دایکی منداڵەکانیشمان دەمانفرۆشتن و پێغەمبەریش ﷺ زیندوو بوو لەناوماندابوو، بۆیە هیچ شتێک لەوەدا (بەگوناهو تاوان) نابینین.

## بابەت: ڕێککەوتن لەنێوان کۆیلە و خاوەنەکەی لەسەر خۆ کڕینەوەی کۆیلەکە و ئازادبوونی

٢٥١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ كُلُّهُمْ حَقٌّ عَلَى اللَّهِ عَوْنُهُ: الْغَازِي فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالْمُكَاتَبُ الَّذِي يُرِيدُ الْأَدَاءَ، وَالنَّاكِحُ الَّذِي يُرِيدُ التَّعَفُّفَ»[٤].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

(٤) حسن. أخرجه الترمذي: ١٦٥٥، والنسائي: ٣١٢٠ و ٣٢١٨.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس هەنە کە هەموویان خوا کردوویەتی بە واجب لەسەر خۆی کە یارمەتیان بدات: ئەو کەسەی لە پێناوی خوادا دەجەنگێ و ئەو کۆیلەی کە لەگەڵ خاوەنەکەی ڕێککەوتووە خۆی بکڕێتەوە و نیەتی پارەدانەکەشی هەبێ و ئەو کەسەش کە هاوسەرگیری دەکات بۆ ئەوەی بە داوێن پاکی بمێنێتەوە.

**٢٥١٩-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا عَبْدٍ كُوتِبَ عَلَى مِائَةِ أُوقِيَّةٍ، فَأَدَّاهَا إِلَّا عَشْرَ أُوقِيَّاتٍ، فَهُوَ رَقِيقٌ»[1].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کۆیلەیەک ڕێککەوتن بکات لەگەڵ خاوەنەکەی لەسەر سەد ئۆقیە و هەمووی بدات جگە لە دە ئۆقیە، هەر بە کۆیلەیی دەمێنێتەوە.

**٢٥٢٠-** عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، أَنَّهَا أَخْبَرَتْ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا كَانَ لِإِحْدَاكُنَّ مُكَاتَبٌ، وَكَانَ عِنْدَهُ مَا يُؤَدِّي، فَلْتَحْتَجِبْ مِنْهُ»[2].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە ئەگەر کۆیلەیەکی هەیە و ڕێککەوتنی لەگەڵ کردوە کە خۆی بکڕێتەوەو کۆیلەکەش ئەو پارەیەی هەیە، با خۆی لە بەرانبەر ئەو کۆیلەیە داپۆشێت (چونکە نامەحرەمە بۆی).

**٢٥٢١-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ بَرِيرَةَ أَتَتْهَا وَهِيَ مُكَاتَبَةٌ قَدْ كَاتَبَهَا أَهْلُهَا عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ فَقَالَتْ لَهَا: إِنْ شَاءَ أَهْلُكِ عَدَدْتُ لَهُمْ عَدَّةً وَاحِدَةً، وَكَانَ الْوَلَاءُ لِي، قَالَ: فَأَتَتْ أَهْلَهَا فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُمْ فَأَبَوْا، إِلَّا أَنْ تَشْتَرِطَ الْوَلَاءَ لَهُمْ. فَذَكَرَتْ عَائِشَةُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «افْعَلِي». قَالَ: فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ. ثُمَّ قَالَ: «مَا بَالُ رِجَالٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ. كُلُّ شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ فَهُوَ بَاطِلٌ، وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ. كِتَابُ اللَّهِ أَحَقُّ. وَشَرْطُ اللَّهِ أَوْثَقُ. الْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ»[3].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٩٢٦ و ٣٩٢٧، والترمذي: ١٢٦٠.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٣٩٢٨، والترمذي: ١٢٦١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٦، ومسلم: ١٥٠٤، وأبو داود: ٣٩٢٩، والترمذي: ٢١٢٤، والنسائي: ٢٦١٤ و ٢٦١٥.

واتە: عائیشە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، بەریرە (کەنیزەکێک بووە) هات بۆ لای عائیشە کە خاوەنەکەی لەگەڵیدا ڕێککەوتبوو لەسەر نۆ ئوقیە، ئنجا (عائیشە) پێی گوت: ئەگەر گەورەکانت پێیان خۆش بوو من بە یەک جار هەموو پارەکە دەدەم بە مەرجێ مافی میراتت بۆ من بێ و من هەقدارت بم، (ڕاوی) دەڵێ: بەریرە هاتەوە لای گەورەکانی و باسەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش ڕازی نەبوون بەو مەرجە نەبێ کە وەلائەکە بۆ خۆیان بێت، ئنجا عائیشە ئەو باسەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: کارەکەت بکە (ئازادی بکە)، (ڕاوی) دەڵێ: ئنجا پێغەمبەر ﷺ هەستا و وتاری بۆ خەڵکەکە دا و سوپاس و ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: ئەو خەڵکانە چییانە کە مەرج گەلێک دادەنێن کە لە کتێبەکەی خوادا نیە، هەر مەرجێک لە کتێبی خوادا نەبێ بەتاڵە ئەگەر سەد مەرجیش بێت، کتێبەکەی خوا شایستەترینە و ئەو مەرجانەی خوا دایناوە توندوتۆڵترین و مەحکەمترینن، وە هەقداری و وەلائی کۆیلە بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی دەکات.

## بابەت: ئازادکردنی کۆیلە

**٢٥٢٢-** عَنْ شُرَحْبِيل بْنِ السِّمْطِ ﵁، قَالَ: قُلْتُ لِكَعْبٍ: يَا كَعْبَ بْنَ مُرَّةَ، حَدِّثْنَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَاحْذَرْ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَعْتَقَ امْرَأً مُسْلِمًا، كَانَ فِكَاكَهُ مِنَ النَّارِ، يُجْزِئُ كُلُّ عَظْمٍ مِنْهُ بِكُلِّ عَظْمٍ مِنْهُ، وَمَنْ أَعْتَقَ امْرَأَتَيْنِ مُسْلِمَتَيْنِ، كَانَتَا فِكَاكَهُ مِنَ النَّارِ، يُجْزِئُ بِكُلِّ عَظْمَيْنِ مِنْهُمَا عَظْمٌ مِنْهُ»[1].

واتە: شورەحبیلی کوڕی سیمت ﵁ دەڵێ: بە کەعبم گوت: ئەی کەعبی کوڕی موڕڕە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەمان بۆ بگێڕەوەو ورياش بە، ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک پیاوێکی مسوڵمان ئازاد بکات، ئەوە بۆی دەبێتە هۆکاری ڕزگاربوون لە ئاگر، کە بە هەر بەشێک لە ئێسکەکانی دەبێتە پارێزەر بۆ بەشێک لە ئێسکەکانی کەسی ئازادکەر، وە هەر کەسێک دوو ئافرەتی مسوڵمان ئازاد بکات، دەبێتە هۆی ڕزگاربوونی لە ئاگر بە هەر دوو ئێسکی ئەو ئافرەتانە ئێسکێکی خۆی لە ئاگر ڕزگار دەکات.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٩٦٧، والنسائي: ٣١٤٤.

٢٥٢٣- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «أَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا، وَأَغْلَاهَا ثَمَنًا»[١].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا باشترین ئازادکردنی کۆیلە کامەیانە؟ فەرمووی: ئەوەیان کە لە لای گەورەکەی بەهادارترینە، وە زۆرترین نرخی هەیە.

## بابەت: هەر کەس ببێتە خاوەن بەندەیەک کە مەحرەمی خۆی بێ، ئازاد دەبێ

٢٥٢٤- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَهُوَ حُرٌّ»[٢].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بوو بە خاوەنی بەندەیەکی مەحرەمی خۆی، یەکسەر بەندەکە ئازاد دەبێ.

٢٥٢٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ مَلَكَ ذَا رَحِمٍ مَحْرَمٍ فَهُوَ حُرٌّ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس ببێتە خاوەنی کۆیلەیەکی مەحرەمی خۆی، ئەو کۆیلەیە یەکسەر ئازاد دەبێ.

## بابەت: ئەو کەسەی بەندەیەک ئازاد دەکات و مەرجی لەسەر دادەنێ خزمەتی بکات

٢٥٢٦- عَنْ سَفِينَةَ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، قَالَ: «أَعْتَقَتْنِي أُمُّ سَلَمَةَ فَاشْتَرَطَتْ عَلَيَّ أَنْ أَخْدُمَ النَّبِيَّ ﷺ مَا عَاشَ»[٤].

واتە: سەفینە (واتە) ئەبو عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەڵێ: ئوممو سەلەمە منی ئازاد کردو مەرجی لەسەر دانام کە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بکەم هەتا ئەوکاتەی لە ژیاندا بێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥١٨، ومسلم: ٨٤، والنسائي: ٣١٢٩.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٩٤٩، والترمذي: ١٣٦٥.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي بإثر: ١٣٦٥ معلقاً.

(٤) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٩٣٢.





## بابەت: ئەو کەسەی بەشی خۆی لە بەندەیەکدا ئازاد بکات

٢٥٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَعْتَقَ نَصِيبًا لَهُ فِي مَمْلُوكٍ، أَوْ شِقْصًا، فَعَلَيْهِ خَلَاصُهُ مِنْ مَالِهِ، إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ، اسْتُسْعِيَ الْعَبْدُ فِي قِيمَتِهِ، غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەشی خۆی یان پشکی خۆی لە کۆیلەیەکی هاوبەش ئازاد بکات، لەسەریەتی کە بەشەکەی دیکەش بکڕێتەوەو، ئازادی بکات بە تەواوی ئەگەر پارەی هەبوو، ئەگەر پارەشی نەبوو، با کۆیلەکە بۆ خۆی پارەکە پەیدا بکات و ڕێی پێ دەدرێ و نابێ قورسایی بخرێتە سەر، چ لە کارکردندا، یان لە پارەی زیاد لەسەر داناندا.

٢٥٢٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِي عَبْدٍ، أُقِيمَ عَلَيْهِ بِقِيمَةِ عَدْلٍ، فَأَعْطَى شُرَكَاءَهُ حِصَصَهُمْ إِنْ كَانَ لَهُ مِنَ الْمَالِ مَا يَبْلُغُ ثَمَنَهُ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ، وَإِلَّا، فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بەشەکەی خۆی لە کۆیلەیەکدا ئازاد بکات، کۆیلەکە بە نرخی گونجاوی هاوشێوەی خۆی دەخەمڵێنرێ و هەموو هاوبەشەکان پشکی خۆیان پێ دەدرێ، ئەگەر ئەوەندەماڵەی هەبوو کە دەگەیشتە نرخی خۆی ئەوە لەسەری ئازاد دەکرێ، ئەگەرنا (ئەوەندە ماڵەی نەبوو) ئەو بەشەی ئازاد دەبێ کە ئازاد کراوە.

## بابەت: ئەو کەسەی کۆیلەیەک ئازاد دەکات کە ماڵی هەبێ

٢٥٢٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَعْتَقَ عَبْدًا وَلَهُ مَالٌ، فَمَالُ الْعَبْدِ لَهُ، إِلَّا أَنْ يَشْتَرِطَ السَّيِّدُ مَالَهُ، فَيَكُونَ لَهُ» وَقَالَ ابْنُ لَهِيعَةَ: إِلَّا أَنْ يَسْتَثْنِيَهُ السَّيِّدُ[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٩٢، ومسلم: ١٥٠٣، وأبو داود: ٣٩٣٧ و ٣٩٣٨، والترمذي: ١٣٤٨.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤٩١، ومسلم: ١٥٠١، وأبو داود: ٣٩٤٠ و ٣٩٤١ و ٣٩٤٣ و ٣٩٤٦ و ٣٩٤٧، والترمذي: ١٣٤٦، والنسائي: ٤٦٩٨ و ٤٦٩٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٩٦٢.




واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەندەیەک ئازاد بکات و بەندەکەش سامانی هەبێ، ئەوە ماڵ و سامانی بەندەکە بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی دەکات مەگەر گەورەکەی بە مەرجی دابنێ کە ماڵەکە بۆ ئەو بێت. وە ئیبنو لەهیعە گوتی: مەگەر گەورەکەی بۆی هەڵاوێرێ (کە ماڵەکە بۆ ئەو بێ).

**٢٥٣٠- عَنْ عُمَيْرٍ ﵁ وَهُوَ مَوْلَى ابْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ قَالَ لَهُ: يَا عُمَيْرُ، إِنِّي أَعْتَقْتُكَ عِتْقًا هَنِيئًا. إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْتَقَ غُلَامًا، وَلَمْ يُسَمِّ مَالَهُ، فَالْمَالُ لَهُ» فَأَخْبِرْنِي مَا مَالُكَ؟**[1]

واتە: عومەیر ﵁ کە ئازدکراوی ئیبنو مەسعوود بووە دەگێڕێتەوە: کە عەبدوڵڵا پێی گوتووە: ئەی عومەیر من بە ئاسانترین و بێ کێشەترین شێوە ئازادت دەکەم، بێگومان بیستوومە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەیفەرموو: هەر کەسێک کۆیلەیەک ئازاد بکات و ناوی ماڵ و سامانەکەی نەهێنێ، ئەوە ماڵ و سامانەکە بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی دەکات، بۆیە پێم بڵێ ماڵ و سامانەکەت چەندە.

**٢٥٣٠م- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ نُمَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُطَّلِبُ بْنُ زِيَادٍ، عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ لِجَدِّي فَذَكَرَ نَحْوَهُ**[2]

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: ئازادکردنی منداڵی زینا

**٢٥٣١- عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ سَعْدٍ ﵂، مَوْلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سُئِلَ عَنْ وَلَدِ الزِّنَا، فَقَالَ: «نَعْلَانِ أُجَاهِدُ فِيهِمَا، خَيْرٌ مِنْ أَنْ أُعْتِقَ وَلَدَ الزِّنَا»**[3].

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف.

(٣) ضعيف.

واتە: مەیمونەی کچی سەعد ﵂ کەنیزەکی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەگێڕێتەوە، پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی منداڵی زینا، ئەویش فەرمووی: (خێر و پاداشتی) جوتێک نەعلم پێ باشترە کە جیهادیان پێ بکەم لەوەی کە منداڵێکی زینا ئازاد بکەم.

## بابەت: ئەو کەسەی دەیەوێ ژن و مێردێک ئازاد بکات با سەرەتا پیاوەکە ئازاد بکات

**٢٥٣٢-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا كَانَ لَهَا غُلَامٌ وَجَارِيَةٌ، زَوْجٌ. فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُعْتِقَهُمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنْ أَعْتَقْتِهِمَا، فَابْدَئِي بِالرَّجُلِ قَبْلَ الْمَرْأَةِ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، کۆیلە و کەنیزەکێکی هەبووە کە ژن و مێرد بوون، جا گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەمەوێ هەردووکیان ئازاد بکەم، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئازادیان دەکەی سەرەتا لە پیاوەکەوە دەست پێبکە.

* * *

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٢٣٧، والنسائي: ٣٤٤٦.



# پەرتووکی

# حەدەکان

# (سزا شەرعییەکان)



---

كِتَابُ الْحُدُودِ.

## بابەت: ڕشتنی خوێنی مسوڵمان دروست نیە جگە لە سێ حاڵەت

**٢٥٣٣-عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ، أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ، فَسَمِعَهُمْ وَهُمْ يَذْكُرُونَ الْقَتْلَ فَقَالَ: إِنَّهُمْ لَيَتَوَاعَدُونِي بِالْقَتْلِ؟ فَلِمَ يَقْتُلُونِي؟ وَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا فِي إِحْدَى ثَلَاثٍ: رَجُلٌ زَنَى وَهُوَ مُحْصَنٌ فَرُجِمَ، أَوْ رَجُلٌ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ، أَوْ رَجُلٌ ارْتَدَّ بَعْدَ إِسْلَامِهِ» فَوَاللَّهِ مَا زَنَيْتُ فِي جَاهِلِيَّةٍ وَلَا فِي إِسْلَامٍ، وَلَا قَتَلْتُ نَفْسًا مُسْلِمَةً، وَلَا ارْتَدَدْتُ مُنْذُ أَسْلَمْتُ[1].**

واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف  دەگێڕێتەوە، عوسمانی کوڕی عەففان ئاگای لێیان بو و، گوێبیست بوو کە ئەوان باسی کوشتنی دەکەن، ئنجا گوتی: ئەوان هەڕەشەی کوشتنم لێ دەکەن، باشە بۆ دەمکوژن لە کاتێکدا کە بۆ خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕشتنی خوێنی مرۆڤی مسوڵمان حەڵاڵ نیە جگە لە سێ حاڵەتە: پیاوێک زینا بکات و ژنی هەبێ کە ڕەجم دەکرێ، یان کەسێک کەسێکی دیکە بکوژێ، بێ ئەوەی کەسی کوشتبێ، یان کەسێک لە دوای ئەوەی کە مسوڵمان بووە هەڵگەڕێتەوە کافر بێتەوە، دەی سوێند بە خوا نە لە سەردەمی نەفامی و نە لە دوای مسوڵمان بوون زینام نەکردوە، وە هیچ کەسێکی مسوڵمانیشم نەکوشتووە، وە دوای ئەوەی مسوڵمانیش بووم هەڵنەگەڕاومەتەوە (لە ئیسلام).

**٢٥٣٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ مَسْعُودٍ ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، إِلَّا أَحَدُ ثَلَاثَةِ نَفَرٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ، الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ»[2].**

واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودەوە  دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕشتنی خوێنی مسوڵمان حەڵاڵ نیە کە شایەدی دەدات هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا، وە شایەدی دەدات کە من نێردراوی خوام، مەگەر یەکێک بێت لەو سێ کەسە: کەسێک کەسێکی کوشتبێ بە ناهەق، وە کەسێک ژنی هەبێ و زینا بکات، وە کەسێک وازی لە دینەکەی هێنابێ و جیابێتەوە لە کۆمەڵی مسوڵمانان.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٠٢، والترمذي: ٢١٥٨، والنسائي: ٤٠١٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٧٨، ومسلم: ١٦٧٦، وأبو داود: ٤٣٥٢، والترمذي: ١٤٠٢، والنسائي: ٤٠١٦ و ٤٧٢١.

## بابەت: کەسێک لە دین هەڵگەڕێتەوە

**٢٥٣٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»[١].**

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک (مسوڵمانێک) دینەکەی خۆی گۆڕی بیکوژن.**

**سەرنج: ئەم فەرموودەیە لەگەڵ فەرموودەکانی تری پەیوەند بەو بابەتەوە دەبێ کۆبکرێتەوە و تێڕامانی وردیان بۆ بکرێت، نەک بە ڕواڵەت لێک بدرێتەوە، ئەو بابەتە پەیوەندی بە سیاسەتی شەرعییەوە هەیەو، دەبێ کەسی شارەزا لەو بوارەوە بێن ڕوونکردنەوەی زیاتری لەسەر بدەن.**

**٢٥٣٦- عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْ مُشْرِكٍ أَشْرَكَ بَعْدَ مَا أَسْلَمَ، عَمَلًا حَتَّى يُفَارِقَ الْمُشْرِكِينَ إِلَى الْمُسْلِمِينَ»[٢].**

**واتە: بەهزی کوڕی حەکیم لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای گەورە هیچ کردەوەیەک لە بابای هاوبەشدانەر وەرناگرێت دوای ئەوەی مسوڵمان دەبێ هەتا لە هاوبەشدانەران جیا نەبێتەوە و نەیەتەوە پاڵ مسوڵمانان.**

## بابەت: جێبەجێ کردنی سزا (شەرعییەکان)

**٢٥٣٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِقَامَةُ حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ، خَيْرٌ مِنْ مَطَرِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً فِي بِلَادِ اللَّهِ ﷻ»[٣].**

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جێبەجێ کردنی سزایەک لە سەر سنوور شکاندنەکانی خوا باشترە لەوەی کە چل شەو باران ببارێ لەو وڵاتەی کە موڵکی خوا ﷻ.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠١٧، وأبو داود: ٤٣٥١، والترمذي: ١٤٥٨، والنسائي: ٤٠٥٩_٤٠٦٢ و ٤٠٦٤ و ٤٠٦٥.

(٢) حسن. أخرجه النسائي: ٢٥٦٨.

(٣) حسن.

**٢٥٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «حَدٌّ يُعْمَلُ بِهِ فِي الْأَرْضِ، خَيْرٌ لِأَهْلِ الْأَرْضِ مِنْ أَنْ يُمْطَرُوا أَرْبَعِينَ صَبَاحًا»[1].**

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سزایەک جێبەجێ بکرێ لەسەر زەمینێک، ئەوە بۆ خەڵکی ئەو سەر زەمینە لە باران بارینی چل ڕۆژ باشترە.**

**٢٥٣٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ جَحَدَ آيَةً مِنَ الْقُرْآنِ فَقَدْ حَلَّ ضَرْبُ عُنُقِهِ، وَمَنْ قَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ فَلَا سَبِيلَ لِأَحَدٍ عَلَيْهِ إِلَّا أَنْ يُصِيبَ حَدًّا فَيُقَامَ عَلَيْهِ»[2].**

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ئینکاری یەک ئایەت لە قورئان بکات لە گەردن دانی حەڵاڵە، وە هەر کەسێک بڵێ: هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە خوا، تاک و تەنیایە و هیچ هاوبەشی نیە، وە بێگومان موحەممەد ﷺ بەندە و نێردراوی ئەوە، ئەوە (هەر کەس ئەوە بڵێ) هیچ کەسێک بۆی نیە هیچی لێ بکات مەگەر تووشی سزا و تۆڵەیەک بێ کە بەسەریدا جێبەجێ دەکرێ.**

**٢٥٤٠- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَقِيمُوا حُدُودَ اللَّهِ فِي الْقَرِيبِ وَالْبَعِيدِ، وَلَا تَأْخُذْكُمْ فِي اللَّهِ لَوْمَةُ لَائِمٍ»[3].**

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سزا و تۆڵەکانی خوا جێبەجێ بکەن لەسەر ئەوانەی کە نزیکتانن یان لێتان دوورن (بە خزمایەتی، نەوەک لەسەر ئەوانەی کە بەهێزن یان بێهێزن)، وە لۆمەی لۆمەکاران نەبێتە ڕێگر لەبەر دەمتاندا.**

---

(١) حسن. أخرجه النسائي: ٤٩٠٤ و ٤٩٠٥ موقوفاً.

(٢) ضعيف.

(٣) حسن.

## بابەت: ئەو کەسەی سزا و تۆڵەی لەسەر پێویست نابێ

٢٥٤١- عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَطِيَّةَ الْقُرَظِيَّ ﷺ يَقُولُ: «عُرِضْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ قُرَيْظَةَ، فَكَانَ مَنْ أَنْبَتَ قُتِلَ، وَمَنْ لَمْ يُنْبِتْ خُلِّيَ سَبِيلُهُ، فَكُنْتُ فِيمَنْ لَمْ يُنْبِتْ فَخُلِّيَ سَبِيلِي»(١).

واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیر دەڵێ: گوێم لە عەتیەی قوڕەزی ﷺ بوو، دەیگوت: لەو ڕۆژەی کە بەسەر بەنو قوڕیزەدا هات ئێمەیان برد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ جا هەر کەسێک کە باڵغ بوو کوژرا ئەوەشی کە باڵغ نەبوو لێیگەڕان، جا منیش لەوانە بووم کە باڵغ نەبووم بۆیە وازیان لێ هێنام.

٢٥٤٢- عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ عُمَيْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَطِيَّةَ الْقُرَظِيَّ ﷺ يَقُولُ: فَهَا أَنَا ذَا بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ(٢).

واتە: عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیر دەڵێ: گوێم لە عەتیەی قوڕەزی ﷺ بوو، دەیگوت: ئا ئەوە منم کە لە ناو ئێوەدام (مەبەستی ئەوە بوو کە ئەو ڕۆژەی کە بەنو قوڕەیزە بەسەریان هات ئەو باڵغ نەبووە، کەسی ناباڵغ سزای لەسەر نیە).

٢٥٤٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «عُرِضْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ، وَأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً، فَلَمْ يُجِزْنِي، وَعُرِضْتُ عَلَيْهِ يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً، فَأَجَازَنِي» قَالَ نَافِعٌ: فَحَدَّثْتُ بِهِ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ فِي خِلَافَتِهِ فَقَالَ: «هَذَا فَصْلُ مَا بَيْنَ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ»(٣).

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: لە جەنگی ئوحوددا منیان برد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە تەمەنم چواردە ساڵ بوو، بۆیە ڕێگەی پێ نەدام (بچم بۆ جەنگ)، لە ڕۆژی غەزای خەندەقدا بردمیان بۆ خزمەتی کە ئەو کات پازدە ساڵ بووم، جا ڕێگەی پێدام. نافیع گوتوویەتی: ئەوەی بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز گێڕایەوە لە سەردەمی خیلافەتەکیدا، ئەویش گوتی: ئەو تەمەنە جیاکەرەوەیە لەنێوان گەورەو گچکە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٠٤، والترمذي: ١٥٨٤، والنسائي: ٣٤٣٠ و ٤٩٨١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٠٤، والترمذي: ١٥٨٤، والنسائي: ٣٤٣٠ و ٤٩٨١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٦٤، ومسلم: ١٨٦٨، وأبو داود: ٢٩٥٧ و ٤٤٠٦، والترمذي: ١٣٦١، والنسائي: ٣٤٣١.

## بابەت: داپۆشینی کەم و کوڕی بڕوادار و لابردنی سزاو تۆڵە بە هۆی گومانەوە

**٢٥٤٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ»[1].

**واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کەم و کوڕی مسوڵمانێک داپۆشێ، خوا لە دونیا و دواڕۆژ کەم و کوڕیەکانی دادەپۆشێ.**

**٢٥٤٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ادْفَعُوا الْحُدُودَ مَا وَجَدْتُمْ لَهُ مَدْفَعًا»[2].

**واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەتا بۆتان دەکرێ سزا و تۆڵەکان لەسەر تۆمەتبار لابدەن.**

**٢٥٤٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ سَتَرَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، سَتَرَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ كَشَفَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، كَشَفَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ، حَتَّى يَفْضَحَهُ بِهَا فِي بَيْتِهِ»[3].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس کەم و کوڕی برای مسوڵمانی داپۆشێ، خوا کەم و کوڕیەکانی دادەپۆشێ لە ڕۆژی قیامەتدا، هەر کەس کەم و کوڕی برای مسوڵمانی ئاشکرا بکات، خوا کەم و کوڕیەکانی ئاشکرا دەکات ئابڕووی دەبات، هەتا ئەگەر لە ناو ماڵەکەی خۆیشیدا بێ.**

## بابەت: تکاکردن لە سنور و سزاکاندا

**٢٥٤٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ قَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟» ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّمَا هَلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ٢٦٩٩، وأبو داود: ١٤٥٥ و ٣٦٤٣ و ٤٩٤٦، والترمذي: ١٤٢٥ و ١٩٣٠ و ٢٦٤٦ و ٢٩٤٥.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح لغيره.



الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَايْمُ اللَّهِ، لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ، لَقَطَعْتُ يَدَهَا» قَالَ: مُحَمَّدُ بْنُ رُمْحٍ: سَمِعْتُ اللَّيْثَ بْنَ سَعْدٍ يَقُولُ: «قَدْ أَعَاذَهَا اللَّهُ ﷻ أَنْ تَسْرِقَ، وَكُلُّ مُسْلِمٍ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَقُولَ هَذَا»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: کە قورەیشییەکان دڵتەنگ و دوودڵ بوون بەکێشەی ئافرەتێک کە لە مەخزومیەکان بوو دزی کردبوو، جا گوتیان: کێ هەیە دەربارەی ئەو ڕووداوە قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ قسە بکات؟ گوتیان: جا کێ دەتوانێ جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید کە خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە ﷺ ؟! ئوسامە قسەی لەگەڵدا کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەربارەی حەدێک لە حەدەکانی خوا تکا دەکەی؟ پاشان هەڵسا و وتاریدا، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! ئەوانەی پێش ئێوە لەناوچوون بە هۆی ئەوەی کە کاتێک گەورە و خانەدانەکانیان دزیان بکردایە وازیان لێ دەهێنا، ئەگەر لاوازەکانیشیان دزیان بکردایە سزاکەیان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، سوێند بە خوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد ﷺ دزی بکات دەستی دەبڕم. موحەممەدی کوڕی ڕومح دەڵێ: گوێبیستی لەیسی کوڕی سەعد بووم دەیگوت: خوا ﷻ پەنای داوە لەوەی دزی بکات، وە پێویستە هەموو مسوڵمانێک ئاوا بڵێ.

**٢٥٤٨-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ طَلْحَةَ بْنِ رُكَانَةَ، عَنْ أُمِّهِ عَائِشَةَ بِنْتِ مَسْعُودِ بْنِ الْأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهَا ﵁ قَالَ: لَمَّا سَرَقَتِ الْمَرْأَةُ تِلْكَ الْقَطِيفَةَ مِنْ بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَعْظَمْنَا ذَلِكَ، وَكَانَتِ امْرَأَةً مِنْ قُرَيْشٍ، فَجِئْنَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ نُكَلِّمُهُ، وَقُلْنَا: نَحْنُ نَفْدِيهَا بِأَرْبَعِينَ أُوقِيَّةً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تُطَهَّرَ خَيْرٌ لَهَا». فَلَمَّا سَمِعْنَا لِينَ قَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَتَيْنَا أُسَامَةَ فَقُلْنَا: كَلِّمْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَلِكَ، قَامَ خَطِيبًا فَقَالَ: «مَا إِكْثَارُكُمْ عَلَيَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ ﷻ وَقَعَ عَلَى أَمَةٍ مِنْ إِمَاءِ اللَّهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ كَانَتْ فَاطِمَةُ ابْنَةُ رَسُولِ اللَّهِ، نَزَلَتْ بِالَّذِي نَزَلَتْ بِهِ، لَقَطَعَ مُحَمَّدٌ يَدَهَا»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٧٣٣، ومسلم: ١٦٨٨، وأبو داود: ٤٣٧٣ و ٤٣٧٤ و ٤٣٩٦ و ٤٣٩٧، والترمذي: ١٤٣٠، والنسائي: ٤٨٩٥ و ٤٨٩٧_٤٩٠٣.

(٢) ضعيف.

واتە: موحەممەدی کوڕی تەڵحەی کوڕی ڕوکانە لە دایکییەوە عائیشەی کچی مەسعوودی کوڕی ئەسوەد لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: کاتێک ئەو ژنە پارچە پۆشاکەکەی لە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دزی بوو، کارەکەمان زۆر بەلاوە گەورە بوو، ئافرەتەکەش لە قورەیش بوو، جا هاتین بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ بکەین و گوتمان: ئێمە چل ئۆقیە بە فیدیە و لە جێگەی دزیەکەی دەدەین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر لەو تاوانە پاک بکرێتەوە بۆی باشترە، ئێمەش کاتێک بینیمان کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەرمی بە قسەکانیەوە دیارە هاتین بۆ لای ئوسامە و گوتمان: قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بکە، جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بینی هەستا و وتاریدا و فەرمووی: ئەوە چییە هێندە زۆری دەکەن لە حەدێک لە حەدەکانی خوای گەورەدا کە یەکێک لە بەندەکانی خوا تێیکەوتووە؟! سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد ﷺ ئەو کارە بکات کە بەسەر ئەو ژنەدا هاتوە، موحەممەد دەستی دەبڕێت.

## بابەت: سزای زینا

**٢٥٤٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، وَشِبْلٍ ﷺ قَالُوا: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: أَنْشُدُكَ اللَّهَ، إِلَّا قَضَيْتَ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ، فَقَالَ خَصْمُهُ وَكَانَ أَفْقَهَ مِنْهُ: اقْضِ بَيْنَنَا بِكِتَابِ اللَّهِ، وَأْذَنْ لِي حَتَّى أَقُولَ، قَالَ: «قُلْ». قَالَ: إِنَّ ابْنِي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا، وَإِنَّهُ زَنَى بِامْرَأَتِهِ، فَافْتَدَيْتُ مِنْهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَخَادِمٍ، فَسَأَلْتُ رِجَالًا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، فَأُخْبِرْتُ أَنَّ عَلَى ابْنِي جَلْدَ مِائَةٍ وَتَغْرِيبَ عَامٍ، وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ، الْمِائَةُ الشَّاةُ وَالْخَادِمُ رَدٌّ عَلَيْكَ، وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَامٍ، وَاغْدُ يَا أُنَيْسُ، عَلَى امْرَأَةِ هَذَا، فَإِنِ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا» قَالَ هِشَامٌ: فَغَدَا عَلَيْهَا، فَاعْتَرَفَتْ، فَرَجَمَهَا[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرە و زەیدی کوڕی خالید و شیبلەوە ﷺ دەگێڕنەوە، گوتوویانە: ئێمە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، جا پیاوێک هات و گوتی: سوێندت دەدەم بە خوا، بە کتێبی خوا بڕیارمان بۆ دەربکەی، ئنجا بەرانبەرەکەی کە لەو شارەزاتر

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣١٤ و ٢٩٩٥، ومسلم: ١٦٩٧، وأبو داود: ٤٤٤٥، والترمذي: ١٤٣٣، والنسائي: ٥٤١٠ و ٥٤١١.

بوو گوتی: بە کتێبی خوا بڕیار لە نێوانماندا بدە و مۆڵەتم پێ بدە تاکو من باسی بکەم، فەرمووی: بڵێ، گوتی: لە ڕاستیدا کوڕەکەی من لای ئەو پیاوە کرێکارە، (کوڕەکەشم) زینای لەگەڵ ژنەکەیدا کردوە، منیش سەد سەر مەڕ و کارەکەرێکم لە بری ئەو کارە داوە، جا پرسیارم لە خەڵکی زانا و شارەزا کردوە و پێیان ڕاگەیاندم کە کوڕەکەم دەبێ سەد داری لێ بدرێ و ساڵێکیش دوور بخرێتەوە، وە خێزانی ئەویش ڕەجمی کەوتۆتە سەر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە بەپێی فەرمانەکانی کتێبی خوا بڕیار لە نێوانتاندا دەدەم، سەد سەر مەڕەکە و کارەکەرەکە بۆ خۆت، وە کوڕەکەت سەد دار و دوورخستنەوەی ساڵێکی کەوتۆتە سەر، ئەی ئونەیس (ناوی یەکێک لە ئامادەبووانە) بەیانی بچۆ بۆ لای ژنی ئەو پیاوە، جا ئەگەر دانی پێدانا ئەوە ڕەجمی بکە، هیشام گوتی: ئونەیس بەیانییەکە چوو، ئافرەتەکەش دانی پێدانا و ڕەجمی کرد.

**تێبینی:** دیارە کە لێرە ناوی یەک لە هاوەڵان هاتوە، مەبەست پێی هەر ئەو نیە، بەڵکو کۆمەڵێک لە هاوەڵانی لەگەڵدا بوون، بۆ جێبەجێ کردنی ئەو حوکمە شەرعیە.

**٢٥٥٠-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلًا. الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ سَنَةٍ، وَالثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ وَالرَّجْمُ»[١].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو جار فەرمووی: بڕیارەکە لە من وەربگرن، بەدڵنیایی خوای گەورە ڕێگا چارەی بۆ ئافرەتان داناوە: کچ لەگەڵ کوڕ (زینا بکەن) سەد دار و، دوور خستنەوەی ساڵێکیان دەکەوێتە سەر، پیاو لەگەڵ ژن سەد دار و بەردبارانکردنیان دەکەوێتە سەر.

## بابەت: کەسێک بچێتە لای کەنیزەکی خێزانەکەی

**٢٥٥١-** عَنْ حَبِيبِ بْنِ سَالِمٍ قَالَ: أُتِيَ النُّعْمَانُ بْنُ بَشِيرٍ ﷺ بِرَجُلٍ غَشِيَ جَارِيَةَ امْرَأَتِهِ، فَقَالَ: لَا أَقْضِي فِيهَا إِلَّا بِقَضَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنْ كَانَتْ أَحَلَّتْهَا لَهُ، جَلَدْتُهُ مِائَةً، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ أَذِنَتْ لَهُ، رَجَمْتُهُ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٩٠، وأبو داود: ٤٤١٥ و ٤٤١٦، والترمذي: ١٤٣٤.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٤٥٨ و ٤٤٥٩، والترمذي: ١٤٥١، والنسائي: ٣٣٦٠_٣٣٦٢.



واتە: حەبیبی کوڕی سالیم دەڵێ: پیاوێکیان هێنا بۆ لای نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ لەگەڵ کەنیزەکی ژنەکەی جوتببوو،، ئەویش گوتی: دادوەریتان لە نێواندا ناکەم تەنها بە بڕیارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێ، گوتی: ئەگەر ژنەکەی ڕێی پێ دابێت و بۆی حەڵاڵ کردبێ ئەوە سەد داری لێ دەدەم، خۆ ئەگەر ژنەکەی بۆی حەڵاڵ نەکردبێ، ئەوە بەردبارانی دەکەم.

**٢٥٥٢- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْمُحَبِّقِ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رُفِعَ إِلَيْهِ رَجُلٌ وَطِئَ جَارِيَةَ امْرَأَتِهِ، فَلَمْ يَحُدَّهُ»[(١)].**

واتە: سەلەمەی کوڕی موحەبیق ﷺ دەگێڕێتەوە، داوایەکیان لەسەر پیاوێک بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزکردەوە کە (پیاوەکە) سەرجێی لەگەڵ کەنیزەکی ژنەکەی کردبوو، جا (پێغەمبەر ﷺ) حەدی لێ دەرنەکرد.

## بابەت: ڕەجم (بەرد باران کردن)

**٢٥٥٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ يَطُولَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ حَتَّى يَقُولَ قَائِلٌ: مَا أَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ مِنْ فَرَائِضِ اللَّهِ، أَلَا وَإِنَّ الرَّجْمَ حَقٌّ، إِذَا أُحْصِنَ الرَّجُلُ وَقَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ حَمْلٌ أَوِ اعْتِرَافٌ، وَقَدْ قَرَأْتُهَا الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ «رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ»[(٢)].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: بەڕاستی ترسم هەیە کە ڕۆژگارێکی درێژ بەسەر خەڵکیدا تێپەڕێ، هەتا یەکێک دەڵێ: هیچ شتێک دەربارەی ڕەجم لە قورئاندا نابینم، جا بە هۆی وازهێنان لە یەکێک لە فەڕزەکانی خوا، گومڕا دەبێ، ئاگاداربن بەڕاستی ڕەجم حوکمەکەی هەقە، ئەگەر پیاو ژنی هەبوو (زینای کرد) و شایەدیش هەبوو لەسەری، یان ئافرەتەکە دووگیان بوو، یان دانپێداهێنان هەبوو، وە بێگومان من خوێندوومەتەوە کە دەڵێ: پیاو و ژن (ی هاوسەردار) ئەگەر زینایان کرد بە یەکجاری بەرد بارانیان بکەن، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەجمی کارپێکردوە و ئێمەش دوای ئەو ڕەجمان کارمان پێکردوە.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٤٦٠ و ٤٤٦١، والنسائي: ٣٣٦٣ و ٣٣٦٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٢٩، ومسلم: ١٦٩١، وأبو داود: ٤٤١٨، والترمذي: ١٤٣٢.

٢٥٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ مَاعِزُ بْنُ مَالِكٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي قَدْ زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ قَالَ: قَدْ زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، حَتَّى أَقَرَّ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ، فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُرْجَمَ، فَلَمَّا أَصَابَتْهُ الْحِجَارَةُ أَدْبَرَ يَشْتَدُّ، فَلَقِيَهُ رَجُلٌ بِيَدِهِ لَحْيُ جَمَلٍ، فَضَرَبَهُ فَصَرَعَهُ، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فِرَارُهُ حِينَ مَسَّتْهُ الْحِجَارَةُ، فَقَالَ: «فَهَلَّا تَرَكْتُمُوهُ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: ماعیزی کوڕی مالیک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: من زینام کردوە، (پێغەمبەریش ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕا، پاشان گوتی: بێگومان من زینام کردوە، (بۆ جاری دووەم پێغەمبەر ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕا، پاشان گوتی: زینام کردوە، (ئەو جاریش پێغەمبەر ﷺ) ڕووی لێ وەرگێڕا، پاشان گوتی: بە دڵنیایی زینام کردوە، هەتا چوار جار دانی پێداهێنا پێغەمبەر ﷺ هەر ڕووی لێ وەردەگێڕا، ئنجا فەرمانی کرد کە ڕەجم بکرێ، جا کاتێک بەردەکانی بەرکەوت ئازاری پێگەیشت و ڕایکرد، ئیتر پیاوێک پێی گەیشت کە ئێسکێکی چەناگەی وشتری پێبوو، جا پێی کێشا و خستی بە زەویدا، جا هەڵاتنەکەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە کە بەردەکەی بەرکەوتبو و ڕایکردبوو، فەرمووی: ئەی بۆ وازتان لێ نەهێنا؟

٢٥٥٥- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَاعْتَرَفَتْ بِالزِّنَا، «فَأَمَرَ بِهَا فَشُكَّتْ عَلَيْهَا ثِيَابُهَا، ثُمَّ رَجَمَهَا، ثُمَّ صَلَّى عَلَيْهَا»[2].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەگێڕێتەوە، ئافرەتێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و دانی نا بەوەی کە زینای کردوە، جا فەرمانی کرد کە بە پۆشاکەکەی خۆی بیپێچنەوە (تاکو لاشەی دەرنەکەوێ)، پاشان (فەرمانی) ڕەجمی کرد، پاشان نوێژی لەسەر کرد.

## بابەت: ڕەجمکردنی ژن و پیاوی جوولەکە

٢٥٥٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَجَمَ يَهُودِيَّيْنِ» أَنَا فِيمَنْ رَجَمَهُمَا، فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ وَإِنَّهُ يَسْتُرُهَا مِنَ الْحِجَارَةِ[3].

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٤٢٨. ونحوه دون قصة فراره: البخاري: ٥٢٧١، ومسلم: ١٦٩١/١٦، وأبو داود: ٤٤٢٨.

(٢) صحيح. أخرجه مطولًا عند مسلم: ١٦٩٦، وأبو داود: ٤٤٤٠، والترمذي: ١٤٣٥، والنسائي: ١٩٥٧.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٢٩، ومسلم: ١٦٩٩، وأبو داود: ٤٤٤٦ و ٤٤٤٩، والترمذي: ١٤٣٦.

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دوو جوولەکەی ڕەجم کردن، منیش لە ناو ئەوانەدا بووم کە ڕەجمیان دەکردن، وە بێگومان چاوم لێ بوو، کە پیاوەکە خۆی بەبەر بەردەکانەوە دەدا تاکو بە ئافرەتەکە نەکەون.

**٢٥٥٧-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَجَمَ يَهُودِيًّا وَيَهُودِيَّةً»[(١)].

واتە: جابیری کوڕی سەموڕە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ژن و پیاوێکی جوولەکەی ڕەجم کردوە.

**٢٥٥٨-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِيَهُودِيٍّ مُحَمَّمٍ مَجْلُودٍ. فَدَعَاهُمْ فَقَالَ: «هَكَذَا تَجِدُونَ فِي كِتَابِكُمْ حَدَّ الزَّانِي؟» قَالُوا: نَعَمْ. فَدَعَا رَجُلًا مِنْ عُلَمَائِهِمْ فَقَالَ: «أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ الَّذِي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى، أَهَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي؟» قَالَ: لَا. وَلَوْلَا أَنَّكَ نَشَدْتَنِي لَمْ أُخْبِرْكَ. نَجِدُ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِنَا الرَّجْمَ، وَلَكِنَّهُ كَثُرَ فِي أَشْرَافِنَا. فَكُنَّا إِذَا أَخَذْنَا الشَّرِيفَ تَرَكْنَاهُ، وَكُنَّا إِذَا أَخَذْنَا الضَّعِيفَ أَقَمْنَا عَلَيْهِ الْحَدَّ. فَقُلْنَا: تَعَالَوْا فَلْنَجْتَمِعْ عَلَى شَيْءٍ نُقِيمُهُ عَلَى الشَّرِيفِ وَالْوَضِيعِ، فَاجْتَمَعْنَا عَلَى التَّحْمِيمِ وَالْجَلْدِ مَكَانَ الرَّجْمِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَوَّلُ مَنْ أَحْيَا أَمْرَكَ، إِذْ أَمَاتُوهُ» . وَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ[(٢)].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای جوولەکەیەکدا تێپەڕی کە دەم و چاویان ڕەش کردبو و داری حەدیان لێ دابوو، بانگی کردن و فەرمووی: حەدی زینا لە کتێبەکەی ئێوە بەو شێوەیە؟ گوتیان: بەڵێ، جا پیاوێکی لە زاناکانیان بانگ کرد و فەرمووی: سوێندت دەدەم بەو خوایەی کە تەوڕاتی بۆ موسا ناردووە، ئایا حەدی زینا لای ئێوە بەو شێوەیە؟ گوتی: نەخێر، خۆ ئەگەر سوێندت نەدابام پێم نەدەگوتی، حەدی زینا لە کتێبەکەی ئێمەدا ڕەجمە، بەڵام لەناو گەورە و خانەدانەکاندا زۆر پەرەی سەندووە، بۆیە ئێمە ئەگەر گەورە و بنەماڵەکان بیانکربایە وازمان لێ دەهێنان، وە ئەگەر لاواز و بێ دەسەڵاتەکان بیانکربایە حەدمان لێ دەردەکردن، ئنجا گوتمان: (بڕیارماندا) با هەموومان لەسەر شتێک کۆببینەوە کە بکرێ لەسەر بەهێز و بێ هێز جێبەجێ بکرێ، ڕێککەوتین لەسەر ڕوو ڕەشکردن و دار

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٠٠، وأبو داود: ٤٤٤٧ و ٤٤٤٨.

لێدان لە جێگای ڕەجم کردن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خودایە من یەکەم کەس دەبم کە فەرمان و بڕیاری تۆ زیندوو دەکەمەوە، پاش ئەوەی کە ئەوان مراندوویانە، ئنجا فەرمانی دەرکرد ڕەجمیان کرد.

## بابەت: کەسێک کە بە ئاشکرا گوناهو تاوان دەکات

٢٥٥٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كُنْتُ رَاجِمًا أَحَدًا بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ لَرَجَمْتُ فُلَانَةَ. فَقَدْ ظَهَرَ مِنْهَا الرِّيبَةُ فِي مَنْطِقِهَا وَهَيْئَتِهَا وَمَنْ يَدْخُلُ عَلَيْهَا»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هیچ کەسێکم بە بێ بەڵگە ڕەجم بکردایە ئەوە فلانە ئافرەتم ڕەجم دەکرد، چونکە بەڕاستی گومانەکانی لەسەر دیارن لە قسەو هەڵسوکەوتی و ئەوانەشی سەردانی دەکەن.

٢٥٦٠- عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ ﷺ، قَالَ: ذَكَرَ ابْنُ عَبَّاسٍ الْمُتَلَاعِنَيْنِ، فَقَالَ لَهُ ابْنُ شَدَّادٍ: هِيَ الَّتِي قَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كُنْتُ رَاجِمًا أَحَدًا بِغَيْرِ بَيِّنَةٍ لَرَجَمْتُهَا» ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: تِلْكَ امْرَأَةٌ أَعْلَنَتْ[٢].

واتە: قاسمی کوڕی موحەممەد ﷺ دەڵێ: ئیبنو عەبباس باسی ئەوانەی کرد کە لیعانیان کرد، ئنجا ئیبنو شەدداد پێی گوت: ئایا ئەوە ئەو ئافرەتەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەیەوە فەرمووی: ئەگەر هیچ کەسێکم بە بێ بەڵگە ڕەجم بکردایە، ئەو ئافرەتەم ڕەجم دەکرد؟ ئنجا ئیبنو عەبباس گوتی: ئەو ئافرەتە بە ئاشکرا (ناسرابوو کە گوناهو تاوانی) دەکرد.

## بابەت: ئەوانەی کردەوەی گەلی لووط دەکەن

٢٥٦١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٥٥، ومسلم: ١٤٩٧ المرفوع منه.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٥٥، ومسلم: ١٤٩٧، والنسائي: ٣٤٧٠ و ٣٤٧١.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٤٦٢، والترمذي: ١٤٥٦.

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێكتان بینی كە كردەوەی گەلی لووط دەكات (واتە: نێربازی دەكات)، هەردووكیان بكوژن.

**٢٥٦٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الَّذِي يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ قَالَ: «ارْجُمُوا الْأَعْلَى وَالْأَسْفَلَ، ارْجُمُوهُمَا جَمِيعًا»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، كە دەربارەی ئەوانەی كە كردەوەی گەلی لووط ئەنجامدەدەن فەرموویەتی: ڕەجمیان بكەن ئەوەی لە سەرەوەیە و ئەوەشی كە لە خوارەوەیە، هەردووكیان ڕەجم بكەن.

**٢٥٦٣-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي عَمَلُ قَوْمِ لُوطٍ»[٢].

واتە: جابیری كوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو شتەی كە زۆر لێی دەترسم لە ناو ئوممەتەكەم بڵاوبێتەوە، كردەوەكەی گەلی لووطە.

## بابەت: ئەوانەی كە دەچنە لای مەحرەم و ئاژەڵ

**٢٥٦٤-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ وَقَعَ عَلَى ذَاتِ مَحْرَمٍ فَاقْتُلُوهُ، وَمَنْ وَقَعَ عَلَى بَهِيمَةٍ فَاقْتُلُوهُ، وَاقْتُلُوا الْبَهِيمَةَ»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك زینای لەگەڵ مەحرەمێكی خۆی كرد، بیكوژن، وە هەر كەسێك چوو بۆ لای ئاژەڵێك، كەسەكە و ئاژەڵەكەش بكوژن.

---

(١) حسن صحيح. أخرجه الترمذي بإثر: ١٤٥٦ تعليقاً بمعناه.

(٢) حسن.

(٣) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٤٤٦٤، والترمذي: ١٤٥٥.

## بابەت: جێبەجێ كردنی حەدەكان لەسەر كەنیزەك

**٢٥٦٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ، وَشِبْلٍ ﷺ قَالُوا: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَسَأَلَهُ رَجُلٌ عَنِ الْأَمَةِ تَزْنِي قَبْلَ أَنْ تُحْصَنَ، فَقَالَ: «اجْلِدْهَا، فَإِنْ زَنَتْ فَاجْلِدْهَا» ثُمَّ قَالَ: فِي الثَّالِثَةِ أَوْ فِي الرَّابِعَةِ «فَبِعْهَا وَلَوْ بِحَبْلٍ مِنْ شَعَرٍ»[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرە و زەیدی كوڕی خالیدو شیبلەوە ﷺ دەگێڕنەوە، گوتوویانە: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، پیاوێك پرسیاری لێكرد دەربارەی كەنیزەكێك كە پێش ئەوەی شوو بكات زینا بكات، ئەویش فەرمووی: داری حەدی لێ بدە، ئنجا ئەگەر زینای كردەوە داری حەدی لێ بدە، پاشان لە سێیەم جار یان چوارەم جار فەرمووی: جا بیفرۆشە ئەگەر بە پەتێكی (گوریسێكی) لە موو دروستكراویش بێ.

**٢٥٦٦-** عَنْ عَمْرَةَ بِنْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ حَدَّثَتْهُ، أَنَّ عَائِشَةَ ﷺ حَدَّثَتْهَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا زَنَتِ الْأَمَةُ فَاجْلِدُوهَا، فَإِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، فَإِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، فَإِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ بِيعُوهَا وَلَوْ بِضَفِيرٍ» وَالضَّفِيرُ: الْحَبْلُ[2].

واتە: عەمرەتەی كچی عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەگێڕێتەوە، عائیشە ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر كەنیزەك زینای كرد، داری حەدی لێ بدەن، جا ئەگەر زینای كردەوە داری حەدی لێ بدەن، جا ئەگەر زینای كردەوە داری حەدی لێ بدەن، جا ئەگەر زینای كردەوە داری حەدی لێ بدەن، پاشان بیفرۆشن ئەگەر بە پەتێكیش بێت.

## بابەت: حەدی بوهتان (بەزینا تۆمەتباركردن)

**٢٥٦٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: «لَمَّا نَزَلَ عُذْرِي قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ فَذَكَرَ ذَلِكَ وَتَلَا الْقُرْآنَ، فَلَمَّا نَزَلَ أَمَرَ بِرَجُلَيْنِ وَامْرَأَةٍ فَضُرِبُوا حَدَّهُمْ»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢١٥٢، ومسلم: ١٧٠٣ و ١٧٠٤، وأبو داود: ٤٤٦٩_٤٤٧١، والترمذي: ١٤٥٥.

(٢) صحيح.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٤٧٤، والترمذي: ٣١٨١. وانظر أبو داود: ٤٠٠٨ و ٥٢١٩.

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: کاتێک کە بەری بوون و پاکی من ئایەتی لەسەر دابەزی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا لەسەر مینبەر ئەوەی باس کرد و قورئانەکەی خوێندەوە، پاشان دابەزی و فەرمانی کرد کە دوو پیاو و ژنێک حەدەکەیان لێ بدرێ.

**٢٥٦٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَالَ: الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: يَا مُخَنَّثُ فَاجْلِدُوهُ عِشْرِينَ، وَإِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: يَا لُوطِيُّ فَاجْلِدُوهُ عِشْرِينَ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێک بە پیاوێکی گوت: ئەی ژنانی بیست داری لێ بدەن، وە ئەگەر پیاوێک بە پیاوێکی گوت: ئەی نێرباز، بیست داری لێ بدەن.

## بابەت: حەدی سەرخۆش

**٢٥٦٩-** عَنْ عُمَيْرِ بْنِ سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ: «مَا كُنْتُ أَدِي مَنْ أَقَمْتُ عَلَيْهِ الْحَدَّ، إِلَّا شَارِبَ الْخَمْرِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَسُنَّ فِيهِ شَيْئًا، إِنَّمَا هُوَ شَيْءٌ جَعَلْنَاهُ نَحْنُ»(٢).

واتە: عومەیری کوڕی سەعید ﷺ دەڵێ: عەلی ئەبو تاڵیب ﷺ گوتوویەتی: بۆ هیچ کەسێک کە داری حەدم لێ داوە و مردووە خوێنم نەداوە، تەنها ئەو کەسە نەبێ کە عارەق خۆرە، چونکە بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ (لە چل جەڵد زیاتر) هیچ بڕیارێکی حەدی دەربارەی نەفەرمووە، بەڵکو تەنها خۆمان شتێکمان بۆ دیاری کردوە.

**٢٥٧٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ» يَضْرِبُ فِي الْخَمْرِ بِالنِّعَالِ وَالْجَرِيدِ»(٣).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە گەڵای دارخورما و بە نەعل لە عارەق خۆری دەدا.

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٤٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٧٨، ومسلم: ١٧٠٧، وأبو داود: ٤٤٨٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٧٣، ومسلم: ١٧٠٦، وأبو داود: ٤٤٧٩، والترمذي: ١٤٤٣.

**٢٥٧١-** عَنْ حُضَيْنِ بْنِ الْمُنْذِرِ ﷺ قَالَ: لَمَّا جِيءَ بِالْوَلِيدِ بْنِ عُقْبَةَ إِلَى عُثْمَانَ قَدْ شَهِدُوا عَلَيْهِ، قَالَ لِعَلِيٍّ: دُونَكَ ابْنَ عَمِّكَ، فَأَقِمْ عَلَيْهِ الْحَدَّ، فَجَلَدَهُ عَلِيٌّ وَقَالَ: «جَلَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَرْبَعِينَ، وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ، وَجَلَدَ عُمَرُ ثَمَانِينَ، وَكُلٌّ سُنَّةٌ»[1].

**واتە: حوزەینی کوڕی مونزیر ﷺ دەڵێ: کاتێک کە وەلیدی کوڕی عوقبەیان هێنا بۆ لای عوسمان، کە بێگومان شایەدیان لەسەردا (کە عارەقی خواردبۆوە)، بە عەلی گوت: کوڕە مامەکەت بگرە و حەدی لێ دەربکە، ئنجا عەلی داری حەدی لێدا، وە گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چل داری لە عارەق خۆر داوە، وە ئەبو بەکریش چل داری لێداوە، عومەر هەشتا داری لێداوە، ئەوانەش هەموویان سوننەتن (واتە: ڕاستن).**

## بابەت: ئەوانەی کە چەند جار عارەق خواردنەوە دووبارە دەکەنەوە

**٢٥٧٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا سَكِرَ فَاجْلِدُوهُ، فَإِنْ عَادَ فَاجْلِدُوهُ، فَإِنْ عَادَ فَاجْلِدُوهُ» ثُمَّ قَالَ فِي الرَّابِعَةِ: «فَإِنْ عَادَ فَاضْرِبُوا عُنُقَهُ»[2].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر (کەسێک) سەرخۆش بوو داری لێبدەن، ئەگەر دووبارەی کردەوە دیسان داری لێبدەن، ئەگەر دووبارەی کردەوە دیسان داری لێبدەن، پاشان لە چوارەم جاردا فەرمووی: ئەگەر دووبارەی کردەوە لە گەردنی بدەن.**

**٢٥٧٣-** عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا شَرِبُوا الْخَمْرَ فَاجْلِدُوهُمْ، ثُمَّ إِذَا شَرِبُوا فَاجْلِدُوهُمْ، ثُمَّ إِذَا شَرِبُوا فَاجْلِدُوهُمْ، ثُمَّ إِذَا شَرِبُوا فَاقْتُلُوهُمْ»[3].

**واتە: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر عارەقیان خواردەوە داری حەدیان لێبدەن، پاشان ئەگەر خواردیانەوە داری حەدیان لێبدەن، پاشان ئەگەر خواردیانەوە داری حەدیان لێبدەن، پاشان ئەگەر (بۆ جاری چوارەم) خواردیانەوە بیانکوژن.**

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٠٧، وأبو داود: ٤٤٨٠ و ٤٤٨١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٨٤، والنسائي: ٥٦٦٢.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٨٤، والنسائي: ١٤٤٤.

## بابەت: کەسی بە تەمەن و نەخۆش حەدی لەسەر واجبە

**٢٥٧٤-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ ﵄ قَالَ: كَانَ بَيْنَ أَبْيَاتِنَا رَجُلٌ مُخْدَجٌ ضَعِيفٌ، فَلَمْ يُرَعْ إِلَّا وَهُوَ عَلَى أَمَةٍ مِنْ إِمَاءِ الدَّارِ يَخْبُثُ بِهَا، فَرَفَعَ شَأْنَهُ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «اجْلِدُوهُ ضَرْبَ مِائَةِ سَوْطٍ» قَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، هُوَ أَضْعَفُ مِنْ ذَلِكَ، لَوْ ضَرَبْنَاهُ مِائَةَ سَوْطٍ مَاتَ، قَالَ «فَخُذُوا لَهُ عِثْكَالًا فِيهِ مِائَةُ شِمْرَاخٍ فَاضْرِبُوهُ ضَرْبَةً وَاحِدَةً»[1].

واتە: سەعیدی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە ﵄ دەڵێ: پیاوێکی ناتەواوی لاواز لەناوماندابوو، بە خۆی نەزانی تاکو لەگەڵ کەنیزەکێکی ئەو ماڵە زینای کرد، جا سەعدی کوڕی عوبادە ئەو باسەی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزکردەوە، ئەویش فەرمووی: لێی بدەن بە لێدانی سەد قامچی، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پیاوە لەوە لاوازترە کە بەرگەی سەد قامچی بگرێ، خۆ ئەگەر سەد شێلاقی لێ بدەین دەمرێ، فەرمووی: لقێکی دارخورما بێنن سەد لاسکی تێدابێ و بە یەکجار بە یەک لێدان لێی بدەن.

**٢٥٧٤م-** حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِيُّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ يَعْقُوبَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلٍ ﵁، عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[2].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: کەسێک کە بە چەک ڕاسێت

**٢٥٧٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک چەک لە ڕووماندا هەڵبگرێ، لە ئێمە نیە.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠١.

**٢٥٧٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا»[١].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک چەک لە دژمان هەڵبگرێ، لە ئێمە نیە.

**٢٥٧٧- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ شَهَرَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا»[٢].**

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک چەک بەرانبەر ئێمە هەڵکێشێ، لە ئێمە نیە.

## بابەت: کەسانێک کە شەڕانگێزبن و خراپە بڵاوبکەنەوە

**٢٥٧٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ أُنَاسًا مِنْ عُرَيْنَةَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَاجْتَوَوْا الْمَدِينَةَ، فَقَالَ: «لَوْ خَرَجْتُمْ إِلَى ذَوْدٍ لَنَا، فَشَرِبْتُمْ مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا» فَفَعَلُوا. فَارْتَدُّوا عَنِ الْإِسْلَامِ، وَقَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَاسْتَاقُوا ذَوْدَهُ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ فِي طَلَبِهِمْ، فَجِيءَ بِهِمْ، فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَرَ أَعْيُنَهُمْ وَتَرَكَهُمْ بِالْحَرَّةِ حَتَّى مَاتُوا[٣].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، کۆمەڵێک خەڵکی لە هۆزی عوڕەینە هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئاو و هەوای مەدینەیان پێ نەدەکەوت و حەزیان لێی نەبوو (نەخۆش کەوتن)، (پێغەمبەریش ﷺ) پێی فەرموون: ئەگەر چووبانایە لای وشترەکانمان (لە دەرەوەی مەدینە) لە شیر و میزەکەیانتان خواردبایەوە (تاکو چاک بوونایەوە)، ئەوانیش ئەوەیان کرد، ئنجا لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە و شوانەکەی پێغەمبەری خوایان ﷺ کوشت، وە وشترەکانیان پێش خۆیاندا و بردیانن، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بە شوێنیاندا و هێنایانن، جا دەست و قاچی بڕین و چاوی بە بزمار ڕشتن (داخ کردن) و لە بەردەڵانی دەرەوەی مەدینە بەجێی هێشتن هەتاکو مردن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٧٤ و ٧٠٧٠، ومسلم: ٩٨، والنسائي: ٤١٠٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٧١، ومسلم: ١٠٠، والترمذي: ١٤٥٩.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٣، ومسلم: ١٦٧١، وأبو داود: ٤٣٦٤_٤٣٦٨، والترمذي: ٧٢ و ١٨٤٥ مختصراً، والنسائي: ٣٠٦.

**٢٥٧٩-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ قَوْمًا أَغَارُوا عَلَى لِقَاحِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، «فَقَطَعَ النَّبِيُّ ﷺ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسَمَلَ أَعْيُنَهُمْ»[1].

**واتە:** عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، کۆمەڵە خەڵکێک غەدریان کرد و وشترەکانی پێغەمبەری خوایان ﷺ برد، پێغەمبەریش ﷺ دەست و قاچی بڕین و چاوی دەرهێنان (یان چاوی داخ کردن).

## بابەت: ئەو کەسەی لەپێناو پاراستنی ماڵەکەیدا بکوژرێ شەهیدە

**٢٥٨٠-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ»[2].

**واتە:** سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە پێناو ماڵەکەیدا بکوژرێ، ئەوە شەهیدە.

**٢٥٨١-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أُتِيَ عِنْدَ مَالِهِ، فَقُوتِلَ فَقَاتَلَ فَقُتِلَ، فَهُوَ شَهِيدٌ»[3].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بێت و پارێزگاری لە ماڵەکەی بکات و بجەنگێت و بکوژرێ، ئەوە شەهیدە.

**٢٥٨٢-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أُرِيدَ مَالُهُ ظُلْمًا فَقُتِلَ، فَهُوَ شَهِيدٌ»[4].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دەستدرێژی بکرێتە سەر ماڵەکەی و بە ستەم بکوژرێ، ئەوە شەهیدە.

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٠٣٨ و ٤٠٣٩ و ٤٠٤٠.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٧٧٢، والترمذي: ١٤١٨ و ١٤٢١، والنسائي: ٤٠٩٠ و ٤٠٩١ و ٤٠٩٤ و ٤٠٩٥.

(٣) صحيح.

(٤) حسن صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٠ بنحوه.

## بابەت: حەدی دز

**٢٥٨٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَعَنَ اللَّهُ السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ، وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ»[1].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەفرەتی خوا لەو دزەی کە هێلکەیەک دەدزێ و بە هۆیەوە دەستی دەبڕدرێ، وە پەتکێک دەدزێ و بە هۆیەوە دەستی دەبڕدرێ.

**٢٥٨٤-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «قَطَعَ النَّبِيُّ ﷺ فِي مِجَنٍّ قِيمَتُهُ ثَلَاثَةُ دَرَاهِمَ»[2].

**واتە:** ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی دزی بڕیوە لەسەر قەڵغانێک کە نرخەکەی سێ درهەم بوو.

**٢٥٨٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُقْطَعُ الْيَدُ إِلَّا فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا»[3].

**واتە:** عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستی دز نابڕدرێ مەگەر لەسەر چواریەکی دینارێک و زیاتر (واتە: یەک لەسەر چواری دینارێک و زیاتر).

**٢٥٨٦-** عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي ثَمَنِ الْمِجَنِّ»[4].

**واتە:** عامری کوڕی سەعد لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستی دز لەسەر نرخی قەڵغانێک دەبڕدرێ.

## بابەت: هەڵواسینی دەست بە گەردنەوە

**٢٥٨٧-** عَنِ ابْنِ مُحَيْرِيزٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ، عَنْ تَعْلِيقِ الْيَدِ فِي الْعُنُقِ؟ فَقَالَ: «السُّنَّةُ، قَطَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَ رَجُلٍ، ثُمَّ عَلَّقَهَا فِي عُنُقِهِ»[5].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٨٣، ومسلم: ١٦٨٧، والنسائي: ٤٨٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٩٥، ومسلم: ١٦٨٦، وأبو داود: ٤٣٨٥ و ٤٣٨٦، والترمذي: ١٤٤٦، والنسائي: ٤٩٠٦_٤٩١٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٨٩، ومسلم: ١٦٨٤ و ١٦٨٥، وأبو داود: ٤٣٨٣ و ٤٣٨٤، والترمذي: ١٤٤٥، والنسائي: ٤٩١٤_٤٩٢٣ و ٤٩٢٨ و ٤٩٣١_٤٩٣٩.

(٤) ضعيف.

(٥) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٤١١، والترمذي: ١٤٤٧، والنسائي: ٤٩٨٢ و ٤٩٨٣.

واتە: ئیبنو موحەیریز ﷺ دەڵێ: پرسیارم لە فەزاڵەی کوڕی عوبەید کرد دەربارەی هەڵواسینی دەست (دەستی دز) بە ئەستۆیەوە، ئەویش گوتی: بەشێکە لە سوننەت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی پیاوێکی بڕی، پاشان بە ئەستۆیەوە هەڵیواسی.

## بابەت: دانپێدانانی دز

**٢٥٨٨-** عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَعْلَبَةَ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ عَمْرَو بْنَ سَمُرَةَ بْنِ حَبِيبِ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي سَرَقْتُ جَمَلًا لِبَنِي فُلَانٍ، فَطَهِّرْنِي، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِمُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالُوا: إِنَّا افْتَقَدْنَا جَمَلًا لَنَا، «فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ فَقُطِعَتْ يَدُهُ» قَالَ ثَعْلَبَةُ: «أَنَا أَنْظُرُ إِلَيْهِ حِينَ وَقَعَتْ يَدُهُ وَهُوَ يَقُولُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي طَهَّرَنِي مِنْكِ أَرَدْتِ أَنْ تُدْخِلِي جَسَدِي النَّارَ»[1].

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی سەعلەبەی ئەنصاریی لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، عەمڕی کوڕی سەموڕەی کوڕی حەبیبی کوڕی عەبدوشەمس هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من وشترێکی فڵانە هۆزم دزیوە، جا هاتوم پاکم بکەیتەوە، پێغەمبەر ﷺ بەدوایدا ناردن و ئەوانیش گوتیان: بێگومان ئێمە وشترێکمان لێ ون بووە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد دەستیان بڕی. سەعلەبە گوتی: من تەماشام دەکرد کاتێ دەستی لێ بۆوە دەیگوت: سوپاس بۆ خوا کە منی پاک کردەوە لە تۆ، ویستت جەستەم بخەیتە ناو ئاگرەوە.

## بابەت: دزی کردنی کۆیلە

**٢٥٨٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا سَرَقَ الْعَبْدُ فَبِيعُوهُ وَلَوْ بِنَشٍّ»[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کۆیلەیەک دزی کرد، بیفرۆشن ئەگەر بە نیو ئۆقیەش بێ، (واتە: با بە نرخێکی زۆر کەمیش بێ، کە دەکاتە بیست درهەم).

---

(١) ضعيف.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٤١٢، والنسائي: ٤٩٨٠.

٢٥٩٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ عَبْدًا مِنْ رَقِيقِ الْخُمُسِ سَرَقَ مِنَ الْخُمُسِ، فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمْ يَقْطَعْهُ وَقَالَ: «مَالُ اللَّهِ ﷻ، سَرَقَ بَعْضُهُ بَعْضًا»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، کۆیلەیەک کە بەشێک بوو لە پێنجیەکی غەنیمەت دزی کردبوو لە پێنجیەکەکە، جا ئەو داوایە بەرزکرایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش دەستی نەبڕی، وە فەرمووی: هەردووکیان موڵکی خوانﷻ، بەشێکی دزی لە بەشەکەی دیکەیدا کردوە (واتە: کۆیلەکەش هەر بەشێک بووە لە پێنجیەکەکە).

## بابەت: ناپاک و تاڵانکەر و ماڵ ڕفێن

٢٥٩١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يُقْطَعُ الْخَائِنُ، وَلَا الْمُنْتَهِبُ، وَلَا الْمُخْتَلِسُ»[2].

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەستی ناپاک و تاڵانکەر و ماڵ ڕفێن نابڕدرێ.

**خائین:** ئەو کەسەی دزی بکات لەو شتەی کە بە ئەمانەت لە لای دانراوەو ناپاکی تێدا کردوە.

**تاڵانکەر:** ئەوە کەسەی بە ئاشکرا شتەکە ببات.

**ڕفێنەر:** ئەو کەسەی بە ئاشکرا و بە خێرایی شت بڕفێنێ.

٢٥٩٢- عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَيْسَ عَلَى الْمُخْتَلِسِ قَطْعٌ»[3].

واتە: ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەو کەسەی شت دەڕفێنێ دەستی نابڕدرێ.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٩١ و ٤٣٩٢، والترمذي: ١٤٤٨، والنسائي: ٤٩٧١_٤٩٧٥.

(٣) صحيح.

## بابەت: بەروبوم بە دارەوەو کرۆکی دارخورما دەستیان لەسەر نابڕدرێ

**٢٥٩٣-** عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[١].

واتە: ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو بەروبوومەی کە بە دارەوەیە و لێ نەکراوەتەوە و کرۆکی دارخورماش دەست بڕینی لەسەر نیە.

**کثر:** شتێکی سپییە لە ناو قەدی دار خورما دێتە دەر و دەخورێ.

**٢٥٩٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەربووم بە دارەوە و کرۆکی دار خورما دەست بڕینیان لەسەر نیە.

## بابەت: ئەو کەسەی شت لە شوێنی پارێزراوی شایەن دەدزێ

**٢٥٩٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَفْوَانَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ نَامَ فِي الْمَسْجِدِ وَتَوَسَّدَ رِدَاءَهُ، فَأُخِذَ مِنْ تَحْتِ رَأْسِهِ، فَجَاءَ بِسَارِقِهِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَمَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُقْطَعَ، فَقَالَ صَفْوَانُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَمْ أُرِدْ هَذَا، رِدَائِي عَلَيْهِ صَدَقَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَهَلَّا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی صەفوان لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، لە مزگەوت نوستووە و سەری بە عەباکەی کردوە و یەکێک لە بن سەری دەری هێناوە (دزراوە)، ئنجا دزەکەی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە دەست بڕینی، صەفوانیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئەوەم نەدەویست! عەباکەم دەبەخشم بە ئەو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەدەکرا پێش ئەوەی بیهێنی بۆ لای من بیبەخشی؟ (واتە: کاتێک کە هێناتە لای من ئەوە حوکمی شەرع پێش دەخرێ).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٨٨، والترمذي: ١٤٤٩، والنسائي: ٤٩٦٠_٤٩٧٠.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٣٩٤، والنسائي: ٤٨٧٨ و ٤٨٧٩ و ٤٨٨٠ مرسلًا، ٤٨٨١ و ٤٨٨٣ و ٤٨٨٤.

**٢٥٩٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا مِنْ مُزَيْنَةَ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الثِّمَارِ، فَقَالَ: «مَا أُخِذَ فِي أَكْمَامِهِ فَاحْتُمِلَ، فَثَمَنُهُ وَمِثْلُهُ مَعَهُ، وَمَا كَانَ مِنَ الْجِرَانِ، فَفِيهِ الْقَطْعُ إِذَا بَلَغَ ذَلِكَ ثَمَنَ الْمِجَنِّ، وَإِنْ أَكَلَ وَلَمْ يَأْخُذْ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ» قَالَ: الشَّاةُ الْحَرِيسَةُ مِنْهُنَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «ثَمَنُهَا وَمِثْلُهُ مَعَهُ وَالنَّكَالُ، وَمَا كَانَ فِي الْمُرَاحِ، فَفِيهِ الْقَطْعُ، إِذَا كَانَ مَا يَأْخُذُ مِنْ ذَلِكَ ثَمَنَ الْمِجَنِّ»[1].

**واتە: عەمڕی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک لە هۆزی موزەینە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی (دزینی) میوە، ئەویش فەرمووی: ئەوەی کە لە ناو توێکڵەکەیدایە، یان پاک نەکراوە (ئەگەر کەسێک دزیتی) ئەوە بە ملی دادەدرێ و نرخی میوەکەی لێ وەردەگیرێ، هەروەها لەگەڵ ئەندازەی نرخی میوەکەش (وەکو تەمێ کردن)، وە هەر کەسێک لە شوێنی خورما وشک کردن خورماکە بدزێ، دەستی دەبڕدرێ ئەگەر نرخی دزراوەکە بگاتە نرخی قەڵغانێک، ئەڵام ئەگەر تەنها بخوات و لێی هەڵنەگرێ، هیچی لەسەر نیە، پیاوەکە گوتی: ئەی دەربارەی ئەو مەڕەی کەوا لە لەوەڕگا دەدزرێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: نرخەکەی و بە ئەندازەی نرخەکەشی لێ وەردەگیرێ لەگەڵ سزادان، ئەوەشی کە لە ئاغەڵ یان مۆڵی شەوانەی مەڕ (ئەو شوێنەی کە شەوانە مەڕی لێ دادەکرێ) دزی بکات، دەست بڕینی دەکەوێتە سەر، ئەگەر ئەو شتەی کە دەیبات نرخەکەی بگاتە نرخی قەڵغانێک.**

## بابەت: فێرکردنی دز بۆ شتێک بەڵکو حەدەکەی لەسەر لابچێ

**٢٥٩٧-** عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْمُنْذِرِ، مَوْلَى أَبِي ذَرٍّ ﷺ يَذْكُرُ أَنَّ أَبَا أُمَيَّةَ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِلِصٍّ فَاعْتَرَفَ اعْتِرَافًا، وَلَمْ يُوجَدْ مَعَهُ الْمَتَاعُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا إِخَالُكَ سَرَقْتَ» قَالَ: بَلَى. ثُمَّ قَالَ: «مَا إِخَالُكَ سَرَقْتَ» قَالَ: بَلَى. فَأَمَرَ بِهِ فَقُطِعَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «قُلْ: أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ» قَالَ: أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ. قَالَ: «اللَّهُمَّ تُبْ عَلَيْهِ» مَرَّتَيْنِ[2].

---

(١) حسن. أخرجه النسائي: ٤٩٥٩. وانظر: أبو داود: ١٧١٠ و ٤٣٩٠، والترمذي: ١٢٨٨، والنسائي: ٤٩٥٨.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٣٨٠، والنسائي: ٤٨٧٧.

واتە: ئیسحاقی کوڕی ئەبو تەڵحە ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەبولمونزیری خزمەتکاری ئەبو زەڕ بوو ﷺ باسی ئەوەی دەکرد کە ئەبو ئومەییە بۆی گێڕاوەتەوە، دزێکیان هێناوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و دانی بە دزییەکەیدا هێنا و هیچ کەل و پەلێکیشی لەگەڵدا نەبوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێموانییە دزیت کردبێت، گوتی: بەڵێ کردوومە، پاشان فەرمووی: پێموانییە دزیت کردبێت، گوتی: بەڵێ کردوومە، ئنجا فەرمانی کرد دەستی بڕدرا، ئنجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: بڵێ: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە، گوتی: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و بۆلای ئەو دەگەڕێمەوە، دوو جار فەرمووی: خودایە تۆبەکەی قبووڵ بکە.

## بابەت: زۆر کردن لە کەسێک بۆ ئەوەی گوناهو تاوان بکات

٢٥٩٨- عَنْ عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: «اسْتُكْرِهَتِ امْرَأَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَدَرَأَ عَنْهَا الْحَدَّ وَأَقَامَهُ عَلَى الَّذِي أَصَابَهَا، وَلَمْ يَذْكُرْ أَنَّهُ جَعَلَ لَهَا مَهْرًا»[١].

واتە: عەبدولجەبباری کوڕی وائیل لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئافرەتێک زۆری لێکرا بۆ زینا لەگەڵ کردن، جا سزای حەدەکەی لەسەر لادرا (چونکە ژنەکە ناچار کرابوو)، وە سزای حەدەکە لەسەر ئەو کەسە جێبەجێ کرا کە چووبوو بۆ لای، باسی ئەوەشی نەکرد ئایا مارەیی لەسەر دانا، یان نا.

## بابەت: ڕێگری کردن لە جێبەجێ کردنی حەدەکان لە مزگەوتەکاندا

٢٥٩٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تُقَامُ الْحُدُودُ فِي الْمَسَاجِدِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەدەکان لە مزگەوتەکاندا جێبەجێ ناکرێن.

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٤٥٣.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ١٤٠١.

**٢٦٠٠- عَنْ عَمْرَو بْنَ شُعَيْبٍ ﷺ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «نَهَى عَنْ جَلْدِ الْحَدِّ فِي الْمَسَاجِدِ»[١].**

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە جێبەجێ کردنی حەدەکان لە مزگەوتەکاندا.**

## بابەت: تەمێکردن

**٢٦٠١- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ نِيَارٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «لَا يُجْلَدُ أَحَدٌ فَوْقَ عَشْرِ جَلَدَاتٍ، إِلَّا فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ»[٢].**

**واتە: ئەبو بوردەی کوڕی نیار ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هیچ کەسێک لە دە دار زیاتری لێ نادرێ، مەگەر لە حەدێک نەبێ لە حەدەکانی خوا.**

**٢٦٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُعَزِّرُوا فَوْقَ عَشَرَةِ أَسْوَاطٍ»[٣].**

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە زیاتر لە دە قامچی کەس تەمێ مەکەن (مادام حەدێک نیە لە حەدەکان).**

## بابەت: حەد دەرکردن پاکبوونەوەی گوناهبارە

**٢٦٠٣- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَصَابَ مِنْكُمْ حَدًّا فَعُجِّلَتْ لَهُ عُقُوبَتُهُ، فَهُوَ كَفَّارَتُهُ، وَإِلَّا فَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ»[٤].**

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێک لە ئێوە تووشی حەدێک بوو، جا سزاکەی پێش خرا، ئەوە بۆی دەبێتە کەفارەت، ئەگەرنا ئەوە لە ژێر ویستی خوادایە.**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٦٤٨، ومسلم: ١٧٠٨، وأبو داود: ٤٤٩١، والترمذي: ١٤٦٣.

(٣) حسن لغيره.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨، ومسلم: ١٧٠٩، والترمذي: ١٤٣٩، والنسائي: ٤١٦١ و ٤١٦٢ و ٤١٧٨ و ٥٠٠٢.

**٢٦٠٤-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَصَابَ فِي الدُّنْيَا ذَنْبًا فَعُوقِبَ بِهِ، فَاللَّهُ أَعْدَلُ مِنْ أَنْ يُثَنِّيَ عُقُوبَتَهُ عَلَى عَبْدِهِ، وَمَنْ أَذْنَبَ ذَنْبًا فِي الدُّنْيَا فَسَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَاللَّهُ أَكْرَمُ مِنْ أَنْ يَعُودَ فِي شَيْءٍ قَدْ عَفَا عَنْهُ»[١].

**واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک لە دونیادا تووشی گوناهێک بوو جا سزاکەی وەرگرت، ئەوە خوا زۆر لەوە دادگەرترە کە دوو جار سزای بەندەکەی بدات، وە هەر کەسێک تاوانێکی کرد لە دونیادا و خوا بۆی داپۆشی، ئەوە خوا زۆر لەوە شکۆمەندترە کە بگەڕێتەوە سەر شتێک کە چاوپۆشی لێکردوە.**

## بابەت: پیاوێک کەسێک لەگەڵ ژنەکەی ببینێ

**٢٦٠٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الرَّجُلُ يَجِدُ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلًا، أَيَقْتُلُهُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا». قَالَ سَعْدٌ: بَلَى، وَالَّذِي أَكْرَمَكَ بِالْحَقِّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْمَعُوا مَا يَقُولُ سَيِّدُكُمْ»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنصاری ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێک لەگەڵ ژنەکەی خۆی پیاوێک دەبینێ، ئایا بۆی هەیە بیکوژێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، سەعد گوتی: بەڵێ، دەبێ بیکوژی سوێند بەو زاتەی کە بە هەق ڕێزی لێگرتووی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گوێ بگرن لەوەی کە گەورەکەتان دەیڵێ.**

**تێبینی: مەبەست لە قسەکەی سەعد ڕەتکردنەوەی قسە و حوکمی پێغەمبەر نییە، بەڵو مەبەستی پەرۆشی و غیرەت و عیززەت و توڕەبوون وا لە پیاوەکە دەکات کە ئەو کار بکات.**

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٦٢٦.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٤٩٨/١٤، وأبو داود: ٤٥٣٢.

**٢٦٠٦-** عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْمُحَبِّقِ ﷺ قَالَ: قِيلَ لِأَبِي ثَابِتٍ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ حِينَ نَزَلَتْ آيَةُ الْحُدُودِ، وَكَانَ رَجُلًا غَيُورًا: أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّكَ وَجَدْتَ مَعَ امْرَأَتِكَ رَجُلًا، أَيَّ شَيْءٍ كُنْتَ تَصْنَعُ؟ قَالَ: كُنْتُ ضَارِبَهُمَا بِالسَّيْفِ، أَنْتَظِرُ حَتَّى أَجِيءَ بِأَرْبَعَةٍ؟ إِلَى مَا ذَاكَ قَدْ قَضَى حَاجَتَهُ وَذَهَبَ، أَوْ أَقُولُ: رَأَيْتُ كَذَا وَكَذَا، فَتَضْرِبُونِي الْحَدَّ وَلَا تَقْبَلُوا لِي شَهَادَةً أَبَدًا، قَالَ: فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «كَفَى بِالسَّيْفِ شَاهِدًا» ثُمَّ قَالَ: «لَا، إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَتَابَعَ فِي ذَلِكَ السَّكْرَانُ وَالْغَيْرَانُ» قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ يَعْنِي ابْنَ مَاجَهْ: سَمِعْتُ أَبَا زُرْعَةَ يَقُولُ: «هَذَا حَدِيثُ عَلِيِّ بْنِ مُحَمَّدٍ الطَّنَافِسِيِّ وَفَاتَنِي مِنْهُ»[1].

**واتە: سەلەمەی کوڕی موحەبیق ﷺ دەڵێ: کاتێک ئایەتی حەدەکان دابەزی بە ئەبو سابیت واتە سەعدی کوڕی عوبادە گوترا کە پیاوێکی خاوەن غیرەت بوو: ئەگەر پیاوێکت لەگەڵ ژنەکەت بینی چی دەکەی؟ گوتی: هەردووکیان بە شمشێر دەکوژم، ئەدی چاوەڕێ بم هەتا چوار شایەد بێنم؟ بۆچی ئەوە کە کابرا لێ بۆوە و ڕۆیشت یان بڵێم: ئەوە و ئەوەم دیتوە جا حەدی بوختانم لێ دەربکەن و هەرگیز شایەدیشم لێ وەرنەگرنەوە، ڕاوی گوتی: جا ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: شایەدیدانی شمشێرەکە تەواوە، پاشان فەرمووی: نەخێر، دەترسێم سەرخۆش و ئەوانەشی کە خاوەنی غیرەتن هەڵسن بەو کوشتنە. ئیبنو ماجە گوتی: گوێم لێبوو ئەبو زەڕعە دەیگوت: ئەوە فەرموودەکەی عەلی کوڕی موحەممەدی تەنافیسییەو لە دەستم چوو.**

## بابەت: کەسێک ژنی باوکی خۆی دوای ئەو مارە بکاتەوە

**٢٦٠٧-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ بِي خَالِي - سَمَّاهُ هُشَيْمٌ فِي حَدِيثِهِ الْحَارِثَ بْنَ عَمْرٍو - وَقَدْ عَقَدَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ لِوَاءً، فَقُلْتُ لَهُ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ فَقَالَ: «بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبِيهِ مِنْ بَعْدِهِ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ»[2].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٥٧، والترمذي: ١٣٦٢، والنسائي: ٣٣٣١ و ٣٣٣٢.

واتە: بەرائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: خاڵم بەلامدا تێپەڕی کە پێغەمبەر ﷺ ئاڵایەکی پێدابوو، پێم گوت: بۆ کوێ دەڕۆی؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردوومی بۆ لای پیاوێک کە ژنی باوکی خۆی لە دوای باوکی مارە کردۆتەوە، جا فەرمانی پێکردووم کە لە گەردنی بدەم.

٢٦٠٨- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: «بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةَ أَبِيهِ، أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ وَأُصَفِّيَ مَالَهُ»[١].

واتە: موعاویەی کوڕی قوڕڕە ﷺ لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ لای پیاوێک کە ژنی باوکی خۆی مارە کردبووەوە، بۆ ئەوەی لە گەردنی بدەم و هەموو ماڵەکەشی بێنم.

## بابەت: کەسێک خۆی بکات بە کوڕی کەسێکیتر یان ئەو کۆیلەی پشت بکات لە گەورەکەیی و خۆی بکات بە کۆیلەی کەسێکیتر

٢٦٠٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ انْتَسَبَ إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوْ تَوَلَّى غَيْرَ مَوَالِيهِ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خۆی بکات بە کوڕی کەسێکیتر، یان خۆی بکات بە کۆیلەی کەسێکیتر و پشت لە گەورەی خۆی بکات، ئەوە نەفرەتی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەرە.

٢٦١٠- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ سَعْدًا، وَأَبَا بَكْرَةَ، وَكُلٌّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا يَقُولُ: سَمِعَتْ أُذُنَايَ وَوَعَى قَلْبِي مُحَمَّدًا ﷺ يَقُولُ: «مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ غَيْرُ أَبِيهِ فَالْجَنَّةُ عَلَيْهِ حَرَامٌ»[٣].

---

(١) حسن صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٢٦، ومسلم: ٦٣، وأبو داود: ٥١١٣.

واتە: ئەبو عوسمانی نەهدیی ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە سەعد و ئەبو بەکرە بوو، کە هەر یەک لەوانە دەیگوت: بە دوو گوێی خۆمان و بە ئاگاداری دڵ بیستمان لە موحەممەد ﷺ کە دەیفەرموو: هەر کەسێک کەسێکیتر بکاتە باوکی خۆی، کە بشزانێ ئەو کەسە باوکی نیە، ئەوە بەهەشتی لەسەر حەڕامە. (تا سزای خۆی وەرنەگرێ ناچێتە بەهەشت)

**٢٦١١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ لَمْ يَرَحْ رِيحَ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ خَمْسِمِائَةِ عَامٍ»[١].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک جگە لە باوکی خۆی کەسێکیتر بکاتە باوکی خۆی، ئەوە بۆنی بەهەشت ناکات، لە کاتێکدا کە بەهەشت پێنج سەد ساڵ ڕێگا بۆنی دەڕوات.

## بابەت: کەسێک کە پیاوێک لە هۆزەکەی نەفی بکات

**٢٦١٢-** عَنِ الْأَشْعَثِ بْنِ قَيْسٍ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي وَفْدِ كِنْدَةَ، وَلَا يَرَوْنِي إِلَّا أَفْضَلَهُمْ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَسْتُمْ مِنَّا؟ فَقَالَ: «نَحْنُ بَنُو النَّضْرِ بْنِ كِنَانَةَ، لَا نَقْفُو أُمَّنَا، وَلَا نَنْتَفِي مِنْ أَبِينَا» قَالَ: فَكَانَ الْأَشْعَثُ بْنُ قَيْسٍ يَقُولُ: «لَا أُوتِي بِرَجُلٍ نَفَى رَجُلًا مِنْ قُرَيْشٍ مِنَ النَّضْرِ بْنِ كِنَانَةَ إِلَّا جَلَدْتُهُ الْحَدَّ»[٢].

واتە: ئەشعەسی کوڕی قەیس ﷺ دەڵێ: لەگەڵ وەفدی کیندەدا هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وە بێگومان منیان لە خۆیان بە باشتر دەبینی، بۆیە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئێوە لە ئێمە نین؟ ئەویش فەرمووی: ئێمە لە «بنو النضر بن كنانة»ین، ئێمە دایکانمان تۆمەتبار ناکەین و نکوڵی لە باوانمان ناکەین، ڕاوی گوتی: ئەشعەسی کوڕی قەیس دەیگوت: هیچ پیاوێک ناهێنرێتە لای من کە نکوڵی لە پیاوێکی قوڕەیش بکات کە لە «النضر بن كنانة»یە، ئەوە بێگومان داری حەددی لێدەدەم.

---

(١) ضعيف.

(٢) حسن.

## بابەت: ئەو پیاوانەی خۆیان بە ئافرەت دەچوێنن (سەرژنانی)

**٢٦١٣-** عَنْ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَجَاءَهُ عَمْرُو بْنُ قُرَّةَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ قَدْ كَتَبَ عَلَيَّ الشِّقْوَةَ، فَمَا أُرَانِي أُرْزَقُ إِلَّا مِنْ دُفِّي بِكَفِّي، فَأْذَنْ لِي فِي الْغِنَاءِ فِي غَيْرِ فَاحِشَةٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا آذَنُ لَكَ، وَلَا كَرَامَةَ، وَلَا نُعْمَةَ عَيْنٍ، كَذَبْتَ، أَيْ عَدُوَّ اللَّهِ، لَقَدْ رَزَقَكَ اللَّهُ طَيِّبًا حَلَالًا، فَاخْتَرْتَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْكَ مِنْ رِزْقِهِ مَكَانَ مَا أَحَلَّ اللَّهُ ﷻ لَكَ مِنْ حَلَالِهِ، وَلَوْ كُنْتُ تَقَدَّمْتُ إِلَيْكَ لَفَعَلْتُ بِكَ وَفَعَلْتُ. قُمْ عَنِّي، وَتُبْ إِلَى اللَّهِ. أَمَا إِنَّكَ إِنْ فَعَلْتَ بَعْدَ التَّقْدِمَةِ إِلَيْكَ، ضَرَبْتُكَ ضَرْبًا وَجِيعًا، وَحَلَقْتُ رَأْسَكَ مُثْلَةً، وَنَفَيْتُكَ مِنْ أَهْلِكَ، وَأَحْلَلْتُ سَلَبَكَ نُهْبَةً لِفِتْيَانِ أَهْلِ الْمَدِينَةِ». فَقَامَ عَمْرٌو، وَبِهِ مِنَ الشَّرِّ وَالْخِزْيِ مَا لَا يَعْلَمُهُ إِلَّا اللَّهُ فَلَمَّا وَلَّى، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَؤُلَاءِ الْعُصَاةُ، مَنْ مَاتَ مِنْهُمْ بِغَيْرِ تَوْبَةٍ حَشَرَهُ اللَّهُ ﷻ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَمَا كَانَ فِي الدُّنْيَا مُخَنَّثًا عُرْيَانًا لَا يَسْتَتِرُ مِنَ النَّاسِ بِهُدْبَةٍ، كُلَّمَا قَامَ صُرِعَ»[(١)].

**واتە: لە صەفوانی کوڕی ئومەییەوە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، لەوکاتەدا عەمری کوڕی قوڕڕە هات، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی خوا بەدبەختی لەسەر من نوسیوە (ڕزق و ڕۆزیم کەمە)، جا من ڕزقی خۆم تەنها لە دەست و پەنجەو دەفەلێدانەکەمدا دەبینم، بۆیە مۆڵەتم بدە کە گۆرانی بڵێم بێ ئەوەی لە خەراپەکاریدا گۆرانی بڵێم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مۆڵەتت پێنادەم و ئەو کارە ڕێزی تێدانیەو چاوڕوونی تێدانیە، درۆت کرد ئەی دوژمنی خوا، چونکە بێگومان خوا ڕزقی حەڵاڵ و پاکی پێداویت، کەچی بۆخۆت لەجێی ئەو ڕزقەی کە خوا بۆی حەڵاڵ کردووی ئەوەت هەڵبژاردووە کە خوا لەسەری حەڕام کردووی، خۆ ئەگەر ئەوەی ئێستا دەیڵێم پێشتر پێت گەیشتبا، ئەوە کارێکم پێ دەکردی (سزام دەدای)، هەڵسە لەلام و تەوبە بکە، خۆ ئەگەر ئەو کارە بکەی لە دوای ئەوەی کە پێم ڕاگەیاندی (کە نابێ بیکەی) لێدانێکی بە ئازارت لێدەدەم، وە سەریشت دەتاشم وەکو سزا، وە لە خانەوادەکەشت دوورم دەخستیەوەو شتە کەسییەکانیشتم دەکرد بە موڵکی گەنجانی مەدینە، جا عەمر هەڵسا لە کاتێکدا کە ڕیسوایی و شەرمەزاری پێوە دیار بوو، جگە لە خوا کەس نەیدەزانی (چەند شەرمەزارە)، جا کاتێک ڕۆیشت**

---

(١) موضوع.



پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوانە ئەو کەسانەن کە سەرپێچی کارن، جا ئەگەر هەر یەکێک لەوانە بمرێت و تەوبە نەکات، خوای بە توانا لە ڕۆژی قیامەتدا بە جۆرێک حەشریان دەکات کە چۆن لە دونیادا ژنانی بوون و ڕووت بوون، خۆیان لە خەڵکی نەدەپاراست بە پۆشاکێک، جا هەرکات ڕاست دەبێتەوە دەکەوێتەوە سەر زەوی.

**٢٦١٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهَا فَسَمِعَ مُخَنَّثًا وَهُوَ يَقُولُ: لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ، إِنْ يَفْتَحِ اللَّهُ الطَّائِفَ غَدًا، دَلَلْتُكَ عَلَى امْرَأَةٍ تُقْبِلُ بِأَرْبَعٍ وَتُدْبِرُ بِثَمَانٍ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَخْرِجُوهُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ»[1].**

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لام، گوێی لێ بوو پیاوێکی سەرژنانی بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەییەی دەگوت: ئەگەر سبەینێ خوا کردی و تائیف ئازادکرا، ئەوە ئافرەتێکت نیشان دەدەم کە ئەگەر لە پێشەوەڕا ببینی چوار لۆیە، وە ئەگەر لە دواوەش ببینی هەشت لۆیە (واتە: وەسفی قەڵەوی و خڕ و پڕی ئەو ئافرەتەی بۆ دەکرد)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو جۆرە کەسانە لەماڵەکانتان دەربکەن (مەهێڵن بێنە ماڵتان).

* * *

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٣٢٤، ومسلم: ٢١٨٠، وأبو داود: ٤٩٢٩.



# پەرتووكى

# خوێنباییەكان



كِتَابُ الدِّيَاتِ.

## بابەت: هەڕەشەی توند لە کوشتنی مسوڵمان بە ستەم

**٢٦١٥-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ»[1].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم شتێک کە لە نێوان خەڵکیدا دادوەری لەسەر دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا دەربارەی خوێنەکانە.**

**٢٦١٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا، إِلَّا كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الْأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا، لِأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ»[2].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کە بە ناهەق بکوژرێ، بەشێکی تاوانەکەی بۆ کوڕی ئادەمی یەکەم دەگەڕێتەوە، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کە کوشتنی داهێنا.**

**٢٦١٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي الدِّمَاءِ»[3].

**واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەم شتێک کە دادوەری لەسەر دەکرێ لە ڕۆژی قیامەتدا، دەربارەی خوێنەکانە.**

**٢٦١٨-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَقِيَ اللَّهَ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا لَمْ يَتَنَدَّ بِدَمٍ حَرَامٍ دَخَلَ الْجَنَّةَ»[4].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک (لە قیامەتدا) بە خوا بگات و، هیچ هاوەڵێکی بۆ خوا بڕیار نەدابێ و، خوێنی کەسیشی لە ئەستۆدا نەبێ، دەچێتە بەهەشتەوە.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٣٣، ومسلم: ١٦٧٨، والترمذي: ١٣٩٦ و ١٣٩٧، والنسائي: ٣٩٩١_٣٩٩٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٣٣٥، ومسلم: ١٦٧٧، والترمذي: ٢٦٧٣، والنسائي: ٣٩٨٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٥٣٣، ومسلم: ١٦٧٨، والترمذي: ١٣٩٦ و ١٣٩٧، والنسائي: ٣٩٩١_٣٩٩٣.

(٤) صحيح.

**٢٦١٩-** عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ قَتْلِ مُؤْمِنٍ بِغَيْرِ حَقٍّ»[١].

**واتە:** بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە ناوچوونی دونیا سادەو ئاسانترە لە لای خوا، لە كوشتنی بڕوادارێک بە ناهەق.

**٢٦٢٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَعَانَ عَلَى قَتْلِ مُؤْمِنٍ وَلَوْ بِشَطْرِ كَلِمَةٍ، لَقِيَ اللَّهَ ﷻ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ: آيِسٌ مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ»[٢].

**واتە:** ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک ئەگەر بە نیو وشە یارمەتی كەسێک بدات بۆ كوشتنی بڕوادارێک، كاتێ دەگاتەوە بە خوا ﷻ لە نێو چاوانی نووسراوە بێ بەشە لە بەزەیی خوا.

## بابەت: بكوژی بڕوادار كە ئایا تۆبەی بۆ هەیە؟

**٢٦٢١-** عَنْ سَالِمِ بْنِ أَبِي الْجَعْدِ ﷺ قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَمَّنْ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا ثُمَّ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى، قَالَ: وَيْحَهُ، وَأَنَّى لَهُ الْهُدَى؟ سَمِعْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ يَقُولُ: «يَجِيءُ الْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُتَعَلِّقٌ بِرَأْسِ صَاحِبِهِ يَقُولُ: رَبِّ سَلْ هَذَا لِمَ قَتَلَنِي؟» وَاللَّهِ لَقَدْ أَنْزَلَهَا اللَّهُ ﷻ عَلَى نَبِيِّكُمْ، ثُمَّ مَا نَسَخَهَا بَعْدَمَا أَنْزَلَهَا[٣].

**واتە:** سالیمی كوڕی ئەبو جەعد ﷺ دەڵێ: پرسیار لە ئیبنو عەبباس كرا دەربارەی كەسێک كە بەئەنقەست بڕوادارێكی كوشتووە، پاشان تەوبەی كردوە و بڕوای هێناوە و كردەوەی باشی كردوە، پاشان ڕێگای ڕاستی گرتووە، ئەویش گوتی: بەڵای لێبدا، چۆن ڕێگای ڕاستی گرتووە؟! بۆخۆم گوێم لە پێغەمبەرەكەتان ﷺ بوو دەیفەرموو: لە ڕۆژی قیامەتدا بكوژ و كوژراو دێنن كە كوژراوەكە بە سەری بكوژەكە بەستراوە و دەڵێ: پەروەردگارا پرسیاری لێبكە بۆچی منی كوشتووە؟ سوێند بە خوا بێگومان خوا ﷻ (حوكمەكەی) دابەزاندۆتە سەر پێغەمبەرەكەتان ﷺ پاشان نەسخیش نەبۆتەوە پاش دابەزینی.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) ضعيف جداً.

(٣) صحيح. أخرجه النسائي: ٣٩٩٩ و ٤٠٠٥. وانظر البخاري: ٤٥٩٠، ومسلم: ٣٠٢٣.




٢٦٢٢-عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَا سَمِعْتُ مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ، وَوَعَاهُ قَلْبِي «إِنَّ عَبْدًا قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْسًا ثُمَّ عَرَضَتْ لَهُ التَّوْبَةُ، فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الْأَرْضِ، فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ فَأَتَاهُ، فَقَالَ: إِنِّي قَتَلْتُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْسًا، فَهَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٍ؟ قَالَ: بَعْدَ تِسْعَةٍ وَتِسْعِينَ نَفْسًا قَالَ: فَانْتَضَى سَيْفَهُ فَقَتَلَهُ، فَأَكْمَلَ بِهِ الْمِائَةَ، ثُمَّ عَرَضَتْ لَهُ التَّوْبَةُ، فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الْأَرْضِ، فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنِّي قَتَلْتُ مِائَةَ نَفْسٍ، فَهَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٍ؟ قَالَ: فَقَالَ: وَيْحَكَ، وَمَنْ يَحُولُ بَيْنَكَ وَبَيْنَ التَّوْبَةِ؟ اخْرُجْ مِنَ الْقَرْيَةِ الْخَبِيثَةِ الَّتِي أَنْتَ فِيهَا إِلَى الْقَرْيَةِ الصَّالِحَةِ قَرْيَةِ كَذَا وَكَذَا، فَاعْبُدْ رَبَّكَ فِيهَا، فَخَرَجَ يُرِيدُ الْقَرْيَةَ الصَّالِحَةَ، فَعَرَضَ لَهُ أَجَلُهُ فِي الطَّرِيقِ، فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلَائِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلَائِكَةُ الْعَذَابِ، قَالَ إِبْلِيسُ: أَنَا أَوْلَى بِهِ، إِنَّهُ لَمْ يَعْصِنِي سَاعَةً قَطُّ، قَالَ: فَقَالَتْ مَلَائِكَةُ الرَّحْمَةِ: إِنَّهُ خَرَجَ تَائِبًا» قَالَ هَمَّامٌ: فَحَدَّثَنِي حُمَيْدٌ الطَّوِيلُ، عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: فَبَعَثَ اللَّهُ ﷻ مَلَكًا، فَاخْتَصَمُوا إِلَيْهِ ثُمَّ رَجَعُوا، فَقَالَ: انْظُرُوا، أَيَّ الْقَرْيَتَيْنِ كَانَتْ أَقْرَبَ، فَأَلْحِقُوهُ بِأَهْلِهَا، قَالَ قَتَادَةُ: فَحَدَّثَنَا الْحَسَنُ، قَالَ: لَمَّا حَضَرَهُ الْمَوْتُ احْتَفَزَ بِنَفْسِهِ فَقَرُبَ مِنَ الْقَرْيَةِ الصَّالِحَةِ، وَبَاعَدَ مِنْهُ الْقَرْيَةَ الْخَبِيثَةَ، فَأَلْحَقُوهُ بِأَهْلِ الْقَرْيَةِ الصَّالِحَةِ[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە بۆ خۆم لە دەمی پێغەمبەری خوام ﷺ بیستوە، دوو گوێیەکانم لێیان بیست و دڵیشم ئاگاداربوو، (فەرمووی:) بەڕاستی کەسێک نەوەد و نۆ کەسی کوشت، پاشان ویستی تەوبە بکات، بۆیە پرسیاری کەسێکی کرد کە لە هەموو خەڵکی سەر زەوی زاناتر بێ، پیاوێکیان نیشاندا و ئەویش چوو بۆ لای و گوتی: بێگومان نەوەد و نۆ کەسم کوشتووە، جا ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم؟ گوتی: لە دوای نەوەد و نۆ کەس؟! ئەویش شمشێرەکەی دەرهێنا و کردی بە سەد کەس (ئەویشی کوشت)، پاشان ویستی تۆبە بکات، ئنجا پرسیاری دەربارەی زاناترین کەسی سەر زەوی کرد، پیاوێکیان نیشاندا و ئەویش چوو بۆ لای ئەو پیاوە و گوتی: سەد کەسم کوشتووە، ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم؟ گوتی: ماڵوێران کێ هەیە ڕێگربێت لە نێوان تۆ و تەوبەکردنتدا؟ لەو گوندە خراپەی کە تێیدای لێی دەربچۆ و بۆ گوندێک کە خەڵکەکەی چاک بێت کە فلان و فلان

---

(١) صحيح دون قوله الحسن: «لَماَّ حَضَرَهُ الْمَوْتُ...» وأخرجه البخاري: ٣٤٧٠ بأخصر من هذا دون قصة إبليس، وسياق آخر. وأخرجه مسلم: ٢٧٦٦ بطولٍ مختلفاً دون قصة إبليس. بل أخر جاه بأن المخاصمة بين ملائكة الرحمة وملائكة العذاب.

گوندە، لەو گوندەدا خواپەرستی بکە، ئەویش ڕۆیشت بەرەو ئەو گوندەی خەڵکەکەی باش بوو، ئنجا لە ڕێگادا مردن بەری پێگرت و فریشتەکانی ڕەحمەت و فریشتەکانی غەزەب کەوتنە کێشە، شەیتانیش گوتی: من شایەنترم بە ئەو، چونکە هەرگیز یەک ساتیش سەرپێچی منی نەکردوە، ئنجا فریشتەکانی ڕەحمەت گوتیان: بە تەوبەکاری دەرچووە (لە گوندەکە). ئەبو ڕافیع دەگێڕێتەوە و دەڵێ: خوای ﷻ فریشتەکانی نارد و ئەوانیش لێیان بوو بە کێشە و گەڕانەوە، خوای گەورە فەرمووی: تەماشا بکەن کامە گوند نزیکتر بوو، ئەوە لەگەڵ خەڵکی ئەو گوندە ئەژماری بکەن. قەتادە دەڵێ: حەسەن گوتی: کاتێ کە مردنی نزیک بوویەوە، پاڵی بە خۆیەوە دەنا و لە گوندە باشەکە نزیک دەبۆوە و لە گوندە خراپەکە دوور دەکەوتەوە، ئنجا بە خەڵکی گوندە باشەکەیان گەیاند.

## بابەت: ئەو کەسەی کەسێکی لێ کوژراوە، لە سێ شت سەرپشکە

**٢٦٢٣-** عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أُصِيبَ بِدَمٍ أَوْ خَبْلٍ - وَالْخَبْلُ: الْجُرْحُ - فَهُوَ بِالْخِيَارِ بَيْنَ إِحْدَى ثَلَاثٍ، فَإِنْ أَرَادَ الرَّابِعَةَ فَخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ: أَنْ يَقْتُلَ، أَوْ يَعْفُوَ، أَوْ يَأْخُذَ الدِّيَةَ، فَمَنْ فَعَلَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ فَعَادَ، فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا»[1].

واتە: ئەبو شوڕەیحی خوزاعیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بوو بە خاوەن خوێن (کەسێکی لێ کوژرا) یان توشی بریندار بوونی ئەندامێکی بوو، ئەوە لە سێ شت سەرپشکە، جا ئەگەر هەڵبژاردەی چوارەمی هەبوو ڕێگەی مەدەن و دەستی بگرن: یان بکوژەکە بکوژێتەوە، یان لێی خۆش بێت، یان خوێنبایی وەرگرێ، جا هەر کەسێک یەکێک لەوانەی هەڵبژارد و (دواتر) زێدەڕۆیی کرد (وەک ئەوەی خوێنبایی وەرگرێ و دواتر بشیکوژێتەوە)، ئەوە بێگومان دەچێتە ناو ئاگر و بە هەمیشەیی لە ناویدا دەمێنێتەوە.

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٤٩٦.

**٢٦٢٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ: إِمَّا أَنْ يَقْتُلَ، وَإِمَّا أَنْ يُفْدَى»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک کەسێکی لێ کوژرا، ئەوە سەرپشکە لەنێوان دوو شتدا: یان بکوژ بکوژێتەوە، یان خوێنبایی وەربگرێ.**

## بابەت: کەسێک کەسێکیتر بە ئەنقەست بکوژێ، بە خوێنبایی ڕازی بن

**٢٦٢٥-** عَنْ زَيْدِ بْنِ ضُمَيْرَةَ ﷺ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي وَعَمِّي، وَكَانَا شَهِدَا حُنَيْنًا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَا: صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الظُّهْرَ، ثُمَّ جَلَسَ تَحْتَ شَجَرَةٍ، فَقَامَ إِلَيْهِ الْأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ وَهُوَ سَيِّدُ خِنْدِفٍ، يَرُدُّ عَنْ دَمِ مُحَلِّمِ بْنِ جَثَّامَةَ، وَقَامَ عُيَيْنَةُ بْنُ حِصْنٍ يَطْلُبُ بِدَمِ عَامِرِ بْنِ الْأَضْبَطِ، وَكَانَ أَشْجَعِيًّا. فَقَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ: «تَقْبَلُونَ الدِّيَةَ؟» فَأَبَوْا، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي لَيْثٍ، يُقَالُ مُكَيْتِلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا شَبَّهْتُ هَذَا الْقَتِيلَ فِي غُرَّةِ الْإِسْلَامِ، إِلَّا كَغَنَمٍ وَرَدَتْ فَرُمِيَتْ فَنَفَرَ آخِرُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَكُمْ خَمْسُونَ فِي سَفَرِنَا، وَخَمْسُونَ إِذَا رَجَعْنَا» فَقَبِلُوا الدِّيَةَ[2].

**واتە: زەیدی کوڕی زومەیرە ﷺ دەڵێ: باوکم و مامم کە ئامادەی جەنگی حونەین بوون لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان گێڕامەوە و گوتیان: پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان لە ژێر دارێک دانیشت، جا ئەقرەعی کوڕی حابیس لەلای پێغەمبەر ﷺ وەستا کە گەورەی هۆزی خیندیف بوو، بەرگری لە خوێنی موحەلیمی کوڕی جەسامە دەکرد، عویەینەی کوڕی حیصنیش هەڵسا داوای خوێنی عامیری کوڕی ئەزبەتی دەکرد کە ئەشجەعی بوو، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: خوێنبایی وەردەگرن؟ ئەوانیش ڕەتیان کردەوە، ئنجا پیاوێک لە هۆزی «بنو لیث» کە پێیان دەگوت موکەیتیل هەڵساو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەخوا ئەو کوشتنەی ئەو کەسە کردی لە سەرەتای ئیسلامدا وێنی نیە، مەگەر وەکو ئەوە وابێ کە ڕانە مەڕێک بێتە**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١١٢، ومسلم: ١٣٥٥، وأبو داود: ٢٠١٧ و ٣٦٤٩ و ٤٥٠٥، والترمذي: ١٤٠٥، والنسائي: ٤٧٨٥ و ٤٧٨٦.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٥٠٣.




سەر ئاو بۆ ئاو خواردنەوەو، بەردێک لە مەڕەکە بگری و ئیتر مەڕەکەی یەکەم بڕوات و ئەوانیتریش هەموو بەدوای ئەودا بڕۆن (واتە: ئەگەر تۆڵەی لێ نەکەیەوە خەڵکی وەک نمونەی مەڕەکان کە لە ئاو خوارنەوەکە ڕایان کرد بەهۆی بەرد تێگرتنێکەوە، بەو جۆرەش خەڵکی لە ئیسلام پەشیمان دەبێتەوە)، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەو گەشتەدا پەنجا وشتریان پێ دەدەین کە گەڕاینەوە پەنجای تریشیان پێ دەدەین، ئەوانیش بەو جۆرە خوێنباییە ڕازی بوون.

**٢٦٢٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَتَلَ عَمْدًا، دُفِعَ إِلَى أَوْلِيَاءِ الْقَتِيلِ، فَإِنْ شَاءُوا قَتَلُوا، وَإِنْ شَاءُوا أَخَذُوا الدِّيَةَ، وَذَلِكَ ثَلَاثُونَ حِقَّةً وَثَلَاثُونَ جَذَعَةً وَأَرْبَعُونَ خَلِفَةً، وَذَلِكَ عَقْلُ الْعَمْدِ، وَمَا صُولِحُوا عَلَيْهِ، فَهُوَ لَهُمْ، وَذَلِكَ تَشْدِيدُ الْعَقْلِ»**[1].

واتە: عەمڕی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کەسێکیتر بە ئەنقەست بکوژێ، ئەوە دەدرێتە دەست کەس وکاری خاوەن کوژراوەکە، جا ئەوانیش ئەگەر پێیان خۆش بوو دەیکوژنەوە، ئەگەر پێشیان خۆش بوو خوێنبایی لێ وەردەگرن، خوێنباییەکەش بەو جۆرەیە: سی وشتری مێی سێ ساڵەو، سی وشتری مێی چوار ساڵەو، چل وشتری ئاوس، ئا ئەوە خوێنبایی کوشتنی بە ئەنقەستە، وە هەرچی لەسەری ڕێک بکەون دروستە، وە ئەوەش بۆ ئەوەیە خوێنبایی گران و قورس بێ (تاکو کەس بە ئارەزووی خۆی بیر لە کوشتن نەکاتەوە).

## بابەت: خوێنبایی کوشتنی وەکو بە ئەنقەست (نیمچە ئەنقەست)

**٢٦٢٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قَتِيلُ الْخَطَأِ شِبْهِ الْعَمْدِ، قَتِيلُ السَّوْطِ وَالْعَصَا، مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ، أَرْبَعُونَ مِنْهَا خَلِفَةً، فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا»**[2].

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥٠٦، والترمذي: ١٣٨٧.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٧٩١ و ٤٧٩٢ مرسلًا.

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوێنبایی کوشتنی هەڵەی نیمچە قەستی بە قامچی و گۆچان سەد وشترە، چل دانە لەو سەدە وشتری ئاوسن (بەچکەکەیان لە سکیان دایە).**

**٢٦٢٧م-** حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ خَالِدٍ الْحَذَّاءِ، عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ عُقْبَةَ بْنِ أَوْسٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ[1].

**واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.**

**٢٦٢٨-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَهُوَ عَلَى دَرَجِ الْكَعْبَةِ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ فَقَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، أَلَا إِنَّ قَتِيلَ الْخَطَأِ، قَتِيلَ السَّوْطِ وَالْعَصَا فِيهِ مِائَةٌ مِنَ الْإِبِلِ، مِنْهَا أَرْبَعُونَ خَلِفَةً، فِي بُطُونِهَا أَوْلَادُهَا، أَلَا إِنَّ كُلَّ مَأْثُرَةٍ كَانَتْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَدَمٍ تَحْتَ قَدَمَيَّ هَاتَيْنِ، إِلَّا مَا كَانَ مِنْ سِدَانَةِ الْبَيْتِ وَسِقَايَةِ الْحَاجِّ، أَلَا إِنِّي قَدْ أَمْضَيْتُهُمَا لِأَهْلِهِمَا كَمَا كَانَا»[2].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا کە لەسەر پلیکانەکانی کەعبە بوو، هەڵسا و سوپاس و ستایشی خوای کرد، ئنجا فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەڵێنەکانی ڕاستن و بەندەی خۆی سەرخست و هەموو لایەنەکانی تری بە تەنیا تێکشکاند، ئاگاداربن خوێنبایی کوشتنی بە هەڵە بە قامچی و گۆچان سەد وشترە کە چل دانەیان ئاوسن، ئاگاداربن هەموو تۆڵەکردنەوە و کێشەیەکی سەردەمی نەفامی و خوێنێک لە ژێر ئەو دوو پێیەم دایە، جگە لە خزمەت کردنی ماڵی خوا و ئاو دان بە حاجیان ئەو دووە وەکو خۆی لێ دەگەڕێم و دەیگێڕمەوە بۆ خاوەنەکانیان وەکو پێشوو.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٥٤٧ و ٤٥٤٨ مطولًا، النسائي: ٤٧٩٣_٤٧٩٤ و ٤٧٩٥ مرسلًا. ٤٧٩٦_٤٧٩٨ و ٤٨٠٠ مرسلًا.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥٤٩ مطولًا، والنسائي: ٤٧٩٩.

## بابەت: خوێنبایی کوشتنی بە هەڵە

**٢٦٢٩-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ «جَعَلَ الدِّيَةَ اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفًا»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دوازدە هەزار درهەمی داناوە بۆ خوێنبایی.**

**٢٦٣٠-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قُتِلَ خَطَأً فَدِيَتُهُ مِنَ الْإِبِلِ ثَلَاثُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ وَثَلَاثُونَ ابْنَةَ لَبُونٍ وَثَلَاثُونَ حِقَّةً وَعَشَرَةٌ بَنِي لَبُونٍ». وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُقَوِّمُهَا عَلَى أَهْلِ الْقُرَى أَرْبَعَمِائَةِ دِينَارٍ، أَوْ عَدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ، وَيُقَوِّمُهَا عَلَى أَزْمَانِ الْإِبِلِ إِذَا غَلَتْ رَفَعَ فِي ثَمَنِهَا وَإِذَا هَانَتْ نَقَصَ مِنْ ثَمَنِهَا، عَلَى نَحْوِ الزَّمَانِ مَا كَانَ. فَبَلَغَ قِيمَتُهَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا بَيْنَ الْأَرْبَعِمِائَةِ دِينَارٍ إِلَى ثَمَانِمِائَةِ دِينَارٍ، أَوْ عَدْلَهَا مِنَ الْوَرِقِ ثَمَانِيَةُ آلَافِ دِرْهَمٍ، وَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ مَنْ كَانَ عَقْلُهُ فِي الْبَقَرِ، عَلَى أَهْلِ الْبَقَرِ مِائَتَيْ بَقَرَةٍ، وَمَنْ كَانَ عَقْلُهُ فِي الشَّاءِ، عَلَى أَهْلِ الشَّاءِ أَلْفَيْ شَاةٍ»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە هەڵە کوژرا، خوێنباییەکەی بە وشتر (بریتیە لە): سی وشتری مێی یەک ساڵە و، سی وشتری مێی دوو ساڵە و، سی وشتری مێی سێ ساڵە و، دە وشتری نێری دوو ساڵە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵکی شاری بە چوار سەد دینار دەیخەمڵاند، یان بای چوار سەد دینارەکە بە زیو دەیخەمڵاند، وە وشترەکانی بەپێی نرخی کات دەخەمڵاند، جا ئەگەر نرخیان زیاتر بووایە، نرخی بەرزدەکردنەوە، وە ئەگەر نرخیان کەم بووبایە، لە نرخەکەی دادەبەزاندن بە گوێرەی کاتی خەمڵاندنەکە، جا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ نرخیان گەیشتە نێوان چوار سەد تا هەشت سەد دینار یان بەرانبەر بە زیو گەیشتە هەشت هەزار درهەم، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوانەی خوێنەکە بە مانگا دەدەن بڕیاری دا بە دوو سەد مانگا، ئەوانەشی کە مەڕ بدەن بڕیاریدا بە دوو هەزار سەر مەڕ.**

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٥٤٦، والترمذي: ١٣٨٨، والنسائي: ٤٨٠٣ و ٤٨٠٤.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥٤١ مختصراً. ٤٥٤٦ مطولًا. والنسائي: ٤٨٠١.

**٢٦٣١-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فِي دِيَةِ الْخَطَأِ عِشْرُونَ حِقَّةً وَعِشْرُونَ جَذَعَةً وَعِشْرُونَ بِنْتَ مَخَاضٍ وَعِشْرُونَ بِنْتَ لَبُونٍ وَعِشْرُونَ بَنِي مَخَاضٍ ذُكُورٌ»[1].

**واتە:** عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوێنبایی کوشتنی بە هەڵە بیست وشتری مێی سێ ساڵە و، بیست وشتری مێی چوار ساڵە و، بیست وشتری مێی یەک ساڵە و، بیست وشتری مێی دوو ساڵە و، بیست وشتری نێری یەک ساڵەیە.

**٢٦٣٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «جَعَلَ الدِّيَةَ اثْنَيْ عَشَرَ أَلْفًا». قَالَ: وَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦ ﴿٧٤﴾﴾ التوبة، قَالَ: بِأَخْذِهِمُ الدِّيَةَ[2].

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دوازدە هەزاری داناوە بۆ خوێنبایی، گوتی: فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦ ﴿٧٤﴾﴾ التوبة، واتە: وە هیچ ڕەخنەو ڕقێکیان نەبوو تەنها لەبەر ئەوە نەبێت کە خواو پێغەمبەرەکەی و (بڕوادارانیان) دەوڵەمەند کردوە لە فەزڵ و بەهرەی خۆی، گوتی: واتە: بە وەرگرتنی خوێنبایی.

## بابەت: خوێنبایی لە ئەستۆی خزمەکانە، ئەگەر خزم و کەسی نەبوو، لە خەزێنەی دەوڵەت دەدرێ

**٢٦٣٣-** عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ، قَالَ: «قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالدِّيَةِ عَلَى الْعَاقِلَةِ»[3].

**واتە:** موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریداوە کە خوێنبایی لەسەر کەس وکارە بیدەن.

**٢٦٣٤-** عَنِ الْمِقْدَامِ الشَّامِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَا وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَهُ، أَعْقِلُ عَنْهُ وَأَرِثُهُ، وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَهُ، يَعْقِلُ عَنْهُ وَيَرِثُهُ»[4].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٥٤٥، والترمذي: ١٣٨٦، والنسائي: ٤٨٠٢.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٨٢، وأبو داود: ٤٥٦٨ و ٤٥٦٩، والترمذي: ١٤١١ مختصراً. والنسائي: ٤٨٢١_٤٨٢٦.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٩٩ و ٢٩٠٠.

واتە: میقدامی شامیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من میراتگری کەسێکم کە میراتگری نەبێ، خوێنبایی بۆ دەدەم و میراتیشی لێدەگرم، وە خاڵیش میراتگری کەسێکە کە میراتگری نەبێ، خوێنبایی بۆ دەدات و میراتیشی لێدەگرێ.

## بابەت: ئەو کەسەی دەبێتە ڕێگر لە نێوان خزم و کەسی کوژراوو تۆڵەکردنەوە یان خوێنبایی

**٢٦٣٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَتَلَ فِي عِمِّيَّةٍ أَوْ عَصَبِيَّةٍ بِحَجَرٍ أَوْ سَوْطٍ أَوْ عَصًا فَعَلَيْهِ عَقْلُ الْخَطَأِ، وَمَنْ قَتَلَ عَمْدًا فَهُوَ قَوَدٌ، وَمَنْ حَالَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لَا يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلَا عَدْلٌ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، (ئەو فەرموودەیەی) بەرز کردۆتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: هەر کەسێک کەسێکیتر بە نادیاری یان بە کوێرانە لەسەر دەمارگیری بکوژێ، بە بەرد، یان قامچی، یان گۆچان، خوێنی کوشتنی بە هەڵەی دەکەوێتە سەر، هەر کەسێکیش بە ئەنقەست کەسێک بکوژێ، تۆڵەی کوشتنەوەی لەسەرە، وە هەر کەسێک ڕێگر بێ لەو بڕیارە نەفرینی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەرە، نە تەوبە و نە فیدیەی لێ وەرناگیرێ، (یان نە فەڕز و سوننەتی لێ وەرناگیرێ).

## بابەت: ئەوەی کە تۆڵەی تێدانیە

**٢٦٣٦-** عَنْ دَهْثَمِ بْنِ قُرَّانَ قَالَ: حَدَّثَنِي نِمْرَانُ بْنُ جَارِيَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا ضَرَبَ رَجُلًا عَلَى سَاعِدِهِ بِالسَّيْفِ فَقَطَعَهَا مِنْ غَيْرِ مَفْصِلٍ، فَاسْتَعْدَى عَلَيْهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَمَرَ لَهُ بِالدِّيَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُرِيدُ الْقِصَاصَ فَقَالَ: «خُذِ الدِّيَةَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا» وَلَمْ يَقْضِ لَهُ بِالْقِصَاصِ[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٤٠ و ٤٥٩١، والنسائي: ٤٧٨٩ و ٤٧٩٠.

(٢) ضعيف.

واتە: دەهسەمی کوڕی قوڕڕان دەڵێ: نیمرانی کوڕی جارییە لە باوکییەوە ﷺ بۆی گێڕامەوە کە پیاوێک بە شمشێر لە باسکی پیاوێکی تری دابو و باسکی پەڕاندبوو، بەڵام لە جومگەوە نا، بۆیە هانای بۆ پێغەمبەر ﷺ برد تاکو تۆڵەی بۆ بکاتەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد خوێنبایی بداتێ، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من تۆڵەم دەوێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوێنباییەکەت وەربگرە و خوا بەرەکەتی بخاتە ناوی بۆت، بڕیاری تۆڵەی بۆ نەدا.

٢٦٣٧- عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا قَوَدَ فِي الْمَأْمُومَةِ، وَلَا الْجَائِفَةِ وَلَا الْمُنَقِّلَةِ»[1].

واتە: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: برینی سەر کە ناگاتە دەماغ و برینی سک کە بگاتە ناو بۆشایی و برینێک کە دەگاتە ئێسقان تۆڵەیان لەسەر نیە (تەنها خوێنبایی لەسەرەو کوشتنەوەی لەسەر نیە).

## بابەت: کەسی بریندارکەر کە لەجێی تۆڵە فیدیە بدات

٢٦٣٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، بَعَثَ أَبَا جَهْمِ بْنَ حُذَيْفَةَ مُصَدِّقًا فَلَاجَّهُ رَجُلٌ فِي صَدَقَتِهِ فَضَرَبَهُ أَبُو جَهْمٍ فَشَجَّهُ، فَأَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالُوا: الْقَوَدَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَكُمْ كَذَا وَكَذَا» فَلَمْ يَرْضَوْا، فَقَالَ: «لَكُمْ كَذَا وَكَذَا» فَرَضُوا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي خَاطِبٌ عَلَى النَّاسِ وَمُخْبِرُهُمْ بِرِضَاكُمْ؟» قَالُوا: نَعَمْ، فَخَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ هَؤُلَاءِ اللَّيْثِيِّينَ أَتَوْنِي يُرِيدُونَ الْقَوَدَ، فَعَرَضْتُ عَلَيْهِمْ كَذَا وَكَذَا، أَرَضِيتُمْ؟» قَالُوا: لَا، فَهَمَّ بِهِمُ الْمُهَاجِرُونَ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَكُفُّوا، فَكَفُّوا، ثُمَّ دَعَاهُمْ فَزَادَهُمْ، فَقَالَ: «أَرَضِيتُمْ؟» قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «إِنِّي خَاطِبٌ عَلَى النَّاسِ وَمُخْبِرُهُمْ بِرِضَاكُمْ» قَالُوا: نَعَمْ. فَخَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «أَرَضِيتُمْ؟» قَالُوا: نَعَمْ[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو جەهمی کوڕی حوزەیفەی نارد بۆ زەکات کۆکردنەوە، کەسێ لەسەر زەکاتەکەی دەمەقاڵێی لەگەڵ کرد، ئەویش سەری شکاند، جا هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆڵەمان بۆ بکەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: واز لە تۆڵە سەندنەوە بێنن ئەوەندە و

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٣٤، والنسائي: ٤٧٧٨.




ئەوەندە ماڵتان دەدەمێ، بەڵام ڕازی نەبوون، ئنجا فەرمووی: ئەوەندە و ئەوەندەتان دەدەینێ، ئنجا ڕازی بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من وتار بۆ خەڵکی دەدەم و پێیان ڕادەگەیەنم کە ئێوە ڕازی بوون، گوتیان: بەڵێ باشە، پێغەمبەریش ﷺ وتاری دا و فەرمووی: ئەوانە «الليثي»یەکانن هاتون بۆ لای من و داوای تۆڵە سەندنەوە دەکەن، منیش ئەوەندە و ئەوەندە ماڵم بۆ پێشنیار کردوون، «الليثي»یەکان ئایا ئێوە ڕازین؟ گوتیان: نەخێر ڕازی نین، کۆچەران نیازیان بوو ئازاریان بدەن و لێیان بدەن، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا کە وازیان لێ بێنن، ئەوانیش وازیان لێ هێنان، پاشان بانگی کردن و بۆی زیاد کردن، وە فەرمووی: ئایا ڕازین؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: منیش قسە بۆ خەڵکەکە دەکەم هەواڵی ڕازی بوونی ئێوەیان پێدەدەم، گوتیان: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ قسەی بۆ کردن، پاشان فەرمووی: ئایا ڕازین؟ گوتیان: بەڵێ.

## بابەت: خوێنبایی کۆرپەلە (مناڵی ناوسک)

**٢٦٣٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْجَنِينِ بِغُرَّةٍ: عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ. فَقَالَ الَّذِي قُضِيَ عَلَيْهِ: أَنَعْقِلُ مَنْ لَا شَرِبَ وَلَا أَكَلَ، وَلَا صَاحَ وَلَا اسْتَهَلَّ، وَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ هَذَا لَيَقُولُ بِقَوْلِ شَاعِرٍ، فِيهِ غُرَّةٌ عَبْدٌ أَوْ أَمَةٌ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خوێنبایی کۆرپەلە بڕیاریدا کەوا سەرێک بدرێ: بەندەیەک یان کەنیزەکێک، جا ئەو کەسەی کە خوێنەکەی کەوتە سەر گوتی: ئایا خوێنبایی کەسێک بدەین کە نە خواردوویەتیەوە، نە خواردوویەتی، نە هاواری کردوەو، نە دەنگی لێهاتووە، نمونەی ئەوانە خوێنباییان نیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی ئا ئەوە وەکو شاعیرەکان قسە دەکات، خوێنباییەکەی سەرێکە بەندەیەکە یان کەنیزەکێکە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٧٥٨، ومسلم: ١٦٨١، وأبو داود: ٤٥٧٦ و ٤٥٧٩، والترمذي: ١٤١٩، والنسائي: ٤٨١٧_٤٨١٩.

**٢٦٤٠-** عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ﵄، قَالَ: اسْتَشَارَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ النَّاسَ فِي إِمْلَاصِ الْمَرْأَةِ - يَعْنِي سِقْطَهَا - فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «قَضَى فِيهِ بِغُرَّةٍ، عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ»، فَقَالَ عُمَرُ: ائْتِنِي بِمَنْ يَشْهَدُ مَعَكَ، فَشَهِدَ مَعَهُ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ[1].

**واتە: میسوەری كوڕی مەخڕەمە ﵄ دەڵێ: عومەری كوڕی خەتتاب دەربارەی خوێنی منداڵی لەبارچوو ڕاوێژی كرد، جا موغیرەی كوڕی شوعبە گوتی: ئامادەبووم كە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا (خوێنبایی كۆرپەلە) بەندەیەک یان كەنیزەكێكە، ئنجا عومەر گوتی: كەسێک بێنە كە لەگەڵ خۆت شایەدی بدات، ئنجا موحەممەدی كوڕی مەسلەمەش لەگەڵیدا شایەدیدا.**

**٢٦٤١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁، أَنَّهُ نَشَدَ النَّاسَ قَضَاءَ النَّبِيِّ ﷺ فِي ذَلِكَ - يَعْنِي فِي الْجَنِينِ - فَقَامَ حَمَلُ بْنُ مَالِكِ بْنِ النَّابِغَةِ فَقَالَ: كُنْتُ بَيْنَ امْرَأَتَيْنِ لِي فَضَرَبَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى بِمِسْطَحٍ فَقَتَلَتْهَا، وَقَتَلَتْ جَنِينَهَا، «فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْجَنِينِ بِغُرَّةٍ عَبْدٍ وَأَنْ تُقْتَلَ بِهَا»[2].

**واتە: ئیبنو عەبباس دەگێڕێتەوە، عومەری كوڕی خەتتاب ﵄ داوای بڕیاری پێغەمبەری ﷺ كرد لەوبارەوە - واتە: خوێنبایی كۆرپەلە-، جا حەمەلی كوڕی مالیكی كوڕی نابیغە هەڵسا، گوتی: من لە نێوانی دوو ژنەكانم بووم، جا یەكێكیان بە دار لەویتری داو كوشتی، منداڵەكەی ناو سكیشی كوشت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی كۆرپەلەكە بڕیاریدا بە سەری بەندەیەک و بڕیاریدا كە ژنەكەش لە تۆڵەی ژنەكەیتردا بكوژرێتەوە.**

## بابەت: میراتی خوێنبایی

**٢٦٤٢-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ ﵁، أَنَّ عُمَرَ كَانَ يَقُولُ: الدِّيَةُ لِلْعَاقِلَةِ وَلَا تَرِثُ الْمَرْأَةُ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا شَيْئًا، حَتَّى كَتَبَ إِلَيْهِ الضَّحَّاكُ بْنُ سُفْيَانَ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَرَّثَ امْرَأَةَ أَشْيَمَ الضِّبَابِيِّ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا»[3].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٩٠٥ و ٦٩٠٦، وانظر مسلم: ١٦٨٢ و ١٦٨٣، وأبو داود: ٤٥٦٨ و ٤٥٧٠، والترمذي: ١٤١١، والنسائي: ٤٨٢١_٤٨٢٦.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٧٢، والنسائي: ٤٧٣٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٩٢٧، والترمذي: ١٤١٥ و ٢١١٠.

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییەب ﷺ دەگێڕێتەوە، عومەر ﷺ دەیگوت: خوێنبایی میراتی خزمی لای باوکە و ژن هیچ میرات لە خوێنبایی مێردەکەی ناگرێ، هەتاکو زەحاکی کوڕی سوفیان نامەیەکی بۆ نووسی کە پێغەمبەر ﷺ میراتی ژنەکەی ئەشیەمی زەبابی دا لە خوێنبایی مێردەکەی.

**٢٦٤٣- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَضَى لِحَمَلِ بْنِ مَالِكٍ الْهُذَلِيِّ اللَّحْيَانِيِّ بِمِيرَاثِهِ مِنَ امْرَأَتِهِ الَّتِي قَتَلَتْهَا امْرَأَتُهُ الْأُخْرَى»[١].**

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا بە میراتگرتنی حەمەلی کوڕی مالیکی هوزەلی لیحیانی لە خوێنبایی ئەو ژنەی کە ژنەکەیتری کوشتبووی.

## بابەت: خوێنبایی کافر

**٢٦٤٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى أَنَّ عَقْلَ أَهْلِ الْكِتَابَيْنِ نِصْفُ عَقْلِ الْمُسْلِمِينَ، وَهُمُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى»[٢].**

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریداوە خوێنبایی ئەهلی کیتاب کە جوولەکەو نەصڕانین نیوەی خوێنبایی مسوڵمانانە.

## بابەت: بکوژ میرات ناگرێ لە کوژراو

**٢٦٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْقَاتِلُ لَا يَرِثُ»[٣].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بکوژ میرات ناگرێ (لە کوژراو).

---

(١) صحيح بما قبله.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥٨٣، والترمذي بإثر: ١٤١٣، والنسائي: ٤٨٠٦ و ٤٨٠٧.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٠٩.




**٢٦٤٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ - رَجُلٌ مِنْ بَنِي مُدْلِجٍ - قَتَلَ ابْنَهُ، فَأَخَذَ مِنْهُ عُمَرُ مِائَةً مِنَ الْإِبِلِ ثَلَاثِينَ حِقَّةً وَثَلَاثِينَ جَذَعَةً وَأَرْبَعِينَ خَلِفَةً، فَقَالَ: أَيْنَ أَخُو الْمَقْتُولِ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَيْسَ لِقَاتِلٍ مِيرَاثٌ»[١].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەبو قەتادە ﷺ - کە پیاوێک بوو لە هۆزی بەنو مودلیج - کوڕەکەی خۆی کوشتبوو، جا عومەر سەد وشتری لێوەرگرت: سی وشتری سێ ساڵە و، سی وشتری چوار ساڵە و، چل وشتری ئاوس، ئنجا گوتی: برای کوژراوەکە لەکوێیە؟ گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بکوژ هیچ میرات ناگرێ (هیچی بە باوکە بکوژەکە نەدا).**

## بابەت: خوێنبایی ژن دەکەوێتە سەر خزمەکانی، میراتەکەش بۆ منداڵەکانییەتی

**٢٦٤٧-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: «قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَعْقِلَ الْمَرْأَةَ عَصَبَتُهَا مَنْ كَانُوا، وَلَا يَرِثُوا مِنْهَا شَيْئًا، إِلَّا مَا فَضَلَ عَنْ وَرَثَتِهَا. وَإِنْ قُتِلَتْ فَعَقْلُهَا بَيْنَ وَرَثَتِهَا فَهُمْ يَقْتُلُونَ قَاتِلَهَا»[٢].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریداوە (کە ئەگەر ژن تاوانی کوشتنی ئەنجامدا) خوێنباییەکە خزمەکانی هەر کەس بن بۆی بدەن، وە میراتیشی لێ ناگرن مەگەر میراتێک کە لەبەر میراتگرەکانی بمێنێتەوە، جا ئەگەر ژنەکە خۆی کوژرا، ئەوە خوێنباییەکەی لە نێوان میراتگرەکانی دابەش دەکرێ و ئەوان بکوژەکە دەکوژنەوە.**

**٢٦٤٨-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الدِّيَةَ عَلَى عَاقِلَةِ الْقَاتِلَةِ، فَقَالَتْ عَاقِلَةُ الْمَقْتُولَةِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مِيرَاثُهَا لَنَا، قَالَ: «لَا مِيرَاثُهَا لِزَوْجِهَا وَوَلَدِهَا»[٣].

---

(١) حسن لغيره.

(٢) حسن.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٧٥ مطولًا.

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بڕیاریداوە کە ژن بکوژ بوو، خوێنباییەکە لەسەر خزمەکانییەتی بۆی بدەن، جا کەس وکاری ژنە کوژراوەکە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ میراتەکەی بۆ ئێمەیە؟ فەرمووی: نەخێر، میراتەکەی بۆ مێردەکەی و منداڵەکانییەتی.

## بابەت: تۆڵە کردنەوەی ددان

**٢٦٤٩-** عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَسَرَتِ الرُّبَيِّعُ عَمَّةُ أَنَسٍ ثَنِيَّةَ جَارِيَةٍ، فَطَلَبُوا الْعَفْوَ، فَأَبَوْا، فَعَرَضُوا عَلَيْهِمُ الْأَرْشَ، فَأَبَوْا، فَأَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ، فَأَمَرَ بِالْقِصَاصِ، فَقَالَ: أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، تُكْسَرُ ثَنِيَّةُ الرُّبَيِّعِ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَا تُكْسَرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَنَسُ كِتَابُ اللَّهِ الْقِصَاصُ». قَالَ: فَرَضِيَ الْقَوْمُ فَعَفَوْا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: ڕوبەیعی پوری ئەنەس ددانی دووانەی کچێکی شکاند، جا داوای لێخۆشبوونیان کرد، ئەوانیش لێی خۆش نەبوون و داوای خوێنباییان کرد، ئەوانیش ڕەتیان کردەوە، ئنجا هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمانی کرد کە تۆڵەیان لێبکرێتەوە، ئنجا ئەنەسی کوڕی نەزر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ددانی دووانەی ڕوبەیع دەشکێنرێ، سوێند بەو زاتەی تۆی بە هەق ناردووە ددانی ناشکێنرێ، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەنەس تۆڵەکردنەوە لە قورئاندا هاتوە، ڕاوی گوتی: جا خەڵکەکە ڕازی بوون و لێی خۆش بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی هەندێ لە بەندەکانی خوا هەن ئەگەر سوێندی لەسەر بخوات (کارێکی بۆ بکات) خوا سوێندەکەی بۆ جێبەجێ دەکات.

## بابەت: خوێنبایی ددان

**٢٦٥٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْأَسْنَانُ سَوَاءٌ الثَّنِيَّةُ وَالضِّرْسُ سَوَاءٌ»[٢].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٦١١، ومسلم: ١٦٧٥ باختلاف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٥٩ وأخرجه بألفاظ متقاربة أبو داود: ٤٥٦٠ و ٤٥٦١، والترمذي: ١٣٩١ و ١٣٩٢، والنسائي: ٤٨٤٩.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ددانەکان وەکو یەک یەکسانن دووانەو خرێنە یەکسانن (واتە: ئەگەر ناویشیان جیابێ، هەر وەکو یەک یەکسانن و ددان هەر ددانە).

**٢٦٥١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ «قَضَى فِي السِّنِّ خَمْسًا مِنَ الْإِبِلِ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بۆ خوێنبایی ددان پێنج وشتری بڕیارداوە (بۆ هەر ددانێک پێنج وشتر).

## بابەت: خوێنبایی پەنجەکان

**٢٦٥٢-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ» - يَعْنِي الْخِنْصَرَ وَالْإِبْهَامَ(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوە و ئەوە وەکو یەکن و یەکسانن، واتە: پەنجە تووتە و پەنجە کەڵە (یەک حوکمیان هەیە).

**٢٦٥٣-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْأَصَابِعُ سَوَاءٌ كُلُّهُنَّ فِيهِنَّ عَشْرٌ عَشْرٌ مِنَ الْإِبِلِ»(٣).

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەنجەکان هەموویان یەکسانن (بۆ خوێنبایی)، بۆ هەر پەنجەیەک دە وشتر دە وشتر خوێنباییە.

**٢٦٥٤-** عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْأَصَابِعُ سَوَاءٌ»(٤).

واتە: ئەبو موسای ئەشعەریی ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: پەنجەکان هەموویان یەکسانن.

---

(١) صحيح بشواهده. أخرجه أبو داود: ٤٥٥٩ وأخرجه بألفاظ متقاربة أبو داود: ٤٥٦٠ و ٤٥٦١، والترمذي: ١٣٩١ و ١٣٩٢، والنسائي: ٤٨٤٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٩٥، وأبو داود: ٤٥٥٨_٤٥٦١، والترمذي: ١٣٩٢، والنسائي: ٤٨٤٧ و ٤٨٤٨.

(٣) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥٦٢، والنسائي: ٤٨٥٠ و ٤٨٥١.

(٤) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٥٦ و ٤٥٥٧، والنسائي: ٤٨٤٣_٤٨٤٥.

## بابەت: برینێک کە دەگاتە سەر ئێسقان

**٢٦٥٥-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «فِي الْمَوَاضِحِ خَمْسٌ خَمْسٌ مِنَ الْإِبِلِ»[1].

**واتە:** عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو برینانەی کە ئێسقانیان تێدا دەردەکەوێ (برینی قوڵ) پێنج وشتر پێنج وشتر خوێنباییەکەیەتی.

## بابەت: ئەو کەسەی دەستی کەسێک دەگەزێ، ئەویش دەستی لە دەمی ڕاپسکێ و ددانی پێشەوەی بشکێ

**٢٦٥٦-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ عَمَّيْهِ يَعْلَى وَسَلَمَةَ ابْنَيْ أُمَيَّةَ قَالَا: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ وَمَعَنَا صَاحِبٌ لَنَا، فَاقْتَتَلَ هُوَ وَرَجُلٌ آخَرُ وَنَحْنُ بِالطَّرِيقِ، قَالَ: فَعَضَّ الرَّجُلُ يَدَ صَاحِبِهِ، فَجَذَبَ صَاحِبُهُ يَدَهُ مِنْ فِيهِ، فَطَرَحَ ثَنِيَّتَهُ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَلْتَمِسُ عَقْلَ ثَنِيَّتِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ إِلَى أَخِيهِ فَيَعَضُّهُ كَعِضَاضِ الْفَحْلِ، ثُمَّ يَأْتِي يَلْتَمِسُ الْعَقْلَ لَا عَقْلَ لَهَا». قَالَ: فَأَبْطَلَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ[2].

**واتە:** صەفوانی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ لە مامەکانی خۆی یەعلا و سەلەمەی کوڕانی ئومەییەوە گێڕاویەتەوە کە گوتوویانە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ غەزای تەبووک دەرچووین، وە هاوڕێیەکی خۆشمان لەگەڵدا بوو، جا کە لە ڕێگادا بووین ئەو هاوڕێیەمان لەگەڵ پیاوێکی تر کردیانە شەڕ، پیاوەکە دەستی هاوڕێکەی گەست، هاوڕێکەش دەستی ڕاپسکاند و لە دەمی دەریهێنا، ئیتر دووانەی ددانی هەڵوەری، جا هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای خوێنبایی دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یەکێک لە ئێوە گاز لە براکەی دەگرێ، وەک چۆن وشتر گاز دەگرێ، پاشانیش دێت داوای خوێنبایی دەکات؟! ئەو کەسە مافی خوێنبایی نیە، ڕاوی گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو داوایەی هەڵوەشاندەوە.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٤٥٦٦، والترمذي: ١٣٩٠، والنسائي: ٤٨٥٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٦٥، ومسلم: ١٦٧٤، وأبو داود: ٤٥٨٤ و ٤٥٨٥، والنسائي: ٤٧٦٥.

٢٦٥٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا عَضَّ رَجُلًا عَلَى ذِرَاعِهِ فَنَزَعَ يَدَهُ فَوَقَعَتْ ثَنِيَّتَاهُ، فَرُفِعَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَبْطَلَهُمَا وَقَالَ: «يَقْضَمُ أَحَدُكُمْ كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ»[١].

واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺدەگێڕێتەوە، پیاوێک باسکی پیاوێکی تری گەست، ئەویش دەستی (لە دەمی) ڕادەپسکێوێ، ئەویش ددانی پێشەوەی هەڵدەوەرێ و داواکەی (بۆ خوێنبایی) بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەرزکردەوە، پێغەمبەریش ﷺ داواکەی هەڵوەشاندەوە، فەرمووی: یەکێکتان ئەویتر وەکو نێرە وشتر دەگەزێ (دواتریش داوای ماف دەکەن).

## بابەت: مسوڵمان لە بری کافر ناکوژرێتەوە

٢٦٥٨- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﷺ، قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ مِنَ الْعِلْمِ لَيْسَ عِنْدَ النَّاسِ؟ قَالَ: لَا وَاللَّهِ مَا عِنْدَنَا إِلَّا مَا عِنْدَ النَّاسِ، إِلَّا أَنْ يَرْزُقَ اللَّهُ رَجُلًا فَهْمًا فِي الْقُرْآنِ، أَوْ مَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ «فِيهَا الدِّيَاتُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنْ لَا يُقْتَلَ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ»[٢].

واتە: ئەبو جوحەیفە ﷺدەڵێ: بە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبم گوت: ئایا هیچ زانیارییەکت لایە کە لای خەڵکی دیکە نەبێ؟ گوتی: نەخێر، سوێند بە خوا شتێکمان لا نیە، جگە لەوەی کە لەلای خەڵکی هەیە، مەگەر ئەوە نەبێ کە تێگەیشتنێک لە قورئان خوا ببەخشێ بە پیاوێک، یان ئەو شتەی کە لە ناو ئەو پەڕاوە دایە، باسی ئەو خوێنباییانە کە پێغەمبەری خوا ﷺباسی کردوون، هەروەها ئەوەش کە مسوڵمان لە بری کافر ناکوژرێتەوە.

٢٦٥٩- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ»[٣].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی: مسوڵمان لە بری کافر ناکوژرێتەوە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٨٩٢، ومسلم: ١٦٧٣، والترمذي: ١٤١٦، والنسائي: ٤٧٥٨_٤٧٦٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١١١، ومسلم: ١٣٧٠، وأبو داود: ٤٥٣٠، والترمذي: ١٤١٢، والنسائي: ٤٧٣٤ و ٤٧٣٥.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٥٠٦، والترمذي: ١٤١٣.

**٢٦٦٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلَا ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار لە بری کافر ناکوژرێتەوەو، کافرێک کە لە ژێر پەیمانی مسوڵمانانداا بێ لە بری کافرێک کە پەیمانی لەگەڵ مسوڵمانانداا نەبێ ناکوژرێتەوە.**

## بابەت: ئەوەی کە باوک لە تۆڵەی کوڕەکەی ناکوژرێتەوە

**٢٦٦١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يُقْتَلُ بِالْوَلَدِ الْوَالِدُ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە تۆڵەی منداڵ باوکەکە ناکوژرێتەوە. (ئەگەر باوک کوڕی خۆی کوشت ناکوژرێ)**

**٢٦٦٢-** عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يُقْتَلُ الْوَالِدُ بِالْوَلَدِ»[٣].

**واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: باوک لە تۆڵەی منداڵەکەی ناکوژرێتەوە.**

## بابەت: ئایا مرۆڤی ئازاد لە بری کۆیلە دەکوژرێتەوە؟

**٢٦٦٣-** عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ، وَمَنْ جَدَعَهُ جَدَعْنَاهُ»[٤].

**واتە: سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کۆیلەکەی خۆی بکوژێ دەیکوژینەوە، وە هەر کەسێک لووت و گوێی ببڕێ لووت و گوێی دەبڕینەوە.**

---

(١) صحيح.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ١٤٠١.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٤٠٠.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٤٥١٥_٤٥١٧، والترمذي: ١٤١٤، والنسائي: ٤٧٣٦_٤٧٣٨.

**٢٦٦٤-** عَنْ عَلِيٍّ، وعَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: «قَتَلَ رَجُلٌ عَبْدَهُ عَمْدًا مُتَعَمِّدًا، فَجَلَدَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِائَةً، وَنَفَاهُ سَنَةً، وَمَحَا سَهْمَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ»[1].

**واتە:** عەلی و عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕنەوە، گوتوویەتی: پیاوێک بە ئەنقەست کۆیلەکەی خۆی کوشت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ سەد داری لێدا و ساڵێکیش دووری خستەوە، بەشەکەشی لە نێو مسوڵمانان‌دا سڕیەوە.

## بابەت: تۆڵەکردنەوە لە بکوژ بەو شێوەی کوشتنەکەی ئەنجامداوە

**٢٦٦٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ «أَنَّ يَهُودِيًّا رَضَخَ رَأْسَ امْرَأَةٍ بَيْنَ حَجَرَيْنِ فَقَتَلَهَا، فَرَضَخَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَأْسَهُ بَيْنَ حَجَرَيْنِ»[2].

**واتە:** ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، جوولەکەیەک سەری ژنێکی لە نێوانی دوو بەرددا شکاند و کوشتی، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ (لە تۆڵەدا) سەری جوولەکەکەی لە نێوان دوو بەرددا شکاندەوە (کوشتییەوە بە هەمان شێوە کە ژنەکەی کوشتبوو).

**٢٦٦٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ يَهُودِيًّا قَتَلَ جَارِيَةً عَلَى أَوْضَاحٍ لَهَا، فَقَالَ لَهَا: «أَقَتَلَكِ فُلَانٌ؟» فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا: أَنْ لَا، ثُمَّ سَأَلَهَا الثَّانِيَةَ، فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا: أَنْ لَا، ثُمَّ سَأَلَهَا الثَّالِثَةَ، فَأَشَارَتْ بِرَأْسِهَا: أَنْ نَعَمْ، فَقَتَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ حَجَرَيْنِ[3].

**واتە:** ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، جوولەکەیەک کەنیزەیەکی، یان کیژۆڵەیەکی کوشتبوو بۆ هەندێ خشڵی زیو کە بە کچەکەوە بوو، (پێش ئەوەی گیانی دەربچێ) پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: فڵان کەس تۆی کوشت؟ بە سەری ئاماژەی کرد، نەخێر، پاشان دووەم جار لێی پرسی، ئەویش بە سەری ئاماژەی کرد، نەخێر، ئنجا بۆ

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤١٣، ومسلم: ١٦٧٢، وأبو داود: ٤٥٢٧_٤٥٢٩ و ٤٥٣٥، والترمذي: ١٣٩٤، والنسائي: ٤٧٤١ و ٤٧٤٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٤١٣، ومسلم: ١٦٧٢، وأبو داود: ٤٥٢٧_٤٥٢٩ و ٤٥٣٥، والترمذي: ١٣٩٤، والنسائي: ٤٧٤١ و ٤٧٤٢.

سێیەم جار (بۆ سێیەم کەس) لێی پرسی، ئەویش بە سەری ئاماژەی کرد، بەڵێ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوانی دوو بەرددا کوشتییەوە (واتە: هەمان سزای دایەوەو بە هەمان شێوە بکوژەکەی کوشتەوە).

## بابەت: تۆڵەکردنەوە تەنها بە شمشێر دەبێ

٢٦٦٧- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا قَوَدَ إِلَّا بِالسَّيْفِ»[١].

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تۆڵە (ئەگەر کوشتن بێت) ناکرێتەوە تەنها بە شمشێر نەبێ.

٢٦٦٨- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا قَوَدَ إِلَّا بِالسَّيْفِ»[٢].

واتە: ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تۆڵەی (کوشتن) ناکرێتەوە تەنها بە شمشێر نەبێ.

## بابەت: کەس تاوانی کەس هەڵناگرێ

٢٦٦٩- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: «أَلَا لَا يَجْنِي جَانٍ إِلَّا عَلَى نَفْسِهِ. لَا يَجْنِي وَالِدٌ عَلَى وَلَدِهِ، وَلَا مَوْلُودٌ عَلَى وَالِدِهِ»[٣].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی عەمری کوڕی ئەحوەصەوە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: لە حەجیماڵئاواییدا گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئاگاداربن تاوانبار تاوانەکەی تەنها لەسەر خۆیەتی، باوک لەسەر منداڵەکەی تاوانبار ناکرێ، وە منداڵیش لەسەر باوکی تاوانبار ناکرێ.

٢٦٧٠- عَنْ طَارِقٍ الْمُحَارِبِيِّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ، يَقُولُ: «أَلَا لَا تَجْنِي أُمٌّ عَلَى وَلَدٍ، أَلَا لَا تَجْنِي أُمٌّ عَلَى وَلَدٍ»[٤].

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) ضعيف.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٨٣٩ بذكر القصة.

واتە: تاریقی موحاریبی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستەکانی بەرزکردەوە هەتاکو سپییەتی بن باڵیم بینی، دەیفەرموو: ئاگاداربن دایک تاوانی منداڵ هەڵناگرێ، ئاگاداربن دایک تاوانی منداڵ هەڵناگرێ.

**٢٦٧١-** عَنِ الْخَشْخَاشِ الْعَنْبَرِيِّ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَمَعِيَ ابْنِي، فَقَالَ: «لَا تَجْنِي عَلَيْهِ، وَلَا يَجْنِي عَلَيْكَ»(١).

واتە: خەشخاشی عەنبەریی ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ کوڕەکەشم لەگەڵم بوو، جا فەرمووی: تۆ تاوانی ئەو هەڵناگری و، ئەویش تاوانی تۆ هەڵناگرێ.

**٢٦٧٢-** عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَجْنِي نَفْسٌ عَلَى أُخْرَى»(٢).

واتە: ئوسامەی کوڕی شەریک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کەس تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێ.

## بابەت: بەهەدەرچوونی زیان

**٢٦٧٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئاژەڵی بەرەڵدا ئەگەر کەسێکی بریندار کرد خوێنی لەسەر نیە، ئەگەر کانێک بروخێ بەسەر کەسێکدا یان زیان بگەیەنێ پێبژاردنی لەسەر نیە، ئەگەر کەسێک بکەوێتە بیرەوە خوێنی لە خاوەن بیرەکە وەرناگیرێتەوە (مادام ئەو شتانە بە دەستی ئەنقەست نەکرێت و بیرەکەشی لە شوێنی شاراوە نەبێ و لەسەر ڕێگاش نەبێ).

**٢٦٧٤-** عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْعَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ»(٤).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٩، ومسلم: ١٧١٠، وأبو داود: ٣٠٨٥، والترمذي: ٦٤٢ و ١٣٧٧، والنسائي: ٢٤٩٧ و ٢٤٩٧.

(٤) صحيح لغيره.

واتە: لە کەسیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عەوفەوە لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئاژەڵ کەسێک بریندار بکات خوێنی لەسەر نیە و بە خاوەن ئاژەڵەکە نابژێردرێ، کەسێک لە کانێکدا (کانگەدا) ئیش بۆ کەسێک بکات و بەسەریدا بڕوخێ خوێنی ناکەوێتە سەر.

**٢٦٧٥-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: «قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنَّ الْمَعْدِنَ جُبَارٌ، وَالْبِئْرَ جُبَارٌ، وَالْعَجْمَاءَ جَرْحُهَا جُبَارٌ» وَالْعَجْمَاءُ: الْبَهِيمَةُ مِنَ الْأَنْعَامِ وَغَيْرِهَا، وَالْجُبَارُ: هُوَ الْهَدْرُ الَّذِي لَا يُغَرَّمُ[١].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بڕیاریداوە کە کانگە تۆڵە و خوێنی لەسەر نیە، وە بیریش تۆڵە و خوێنی لەسەر نیە، وە ئاژەڵیش کەسێک بریندار بکات تۆڵە و خوێنی لەسەر نیە. وە «العجماء»: ئاژەڵی چوار پەل و هی دیکەش، وە «الجبار» واتە: ئەو شتەی کە بەهەدەر دەڕوات و خوێنی لەسەر نیە.

**٢٦٧٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «النَّارُ جُبَارٌ»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەرەر و زیانی ئاگرێک کە داکەوێت پێبژاردنی نیە. (ئەگەر کەمتەرخەم و بەئەنقەست نەبێت)

## بابەت: پاکانە کردن

**٢٦٧٧-** عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ ﷺ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ عَنْ رِجَالٍ مِنْ كُبَرَاءِ قَوْمِهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْ، فَأُتِيَ مُحَيِّصَةُ فَأُخْبِرَ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ قَدْ قُتِلَ وَأُلْقِيَ فِي فَقِيرٍ أَوْ عَيْنٍ بِخَيْبَرَ، فَأَتَى يَهُودَ فَقَالَ: أَنْتُمْ وَاللَّهِ قَتَلْتُمُوهُ، فَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِهِ، فَذَكَرَ لَهُمْ ذَلِكَ، ثُمَّ أَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ - وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْهُ - وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ، فَذَهَبَ مُحَيِّصَةُ يَتَكَلَّمُ، وَهُوَ الَّذِي كَانَ بِخَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمُحَيِّصَةَ: «كَبِّرْ، كَبِّرْ» يُرِيدُ السِّنَّ، فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِمَّا

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٤٩٩، ومسلم: ١٧١٠ فيهما «الْبِئْرُ جُبَارٌ» وأبو داود: ٤٥٩٤ وفيه «النَّارُ جُبَارٌ».

أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ، وَإِمَّا أَنْ يُؤْذَنُوا بِحَرْبٍ». فَكَتَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَيْهِمْ فِي ذَلِكَ، فَكَتَبُوا: إِنَّا وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِحُوَيِّصَةَ وَمُحَيِّصَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ: «تَحْلِفُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ؟» قَالُوا: لَا. قَالَ: «فَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ؟» قَالُوا: لَيْسُوا بِمُسْلِمِينَ. فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِائَةَ نَاقَةٍ، حَتَّى أُدْخِلَتْ عَلَيْهِمُ الدَّارَ. قَالَ سَهْلٌ: فَلَقَدْ رَكَضَتْنِي مِنْهَا نَاقَةٌ حَمْرَاءُ[1].

واتە: سەهلی کوڕی ئەبو حەسمە ﷺ دەگێڕێتەوە، لە کۆمەڵێک لە گەورە پیاوانی هۆزەکەی، کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەیصە ڕۆیشتن بۆ خەیبەر لە تینی برسییەتییەک کە تووشیان هاتبوو، جا موحەیصە هات و هەواڵیدا کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژراوە و فڕێدراوەتە ناو بیرێک یان کانییەک لە خەیبەر، ئنجا هات بۆ لای جوولەکەکان گوتی: سوێند بە خوا ئێوە کوشتووتانە، ئەوانیش گوتیان: سوێند بە خوا ئێمە نەمانکوشتووە، پاشان هاتەوە ناو خزمەکانی و باسەکەی بۆ گێڕانەوە، پاشان بەخۆی و براکەی کە ناوی حوەیصە بو و لە خۆی گەورەتر بوو لەگەڵ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهل هاتن و موحەیصە ڕۆیشت قسە بکات کە ئەو لە خەیبەر بوو (ئاگاداری بەسەرهاتەکە بوو)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە موحەیصەی فەرموو: کامەتان گەورەترە ئەوە قسە بکات، جا حوەیصە قسەی خۆی کرد، ئنجا موحەیصەش قسەی کرد، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یان دەبێ جوولەکەکان خوێنی هاوڕێکەتان بدەن، یان دەرگای شەڕ لەسەر خۆیان دەکەنەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەکی لەوبارەوە بۆ نووسین و ئەوانیش بۆیان نوسییەوە کە سوێند بە خوا ئێمە نەمانکوشتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە حوەیصە و موحەیصە و عەبدوڕڕەحمانی فەرموو: سوێند دەخۆن هەتاکو خوێنی هاوڕێکەتان وەربگرنەوە؟ گوتیان: نەخێر، فەرمووی: جا جوولەکەکان سوێندتان بۆ دەخۆن، گوتیان: جا ئەوان مسوڵمان نین! ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای خۆیەوە خوێنباییەکەی دا و پێغەمبەری خوا ﷺ سەد وشتری تاکو ماڵەوە بۆ ناردن، سەهل گوتی: وشترێکی سوور لەو وشترانە لە قەیەکی لێدام.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٧٣، ومسلم: ١٦٦٩، وأبو داود: ٤٥٢٠ و ٤٥٢١ و ٤٥٢٣، والترمذي: ١٤٢٢، والنسائي: ٤٧١٣_٤٧١٦ و ٤٧١٨.

**٢٦٧٨- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ حُوَيِّصَةَ وَمُحَيِّصَةَ ابْنَيْ مَسْعُودٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ ابْنَيْ سَهْلٍ، خَرَجُوا يَمْتَارُونَ بِخَيْبَرَ، فَعُدِيَ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ، فَقُتِلَ. فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «تُقْسِمُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ» فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ نُقْسِمُ وَلَمْ نَشْهَدْ؟ قَالَ: «فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ؟» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِذًا تَقْتُلَنَا، قَالَ: فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ عِنْدِهِ**[1].

واتە: لە عەمرِی کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕنەوە، دوو کوڕەکەی مەسعوود حوەیصە و موحەیصە، وە دوو کوڕەکەی سەهل عەبدوڵلاو عەبدوڕڕەحمان بۆ پەیداکردنی خواردن و خۆراک ڕۆیشتن بۆ خەیبەر، ئنجا عەبدوڵلا دەستدرێژی کرایە سەر و کوژرا، جا ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: سوێند دەخۆن هەتاکو مافی وەربگرنەوە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن سوێند بخۆین لە کاتێکدا کە بە چاوی خۆمان نەمان دیتووە؟ فەرمووی: جوولەکەکان پاکانەتان بۆ دەکەن (خۆیان بەری دەکەن)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەواتە دەمانکوژی، ڕاوی دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای خۆیەوە خوێنباییەکەی پێدان.

## بابەت: ئەوەی کە هەر کەس جەستەی کۆیلەکەی بشێوێنێ ئەوا ئەو کۆیلەیە ئازادە

**٢٦٧٩- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ رَوْحِ بْنِ زِنْبَاعٍ، ﷺ عَنْ جَدِّهِ ﷺ، «أَنَّهُ قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَقَدْ أَخْصَى غُلَامًا لَهُ، فَأَعْتَقَهُ النَّبِيُّ ﷺ بِالْمُثْلَةِ»**[2].

واتە: سەلەمەی کوڕی ڕەوحی کوڕی زینباع لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە هاتووە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە کۆیلەیەکی هەبووەو، خەساندوویەتی، ئنجا پێغەمبەر ﷺ بە هۆی ئەوەی کە ئەو پیاوە جەستەی کۆیلەکەی شێواندبوو کۆیلەکەی ئازادکرد.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) حسن بما بعده.

**٢٦٨٠-** عَنْ عَمْرُو بْنُ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ صَارِخًا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا لَكَ؟» قَالَ: سَيِّدِي رَآنِي أُقَبِّلُ جَارِيَةً لَهُ فَجَبَّ مَذَاكِيرِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَيَّ بِالرَّجُلِ» فَطُلِبَ فَلَمْ يُقْدَرْ عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اذْهَبْ، فَأَنْتَ حُرٌّ». قَالَ: عَلَى مَنْ نُصْرَتِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ يَقُولُ: أَرَأَيْتَ إِنِ اسْتَرَقَّنِي مَوْلَايَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَى كُلِّ مُؤْمِنٍ أَوْ مُسْلِمٍ»[١].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێک بە هات و هاوار هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەوە چیتە؟ گوتی: گەورەکەم منی بینیوە لەکاتێکدا کە کەنیزەکەکەیم ماچ کردوە، ئنجا ئەندامی نێرینەی بڕیوم! جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو پیاوەم بۆ بێنن، بە دوایدا ڕۆیشتن، بەڵام نەیانتوانی بەردەستی بکەن (لە ترسان هەڵهاتبوو)، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڕۆ تۆ ئازادی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێ داڵدە و پەنام دەدات، ڕاوی دەڵێ: مەبەستی ئەوە بوو کە گەورەکەی دەڵێ: کێ ئازادی کردووی؟ (واتە: دەمکاتەوە بە کۆیلە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: داڵدەدانت لەسەر هەموو بڕوادار و مسوڵمانێکە.

## بابەت: بڕواداران لە هەموو کەس بە بەزەییترن لە کوشتنەوەدا

**٢٦٨١-** عَنْ عَلْقَمَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَعَفَّ النَّاسِ قِتْلَةً أَهْلُ الْإِيمَانِ»[٢].

واتە: عەلقەمە ﷺ، دەڵێ: عەبدوڵڵا ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بەزەییترین کەس لە کاتی تۆڵەکردنەوەی کوشتنەوەدا خەڵکی بڕوادارە.

**٢٦٨٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَعَفَّ النَّاسِ قِتْلَةً أَهْلُ الْإِيمَانِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە بەزەییترینی خەڵکی لە کاتی تۆڵەکردنەوەی کوشتنەوەدا خەڵکی بڕوادارە.

---

(١) حسن، أخرجه أبو داود: ٤٥١٩.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٦٦٦.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٦٦٦.

## بابەت: مسوڵمانان یەکسانن لە تۆڵەو خوێندا

**٢٦٨٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ، وَيُرَدُّ عَلَى أَقْصَاهُمْ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمانان خوێنەکانیان یەکسانە (گەورە و گچکە و پلە و پایە بەهێز و لاواز هەموویان یەکسانن لە تۆڵە و خوێنباییدا)، لەگەڵ یەکتردا یەکدەستن و هاوکاری یەکترن لە بەرانبەر خەڵکیتردا، کامەیان لە هەمووان لە خوارەوەترە، ئەگەر کەسێکی پەنادا پەنادانەکە دەکەوێتە ئەستۆی هەمووان، وە نزیک و دوور و لاواز و بەهێز لە غەنیمەتدا یەکسانن.

**٢٦٨٤-** عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُسْلِمُونَ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، وَتَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ»[2].

واتە: مەعقیلی کوڕی یەسار ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمانان هەموویان یەکدەست و یەکبازوون لەگەڵ یەکتری بەرانبەر بە غەیری خۆیان و خوێنەکانیان یەکسانن.

**٢٦٨٥-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَدُ الْمُسْلِمِينَ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ، وَيُجِيرُ عَلَى الْمُسْلِمِينَ أَدْنَاهُمْ، وَيَرُدُّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ أَقْصَاهُمْ»[3].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمانان بەرانبەر بە غەیری خۆیان هەموویان خۆبەخۆ یەکدەستن، خوێن وماڵیان یەکسانە، پەنادراوی خواری خوارەوەیان پەنادەدەن (واتە: ئەگەر یەکێکتان پەیمانی بەست لەگەڵ کافرێکدا پەیمانەکەی جێبەجێ دەکرێ)، وە لە دەستکەوتی جەنگیدا دوورترین و نزیکترین یەکسانن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٧٥١ و ٤٥٣١ مطولًا.

## بابەت: کەسێک خاوەن پەیمانێک بکوژێ

٢٦٨٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَتَلَ مُعَاهَدًا لَمْ يَرَحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًا»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کافرێکی خاوەن پەیمان (کافرێک کە پەیمانی پاراستنی پێدرابێ) بکوژێ، بۆنی بەهەشت ناکات، لە کاتێکدا بێگومان بۆنی بەهەشت لە دووری چل ساڵە ڕێگا بۆن دەکرێ.

٢٦٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَتَلَ مُعَاهَدًا لَهُ ذِمَّةُ اللَّهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ فَلَا يَرَحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ سَبْعِينَ عَامًا»[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک کافرێکی پەیمان لەگەڵ بەستراو بکوژێ، کە پەیمانی لەگەڵ خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، بۆنی بەهەشت ناکات، لە کاتێکدا بۆنی بەهەشت چل ساڵە ڕێگا دوور بۆن دەکرێ.

## بابەت: کەسێک دڵنیایی بداتە پیاوێک و بیکوژێ

٢٦٨٨- عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ شَدَّادٍ الْفِتْيَانِيِّ ﵁، قَالَ: لَوْلَا كَلِمَةٌ سَمِعْتُهَا مِنْ عَمْرِو بْنِ الْحَمِقِ الْخُزَاعِيِّ، لَمَشَيْتُ فِيمَا بَيْنَ رَأْسِ الْمُخْتَارِ وَجَسَدِهِ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَمِنَ رَجُلًا عَلَى دَمِهِ، فَقَتَلَهُ، فَإِنَّهُ يَحْمِلُ لِوَاءَ غَدْرٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[3].

واتە: ڕیفاعەی کوڕی شەددادی فیتیانی ﵁ دەڵێ: ئەگەر ئەو قسەیە نەبایە کە لە عەمرِی کوڕی حەمِقی خوزاعییەوە بیستومە، سەری موختارم لە لاشەی جیادەکردەوە، بە نێوانی سەری و لاشەیدا هاتووچۆم دەکرد، (بەڵام) گوێم لێبوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دڵنیایی بداتە کەسێک کە گیانی پارێزراو بێت و دواتریش بیکوژێ، ئەوە ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا ئاڵای ناپاکی ستەمکاریی هەڵدەگرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٦٦ و ٦٩١٤، والنسائي: ٤٧٥٠.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٤٠٣.

(٣) صحيح.

**٢٦٨٩- عَنْ رِفَاعَةَ ﷺ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى الْمُخْتَارِ فِي قَصْرِهِ فَقَالَ: قَامَ جِبْرَائِيلُ مِنْ عِنْدِيَ السَّاعَةَ. فَمَا مَنَعَنِي مِنْ ضَرْبِ عُنُقِهِ إِلَّا حَدِيثٌ سَمِعْتُهُ مِنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «إِذَا أَمِنَكَ الرَّجُلُ عَلَى دَمِهِ فَلَا تَقْتُلْهُ» فَذَاكَ الَّذِي مَنَعَنِي مِنْهُ[1].**

**واتە: ڕیفاعە ﷺ دەڵێ: چوومە لای موختار لە کۆشکەکەیدا، جا گوتی: جیبریل ئێستا لەلای من هەڵسا ڕۆیشت، لەوکاتەدا ئەوەی کە ڕێگر بوو لەبەردەممدا کە لە گەردنم نەدا تەنها ئەو فەرموودەیە بوو کە لە سولەیمانی کوڕی صورەدەوە گوێم لێبوو، لە پێغەمبەر ﷺ دەیگێڕایەوە، فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک بە ئەمینداری زانی بەرانبەر بە خوێنی خۆی، مەیکوژە، ئیتر ئەوە بوو کە ڕێگری لێکردم لە کوشتنی.**

## بابەت: چاوپۆشکردن و لێخۆشبوون لە بکوژ

**٢٦٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَتَلَ رَجُلٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَرُفِعَ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَدَفَعَهُ إِلَى وَلِيِّ الْمَقْتُولِ، فَقَالَ الْقَاتِلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا أَرَدْتُ قَتْلَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْوَلِيِّ: «أَمَا إِنَّهُ إِنْ كَانَ صَادِقًا ثُمَّ قَتَلْتَهُ دَخَلْتَ النَّارَ». قَالَ: فَخَلَّى سَبِيلَهُ، قَالَ: وَكَانَ مَكْتُوفًا بِنِسْعَةٍ، فَخَرَجَ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ، فَسُمِّيَ ذَا النِّسْعَةِ[2].**

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوێک کەسێکی کوشت، جا داواکەیان بەرزکردەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش دای بە دەستی خزم و کەسی کوژراوەکە، بکوژەکەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بە خوا نیازی کوشتنیم نەبوو، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە خزم و کەسی کوژراوەکەی فەرموو: بەڵام ئەگەر ڕاست بکات (کە مەبەستی کوشتن نەبووە) و تۆش بیکوژیتەوە، تۆ دەچیتە دۆزەخ، ڕاوی دەڵێ: ئەویش وازی لێهێنا، دەڵێ: بکوژەکە دەستەکانی بە قایشێک بەسترابوو، جا کە هاتە دەرەوە قایشەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا، لەوکاتەوە ناویان لێنا خاوەن قایش.**

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٩٨، والترمذي: ١٤٠٧، والنسائي: ٤٧٢٢.

**٢٦٩١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: أَتَى رَجُلٌ بِقَاتِلِ وَلِيِّهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «اعْفُ» فَأَبَى. فَقَالَ: «خُذْ أَرْشَكَ» فَأَبَى. قَالَ: «اذْهَبْ فَاقْتُلْهُ فَإِنَّكَ مِثْلُهُ» قَالَ: فَلُحِقَ بِهِ فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ قَدْ قَالَ: «اقْتُلْهُ فَإِنَّكَ مِثْلُهُ» فَخَلَّى سَبِيلَهُ. قَالَ: فَرُئِيَ يَجُرُّ نِسْعَتَهُ ذَاهِبًا إِلَى أَهْلِهِ، قَالَ: كَأَنَّهُ قَدْ كَانَ أَوْثَقَهُ. قَالَ أَبُو عُمَيْرٍ فِي حَدِيثِهِ: قَالَ: ابْنُ شَوْذَبٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ: فَلَيْسَ لِأَحَدٍ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ أَنْ يَقُولَ: «اقْتُلْهُ فَإِنَّكَ مِثْلُهُ» قَالَ ابْنُ مَاجَةَ: «هَذَا حَدِيثُ الرَّمْلِيِّينَ لَيْسَ إِلَّا عِنْدَهُمْ»[1].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پیاوێک بکوژی خزمێکی خۆی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: لێی خۆشبە، ئەویش ڕازی نەبوو، فەرمووی: خوێنبایی وەرگرە، ئەویش ڕازی نەبوو، ئنجا فەرمووی: برۆ بیکوژە ئەوکات تۆش وەکو ئەوی، ڕاوی دەڵێ: خەڵکی بە کابرا گەیشتن پێی گوترا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بیکوژە و تۆش وەکو ئەوی، ئنجا وازی لێهێنا. ڕاوی دەڵێ: بینرا کە قایشێک لەسەر ئەو پێستەی دەکرێتە ڕیشمەی وشتر بە دوای خۆیدا ڕایدەکێشا، وەک بڵێی پێی بەسترابۆوە. عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسم دەڵێ: هیچ کەسێک دوای پێغەمبەر ﷺ بۆی نیە کە بڵێ: بیکوژە تۆش وەکو ئەوی. ئیبنو ماجە دەڵێ: ئەوە گێڕانەوەی ڕەملییەکانە، ئەو فەرموودەیە تەنها لای ئەوان هەیە.

## بابەت: لێخۆش بوون لە تۆڵەکردنەوەدا

**٢٦٩٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: «مَا رُفِعَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْءٌ فِيهِ الْقِصَاصُ، إِلَّا أَمَرَ فِيهِ بِالْعَفْوِ»[2].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: هەر داوایەکی تۆڵەکردنەوە بەرزکرابێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر فەرمانی بەوە کردوە کە لێی خۆش بێ.

---

(١) صحيح. أخرجه النسائي: ٤٧٣٠.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٤٤٩٧، والنسائي: ٤٧٨٣ و ٤٧٨٤.

٢٦٩٣- عَنْ أَبِي السَّفَرِ ﷺ، قَالَ: قَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ رَجُلٍ يُصَابُ بِشَيْءٍ مِنْ جَسَدِهِ فَيَتَصَدَّقُ بِهِ، إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ بِهِ دَرَجَةً، أَوْ حَطَّ عَنْهُ بِهِ خَطِيئَةً» سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي[١].

واتە: ئەبو سەفەر ﷺ دەڵێ: ئەبو دەرداء گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: هەر کەسێک لاشەی تووشی زیانێک ببێ و چاوپۆشی بکات لە تۆڵە، مسۆگەر خوا بە هۆیەوە پلەیەک بەرزی دەکاتەوە، یان گوناهێکی لێ دەسڕێتەوە، دەڵێ: دوو گوێیەکانم ئاوایان بیست و دڵیشم ئاگای لێبوو.

## بابەت: ئافرەتی دووگیان تۆڵەی لێ دەکرێتەوە

٢٦٩٤- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ غَنْمٍ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ، وَعُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ، وَشَدَّادُ بْنُ أَوْسٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْمَرْأَةُ إِذَا قَتَلَتْ عَمْدًا لَا تُقْتَلُ حَتَّى تَضَعَ مَا فِي بَطْنِهَا إِنْ كَانَتْ حَامِلًا، وَحَتَّى يُكْفَلَ وَلَدُهَا، وَإِنْ زَنَتْ لَمْ تُرْجَمْ حَتَّى تَضَعَ مَا فِي بَطْنِهَا، وَحَتَّى يُكْفَلَ وَلَدُهَا»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی غەنم ﷺ دەڵێ: موعازی کوڕی جەبەل و ئەبو عوبەیدەی جەڕاح و عوبادەی کوڕی صامیت و شەددادی کوڕی ئەوس بۆیان گێڕاینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئافرەتێکی دوو گیان بە ئەنقەست کەسێکی کوشت، ناکوژرێتەوە هەتاکو منداڵەکەی دەبێ، وە تاکو منداڵەکەشی دەستەبەری ژیانی بۆ دەکرێ، وە ئەگەر زینای کرد، بەردباران ناکرێ، هەتا منداڵەکەی ناو سکی دادەنێ و دەستەبەری ژیانی منداڵەکەش دەکرێ.

* * *

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٣٩٣.

(٢) ضعيف.



# پەرتووکی

# وەسیەتەکان و ڕاسپێرییەکان





---

كِتَابُ الْوَصَايَا.

## بابەت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی کردوە؟

**٢٦٩٥-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِينَارًا وَلَا دِرْهَمًا، وَلَا شَاةً وَلَا بَعِيرًا، وَلَا أَوْصَى بِشَيْءٍ[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نە درهەم و، نە دینارو، نە مەڕ و، نە وشتری (وەک میرات) لە دوای خۆی بەجێنەهێشت، وە (لە بارەی سەروەت و سامان) وەسیەتی بە هیچ شتێک نەکرد.

**٢٦٩٦-** عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى أَوْصَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَيْءٍ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: فَكَيْفَ أَمَرَ الْمُسْلِمِينَ بِالْوَصِيَّةِ، قَالَ: «أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ». قَالَ مَالِكٌ: وَقَالَ طَلْحَةُ بْنُ مُصَرِّفٍ: قَالَ الْهُزَيْلُ بْنُ شُرَحْبِيلَ: «أَبُو بَكْرٍ كَانَ يَتَأَمَّرُ عَلَى وَصِيِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ وَدَّ أَبُو بَكْرٍ أَنَّهُ وَجَدَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَهْدًا، فَخَزَمَ أَنْفَهُ بِخِزَامٍ»[2].

واتە: تەڵحەی کوڕی موصەڕڕیف دەڵێ: بە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفام ﵄ گوت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی بە هیچ شتێک کرد؟ گوتی: نەخێر، گوتم: ئەی چۆنە فەرمانی کردوە بە مسوڵمانان کە وەسیەت بکەن؟ گوتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ) وەسیەتی بە کتێبی خوا کردوە (کە مسوڵمانان دەستی پێوە بگرن)، مالیک دەڵێ: تەڵحەی کوڕی موصەڕڕیف گوتی: هوزەیلی کوڕی شوڕەحبیل گوتی: ئایا ئەبو بەکر فەرمانڕەواییەکەی بەسەر وەسیەتی پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕاند (کە هەندێک پێیان وایە وەسیەتی بۆ عەلی ﵁ کردوە)؟ ئەبو بەکر ﵁ پێی خۆش بوو کەسێک دیاری کرابایە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەویش بە دوای کەوتبا.

**سەرنج:** (فَخَزَمَ أَنْفَهُ بِخِزَامٍ) واتە: هەروەکو چۆن وشتر ڕەشمە دەکرێ، جا بۆ کوێ بتەوێ ڕایدەکێشی، واتە: ئەبو بەکریش ﵁ ئاوا گوێڕایەڵی دەکرد، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ وەسیەتی بۆ عەلی ﵁ بکردبایە.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٣٥، وأبو داود: ٢٨٦٣، والنسائي: ٣٦٢١ و ٣٦٢٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٤٠، ومسلم: ١٦٣٤، والترمذي: ٢١١٩، والنسائي: ٣٦٢٠.

**٢٦٩٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَتْ عَامَّةُ وَصِيَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ، وَهُوَ يُغَرْغِرُ بِنَفْسِهِ «الصَّلَاةَ، وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: بە گشتی وەسیەتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەمەرگ خەریک بوو، ڕووحی پاکی دەسپارد، ئەوە بوو: ئاگاداری نوێژەکانتان بن و ئاگاتان لەوانەش بێت کە لە ژێر دەستتانن (واتە: کۆیلە و کەنیزەکەکان).**

**٢٦٩٨-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ آخِرُ كَلَامِ النَّبِيِّ ﷺ: «الصَّلَاةَ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ»[٢].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: کۆتا فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو: ئاگاداری نوێژەکانتان بن و ئاگاتان لەوانەش بێت کە لە ژێر دەستتانن (واتە: کۆیلە و کەنیزەکەکان).**

## بابەت: هاندان لەسەر وەسیەت کردن

**٢٦٩٩-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ أَنْ يَبِيتَ لَيْلَتَيْنِ وَلَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ، إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مرۆڤی مسوڵمان ئەگەر شتێکی هەبێ و شایەنی وەسیەت کردن بێ، هەق نیە کە دوو شەو ئەو شتەی لەلا بمێنێتەوە و وەسیەتی نووسراویشی نەبێت لە لای خۆی.**

**٢٧٠٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَحْرُومُ مَنْ حُرِمَ وَصِيَّتَهُ»[٤].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێبەش لە خێر و چاکە ئەو کەسەیە کە بێبەش بێ لە وەسیەت کردن.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٥١٥٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٣٨، ومسلم: ١٦٢٧، وأبو داود: ٢٨٦٢، والترمذي: ٩٧٤ و ٢١١٨، والنسائي: ٣٦١٥ و ٣٦١٦ و ٣٦١٨ و ٣٦١٩.

(٤) ضعيف.

**٢٧٠١-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ مَاتَ عَلَى وَصِيَّةٍ مَاتَ عَلَى سَبِيلٍ وَسُنَّةٍ، وَمَاتَ عَلَى تُقًى وَشَهَادَةٍ، وَمَاتَ مَغْفُورًا لَهُ»[١].

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بمرێت و وەسیەتی کردبێ، لەسەر ڕێگا و ڕێبازی ڕاست مردووە، وە لەسەر ڕێگای پارێزکاران و شەهیدان مردووە، وە بە جۆرێک مردووە کە خوا لێی خۆش بووە.**

**٢٧٠٢-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ وَلَهُ شَيْءٌ يُوصِي بِهِ، إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەسێکی موسڵمان شتێکی هەبێ و پێویست بێ وەسیەتی پێ بکات، هەق نیە دوو شەو لەسەر یەک بمێنێتەوە، کەچی وەسیەتنامەکەی بە نووسراوی لای نەبێ.**

## بابەت: ستەمکردن لە وەسیەتدا

**٢٧٠٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ فَرَّ مِنْ مِيرَاثِ وَارِثِهِ، قَطَعَ اللَّهُ مِيرَاثَهُ مِنَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک میراتگرەکانی لە میرات بێبەش بکات، لە ڕۆژی دواییدا خوا میراتی لێ دەبڕێ لە بەهەشتدا.**

**٢٧٠٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْخَيْرِ سَبْعِينَ سَنَةً، فَإِذَا أَوْصَى حَافَ فِي وَصِيَّتِهِ، فَيُخْتَمُ لَهُ بِشَرِّ عَمَلِهِ فَيَدْخُلُ النَّارَ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الشَّرِّ سَبْعِينَ سَنَةً، فَيَعْدِلُ فِي وَصِيَّتِهِ، فَيُخْتَمُ لَهُ بِخَيْرِ عَمَلِهِ فَيَدْخُلُ الْجَنَّةَ» قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ﴿١٣﴾ ﴾ النساء - إِلَى قَوْلِهِ - ﴿ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾ ﴾ النساء[٤].

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٣٨، ومسلم: ١٦٢٧.

(٣) ضعيف.

(٤) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٨٦٧، والترمذي: ٢١١٧.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاو هەیە کار وکردەوەی چاکە دەکات لە ماوەی حەفتا ساڵدا، جا ئەگەر وەسیەتی کرد لە وەسیەت کردنەکەیدا ستەم و نادادگەری دەکات و کۆتایی کردەوەکانی بە خراپەکاری دێت و دەچێتە ناو ئاگر، وە پیاو هەیە حەفتا ساڵ کار وکردەوەی خراپ دەکات بەڵام لە وەسیەت کردنەکەیدا دادگەری دەکات و کۆتایی کردەوەکانی بە چاکە و خێر دەبێت، ئنجا بەو هۆیەوە دەچێتە بەهەشت. ئەبو هورەیرە گوتی: ئەگەر پێتان خۆش بوو ئەو ئایەتە بخوێننەوە: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ﴿١٣﴾﴾ النساء، واتە: ئەو (یاسایانە) سنورەکانی خودان، دەبێ ئێوەش بە باشی ئاگاتان لێی بێ، هەتاوەکو دەفەرموێ: ﴿عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾﴾ النساء، واتە: سزایەکی ڕیسواکەر، کەوابوو هەرگیز سپاردەو وەسیەتەکانی خوا مەشکێنن.

٢٧٠٥- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ فَأَوْصَى، فَكَانَتْ وَصِيَّتُهُ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ، كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا تَرَكَ مِنْ زَكَاتِهِ فِي حَيَاتِهِ»[١].

واتە: موعاویەی کوڕی قوڕڕە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک مردنی نزیک بوو یەخەی پێگرت و وەسیەتی کرد، وە وەسیەتەکەی بەپێی فەرمانی کتێبی خوا بوو، ئەوە بۆی دەبێتە کەفارەتی ئەو بەشە زەکاتەی کە لە ژیانیدا نەیداوە.

## بابەت: نەهیکردن لە چرووکی لە کاتی ژیاندا و دەستبڵاوی لە کاتی سەرەمەرگدا

٢٧٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَبِّئْنِي بِأَحَقِّ النَّاسِ مِنِّي بِحُسْنِ الصُّحْبَةِ؟ فَقَالَ: «نَعَمْ، وَأَبِيكَ لَتُنَبَّأَنَّ أُمُّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ أُمُّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ أُمُّكَ». قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَبُوكَ». قَالَ: نَبِّئْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَنْ مَالِي كَيْفَ أَتَصَدَّقُ فِيهِ؟ قَالَ: «نَعَمْ، وَاللَّهِ لَتُنَبَّأَنَّ، أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ تَأْمُلُ الْعَيْشَ وَتَخَافُ الْفَقْرَ، وَلَا تُمْهِلْ، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ نَفْسُكَ هَاهُنَا، قُلْتَ: مَالِي لِفُلَانٍ، وَمَالِي لِفُلَانٍ، وَهُوَ لَهُمْ، وَإِنْ كَرِهْتَ»[٢].

---

(١) ضيعف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٩٧١، ومسلم: ٢٥٤٨ قسمه الأول.

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ کێ شایستەترین کەسە کە من بە جوانی هاوەڵیەتی بکەم؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵێ سوێند بێت پێتی ڕادەگەیەنم: دایکت، گوتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: پاشانیش دایکت، گوتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: پاشانیش دایکت، گوتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: پاشان باوکت، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تێم بگەیەنە کە چۆن خێر و چاکە بە سامانەکەم بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ سوێند بە خوا پێتی ڕادەگەیەنم، کاتێک خێر و چاکە بکە کە تۆ ساغی و ڕەزیل و چروکی و هیوات هەیە بە ژیان و لە هەژاری دەترسیت، وە مۆڵەت مەدە هەتا ڕووحت دەگاتە ئێرە (واتە: مردنت نزیک دەبێتەوە)، جا ئەوجار بڵێی: ماڵ و سامانەکەم بۆ فڵان و فڵان، خۆ (دوای خۆت) هەر هی ئەوانە ئەگەر پێشت ناخۆش بێ.

**٢٧٠٧- عَنْ بُسْرِ بْنِ جَحَّاشٍ الْقُرَشِيِّ ﷺ قَالَ: بَزَقَ النَّبِيُّ ﷺ فِي كَفِّهِ، ثُمَّ وَضَعَ أُصْبُعَهُ السَّبَّابَةَ وَقَالَ: «يَقُولُ اللَّهُ ﷻ: أَنَّى تُعْجِزُنِي ابْنَ آدَمَ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ مِثْلِ هَذِهِ، فَإِذَا بَلَغَتْ نَفْسُكَ هَذِهِ - وَأَشَارَ إِلَى حَلْقِهِ - قُلْتَ: أَتَصَدَّقُ، وَأَنَّى أَوَانُ الصَّدَقَةِ؟»[١].**

واتە: بوسری کوڕی جەحاشی قوڕەشی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تفی کردە لەپی دەستی و، بە پەنجەی شایەتمان پەنجەی لێدا و، فەرمووی: خوا دەفەرموێ: ئەوە بۆ وەچەی ئادەم بەربەرەکانیم دەکەی لە کاتێکدا لە شتێکی ئاوا دروستم کردووی، جا کاتێک گیانت دەگاتە گەرووت دەڵێی: ئیتر چاکە و خێر دەکەم! دەی کەی ئەوە کاتی خێر و چاکەیە!!

## بابەت: وەسیەت کردن بە سێیەکی ماڵ

**٢٧٠٨- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: مَرِضْتُ عَامَ الْفَتْحِ حَتَّى أَشْفَيْتُ عَلَى الْمَوْتِ، فَعَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: أَيْ رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي مَالًا كَثِيرًا وَلَيْسَ يَرِثُنِي إِلَّا ابْنَةٌ لِي، أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: «لَا». قُلْتُ: فَالشَّطْرُ؟ قَالَ: «لَا». قُلْتُ: فَالثُّلُثُ؟ قَالَ: «الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ إِنَّكَ أَنْ تَتْرُكَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَتْرُكَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ»[٢].**

---

(١) حسن.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٩٥، ومسلم: ١٦٢٨، وأبو داود: ٢٨٦٤، والترمذي: ٩٧٥ و ٢١١٦، والنسائي: ٣٦٢٦_٣٦٢٨ و ٣٦٣٠.

واتە: عامیری کوڕی سەعدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: لە ساڵی فەتحی مەککەدا نەخۆش کەوتم بە جۆرێک هەستم کرد مردنم نزیک بۆتەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ماڵ و سامانێکی زۆرم هەیە و، تەنها یەک کچیشم هەیە میراتم لێ بگرێ، ئایا دوو لەسەر سێی ماڵەکەم بکەم بە خێر؟ فەرمووی: نەخێر، گوتم: مادام نیوەکەی، فەرمووی: نەخێر، گوتم: دەی مادام یەک لەسەر سێی (سێیەک)، فەرمووی: سێیەک باشە، وە سێیەکیش زۆرە، چونکە ئەگەر میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بێڵی باشترە لەوەی کە بە هەژاری جێیان بێڵی و، دەست لەبەر خەڵکی پان بکەنەوە. (سواڵ بکەن)

**٢٧٠٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ تَصَدَّقَ عَلَيْكُمْ، عِنْدَ وَفَاتِكُمْ، بِثُلُثِ أَمْوَالِكُمْ، زِيَادَةً لَكُمْ فِي أَعْمَالِكُمْ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا چاکەی لەگەڵ ئێوەدا کردوە کە لە کاتی مردنتاندا دەتوانن سێیەکی ماڵتان بکەنە خێرو بیبەخشن، ئەوەش دەبێتە مایەی زیادبوونی کردەوە باشەکانتان.

**٢٧١٠-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ ﷻ يَقُولُ: «يَا ابْنَ آدَمَ، اثْنَتَانِ لَمْ تَكُنْ لَكَ وَاحِدَةٌ مِنْهُمَا، جَعَلْتُ لَكَ نَصِيبًا مِنْ مَالِكَ حِينَ أَخَذْتُ بِكَظَمِكَ، لِأُطَهِّرَكَ بِهِ وَأُزَكِّيَكَ، وَصَلَاةُ عِبَادِي عَلَيْكَ بَعْدَ انْقِضَاءِ أَجَلِكَ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ﷻ دەفەرمووێ: ئەی وەچەی ئادەم، دوو شتم پێداوی هی خۆت نەبوون: بەشێک لەو ماڵەی هەتە کاتێک نزیکی مردن دەبی بەشی تۆم تێخستووە کە بیکەی بە خێر هەتاکو بەهۆیەوە پاکت بکەمەوە و کردەوەت زیاد بکەم، هەروەها نوێژی بەندەکانیشم کاتێک کە دەمری و نوێژی مردووت لەسەر دەکەن.

---

(١) حسن.

(٢) ضعيف.

**٢٧١١-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: وَدِدْتُ أَنَّ النَّاسَ غَضُّوا مِنَ الثُّلُثِ إِلَى الرُّبُعِ، لِأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الثُّلُثُ كَبِيرٌ - أَوْ كَثِيرٌ»[١].

**واتە:** ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێم خۆش بوو کە خەڵکی (لە کاتی وەسیەت کردندا) لە سێیەک کەم بکەنەوە و (کەمتر لە سێیەک بکەنە وەسیەت) بیکەنە چواریەک، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێیەک بەشێکی گەورەیە، یان زۆرە.

## بابەت: وەسیەت کردن بۆ میراتگر دروست نیە

**٢٧١٢-** عَنْ عَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَهُمْ وَهُوَ عَلَى رَاحِلَتِهِ، وَإِنَّ رَاحِلَتَهُ لَتَقْصَعُ بِجِرَّتِهَا، وَإِنَّ لُغَامَهَا لَيَسِيلُ بَيْنَ كَتِفَيَّ، قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَسَمَ لِكُلِّ وَارِثٍ نَصِيبَهُ مِنَ الْمِيرَاثِ، فَلَا تَجُوزُ لِوَارِثٍ وَصِيَّةٌ. الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ، وَمَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ، أَوْ تَوَلَّى غَيْرَ مَوَالِيهِ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لَا يُقْبَلُ مِنْهُ صَرْفٌ وَلَا عَدْلٌ - أَوْ قَالَ: عَدْلٌ وَلَا صَرْفٌ -»[٢].

**واتە:** عەمری کوڕی خاریجە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لەسەر پشتی وشترەکەی وتاری بۆ داون و لەوکاتەدا وشترەکەی کاوێژی کردوە و (دەڵێ:) لیکی وشترەکە بەناو شانمدا دەهاتە خوارێ، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بێگومان خوا بۆ هەر میراتگرێک بەشێکی بۆ جیاکردۆتەوە، بۆیە وەسیەت کردن بۆ میراتگر دروست نیە، وە منداڵ هی خاوەن نوێنە و داوێنپیس لێی بێبەشە، وە هەر کەسێک بانگەشە بکات کە کوڕی کەسێکیترە جگە لە باوکی خۆی، یان هەر کۆیلەیەک بانگەشە بۆ کەسێکیتر بکات، کە خاوەنیەتی جگە لە گەورەکەی خۆی، ئەو کەسە نەفرینی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەرە، وە نە فەرز و نە سوننەتی لێ وەرناگیرێ.

**٢٧١٣-** عَنْ أَبَا أُمَامَةَ الْبَاهِلِيَّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي خُطْبَتِهِ عَامَ حِجَّةِ الْوَدَاعِ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، فَلَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٤٣، ومسلم: ١٦٢٩، والنسائي: ٣٦٣٤.

(٢) صحيح لغيره. أخرجه الترمذي: ٢١٢١، والنسائي: ٣٦٤١_٣٦٤٣.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٧٠ و ٣٥٦٥، والترمذي: ٢١٢٠.

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە وتارەکەی ساڵی حەجی ماڵئاواییدا دەیفەرموو: بێگومان خوا مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە، بۆیە وەسیەت کردن بۆ میراتگر دروست نیە.

٢٧١٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: إِنِّي لَتَحْتَ نَاقَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَسِيلُ عَلَيَّ لُعَابُهَا فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، أَلَا لَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: من لە خوارەوەی وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم و لیکەکەی بەسەر مندا دەڕژا، گوێم لێبوو (پێغەمبەر ﷺ ) دەیفەرموو: بێگومان خوا مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە، ئاگاداربن وەسیەت کردن بۆ میراتگر دروست نیە.

## بابەت: قەرز دانەوە پێش (جێبەجێکردنی) وەسیەتە

٢٧١٥- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: «قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالدَّيْنِ قَبْلَ الْوَصِيَّةِ، وَأَنْتُمْ تَقْرَءُونَهَا: ﴿ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ ﴿١١﴾ ﴾ النساء، وَإِنَّ أَعْيَانَ بَنِي الْأُمِّ لَيَتَوَارَثُونَ دُونَ بَنِي الْعَلَّاتِ»[٢].

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریداوە کە پێش جێبەجێ کردنی وەسیەت قەرز دەدرێتەوە، وە ئێوەش ئەو ئایەتەتان خوێندۆتەوە کە دەفەرموێ: ﴿ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ ﴿١١﴾ ﴾ النساء، واتە: لەپاش (دەرکردنی) وەسیەتێک وەسێتی پێ کرابێ (لە لایەن مردووەکەوە) یان دانەوەی قەرزێک (کە لەسەری بێت)، وە ئەو برا و خوشکانەی دایک و باوکیان یەکە میرات لەیەک دەگرن، نەک ئەوانەی باوکیان یەکە و دایکیان جیاوازە.

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٢٠٩٤ و ٢٠٩٥ و ٢١٢٢.

## بابەت: کەسێک کە مردبێ و وەسیەتی نەکردبێ ئایا خێر و چاکەی بۆ دەکرێ؟

**٢٧١٦-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أَبِي قَدْ مَاتَ وَتَرَكَ مَالًا وَلَمْ يُوصِ، فَهَلْ يُكَفِّرُ عَنْهُ أَنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، گوتی: باوکم مردووە و سامانی لە دوای خۆی جێهێشتووە و وەسیەتیشی نەکردوە، جا ئایا ئەگەر من خێر و چاکەی بۆ بکەم دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهەکانی؟ فەرمووی: بەڵێ.

**٢٧١٧-** عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا وَلَمْ تُوصِ، وَإِنِّي أَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ لَتَصَدَّقَتْ، فَلَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا وَلِيَ أَجْرٌ؟ فَقَالَ: «نَعَمْ»[٢].

واتە: عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: لەڕاستیدا دایکم لە ناکاو مرد و وەسیەتی نەکرد، وە من گومانم وایە ئەگەر پێڕاگەیشتبا قسە بکات، خێر و چاکەی دەکرد، جا ئەگەر من خێر و چاکە لە بری ئەو بکەم پاداشتەکەی بۆ دەچێت و منیش خێرم پێ دەگات؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بەڵێ.

**٢٧١٨-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: لَا أَجِدُ شَيْئًا وَلَيْسَ لِي مَالٌ، وَلِي يَتِيمٌ لَهُ مَالٌ، قَالَ ﷺ: «كُلْ مِنْ مَالِ يَتِيمِكَ، غَيْرَ مُسْرِفٍ وَلَا مُتَأَثِّلٍ مَالًا - قَالَ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: - وَلَا تَقِي مَالَكَ بِمَالِهِ»[٣].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: هیچ شتێک شک نابەم و ماڵ و سامانیشم نیە، وە هەتیوم بەسەرەوەن و (سەرپەرشتیان دەکەم) ماڵیان هەیە، فەرمووی: لە ماڵی هەتیوەکانت بخۆ بەڵام بەبێ زیادەڕەوی کردن و لە دەسایەی ماڵ و سامانەکەیان

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٣٠، والنسائي: ٣٦٥٢.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٣٨٨، ومسلم: ١٠٠٤، وأبو داود: ٢٨٨١، والنسائي: ٣٦٤٩.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٧٢، والنسائي: ٣٦٦٨.

پاشەکەوت مەکە (بەڵکو لە قازانجەکەی کەوا تۆ ئیشی پێدەکەی بۆ ئەوان)، ڕاوی گوتی: وابزانم فەرمووی: پارێزگاری ماڵ و سامانی خۆت بە هی ئەوان مەکە (واتە: سامانی ئەوان بە قوربانی ماڵ و سامانی خۆت مەکە).

* * *

## بابەت: هاندان لەسەر فێربوونی زانستی میرات

٢٧١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَبَا هُرَيْرَةَ تَعَلَّمُوا الْفَرَائِضَ وَعَلِّمُوهَا، فَإِنَّهُ نِصْفُ الْعِلْمِ وَهُوَ يُنْسَى، وَهُوَ أَوَّلُ شَيْءٍ يُنْزَعُ مِنْ أُمَّتِي»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی ئەبو هورەیرە زانستی میرات فێربن و خەڵکیش فێربکەن، چونکە بێگومان (زانستی میرات) نیوەی زانستە، وە ئەو زانستە لەبیر دەچێتەوە و لەبیر دەکرێ، یەکەم شتیشە کە لە ناو ئوممەتەکەمدا هەڵدەگیرێتەوە

## بابەت: میراتی پشت (باوک و کچ و کوڕ و نەوە)

٢٧٢٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةُ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ بِابْنَتَيْ سَعْدٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَاتَانِ ابْنَتَا سَعْدٍ قُتِلَ مَعَكَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَإِنَّ عَمَّهُمَا أَخَذَ جَمِيعَ مَا تَرَكَ أَبُوهُمَا، وَإِنَّ الْمَرْأَةَ لَا تُنْكَحُ إِلَّا عَلَى مَالِهَا، فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى أُنْزِلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَخَا سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ فَقَالَ: «أَعْطِ ابْنَتَيْ سَعْدٍ ثُلُثَيْ مَالِهِ، وَأَعْطِ امْرَأَتَهُ الثُّمُنَ، وَخُذْ أَنْتَ مَا بَقِيَ»(٢).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: خێزانی سەعدی کوڕی ڕەبیع دوو کچەکەی سەعدی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە دوو کچەکەی سەعدن کە لە ئوحود لەگەڵ تۆ بو و کوژراوە، وە مامەکەشیان هەموو ئەو ماڵ و سامانەی کە باوکیان بەجێی هێشتبوو بردوویەتی بۆ خۆی، لە کاتێکدا کە ئافرەت هیچ ماڵێکی نەبێ شووی بۆ ناکرێ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو هەتا ئایەتی میرات دابەزی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی براکەی سەعدی کوڕی ڕەبیعی کرد، فەرمووی: دوو لە سێی ماڵ و سامانەکەی سەعد بدە بە کچەکانی و هەشت یەک بدە بە خێزانەکەی، ئەویتریش کە مایەوە هەڵیگرە بۆ خۆت.

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ٢٠٩١.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٨٩١ و ٢٨٩٢، والترمذي: ٢٠٩٢.

**٢٧٢١-** عَنِ الْهُزَيْلِ بْنِ شُرَحْبِيلَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ وَسَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ الْبَاهِلِيِّ فَسَأَلَهُمَا عَنِ ابْنَةٍ، وَابْنَةِ ابْنٍ، وَأُخْتٍ لِأَبٍ وَأُمٍّ، فَقَالَا: لِلابْنَةِ النِّصْفُ، وَمَا بَقِيَ فَلِلْأُخْتِ، وَائْتِ ابْنَ مَسْعُودٍ، فَسَيُتَابِعُنَا، فَأَتَى الرَّجُلُ ابْنَ مَسْعُودٍ فَسَأَلَهُ، وَأَخْبَرَهُ بِمَا قَالَا: فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ، وَلَكِنِّي سَأَقْضِي بِمَا قَضَى بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لِلابْنَةِ النِّصْفُ، وَلِابْنَةِ الِابْنِ السُّدُسُ، تَكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلْأُخْتِ»[١].

**واتە:** هوزەیلی کوڕی شوڕەحبیل ﷺ دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای ئەبو موسای ئەشعەری و سەلمانی کوڕی ڕەبیعەی باهیلی و پرسیاری لێکردن دەربارەی میراتی کچێک و کچێکی کوڕ و خوشکێکی لە دایک و باوکی، ئەوانیش گوتیان: کچەکە نیوەی هەیە و ئەوەی مایەوە بۆ خوشکەکەیە، وە بچۆ بۆلای ئیبنو مەسعوود ئەویش وەکو ئێمە بڕیار دەدات، ئنجا پیاوەکە هاتە لای ئیبنو مەسعوود و پرسیارەکەی لێکرد و هەواڵی بڕیاری ئەوانیشی پێدا، عەبدوڵڵاش گوتی: ئەگەر وەکو ئەوان بڵێم و بڕیار بدەم کەواتە گومڕا و سەر لێشێواو بم (چونکە ئاگاداری بڕیارەکەی پێغەمبەر ﷺ نین)، بەڵام من بە بڕیاری پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیار دەدەم: کچەکە نیوەی دەکەوێ، کچی کوڕەکەش شەشیەکی دەکەوێ، کە بە هەردووکی دەبێتە دوو لەسەر سێ، جا ئەوەی مایەوە بۆ خوشکەکەیە.

## بابەت: میراتی باپیرە

**٢٧٢٢-** عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ الْمُزَنِيِّ ﷺ، قَالَ: «سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِفَرِيضَةٍ فِيهَا جَدٌّ، فَأَعْطَاهُ ثُلُثًا، أَوْ سُدُسًا»[٢].

**واتە:** مەعقیلی کوڕی یەساری موزەنیی ﷺ دەڵێ: میراتی باپیرەیەکیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوێم لێبوو کە سێیەک یان شەشیەکی پێدا.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٣٦، وأبو داود: ٢٨٩٠، والترمذي: ٢٠٩٣.

(٢) صحيح لغيره.

**٢٧٢٣-** عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ ﷺ، قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي جَدٍّ كَانَ فِينَا بِالسُّدُسِ[١].

واتە: مەعقیلی کوڕی یەسار ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ میراتی باپیرەیەک لەناوماندا بڕیاری شەشیەکی بۆدا.

## بابەت: میراتی داپیرە (نەنک)

**٢٧٢٤-** عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ ذُؤَيْبٍ ﷺ قَالَ: جَاءَتِ الْجَدَّةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﷺ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، فَقَالَ لَهَا: أَبُو بَكْرٍ مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللَّهِ شَيْءٌ، وَمَا عَلِمْتُ لَكِ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْئًا، فَارْجِعِي حَتَّى أَسْأَلَ النَّاسَ، فَسَأَلَ النَّاسَ، فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: «حَضَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَعْطَاهَا السُّدُسَ». فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَلْ مَعَكَ غَيْرُكَ؟ فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَأَنْفَذَهُ لَهَا أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ جَاءَتِ الْجَدَّةُ الْأُخْرَى مِنْ قِبَلِ الْأَبِ إِلَى عُمَرَ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، فَقَالَ: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللَّهِ شَيْءٌ، وَمَا كَانَ الْقَضَاءُ الَّذِي قُضِيَ بِهِ إِلَّا لِغَيْرِكِ، وَمَا أَنَا بِزَائِدٍ فِي الْفَرَائِضِ شَيْئًا، وَلَكِنْ هُوَ ذَاكِ السُّدُسُ، فَإِنِ اجْتَمَعْتُمَا فِيهِ، فَهُوَ بَيْنَكُمَا، وَأَيَّتُكُمَا خَلَتْ بِهِ فَهُوَ لَهَا[٢].

واتە: قەبیصەی کوڕی زوئەیب ﷺ دەڵێ: داپیرەیەک (نەنک) هات بۆ لای ئەبو بەکری صیددیق ﷺ پرسیاری لێکرد دەربارەی بەشە میراتەکەی خۆی، جا ئەبو بەکر ﷺ پێی گوت: لە کتێبەکەی خوادا هیچ بەشێکت بۆ دیاری نەکراوە، وە لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هیچ شتێکم لەوبارەوە ئاگا لێ نیە، بۆیە بچۆوە هەتاکو پرسیار لە خەڵکەکە دەکەم، ئنجا پرسیاری لە خەڵک کرد، جا موغیرەی کوڕی شوعبە گوتی: ئاگادارم و ئامادە بووم کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەشیەکی (بە نەنک) داوە، ئەبو بەکریش گوتی: جگە لە خۆت کەسیترت لەگەڵدایە (بۆ ئەو شایەدییە)؟ ئنجا موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاڕی هەڵساو هەمان ئەو شتەی گوت کە موغیرەی کوڕی شوعبە گوتبووی، ئنجا ئەبو بەکر بڕیارەکەی بۆ نەنکە جێبەجێ کرد، پاشان نەنکێکیتر کە لەلایەن باوکەوە دەبوو بە نەنک هات بۆ لای عومەر پرسیاری میراتەکەی لێکرد، ئەویش گوتی: لە قوڕئاندا هیچ بەشت بۆ دیاری نەکراوە، ئەو

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٩٧.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٨٩٤، والترمذي: ٢١٠٠ و ٢١٠١.

بڕیارەی کە دراویشە (لەلایەن ئەبو بەکرەوە) بۆ کەسێکیتر بوو جگە لە تۆ، وە منیش هیچ شتێک لە پشکە میراتەکان زیاد ناکەم، بەڵام هەر ئەو شەشیەکەت بۆ هەیە، جا ئەگەر دوو نەنک کۆبوونەوە ئەوە شەشیەکەکە لە نێوان خۆتاندا دابەش بکەن، کامەشتان بە تەنیا بوون بۆ ئەوە.

**٢٧٢٥**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَرَّثَ جَدَّةً سُدُسًا»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ شەشیەکی بە میرات بۆ نەنک داناوە.

## بابەت: کەلالە

**٢٧٢٦**- عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ الْيَعْمُرِيِّ ﷺ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، قَامَ خَطِيبًا يَوْمَ الْجُمُعَةِ - أَوْ خَطَبَهُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ - فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا أَدَعُ بَعْدِي شَيْئًا هُوَ أَهَمُّ إِلَيَّ مِنْ أَمْرِ الْكَلَالَةِ، وَقَدْ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَمَا أَغْلَظَ لِي فِي شَيْءٍ مَا أَغْلَظَ لِي فِيهَا، حَتَّى طَعَنَ بِإِصْبَعِهِ فِي جَنْبِي - أَوْ فِي صَدْرِي - ثُمَّ قَالَ: «يَا عُمَرُ، تَكْفِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ الَّتِي نَزَلَتْ فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ»[٢].

واتە: مەعدانی کوڕی ئەبو تەڵحەی یەعموریی ﷺ دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ ڕۆژی جومعە وتاریدا یان تاری بۆدان، جا سوپاس و ستایشی خوای کرد و گوتی: بێگومان سوێند بە خوا من شتێک لە دوای خۆم بەجێ ناهێڵم کە لە مەسەلەی کەلالە پێم گرنگتر بێت، وە بێگومان پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی، لە هیچ ئەوەندە پێداگری لێنەکردم وەکو لەو باسەدا توندگیری لێکردم، هەتا وایلێهات بە پەنجەی نقورچی لە کەلەکەم یان لە سینگم دا، پاشان فەرمووی: ئەی عومەر ئەو ئایەتەی کۆتایی سووڕەتی (النِّسَاءِ) کە لە هاویندا دابەزی لەو بارەوە بەسە بۆ تۆ.

---

(١) ضعيف الإسناد.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ٥٦٧، والنسائي: ٧٠٨.

**تێبینی:** وشەی (کلالة) ناوە بۆ جیا لە منداڵ و دایک و باوک، واتە: ئەوانەی کە میرات دەگرن، ئەگەر باوک و دایک نەبن و، منداڵی مردووەکە نەبن، خوشک بن، یان برا بن، یان مام و خاڵ بن، ئەوا پێیان دەگوترێ: (کلالة). یان ئەو مردووەیە کە میراتی لێدەگیرێ، نە باوک و دایکی هەیە نە منداڵی هەیە، بەڵکو خوشک و برا و مام و خاڵ و ئەوانە میراتی لێدەگرن.

**٢٧٢٧-** عَنْ مُرَّةَ بْنِ شَرَاحِيلَ ﷺ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: «ثَلَاثٌ لَأَنْ يَكُونَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيَّنَهُنَّ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا: الْكَلَالَةُ، وَالرِّبَا، وَالْخِلَافَةُ»[١].

**واتە:** مورەی کوڕی شەڕاحیل ﷺ دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: سێ شت هەیە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردبایەوە بۆم لەلام خۆشەویستتر بوو لە دونیا و ئەوەشی کە تێیدایە: کەلالە و ڕیبا و جێنشینی (هیچ شتێک نەماوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕوونی نەکردبێتەوە، بەڵام پێشەوا عومەر مەبەستی لە وردەکاری ئەو سێ شتە بوو!!).

**٢٧٢٨-** عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ ﷺ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ: مَرِضْتُ فَأَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي هُوَ وَأَبُو بَكْرٍ مَعَهُ وَهُمَا مَاشِيَانِ، وَقَدْ أُغْمِيَ عَلَيَّ، فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَبَّ عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَصْنَعُ، كَيْفَ أَقْضِي فِي مَالِي؟ حَتَّى نَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ فِي آخِرِ النِّسَاءِ: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً ﴿١٢﴾﴾ النساء، الْآيَةَ. وَ ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ﴿١٧٦﴾﴾ النساء، الْآيَةَ»[٢].

**واتە:** موحەممەدی کوڕی مونکەدیر ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ بوو، دەیگوت: نەخۆش بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر بە یەکەوە بە پیادە سەردانیان کردم، لەوکاتەدا من بێهۆش ببووم، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی شوشت و لە ئاوی دەستنوێژەکەی ئاوی پێداکردم، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من چی بکەم چی لە ماڵ و سامانەکەم بکەم و چۆن بڕیاری لێبدەم؟ هەتا ئایەتی میراتی کۆتایی سوورەتی (النساء) دابەزی: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً ﴿١٢﴾﴾ النساء، واتە: وە ئەگەر پیاوێک یان ئافرەتێک کەمیراتی لێ ئەگیرا (مردبوو)

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٩٤، ومسلم: ١٦١٦، وأبو داود: ٢٨٨٦ و ٢٨٨٧، والترمذي: ٢٠٩٧.




نەباوان (دایک وباوکی) هەبوو نە منداڵ، وە: ﴿يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِ ﴾ النساء، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) داوای فتوات لێ دەکەن و لێت دەپرسن بڵێ خوا فتواتان بۆ دەدات دەربارەی کەلالە (کەسێکە نەوەو کوڕو باوک و باپیری نەبێت).

## بابەت: میراتگرتنی مسوڵمانان لە هاوبەشدانەران

٢٧٢٩- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ، وَلَا الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ»[1].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان میرات لە کافر ناگرێ و کافریش میرات لە مسوڵمان ناگرێ.

٢٧٣٠- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَنْزِلُ فِي دَارِكَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: «وَهَلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مِنْ رِبَاعٍ أَوْ دُورٍ؟»[2]. وَكَانَ عَقِيلٌ وَرِثَ أَبَا طَالِبٍ هُوَ وَطَالِبٌ، وَلَمْ يَرِثْ جَعْفَرٌ وَلَا عَلِيٌّ شَيْئًا، لِأَنَّهُمَا كَانَا مُسْلِمَيْنِ، وَكَانَ عَقِيلٌ وَطَالِبٌ كَافِرَيْنِ. فَكَانَ عُمَرُ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ يَقُولُ: لَا يَرِثُ الْمُؤْمِنُ الْكَافِرَ. وَقَالَ أُسَامَةُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ وَلَا الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ»[3].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە مەککەدا دەچیتە ناو خانووەکەت؟ ئەویش فەرمووی: ئایا مەگەر عەقیل هیچ شتێکی لە خانوبەرە و زەوی بۆ ئێمە جێهێشتووە؟ بۆیە ئاوای فەرموو چونکە عەقیل و تاڵیب میراتیان لە ئەبو تاڵیب گرتبوو، بەڵام جەعفەر و عەلی هیچیان وەرنەگرتبوو، چونکە ئەوان مسوڵمان بوون و عەقیل و تاڵیب کافر بوون، جا عومەر لەبەر ئەوەبوو دەیگوت: بڕوادار میرات لە کافر ناگرێ، وە ئوسامەش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مسوڵمان میرات لە کافر ناگرێ، وە کافریش میرات لە مسوڵمان ناگرێ.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٦٤، ومسلم: ١٦١٤، وأبو داود: ٢٩٠٩، والترمذي: ٢١٠٧.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٥٨٨ و ٣٠٥٨ و ٤٢٨٢، ومسلم: ١٣٥١، وأبو داود: ٢٠١٠ و ٢٩١٠.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٦٤، ومسلم: ١٦١٤، وأبو داود: ٢٩٠٩، والترمذي: ٢١٠٧.

**٢٧٣١-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ»[1].

واتە: عەمڕی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەیڕەوانی دوو ئاین میرات لە یەکتری ناگرن.

## بابەت: میراتی وەلاء (کۆیلە و کەنیزەک)

**٢٧٣٢-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: تَزَوَّجَ رِئَابُ بْنُ حُذَيْفَةَ بْنِ سَعِيدِ بْنِ سَهْمٍ أُمَّ وَائِلٍ بِنْتَ مَعْمَرٍ الْجُمَحِيَّةَ، فَوَلَدَتْ لَهُ ثَلَاثَةً، فَتُوُفِّيَتْ أُمُّهُمْ، فَوَرِثَهَا بَنُوهَا، رِبَاعًا وَوَلَاءَ مَوَالِيهَا، فَخَرَجَ بِهِمْ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ إِلَى الشَّامِ، فَمَاتُوا فِي طَاعُونِ عَمْوَاسٍ، فَوَرِثَهُمْ عَمْرُو، وَكَانَ عَصَبَتَهُمْ، فَلَمَّا رَجَعَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ جَاءَ بَنُو مَعْمَرٍ، يُخَاصِمُونَهُ فِي وَلَاءِ أُخْتِهِمْ إِلَى عُمَرَ، فَقَالَ عُمَرُ: أَقْضِي بَيْنَكُمْ بِمَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «مَا أَحْرَزَ الْوَلَدُ وَالْوَالِدُ فَهُوَ لِعَصَبَتِهِ، مَنْ كَانَ». قَالَ: فَقَضَى لَنَا بِهِ، وَكَتَبَ لَنَا بِهِ، كِتَابًا فِيهِ شَهَادَةُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ وَآخَرَ، حَتَّى إِذَا اسْتُخْلِفَ عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ مَرْوَانَ، تُوُفِّيَ مَوْلًى لَهَا، وَتَرَكَ أَلْفَيْ دِينَارٍ، فَبَلَغَنِي أَنَّ ذَلِكَ الْقَضَاءَ قَدْ غُيِّرَ، فَخَاصَمُوا إِلَى هِشَامِ بْنِ إِسْمَاعِيلَ، فَرَفَعَنَا إِلَى عَبْدِ الْمَلِكِ فَأَتَيْنَاهُ بِكِتَابِ عُمَرَ، فَقَالَ: إِنْ كُنْتُ لَأَرَى أَنَّ هَذَا مِنَ الْقَضَاءِ الَّذِي لَا يُشَكُّ فِيهِ، وَمَا كُنْتُ أَرَى أَنَّ أَمْرَ أَهْلِ الْمَدِينَةِ بَلَغَ هَذَا، أَنْ يَشُكُّوا فِي هَذَا الْقَضَاءِ، فَقَضَى لَنَا فِيهِ فَلَمْ نَزَلْ فِيهِ بَعْدُ[2].

واتە: عەمڕی کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ڕیئابی کوڕی حوزەیفەی کوڕی سەعیدی کوڕی سەهم، ئوممو وائیلی کچی مەعمەری جومەحییەی مارەبڕی، ئنجا سێ منداڵی لێی بوو، جا منداڵەکان دایکیان مرد، کوڕەکانیشی هەم خانووبەرەو هەم وەلائی بەندە ئازادکراوەکەی دایکیان بە میرات برد، جا عەمڕی کوڕی عاص بردنی بۆ شام، لەوێش بە نەخۆشی تاعونی عەمواس مردن، بۆیە عەمڕ کە خزمی پشتییان بوو میراتی لێ گرتن، جا کاتێک عەمڕی کوڕی عاص (لە شام) گەڕایەوە خزمی ژنەکە بەنو مەعمەر هاتن داوای وەلائی خوشکەکەیان کردو، کردیانە کێشە لەگەڵ عەمڕ، جا چوون بۆ لای عومەر، عومەریش

---

(١) حسن صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٩١١.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٩١٧.

گوتی: بە بڕیارێک کێشەکەتان بۆ چارەسەر دەکەم کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستومە، گوێم لێبوو دەیفەرموو: ئەوەی کە منداڵ لە دایک و باوکی بە میرات بەدەستی دێنێ بۆ خزمی پشتێیە جا هەر کەسێک بن، عەمڕ گوتی: جا بڕیاری لەنێوانماندا داو نووسراوێکی بۆ نوسین کە شایەدی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و زەیدی کوڕی سابیت و کەسێکی تری تێدا بوو، هەتاکو سەردەمی خەلافەتی عەبولمەلیکی کوڕی مەڕوان هات، جا بەندە ئازادکراوەکەی ژنەکەش مرد، دوو هەزار دیناریشی لە دوای خۆی بەجێ هێشتبوو، جا پێیان ڕاگەیاندم کە بڕیارەکە گۆڕاوە (ئەوەی کە عومەر کاتی خۆی بڕیاری لێ دابوو کە ئەوەی منداڵ بەدەستی دێنێ بۆ خزمی پشتێیە)، بۆیە کێشەکەیان بردە لای هیشامی کوڕی ئیسماعیل، ئێمەش بەرزمان کردەوە بۆ لای عەبدولمەلیک و نووسراوەکەی عومەرمان هێنا، ئەویش گوتی: من وای دەبینم کە ئەو بڕیارە هیچ گومانێکی تێدانیە، وە منیش وای نابینم و پێم سەیرە خەڵکی مەدینە وای لێ هاتبێ کە گومان لەو بڕیارە بکەن، ئیتر بڕیاری بۆ داین بەو بڕیارەی کە لە پەڕاوەکەدا بوو، جا تا ئێستاش هەر لەسەر ئەو بڕیارە دەڕۆین.

**٢٧٣٣-** عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ مَوْلًى لِلنَّبِيِّ ﷺ وَقَعَ مِنْ نَخْلَةٍ، فَمَاتَ وَتَرَكَ مَالًا وَلَمْ يَتْرُكْ وَلَدًا وَلَا حَمِيمًا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَعْطُوا مِيرَاثَهُ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ قَرْيَتِهِ»[(١)].

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بەندەیەکی هەبوو، جا لەسەر دار خورمایەک کەوتە خوارەوەو مرد، ماڵ و سامانێکیشی لەدوا بەجێیا، نە منداڵیشی هەبوو نە خزم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: میراتەکەی بدەنە کەسێک (لە مسوڵمانان) لە گوندەکەی خۆی.

**٢٧٣٤-** عَنْ أُخْتِ ابْنِ شَدَّادٍ لِأُمِّهِ - قَالَتْ: «مَاتَ مَوْلَايَ وَتَرَكَ ابْنَةً فَقَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَالَهُ بَيْنِي وَبَيْنَ ابْنَتِهِ، فَجَعَلَ لِي النِّصْفَ، وَلَهَا النِّصْفَ»[(٢)].

واتە: خوشکی ئیبنو شەدداد لە دایکیەوە، دەڵێ: بەندەیەکم مرد و کچێکی لە دوا بەجێیا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵ و سامانی بەندەکەمی بەشکرد لە نێوان من و کچی بەندەکەمدا، جا نیوەی میراتەکەی بۆ من دانا و نیوەیشی بۆ کچەکە.

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٩٠٢، والترمذي: ٢١٠٥.

(٢) حسن.

## بابەت: میراتی بکوژ

**٢٧٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «الْقَاتِلُ لَا يَرِثُ»[١].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: بکوژ میرات ناگرێ.

**٢٧٣٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَامَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ فَقَالَ: «الْمَرْأَةُ تَرِثُ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا وَمَالِهِ، وَهُوَ يَرِثُ مِنْ دِيَتِهَا وَمَالِهَا، مَا لَمْ يَقْتُلْ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَإِذَا قَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ عَمْدًا لَمْ يَرِثْ مِنْ دِيَتِهِ وَمَالِهِ شَيْئًا، وَإِنْ قَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ خَطَأً وَرِثَ مِنْ مَالِهِ وَلَمْ يَرِثْ مِنْ دِيَتِهِ»[٢].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا هەڵساو فەرمووی: ژن میرات لە خوێنبایی و سامانی مێردەکەی دەگرێ، وە پیاویش میرات لە خوێنبایی و سامانی ژنەکەی دەگرێ، مادام یەکێکیان ئەویتری نەکوشتبێ، جا ئەگەر یەکێک لەو دووانە ئەویتری کوشت بە ئەنقەست، نە لە خوێنبایی و نە لە سامانەکەی میرات ناگرێ، وە ئەگەر یەکێکیان ئەویتری بە هەڵە کوشت، لە سامانەکەی میرات دەگرێ و لە خوێنباییەکەی میرات ناگرێ.

## بابەت: ئەو خزمە نزیکانەی، بەشیان نیە لە میراتدا

**٢٧٣٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا رَمَى رَجُلًا بِسَهْمٍ فَقَتَلَهُ، وَلَيْسَ لَهُ وَارِثٌ إِلَّا خَالٌ، فَكَتَبَ فِي ذَلِكَ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ إِلَى عُمَرَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ عُمَرُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اللَّهُ وَرَسُولُهُ مَوْلَى مَنْ لَا مَوْلَى لَهُ، وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَهُ»[٣].**

واتە: ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێک تیرێکی هاوێژتە پیاوێکی تر و کوشتی، وە (کوژراوەکە) هیچ میراتگریشی نەبوو جگە لە خاڵی، ئنجا ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح لەوبارەوە نامەیەک دەنووسێ بۆ عومەر،

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٠٩.

(٢) موضوع.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ٢١٠٣.




عومەریش بۆی دەنوسێ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ سەرپەرشتیار و پشتیوانی کەسێکن کە سەرپەرشتیاری نەبێ، وە خاڵیش (برای دایک) میراتگری کەسێکە کە میراتگری نەبێ.

**٢٧٣٨-** عَنِ الْمِقْدَامِ أَبِي كَرِيمَةَ ﷺ، - رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ -: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَرَكَ مَالًا فَلِوَرَثَتِهِ، وَمَنْ تَرَكَ كَلًّا فَإِلَيْنَا - وَرُبَّمَا قَالَ: فَإِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ - وَأَنَا وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَهُ أَعْقِلُ عَنْهُ وَأَرِثُهُ، وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَهُ يَعْقِلُ عَنْهُ وَيَرِثُهُ»[١].

واتە: میقدامی ئەبو کەریم ﷺ دەگێڕێتەوە - پیاوێک لە خەڵکی شام لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی -: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ماڵ و سامان بە میرات بەجێ بێڵێ، بۆ میراتگرەکانییەتی، وە هەر کەسێک قەرز و خێزانی بە هەژاری بەجێ بێڵێ لەسەر ئێمەیە و ئێمە لێی بەرپرسیارین - پێشم وابێ فەرمووی: بۆ خواو پێغەمبەرەکەی-، وە من میراتگری کەسێکم کە میراتگری نەبێ، خوێنبایی لە بری دەدەم و میراتیشی لێدەگرم، وە خاڵیش میراتگری کەسێکە کە میراتگری نەبێ، خوێنبایی لە بری دەدات و میراتیشی لێدەگرێ.

## بابەت: میراتی ئەو کەسانەی بەشیان دیاری نەکراوە

**٢٧٣٩-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنَّ «أَعْيَانَ بَنِي الْأُمِّ يَتَوَارَثُونَ دُونَ بَنِي الْعَلَّاتِ، يَرِثُ الرَّجُلُ أَخَاهُ لِأَبِيهِ وَأُمِّهِ، دُونَ إِخْوَتِهِ لِأَبِيهِ»[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری داوە کە خوشک و برایەک لە یەک دایک و باوک بن میرات لە یەکتری دەگرن، بەڵام ئەوانەی باوکیان یان دایکیان جیایە میرات لە یەکتری ناگرن، پیاو میرات لە برای دایک و باوکی دەگرێ، جگە لەو برایانەی کە تەنها لە باوکەوە بران.

**٢٧٤٠-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْسِمُوا الْمَالَ بَيْنَ أَهْلِ الْفَرَائِضِ، عَلَى كِتَابِ اللَّهِ، فَمَا تَرَكَتِ الْفَرَائِضُ، فَلِأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٨٩٩ و ٢٩٠٠.

(٢) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ٢٠٩٤ و ٢٠٩٥ و ٢١٢٢.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٧٣٢، ومسلم: ١٦١٥، وأبو داود: ٢٨٩٨، والترمذي: ٢٠٩٨.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ماڵ و میرات لە نێوان خاوەن بەشە دیاریکراوەکان دابەش بکەن، بە گوێرەی ئەوەی کە قورئان دیاری کردوە، جا ئەوەی لەبەر خاوەن بەشەکان مایەوە بۆ نزیکترین نێرینەیە لە خزمەکانی.

## بابەت: ئەو کەسەی میراتگری نیە

٢٧٤١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَاتَ رَجُلٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَمْ يَدَعْ لَهُ وَارِثًا إِلَّا عَبْدًا هُوَ أَعْتَقَهُ، «فَدَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ مِيرَاثَهُ إِلَيْهِ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پیاوێک مرد و هیچ میراتگرێکی لە پاش بەجێ نەمابوو، جگە لە بەندەیەک کە ئازادی کردبوو، ئنجا پێغەمبەر ﷺ میراتەکەی بۆ بەندەی کابرا گێڕایەوە.

## بابەت: ئافرەت سێ جۆر میراتگرتنی هەیە

٢٧٤٢- عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الْأَسْقَعِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمَرْأَةُ تَحْرِزُ ثَلَاثَ مَوَارِيثَ: عَتِيقِهَا، وَلَقِيطِهَا، وَوَلَدِهَا الَّذِي لَاعَنَتْ عَلَيْهِ»(٢).

واتە: واسیلەی کوڕی ئەسقەع ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت میراتی سێ کەس کۆدەکاتەوە: ئەو کۆیلەیەی کە ئازادی کردوە، وە ئەو منداڵەی کە دۆزیویەتیەوە و پەروەردەی کردوە، وە ئەو منداڵەشی کە لیعانی لەسەر کراوە و بۆتە هی خۆی.

## بابەت: ئەو کەسەی نکوڵی لە منداڵەکەی بکات

٢٧٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ آيَةُ اللِّعَانِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَلْحَقَتْ بِقَوْمٍ مَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ، فَلَيْسَتْ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ، وَلَنْ يُدْخِلَهَا جَنَّتَهُ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ أَنْكَرَ وَلَدَهُ وَقَدْ عَرَفَهُ، احْتَجَبَ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَفَضَحَهُ عَلَى رُءُوسِ الْأَشْهَادِ»(٣).

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٩٠٥، والترمذي: ٢١٠٦.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٩٠٦، والترمذي: ٢١١٥.

(٣) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٢٦٣، والنسائي: ٣٤٨١.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێک ئایەتی لیعان دابەزی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر ئافرەتێک بەهۆی داوێن پیسییەوە منداڵی یەکێکی تر بکاتە هی هۆزێکی تر، هیچ بەشی بە ڕەحمەتی خواوە نیە، وە نایباتە ناو بەهەشتەکەی خۆیەوە، وە هەر پیاوێکیش نکوڵی لە منداڵەکەی خۆی بکات لەکاتێکدا کە دەشیناسێتەوە، خوا لە قیامەتدا پەردەیەک دەخاتە نێوان خۆی و ئەو کەسە و بێبەشی دەکات لە بینینی خۆی، وە لە پێش چاوی ئامادەبووانی (قیامەت) ئابڕوی دەبات.

**٢٧٤٤-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كُفْرٌ بِامْرِئٍ ادِّعَاءُ نَسَبٍ لَا يَعْرِفُهُ، أَوْ جَحْدُهُ، وَإِنْ دَقَّ»[١].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بانگەشەی کەسێک بۆ ڕەچەڵەکێک کە نایناسێ و خۆی لە ئەوان بزانێ، کوفری نیعمەتی ڕەچەڵەکی کردوە، یان نکوڵی لە ڕەچەڵەکی خۆی بکات، بە هەمان شێوەیە هەرچەند گومانیشی هەبێت و لەلای ڕوون نەبێ.

## بابەت: بانگەشە کردن بۆ منداڵ

**٢٧٤٥-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «مَنْ عَاهَرَ أَمَةً أَوْ حُرَّةً، فَوَلَدُهُ وَلَدُ زِنًا لَا يَرِثُ وَلَا يُورَثُ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب ﷺ لە باوکییەوە لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەس زینا لەگەڵ کەنیزەک، یان ئافرەتی ئازاددا بکات، ئەو منداڵەی دەبێ منداڵی زینایە، نە میرات دەگرێ و نە میراتی لێ دەگیرێ.

**٢٧٤٦-** عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّ مُسْتَلْحَقٍ اسْتُلْحِقَ بَعْدَ أَبِيهِ الَّذِي يُدْعَى لَهُ، ادَّعَاهُ وَرَثَتُهُ مِنْ بَعْدِهِ، فَقَضَى أَنَّ مَنْ كَانَ مِنْ أَمَةٍ يَمْلِكُهَا يَوْمَ أَصَابَهَا، فَقَدْ لَحِقَ بِمَنِ اسْتَلْحَقَهُ. وَلَيْسَ لَهُ فِيمَا قُسِمَ قَبْلَهُ مِنَ الْمِيرَاثِ شَيْءٌ، وَمَا أَدْرَكَ مِنْ مِيرَاثٍ لَمْ يُقْسَمْ، فَلَهُ نَصِيبُهُ، وَلَا يَلْحَقُ إِذَا كَانَ أَبُوهُ الَّذِي يُدْعَى لَهُ أَنْكَرَهُ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَمَةٍ لَا يَمْلِكُهَا أَوْ

---

(١) حسن صحيح.

(٢) حسن. أخرجه الترمذي: ٢١١٣.

مِنْ حُرَّةٍ عَاهَرَ بِهَا، فَإِنَّهُ لَا يَلْحَقُ وَلَا يَرِثُ، وَإِنْ كَانَ الَّذِي يُدْعَى لَهُ هُوَ ادَّعَاهُ، فَهُوَ وَلَدُ زِنًا، لِأَهْلِ أُمِّهِ مَنْ كَانُوا، حُرَّةً أَوْ أَمَةً» قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ رَاشِدٍ: يَعْنِي بِذَلِكَ مَا قُسِمَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ قَبْلَ الْإِسْلَامِ[1].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو ئەوانەی پاڵدەدرێنە لای باوکیان و میراتگرەکانیش داوای ئەوە بکەن کە لە باوکیانە، ئەو منداڵە پاڵدەدرێتە لای ئەو باوکەی کە میراتگرەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، جا بڕیارەکەی بەوجۆرەدا کە ئەگەر ئەو کەنیزەکەی پیاوەکە چووەتە لای لەوکاتەدا خۆی خاوەنی کەنیزەکەکە بووبێ، منداڵەکە دەدرێتە پاڵی و لەو میراتەی کە پێشتر دابەشکراوە بەشی نیە، وە لەو میراتەی کە دواتر پێی دەگات بەشی هەیە، خۆ ئەگەر ئەو باوکەی دەدرێتە پاڵی بە زیندوویی خۆی نکوڵی بکات نادرێتە پاڵی و پاڵدانەکە دروست نیە، وە ئەگەر منداڵەکە لە کەنیزەیەک بوو کە پیاوەکە خاوەنی نەبووەو هی کەسێکی دیکە بووبێ، یان لەگەڵ ئافرەتێکی ئازاددا زینای کردبێ، ئەو منداڵە نە دەدرێتە لای کابراو نە میراتیشی لێ دەگرێ (چونکە منداڵی زینایە)، خۆ ئەگەر بانگەشەی ئەوەش بکات کە منداڵەکە لە خۆیەتی، هەر بە منداڵی زینا هەژمار دەکرێ و پاڵ دەدرێتە لای دایکەکە، جا دایکەکە کەنیزەک بێ، یان ئازاد بێ. موحەممەدی کوڕی ڕاشید دەڵێ: مەبەستی لەوەی کە دەفەرمووێ: «فیما قسم قبله» واتە: ئەوەی کە لەپێش ئیسلامداو لە سەردەمی نەفامیدا دابەشکراوە.

## بابەت: نەهی کردن لە فرۆشتنی سەرپەرشتیاری (وەلاء) وە لە بەخشینی

**٢٧٤٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْوَلَاءِ وَعَنْ هِبَتِهِ»[2].**

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە فرۆشتنی سەرپەرشتیاری (وەلاء) و لە بەخشینی.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٢٦٥ و ٢٢٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٥٣٥، ومسلم: ١٥٠٦، وأبو داود: ٢٩١٩، والترمذي: ١٢٣٦ و ٢١٢٦، والنسائي: ٤٦٥٧_٤٦٥٩.

٢٧٤٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْوَلَاءِ وَعَنْ هِبَتِهِ»[١].

واته: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە فرۆشتنی سەرپەرشتیاری و هەم لە بەخشینی.

## بابەت: دابەشکردنی میرات

٢٧٤٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا كَانَ مِنْ مِيرَاثٍ قُسِمَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَهُوَ عَلَى قِسْمَةِ الْجَاهِلِيَّةِ، وَمَا كَانَ مِنْ مِيرَاثٍ أَدْرَكَهُ الْإِسْلَامُ فَهُوَ عَلَى قِسْمَةِ الْإِسْلَامِ»[٢].

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر میراتێک لە سەردەمی نەفامیدا دابەشکرابێ، لەسەر هەمان دابەشکردن دەمێنێتەوە، وە هەر میراتێکیش لە سەردەمی ئیسلامدا بێ، بە گوێرەی بڕیارەکانی ئیسلام دابەش دەکرێ.

## بابەت: میراتی منداڵێک کە بە زیندوویی لە دایک ببێ

٢٧٥٠- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اسْتَهَلَّ الصَّبِيُّ صُلِّيَ عَلَيْهِ وَوَرِثَ»[٣].

واته: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منداڵ کە لە دایک دەبێ تەنها دەنگی لێوە بێ، هەم نوێژی لەسەر دەکرێ (کە مرد) هەم میراتیش دەگرێ.

٢٧٥١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، وَالْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ ؤ، قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَرِثُ الصَّبِيُّ حَتَّى يَسْتَهِلَّ صَارِخًا» قَالَ: وَاسْتِهْلَالُهُ أَنْ يَبْكِيَ وَيَصِيحَ أَوْ يَعْطِسَ[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٢٣٥، ومسلم: ١٥٠٦، وأبو داود: ٢٩١٩، والترمذي: ١٢٣٦ و ٢١٢٦، والنسائي: ٤٦٥٧_٤٦٥٩.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٣٢.

(٤) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٠٣٢.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا و میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منداڵ میرات ناگرێ تاکو دەنگی لێوە نەیەت و هاوار نەکات (لە کاتی لە دایک بووندا)، ڕاوی گوتی: «استهلال» واتە: بگریەت یان هاوار بکات، یان بپژمێ.

## بابەت: ئەوەی پیاو لەسەر دەستی پیاوێک مسوڵمان ببێت

**٢٧٥٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَوْهَبٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ تَمِيمًا الدَّارِيَّ يَقُولُ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا السُّنَّةُ فِي الرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ يُسْلِمُ عَلَى يَدَيِ الرَّجُلِ؟ قَالَ: «هُوَ أَوْلَى النَّاسِ بِمَحْيَاهُ وَمَمَاتِهِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەوهەب ﷺ دەڵێ: گوێم لە تەمیمی داری بوو دەیگوت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر پیاوێک (کەسێک) لە ئەهلی کیتاب لەسەر دەستی پیاوێکیتر مسوڵمان ببێ، چ هەقێکی بەسەریەوە هەیە؟ فەرمووی: ئەو کەسە لە پێشترینە بۆ ئەو لە ژیان و مردنیدا.

* * *

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٩١٨، والترمذي: ٢١١٢.

## بابەت: گەورەیی جیهاد و تێکۆشان لەپێناوی خوای گەورە

**٢٧٥٣-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَعَدَّ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا جِهَادٌ فِي سَبِيلِي، وَإِيمَانٌ بِي، وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِي، فَهُوَ عَلَيَّ ضَامِنٌ أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ أَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ، نَائِلًا مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ» ثُمَّ قَالَ «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا قَعَدْتُ خِلَافَ سَرِيَّةٍ تَخْرُجُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَبَدًا، وَلَكِنْ لَا أَجِدُ سَعَةً فَأَحْمِلَهُمْ، وَلَا يَجِدُونَ سَعَةً فَيَتَّبِعُونِي، وَلَا تَطِيبُ أَنْفُسُهُمْ فَيَتَخَلَّفُونَ بَعْدِي، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوَدِدْتُ أَنْ أَغْزُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأُقْتَلَ، ثُمَّ أَغْزُوَ فَأُقْتَلَ ثُمَّ أَغْزُوَ فَأُقْتَلَ»[1].

**واتە:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا ئامادەسازی کردوە بۆ ئەوانەی کە لە پێناوی ئایینەکەیدا دەردەچن، (خوا دەفەرموێ:) لەبەر خاتری هیچ شتێکیتر دەرنەچووە جگە لەوەی کە لە پێناو ئایین و ڕەزامەندی مندایە، وە لە پێناو بڕواکەی بە من و بەڕاستدانانی پێغەمبەرەکانی من، ئەو کەسە من دەستەبەری چوونە بەهەشتی بۆ دەکەم، یان دەیگەڕێنمەوە ناو ئەو ماڵ و منداڵەی کە لێی دەرچووە بۆ جیهاد بە پاداشت و دەستکەوتێکی زۆرەوە، پاشان (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر لەسەر مسوڵمانان قورس نەبووایە، هەرگیز لە هیچ سوپایەک دوانەدەکەوتم کە لە پێناو خوادا دەردەچێ بۆ جیهاد، بەڵام کەل وپەلی تەواوم بۆ هەموویان دەست ناکەوێ تاکو پێیان بدەم و ئەوانیش بۆ خۆیان ناتوانن کەل وپەلی تەواو بە دەست بێنن و پێشیان خۆش نیە کە من بڕۆم و ئەوان بەجێ بمێنن، وە سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بە دەستە حەزم دەکرد کە جیهاد و تێکۆشان بکەم لە پێناو خوادا و شەهید بووبام، پاشان جیهادم کردبایە و شەهید بووبام و دیسان جیهادم کردبایە و شەهید بوومایە.

**٢٧٥٤-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مَضْمُونٌ عَلَى اللَّهِ، إِمَّا أَنْ يَكْفِتَهُ إِلَى مَغْفِرَتِهِ وَرَحْمَتِهِ، وَإِمَّا أَنْ يَرْجِعَهُ بِأَجْرٍ وَغَنِيمَةٍ، وَمَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ، الَّذِي لَا يَفْتُرُ حَتَّى يَرْجِعَ»[2].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٦، ومسلم: ١٨٧٦، والنسائي: ٣٠٩٨ و ٣١٢٢_٣١٢٤ و ٣١٥١ و ٥٠٢٩ و ٥٠٣٠.

(٢) صحيح.





واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: موجاهیدێک کە لە پێناو خوا دەجەنگێ لە زەمانەتی خوایە یان لە ناو سۆز و بەزەیی و لێخۆشبوونی خۆی دەگرێ یان بە پاداشت و دەسکەوتەوە دەیگێڕێتەوە (بۆ ناو ماڵ و خێزانی)، وە نمونەی موجاهید کە دەجەنگێ لە پێناو خوادا وەکو نمونەی کەسێک وایە بە ڕۆژ بەڕۆژوو بێت و بە شەو بێداربێ، بە جۆرێک کە هیچ ماندوو بوونێکی بەسەردا نەیەت، هەتاکو ئەو کاتەی کە دەگەڕێتەوە.

## بابەت: گەورەیی ساتێک دەرچوون بۆ جیهاد لەپێناو خوا لە بەیانی و ئێوارەدا

**٢٧٥٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «غَدْوَةٌ أَوْ رَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ساتێک دەرچوون لە پێناو خوا چ لە بەیانی، یان لە ئێوارەدا، لە دونیا و ئەوەشی کە تێیدایە باشترە بۆ ئەو کەسە.

**٢٧٥٦-** عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «غَدْوَةٌ أَوْ رَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»[٢].

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ساتێک دەرچوون چ لە بەرەبەیاندا یان ئێواراندا لە پێناو خوا باشترە لە دونیا و ئەوەشی کە لە دونیا دایە.

**٢٧٥٧-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَغَدْوَةٌ أَوْ رَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»[٣].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٩٣، ومسلم: ١٨٨٢، والترمذي: ١٦٤٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٩٤، ومسلم: ١٨٨١، والترمذي: ١٦٤٨ و ١٦٦٤، والنسائي: ٣١١٨.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٩٢، ومسلم: ١٨٨٠، والترمذي: ١٦٥١.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ساتێک دەرچوون لە پێناو خوا باشترە لە دونیا و ئەوەی کە لە دونیاش دایە.

## بابەت: کەسێک کە ئامادەباشی بکات بۆ موجاهیدێک

٢٧٥٨- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَتَّى يَسْتَقِلَّ، كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ حَتَّى يَمُوتَ أَوْ يَرْجِعَ»[١].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک ئامادەکاری بۆ موجاهیدێک بکات لە پێناو خوادا بجەنگێ، تا ئەوکاتەی دەڕوات، بە وێنەی موجاهیدەکە خێر و پاداشتی هەیە تا دەمرێ، یان دەگەڕێتەوە.

٢٧٥٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَجْرِ الْغَازِي شَيْئًا»[٢].

واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک پێداویستی موجاهیدێکی جەنگاوەر لە پێناو خوادا ئامادە بکات، وەکو ئەو موجاهیدە پاداشتی هەیە بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی موجاهیدەکە کەم ببێتەوە.

## بابەت: گەورەیی بەخشین لەپێناو خوای بەرزدا

٢٧٦٠- عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْضَلُ دِينَارٍ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ دِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى عِيَالِهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ عَلَى أَصْحَابِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[٣].

واتە: سەوبان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین دینارێک کە پیاو خەرجی بکات ئەو دینارەیە کە بۆ ماڵ و منداڵی خۆی خەرجی دەکات، وە ئەو دینارەیە کە بۆ ئەسپێک خەرجی دەکات لە پێناو خوادا، وە ئەو دینارەیش کە پیاو بۆ هاوڕێکانی لە پێناو خوادا خەرجی دەکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٤٣، ومسلم: ١٨٩٥، وأبو داود: ٢٥٠٩، والترمذي: ١٦٢٨ و ١٦٣١، والنسائي: ٣١٨٠ و ٣١٨١.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ٩٩٤، والترمذي: ١٩٦٦.

**٢٧٦١-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَبِي الدَّرْدَاءِ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، وَجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، وَعِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ ﷺ كُلُّهُمْ يُحَدِّثُ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ أَرْسَلَ بِنَفَقَةٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأَقَامَ فِي بَيْتِهِ، فَلَهُ بِكُلِّ دِرْهَمٍ سَبْعُمِائَةِ دِرْهَمٍ، وَمَنْ غَزَا بِنَفْسِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَأَنْفَقَ فِي وَجْهِ ذَلِكَ، فَلَهُ بِكُلِّ دِرْهَمٍ سَبْعُمِائَةِ أَلْفِ دِرْهَمٍ»، ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ﴿٢٦١﴾﴾ البقرة[1].

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و ئەبو دەرداء و ئەبو هورەیرەو ئەبو ئومامەی باهیلی و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ و جابیری کوڕی عەبدوڵڵا و عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە هەموویان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕنەوە، فەرموویەتی: هەر کەسێک ماڵ و بەخشین لە پێناو خوادا بنێرێ و خۆی لە ماڵەوە بێت (عوزری هەبێ)، بۆ هەر درهەمێک بۆی بە حەوسەد درهەم هەژمار دەکرێ، وە هەر کەس بۆ خۆی بچێ بۆ غەزا لە پێناو خوادا و لەو پێناوەشدا ماڵ ببەخشێ، هەر درهەمێکی بۆ بە حەوت سەد هەزار درهەم هەژمار دەکرێ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ﴿٢٦١﴾﴾ البقرة، واتە: وە خوا لەمەش زیاتری دەکات بۆ هەر کەسێک کە خۆی بیەوێت.

## بابەت: هەڕەشەکردن لە وازهێنان لە جیهاد

**٢٧٦٢-** عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَغْزُ أَوْ يُجَهِّزْ غَازِيًا أَوْ يَخْلُفْ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ، أَصَابَهُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ بِقَارِعَةٍ قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[2].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک جیهاد نەکات، یان ئامادەسازی بۆ جەنگاوەرێک نەکات، یان جێگای جەنگاوەرێک بۆ ماڵ و منداڵی جەنگاوەرەکە بە باشی نەگرێتەوە، خوا تووشی بەڵاو چارەڕەشی دەکات پێش ئەوەی قیامەت بێ.

---

(١) ضعيف.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٠٣.

**٢٧٦٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَقِيَ اللَّهَ وَلَيْسَ لَهُ أَثَرٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، لَقِيَ اللَّهَ وَفِيهِ ثُلْمَةٌ»[1].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بچێتەوە دیداری خواو، هیچ شوێنەواری جیهادی پێوە نەبێ، بە نوقسانی و کەم و کوڕی دەگاتەوە بە خوا.

## بابەت: ئەو کەسەی بێ پاساوی شەرعی ناتوانێ بچێ بۆ جیهاد

**٢٧٦٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ فَدَنَا مِنَ الْمَدِينَةِ قَالَ: «إِنَّ بِالْمَدِينَةِ لَقَوْمًا مَا سِرْتُمْ مِنْ مَسِيرٍ، وَلَا قَطَعْتُمْ وَادِيًا، إِلَّا كَانُوا مَعَكُمْ فِيهِ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ؟ قَالَ: «وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ»[2].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزای تەبوک گەڕایەوەو لە مەدینە نزیک بووەوە فەرمووی: بێگومان لەناو مەدینەدا کەسانێک هەن هەر ڕێگایەکتان بڕیوە و هەر شیو و دۆڵێکتان بڕیوە، مسۆگەر ئەوانیش لەگەڵ ئێوە بوون، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان لە مەدینەن؟ فەرمووی: ئەوان لە مەدینەن، بەڵام پاساوی شەرعی ڕێگەی لێگرتوون (کە لەگەڵ ئێمە بێن، واتە: لە پاداشت لەگەڵتانن).

**٢٧٦٥- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ بِالْمَدِينَةِ رِجَالًا مَا قَطَعْتُمْ وَادِيًا، وَلَا سَلَكْتُمْ طَرِيقًا، إِلَّا شَرِكُوكُمْ فِي الْأَجْرِ، حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ» قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ ابْنُ مَاجَةَ: «أَوْ كَمَا قَالَ كَتَبْتُهُ لَفْظًا»[3].**

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە ناو مەدینەدا پیاوانێک هەن کە هەر شیوێکتان تێپەڕاندووە و، هەر ڕێگایەکتان بڕیوە بە دڵنیایی ئەوانیش لەگەڵ ئێوە (لە پاداشتەکە) هاوبەشن، پاساوی شەرعی ڕێی لە هاتنیان گرتووە. ئیبنو ماجە گوتی: یان وەکو ئەوەی فەرموو کە بەو دەربڕینە نوسیومە.

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٦٦٦.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٤٢٣، وأبو داود: ٢٥٠٨.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩١١.

## بابەت: گەورەیی ئێشکگرتن و پاسەوانی لە پێناوی خوا

**٢٧٦٦-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ، قَالَ: خَطَبَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ النَّاسَ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي سَمِعْتُ حَدِيثًا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أُحَدِّثَكُمْ بِهِ إِلَّا الضَّنُّ بِكَمْ وَبِصَحَابَتِكُمْ، فَلْيَخْتَرْ مُخْتَارٌ لِنَفْسِهِ أَوْ لِيَدَعْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ رَابَطَ لَيْلَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ سُبْحَانَهُ، كَانَتْ كَأَلْفِ لَيْلَةٍ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەففان وتاری بۆ خەڵکیدا، گوتی: ئەی خەڵکینە فەرموودەیەکم لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێ لێبووە، بۆیە بۆم باس نەکردوون لە ترسی ئەوەی لە من دوور بکەونەوە (تاکو بچن ئەو فەرموودەیە جێبەجێ بکەن)، بەڵام کێ چی پێخۆشە بۆ خۆی هەڵیبژێرێ، یان وازی لێبێنێ، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک یەک شەو لە پێناوی خوای پاک و بێگەردا بچێ پاسەوانی (سەر سنوورەکان) بکات، بە ئەندازەی ڕۆژو و شەونوێژی هەزار شەو (پاداشتی) هەیە.

**٢٧٦٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَاتَ مُرَابِطًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَجْرَى عَلَيْهِ أَجْرَ عَمَلِهِ الصَّالِحِ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُ، وَأَجْرَى عَلَيْهِ رِزْقَهُ، وَأَمِنَ مِنَ الْفَتَّانِ، وَبَعَثَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ آمِنًا مِنَ الْفَزَعِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: هەر کەسێک لە کاتی پاسەوانیکردندا لە پێناوی خوا بمرێ، ئەو کردەوانەی کە دەیکردن دوای مردنی هەر بۆی هەژمار دەکرێن و ڕزق و ڕۆزییەکەشی پێ دەدرێ و لە فیتنەی سزای گۆڕیش پارێزراو دەبێ و لە ڕۆژی قیامەتیشدا کە زیندوو دەکرێتەوە، تووشی ناخۆشی و ناڕەحەتی ئەو ڕۆژە نابێ.

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ١٦٦٧، والنسائي: ٣١٦٩ و ٣١٧٠ كلاهما عن أبي صالح مولى عثمان.

(٢) صحيح.




**٢٧٦٨-** عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَرِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مِنْ وَرَاءِ عَوْرَةِ الْمُسْلِمِينَ، مُحْتَسِبًا مِنْ غَيْرِ شَهْرِ رَمَضَانَ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنْ عِبَادَةِ مِائَةِ سَنَةٍ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا، وَرِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مِنْ وَرَاءِ عَوْرَةِ الْمُسْلِمِينَ، مُحْتَسِبًا مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ أَفْضَلُ عِنْدَ اللَّهِ وَأَعْظَمُ أَجْرًا - أُرَاهُ قَالَ - مِنْ عِبَادَةِ أَلْفِ سَنَةٍ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا، فَإِنْ رَدَّهُ اللَّهُ إِلَى أَهْلِهِ سَالِمًا، لَمْ تُكْتَبْ عَلَيْهِ سَيِّئَةٌ أَلْفَ سَنَةٍ، وَتُكْتَبُ لَهُ الْحَسَنَاتُ، وَيُجْرَى لَهُ أَجْرُ الرِّبَاطِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»(١).

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێشکگرتنی یەک ڕۆژ لە پێناوی خوا لە سەنگەر و کەلێنەکانی گەڵ مسوڵمانان ئەگەر بۆ خوا بیکات و لە مانگی ڕەمەزاندا نەبێ، پاداشتەکەی لە پەرستشی ڕۆژو و شەونوێژی سەد ساڵ گەورەترە، وە پاسەوانی کردنی ڕۆژێک لە دواوەی مسوڵمانان و سەنگەرەکانیان کە بۆ خوا بێت و لە مانگی ڕەمەزانیشدا بێ، پاداشتەکەی باشتر و گەورەترە - ڕاوی دەڵێ: وابزانم فەرمووی:- لە پەرستشی هەزار ساڵ بەڕۆژووبوون و شەونوێژیشەوە، جا ئەگەر گەڕاندییەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵەکەی بە سەلامەتی ئەوە تا هەزار ساڵ خراپەی لەسەر نانووسرێ، وە چاکەی بۆ دەنووسرێ، وە تا ڕۆژی دوایی پاداشتی پاسەوانیکردنی بۆ دەنووسرێ.

## بابەت: گەورەیی ئێشکگرتن و تەکبیر لێدان لە جیهاددا

**٢٧٦٩-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَحِمَ اللَّهُ حَارِسَ الْحَرَسِ»(٢).

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕەحمەتی خوا لە ئێشکگرە سەربازەکان.

**٢٧٧٠-** عَنْ سَعِيدِ بْنِ خَالِدِ بْنِ أَبِي الطَّوِيلِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «حَرَسُ لَيْلَةٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَفْضَلُ مِنْ صِيَامِ رَجُلٍ وَقِيَامِهِ فِي أَهْلِهِ أَلْفَ سَنَةٍ: السَّنَةُ ثَلَاثُمِائَةٍ وَسِتُّونَ يَوْمًا، وَالْيَوْمُ كَأَلْفِ سَنَةٍ»(٣).

---

(١) موضوع.

(٢) ضعيف.

(٣) موضوع.

واتە: سەعیدی کوڕی خالیدی کوڕی ئەبو تەویل ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پاسەوانی کردنی یەک شەو لە پێناوی خوا باشتر و گەورەترە لە ڕۆژو وگرتن و شەونوێژ کردنی هەزار ساڵی کەسێک لە ناو ماڵ و منداڵی خۆی، یەک ساڵ سێ سەد و شەست ڕۆژە وە ڕۆژێکیش وەکو هەزار ساڵ وایە.

**٢٧٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِرَجُلٍ: «أُوصِيكَ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَالتَّكْبِيرِ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ»**(١).

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: وەسیەتت بۆ دەکەم بە پارێزکاری کردنی خوا و تەکبیر لێدان لەسەر هەر جێیەکی بەرز (کە بۆی سەرکەوتی).

## بابەت: دەرچوون بۆ جەنگ و جیهاد

**٢٧٧٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: ذُكِرَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «كَانَ أَحْسَنَ النَّاسِ، وَكَانَ أَجْوَدَ النَّاسِ، وَكَانَ أَشْجَعَ النَّاسِ. وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ لَيْلَةً، فَانْطَلَقُوا قِبَلَ الصَّوْتِ، فَتَلَقَّاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ سَبَقَهُمْ إِلَى الصَّوْتِ، وَهُوَ عَلَى فَرَسٍ لِأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ، مَا عَلَيْهِ سَرْجٌ فِي عُنُقِهِ السَّيْفُ، وَهُوَ يَقُولُ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، لَنْ تُرَاعُوا» يَرُدُّهُمْ، ثُمَّ قَالَ: لِلْفَرَسِ «وَجَدْنَاهُ بَحْرًا» أَوْ «إِنَّهُ لَبَحْرٌ» قَالَ حَمَّادٌ: وَحَدَّثَنِي ثَابِتٌ أَوْ غَيْرُهُ قَالَ: «كَانَ فَرَسًا لِأَبِي طَلْحَةَ يُبَطَّأُ فَمَا سُبِقَ بَعْدَ ذَلِكَ الْيَوْمِ»**(٢).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: باسی پێغەمبەر کرا ﷺ، جا (ئەنەس) گوتی: (پێغەمبەر ﷺ) جوانترینی خەڵکی بوو، سەخیترینی خەڵکی بوو، وە ئازاترینی خەڵکیش بوو، شەوێکیان خەڵکی مەدینە ترسێکیان لێ نیشت (بەهۆی دەنگێک)، ئنجا بەرەو شوێنی دەنگەکە ڕۆشتن، جا لە ڕێگادا پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان گەیشت (ئەو دەگەڕایەوە)، پێش ئەوان چووبوو بۆ شوێنی دەنگەکە، وە لەسەر ئەسپەکەی ئەبو تەڵحە بوو کە ئەسپەکە ڕووت بوو زین نەکرابوو، (پێغەمبەر ﷺ) شمشێرەکەی

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٤٤٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٦٢٧، ومسلم: ٢٣٠٧، وأبو داود: ٤٩٨٨، والترمذي: ١٦٨٥ و ١٦٨٦ و ١٦٨٧.

لە ملدا بوو، دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە مەشڵەژێن (مەترسێن) دووبارەی دەکردەوە، پاشان دەربارەی ئەسپەکە فەرمووی: وەکو دەریا وایە، یان بەڕاستی دەڵێی دەریایە (لە ڕۆیشتندا). حەماد گوتی: سابیت یان یەکێکی تر بۆی گێڕامەوە و گوتی: ئەسپەکەی ئەبو تەڵحە سست و شل دەبوو، بەڵام لەو ڕۆژە بەدواوە هیچ ئەسپێک پێی نەدەگەیشت.

**٢٧٧٣-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر داواتان لێکرا کە بۆ جیهاد دەربچن، بڕۆن.

**٢٧٧٤-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي جَوْفِ عَبْدٍ مُسْلِمٍ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: تەپوتۆز و خۆڵی ڕێگای جیهاد لە پێناوی خوادا لەگەڵ دوکەڵی ئاگری دۆزەخ بەیەکەوە لە ناو ناخ و دەروونی بەندەیەکی مسوڵماندا کۆ نابنەوە.

**٢٧٧٥-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَاحَ رَوْحَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، كَانَ لَهُ بِمِثْلِ مَا أَصَابَهُ مِنَ الْغُبَارِ مِسْكًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ساتێک لە ئێوارەیەکدا بڕوات لە پێناوی خوادا، بە ئەندازەی ئەو خۆڵ و تۆزەی لێی دەنیشێ بۆی دەبێتە میسک لە قیامەتدا. (پێی دەبەخشرێت)

## بابەت: گەورەیی جیهاد کردن لە دەریادا و بە دەریادا

**٢٧٧٦-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ خَالَتِهِ أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ، أَنَّهَا قَالَتْ: نَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا قَرِيبًا مِنِّي ثُمَّ اسْتَيْقَظَ يَتَبَسَّمُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَضْحَكَكَ؟ قَالَ: «نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٣٤، ومسلم: ١٣٥٣، وأبو داود: ٢٤٨٠، والترمذي: ١٥٩٠، والنسائي: ٤١٧٠.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٣٣ و ٢٣١١، والنسائي: ٣١٠٧_٣١١٥.

(٣) حسن.

عُرِضُوا عَلَيَّ يَرْكَبُونَ ظَهْرَ هَذَا الْبَحْرِ كَالْمُلُوكِ عَلَى الْأَسِرَّةِ». قَالَتْ: فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: فَدَعَا لَهَا، ثُمَّ نَامَ الثَّانِيَةَ، فَفَعَلَ مِثْلَهَا، ثُمَّ قَالَتْ مِثْلَ قَوْلِهَا، فَأَجَابَهَا مِثْلَ جَوَابِهِ الْأَوَّلِ، قَالَتْ: فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: «أَنْتِ مِنَ الْأَوَّلِينَ». قَالَ: فَخَرَجَتْ مَعَ زَوْجِهَا عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ غَازِيَةً أَوَّلَ مَا رَكِبَ الْمُسْلِمُونَ الْبَحْرَ مَعَ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، فَلَمَّا انْصَرَفُوا مِنْ غَزَاتِهِمْ قَافِلِينَ، فَنَزَلُوا الشَّامَ، فَقُرِّبَتْ إِلَيْهَا دَابَّةٌ لِتَرْكَبَ فَصَرَعَتْهَا فَمَاتَتْ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ لە ئوممو حەڕامی کچی میلحانی پوریەوە دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە نزیکی من خەوتبوو، پاشان خەبەری بۆوە زەردەخەنەی دەکرد، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە چ پێدەکەنی؟ فەرمووی: کۆمەڵە خەڵکێکم نیشاندرا لە ئوممەتەکەم کە وەکو پاشاکان لەسەر تەخت سواری ئەو دەریایە ببوون، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعام بۆ بکە منیش یەکێک بم لەوان، ڕاوی دەڵێ: ئنجا دوعای بۆ کرد، پاشان بۆ دووەم جار خەوتەوە، وەک جاری پێشووی کردەوەو هەمان قسەی پێشووشی فەرموو، ئەویش وەکو پێشوو پرسیاری لێکرد، ئنجا پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوە وەکو وەڵامی یەکەم جار، ئنجا گوتی: دوعام بۆ بکە یەکێک بم لەوان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ لە دەستەی یەکەمیانی، ڕاوی دەڵێ: (ئوممو حەڕام) لەگەڵ عوبادەی کوڕی صامیتی مێردی دەرچوو بۆ غەزا، لەگەڵ یەکەم دەستەی مسوڵمانان بەسەر دەریادا لەگەڵ موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، جا کاتێک بە کاروانەوە لە غەزاکە گەڕانەوە لە شام دابەزین، جا ئەسپێکیان (بۆ ئوممو حەڕام) هێنا بۆ ئەوەی کە سواری بێت، ئەسپەکەش بەریدایەوەو مرد.

**٢٧٧٧**- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «غَزْوَةٌ فِي الْبَحْرِ مِثْلُ عَشْرِ غَزَوَاتٍ فِي الْبَرِّ، وَالَّذِي يَسْدَرُ فِي الْبَحْرِ كَالْمُتَشَحِّطِ فِي دَمِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ سُبْحَانَهُ»[2].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەک جار غەزاکردن و جەنگ لە پێناوی خوادا لە ناو دەریادا، یان بە ناو دەریادا پاداشتی وەکو دە جار جەنگان هەیە لە وشکانیدا، وە ئەو کەسەی کە سەری گێژ دەخوات لە

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٧٨٩ و ٢٧٩٩ و ٢٨٠٠، ومسلم: ١٩١٢، وأبو داود: ٢٤٩٠، والنسائي: ٣١٧١ و ٣١٧٢.

(٢) ضعيف.

ناو دەریادا وەکو ئەو کەسە وایە کە لە پێناوی خوادا لە خوێنی خۆیدا پێچ دەخوات دێت و دەچێت و دەتلێتەوە.

**٢٧٧٨-** عَنْ سُلَيْمِ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «شَهِيدُ الْبَحْرِ مِثْلُ شَهِيدَيِ الْبَرِّ، وَالْمَائِدُ فِي الْبَحْرِ كَالْمُتَشَحِّطِ فِي دَمِهِ فِي الْبَرِّ، وَمَا بَيْنَ الْمَوْجَتَيْنِ كَقَاطِعِ الدُّنْيَا فِي طَاعَةِ اللَّهِ، وَإِنَّ اللَّهَ ﷻ وَكَّلَ مَلَكَ الْمَوْتِ بِقَبْضِ الْأَرْوَاحِ إِلَّا شَهِيدَ الْبَحْرِ، فَإِنَّهُ يَتَوَلَّى قَبْضَ أَرْوَاحِهِمْ وَيَغْفِرُ لِشَهِيدِ الْبَرِّ الذُّنُوبَ كُلَّهَا، إِلَّا الدَّيْنَ وَلِشَهِيدِ الْبَحْرِ الذُّنُوبَ وَالدَّيْنَ»[1].

واتە: سولەیمی کوڕی عامیر ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەبو ئومامە بوو دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پاداشتی شەهیدێکی دەریا بە ئەندازەی دوو شەهیدی وشکانییە، ئەو کەسەی کە لەناو دەریادا سەری پێچ دەخوات، وەکو ئەو کەسە وایە کە لەناو خوێنی خۆی دەتلێتەوە لە وشکانیدا، وە ئەو کەسەی کە دەکەوێتە نێوان دوو شەپۆلەوە (دەیانبڕێ) وەکو کەسێک وایە کە تەواوی ژیانی دونیای لە فەرمانبەرداری خوادا بەسەربردبێ، وە بێگومان خوا ﷻ بۆ کێشانی گیانی هەر کەسێک فریشتەی ڕاسپاردوە تەنها شەهیدی دەریا نەبێ، چونکە بۆخۆی ڕووحیان وەردەگرێتەوە، وە لە هەموو گوناهەکانی شەهیدی وشکانی خۆش دەبێ تەنها قەرز نەبێت، وە بۆ شەهیدی دەریا لە گوناهەکانیشی و لە قەرزەکەیشی خۆش دەبێ.

## بابەت: باسی دەیلەم و گەورەیی قەزوێن

**٢٧٧٩-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلَّا يَوْمٌ لَطَوَّلَهُ اللَّهُ ﷻ حَتَّى يَمْلِكَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي، يَمْلِكُ جَبَلَ الدَّيْلَمِ وَالْقُسْطَنْطِينِيَّةَ»[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دونیا تەنها یەک ڕۆژی مابێ، خوا ﷻ ئەو ڕۆژە درێژ دەکاتەوە هەتاکو پیاوێک لە ئال و بەیتی من دەبێتە خاوەن و دەسەڵاتداری کێوی دەیلەم و شاری قوستەنتینیە.

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) ضعيف. أخرجه الترمذي بإثر: ٢٢٣١.




**٢٧٨٠-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمُ الْآفَاقُ، وَسَتُفْتَحُ عَلَيْكُمْ مَدِينَةٌ يُقَالُ لَهَا قَزْوِينُ، مَنْ رَابَطَ فِيهَا أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، كَانَ لَهُ فِي الْجَنَّةِ عَمُودٌ مِنْ ذَهَبٍ، عَلَيْهِ زَبَرْجَدَةٌ خَضْرَاءُ، عَلَيْهَا قُبَّةٌ مِنْ يَاقُوتَةٍ حَمْرَاءَ، لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ مِصْرَاعٍ مِنْ ذَهَبٍ، عَلَى كُلِّ مِصْرَاعٍ زَوْجَةٌ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە چوار دەوری دونیادا شوێنەکان ڕزگار دەکەن، وە شارێک ڕزگار دەکەن پێی دەڵێن: قەزوێن، هەر کەسێک چل ڕۆژ یان چل شەو لەو شارەدا پارێزگاری و پاسەوانی بکات، لە بەهەشتدا شوێنێکی پێ دەدرێ کە پایەکەی لە زێڕە، بەردی گرانبەهای سەوزی بەسەرەوەیەو گومەتێکی لەسەرە کە لە یاقووتی سوورەو حەفتا هەزار دەرچەی ئاڵتونی هەیە، کە لەسەر هەر دەرچەیەک حۆرییەک هەیە.

## بابەت: ئەو پیاوەی دەچێ بۆ جیهادو دایک و باوکی لە ژیان ماون

**٢٧٨١-** عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ جَاهِمَةَ السُّلَمِيِّ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي كُنْتُ أَرَدْتُ الْجِهَادَ مَعَكَ أَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ، قَالَ: «وَيْحَكَ، أَحَيَّةٌ أُمُّكَ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «ارْجِعْ فَبَرَّهَا» ثُمَّ أَتَيْتُهُ مِنَ الْجَانِبِ الْآخَرِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي كُنْتُ أَرَدْتُ الْجِهَادَ مَعَكَ، أَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ، قَالَ: «وَيْحَكَ، أَحَيَّةٌ أُمُّكَ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «فَارْجِعْ إِلَيْهَا فَبَرَّهَا» ثُمَّ أَتَيْتُهُ مِنْ أَمَامِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي كُنْتُ أَرَدْتُ الْجِهَادَ مَعَكَ، أَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ، قَالَ: «وَيْحَكَ، أَحَيَّةٌ أُمُّكَ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «وَيْحَكَ، الْزَمْ رِجْلَهَا، فَثَمَّ الْجَنَّةُ»(٢).

واتە: موعاویەی کوڕی جاهیمەی سولەمیی ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەمەوێ جیهاد بکەم لەگەڵ تۆدا، مەبەستم تەنها ڕەزامەندی خواو ڕۆژی دواییە، فەرمووی: هاوار بۆ تۆ دایکت زیندووە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: بگەڕێوە خزمەتی ئەو بکە، پاشان لە لایەکی ترەوە هاتمەوە و

---

(١) موضوع.

(٢) صحيح. أخرجه النسائي: ٣١٠٤.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەمەوێ جیهاد بکەم لەگەڵ تۆدا کە مەبەستم تەنها ڕەزامەندی خواو ڕۆژی دواییە، فەرمووی: هاوار بۆ تۆ! ئەدی دایکت زیندووە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: بگەڕێوە خزمەتی ئەو بکە، پاشان لە پێشیەوە هاتم و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەمەوێ جیهاد بکەم لەگەڵ تۆدا کە مەبەستم تەنها ڕەزامەندی خواو بە دەستهێنانی ڕۆژی دواییە، فەرمووی: هاوار بۆ تۆ! ئەی دایکت ماوە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: لەبەر پێی دایکت بە (خزمەتی بکە)، چونکە بەهەشت لەوێیە.

**٢٧٨١م-** حَدَّثَنَا هَارُونُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْحَمَّالُ قَالَ: حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بْنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، عَنْ أَبِيهِ طَلْحَةَ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ جَاهِمَةَ السُّلَمِيِّ، أَنَّ جَاهِمَةَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ نَحْوَهُ قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ بْنُ مَاجَةَ: «هَذَا جَاهِمَةُ بْنُ عَبَّاسِ بْنِ مِرْدَاسٍ السُّلَمِيُّ الَّذِي عَاتَبَ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ»[1].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

**٢٧٨٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: أَتَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي جِئْتُ أُرِيدُ الْجِهَادَ مَعَكَ، أَبْتَغِي وَجْهَ اللَّهِ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ، وَلَقَدْ أَتَيْتُ وَإِنَّ وَالِدَيَّ لَيَبْكِيَانِ، قَالَ: «فَارْجِعْ إِلَيْهِمَا، فَأَضْحِكْهُمَا كَمَا أَبْكَيْتَهُمَا»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووم لەگەڵ تۆدا بێم بۆ جیهاد لە پێناوی خواو بە دەستهێنانی دوارِۆژ، لەکاتێکدا کە هاتووم دایک و باوکم دەگریان، فەرمووی: بگەڕێوە بۆ لایان و پێکەنینیان بۆ بگێڕەوە، هەروەک چۆن گریاندووتن.

## بابەت: نیەت لە جەنگ و جیهاددا

**٢٧٨٣-** عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[3].

---

(١) حسن. أخرجه النسائي: ٣١٠٤.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٠٤، ومسلم: ٢٥٤٩، وأبو داود: ٢٥٢٩، والترمذي: ١٦٧١، والنسائي: ٣١٠٣.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ١٢٣، ومسلم: ١٩٠٤، وأبو داود: ٢٥١٧ و ٢٥١٨، والترمذي: ١٦٤٦، والنسائي: ٣١٣٦.

واتە: ئەبو موسا ﷺ دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی پیاوێک کە بۆ ئەوەی پێی بگوترێ ئازایە شەڕ دەکات، وە کەسێک لەبەر دەمارگیری خزمایەتی شەڕ دەکات و کەسێک بە ڕووپامایی (ڕیا) شەڕ دەکات، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک بۆ ئەوە بجەنگێ کە بەرنامەی خوا سەرکەوێ، (ئەو جەنگانە) لە پێناو خوایە.

٢٧٨٤- عَنْ أَبِي عُقْبَةَ ﷺ، وَكَانَ مَوْلًى لِأَهْلِ فَارِسَ، قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ فَضَرَبْتُ رَجُلًا مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَقُلْتُ: خُذْهَا مِنِّي وَأَنَا الْغُلَامُ الْفَارِسِيُّ، فَبَلَغَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «أَلَا قُلْتَ: خُذْهَا مِنِّي وَأَنَا الْغُلَامُ الْأَنْصَارِيُّ»[١].

واتە: ئەبو عوقبە ﷺ کە لاوێکی خەڵکی فارس بوو، دەڵێ: لە جەنگی ئوحوددا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئامادەبووم، منیش لە گەردنی موشریکێکم دا و گوتم: بگرە لە دەستم کە من لاوێکی فارسیم، ئنجا ئەو هەواڵە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە، ئەویش فەرمووی: بۆ نەتگوت: بگرە لە دەستم کە من غوڵامێکی ئەنصاڕیم!!

٢٧٨٥- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ غَازِيَةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُصِيبُوا غَنِيمَةً، إِلَّا تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أَجْرِهِمْ. فَإِنْ لَمْ يُصِيبُوا غَنِيمَةً تَمَّ لَهُمْ أَجْرُهُمْ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کۆمەڵە جەنگاوەرێک بچنە غەزا، ئنجا غەنیمەت بە دەست بێنن ئەوا بێگومان دوو لەسەر سێی پاداشتیان وەرگرتووە (پێش قیامەت)، خۆ ئەگەر هیچ غەنیمەتیان دەست نەکەوت (لە قیامەتدا) هەموو پاداشتەکەیان بە تەواوی پێدەدرێتەوە.

## بابەت: بەخێوکردن و ئامادەکردنی ئەسپ بۆ جیهاد لە پێناو خوا

٢٧٨٦- عَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْخَيْرُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِي الْخَيْلِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[٣].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٥١٢٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٠٦، وأبو داود: ٢٤٩٧، والنسائي: ٣١٢٥.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٥٠، ومسلم: ١٨٧٣، والترمذي: ١٦٩٤، والنسائي: ٣٥٧٤_٣٥٧٧.

**واتە: عوڕوەی باریقیی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خێر و چاکە بە پێشەسەر (یاڵ)ـی ئەسپەوە پیوەستە تاکو ڕۆژی دوایی (مەبەستی ئەوەیە کە هۆکارە بۆ دەستخستنی خێر و پاداشت).**

**٢٧٨٧-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «الْخَيْلُ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەسپ خێر و چاکەی بە نێوچاوانەوەیە تاکو ڕۆژی دوایی.**

**٢٧٨٨-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْخَيْلُ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ - أَوْ قَالَ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ، قَالَ سُهَيْلٌ: أَنَا أَشُكُّ الْخَيْرُ - إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. الْخَيْلُ ثَلَاثَةٌ: فَهِيَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ، وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ. فَأَمَّا الَّذِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ فَالرَّجُلُ يَتَّخِذُهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَيُعِدُّهَا، فَلَا تُغَيِّبُ شَيْئًا فِي بُطُونِهَا إِلَّا كُتِبَ لَهُ أَجْرٌ، وَلَوْ رَعَاهَا فِي مَرْجٍ، مَا أَكَلَتْ شَيْئًا إِلَّا كُتِبَ لَهُ بِهَا أَجْرٌ، وَلَوْ سَقَاهَا مِنْ نَهَرٍ جَارٍ كَانَ لَهُ بِكُلِّ قَطْرَةٍ تُغَيِّبُهَا فِي بُطُونِهَا أَجْرٌ، - حَتَّى ذَكَرَ الْأَجْرَ فِي أَبْوَالِهَا وَأَرْوَاثِهَا - وَلَوِ اسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ، كُتِبَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ تَخْطُوهَا أَجْرٌ. وَأَمَّا الَّذِي هِيَ لَهُ سِتْرٌ، فَالرَّجُلُ يَتَّخِذُهَا تَكَرُّمًا وَتَجَمُّلًا وَلَا يَنْسَى حَقَّ ظُهُورِهَا وَبُطُونِهَا فِي عُسْرِهَا وَيُسْرِهَا. وَأَمَّا الَّذِي هِيَ عَلَيْهِ وِزْرٌ، فَالَّذِي يَتَّخِذُهَا أَشَرًا وَبَطَرًا وَبَذَخًا وَرِيَاءَ النَّاسِ، فَذَلِكَ الَّذِي هِيَ عَلَيْهِ وِزْرٌ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەسپ خێر و پاداشتی بە نێوچاوانەوەیە، یان فەرمووی: وڵاخەبەرزە خێر و پاداشتی بە پێشە سەرەوە بەستراوە تاکو ڕۆژی قیامەت، وڵاخە بەرزە سێ جۆرە: یان خێر و بێرە بۆ پیاو، یان داپۆشەری حاڵییەتی، یان دەبێتە مایەی شەڕ و تاوان بۆی، جا ئەو کەسەی کە بۆی دەبێتە مایەی خێر ئەو پیاوەیە کە لە پێناوی خوادا ڕایدەگرێ و ئامادەی دەکات بۆ جەنگ و جیهاد، ئنجا هەرچی بیخوات بۆ خاوەنەکەی بە پاداشت هەژمار دەکرێ، خۆ ئەگەر لە لەوەڕگەیەک بیلەوەڕێنێ بە خواردنی هەر شتێک پاداشتی بۆ دەنووسرێ، ئەگەر ئاوی بدات لە ڕوبارێک، بە خواردنەوەی هەر دڵۆپە ئاوێک پاداشتی بۆ دەنووسرێ،**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٤٩، ومسلم: ١٨٧١، والنسائي: ٣٥٧٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٧١، ومسلم: ٩٨٧، والترمذي: ١٦٣٦، والنسائي: ٣٥٦٢ و ٣٥٦٣ و ٣٥٨٢.

هەتا باسی پاداشتی میزو پاشەڕۆیەکەشی کرد، خۆ ئەگەر غارێک بکات بە هەر هەنگاوێک چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ، ئەو کەسەش کە بۆی وەکو داپۆشەرێک وایە ئەو پیاوەیە کە بۆ خۆی ڕایدەگرێ و سودی لێ دەبینێ بۆ شکۆ و جوانی و بە پێی تواناش ئەو مافەی لەسەریەتی، لەبیری ناچێ و دەیدات لە سواربوون و ئالیک پێدانی لە خۆشی و ناخۆشیدا، ئەوەشی کە بۆی دەبێتە مایەی شەڕ ئەو کەسەیە کە بۆ فیز و خۆ بە زل زانین و شانازی و ڕیایی کردن بەسەر خەڵکدا ڕایدەگرێ، بۆ ئەو کەسە مایەی شەڕ و تاوانە.

**٢٧٨٩- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ الْخَيْلِ الْأَدْهَمُ، الْأَقْرَحُ، الْمُحَجَّلُ، الْأَرْثَمُ طَلْقُ الْيَدِ الْيُمْنَى، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَدْهَمَ فَكُمَيْتٌ عَلَى هَذِهِ الشِّيَةِ»[1].**

**واتە: ئەبو قەتادەی ئەنصاریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین ئەسپ ئەوەیە کە ڕەشی تێر بێت و قەشان بێت (نێوچاوانی کەمێک سپی بێت) چوار پەلی سپی بێت و لمبۆزی سپی بێت، پەلی ڕاستی سپی نەبێ، ئەگەر ڕەشی تێر نەبوو، با ڕەنگێک بێ کە لەنێوان ڕەش و سوردا بێ.**

**٢٧٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ، يَكْرَهُ الشِّكَالَ مِنَ الْخَيْلِ»[2].**

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خۆشی لە ئەسپی شیکال نەدەهات.**

**الشیکال: واتە پێی ڕاستی و دەستی چەپی سپییەتی تێدابێ، یان دەستی ڕاستی و پێی چەپی سپییەتی تێدابێ.**

**٢٧٩١- عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ ارْتَبَطَ فَرَسًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، ثُمَّ عَالَجَ عَلَفَهُ بِيَدِهِ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ حَبَّةٍ حَسَنَةٌ»[3].**

---

(١) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٩٦ و ١٦٩٧.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٧٥، وأبو داود: ٢٥٤٧، والترمذي: ١٦٩٨، والنسائي: ٣٥٦٦.

(٣) حسن.

واتە: تەمیمی داریی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک ئەسپێک (وڵاخە بەرزەیەک) بەخێو بکات و ئامادەی بکات لە پێناوی خوادا، پاشان بۆ خۆی لەوەڕ و پەلخوری بە دەستی خۆی پێبدات، بۆ هەر دەنکە دانەوێڵەیەک کە پێی دەدات چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ.

## بابەت: جەنگکردن لە پێناوی خوای پاک و بێگەردو بەرز

**٢٧٩٢-** عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ فُوَاقَ نَاقَةٍ، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ»(١).

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە، دەیفەرموو: هەر مسوڵمانێک بە ئەندازەی دۆشینی وشترێک لە پێناوی خوا بجەنگێ، بەهەشتی بۆ پێویست دەبێ.

**٢٧٩٣-** عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: حَضَرْتُ حَرْبًا فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ:

«يَا نَفْسِ أَلَا أَرَاكِ تَكْرَهِينَ الْجَنَّهْ، أَحْلِفُ بِاللَّهِ لَتَنْزِلِنَّهْ طَائِعَةً أَوْ لَتُكْرَهِنَّهْ»(٢).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: لە جەنگێکدا لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ئامادە بووم، جا (عەبدوڵڵا) گوتی:

ئەی نەفسەکەم دەتبینم بەهەشتت پێ خۆش نیە ... سوێند بە خوا دەبێ بچیتێ بە خۆشی یان ناخۆشی.

(مەبەستی هۆکاری چوونە بەهەشتە، کە بریتیە لە جەنگان لە پێناوی خواو شەهید بوون لەو ڕێگەیەدا).

**٢٧٩٤-** عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «مَنْ أُهَرِيقَ دَمُهُ وَعُقِرَ جَوَادُهُ»(٣).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٤١، والترمذي: ١٦٥٧، والنسائي: ٣١٤١.

(٢) حسن.

(٣) صحيح لغيره.

**واتە: عەمری کوڕی عەبەسە ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین جیهاد کامەیە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە کەسێک خوێنی بڕژێ و ئەسپەکەی بریندار بێ.**

**٢٧٩٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مَجْرُوحٍ يُجْرَحُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُجْرَحُ فِي سَبِيلِهِ، إِلَّا جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَجُرْحُهُ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ جُرِحَ، اللَّوْنُ لَوْنُ دَمٍ، وَالرِّيحُ رِيحُ مِسْكٍ»[1].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر برینداریێک کە لە پێناوی خوادا بریندار بووبێ، کە هەر خوا خۆی دەزانێ کێ لە پێناویدا بریندار دەبێ، بێگومان ئەو کەسە ڕۆژی قیامەت دێ لە حاڵێکدا کە شێوەی برینەکەی وەکو ئەو ڕۆژەیە کە تێیدا بریندار بووە، ڕەنگی ڕەنگی خوێنە و بۆنیشی بۆنی میسکە.**

**٢٧٩٦-** عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ، يَقُولُ: دَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْأَحْزَابِ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، سَرِيعَ الْحِسَابِ، اهْزِمِ الْأَحْزَابَ، اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ»[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای کرد لە کۆمەڵی بێبڕوایان و فەرمووی: خودایە ئەی ئەو زاتەی دابەزێنەری قوڕئانیت و حیساب و لێ پێچینەوەت دەست بەجێیە، تێکشکێنەری چین و کۆمەڵەکان، خودایە تێکیان بشکێنە و لەرزەو ترس بخە ناویان.**

**٢٧٩٧-** عَنْ سَهْل بْن أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ، حَدَّثَهُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ مِنْ قَلْبِهِ، بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ، وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ»[3].

**واتە: سەهلی کوڕی ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفەوە لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە ڕاستی لە دڵییەوە داوای شەهید بوون لە خوا بکات، خوا دەیگەیەنێ بە پلەی شەهیدەکان، ئەگەر لەسەر جێگاکەشی (لە ماڵی خۆی) بمرێ.**

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٧، ومسلم: ١٨٧٦، والترمذي: ١٦٥٧، والنسائي: ٣١٤٦ و ٣١٥١.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٣٣، ومسلم: ١٧٤٢، وأبو داود: ٢٦٣١، والترمذي: ١٦٧٨.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩٠٩، وأبو داود: ١٥٢٠، والترمذي: ١٦٥٣، والنسائي: ٣١٦٢.

## بابەت: گەورەیی شەهید بوون لە پێناوی خوادا

٢٧٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ذُكِرَ الشُّهَدَاءُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «لَا تَجِفُّ الْأَرْضُ مِنْ دَمِ الشَّهِيدِ حَتَّى تَبْتَدِرَهُ زَوْجَتَاهُ، كَأَنَّهُمَا ظِئْرَانِ أَضَلَّتَا فَصِيلَيْهِمَا فِي بَرَاحٍ مِنَ الْأَرْضِ، وَفِي يَدِ كُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا حُلَّةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ و دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ باسی شەهیدەكان كرا، ئەویش فەرمووی: خوێنی شەهید لەسەر زەوی وشك نابێتەوە هەتاكو دوو هاوسەری حۆری پەلە دەكەن بۆ لای هەر وەكو ئەو شیردەرەی كە شیرەخۆرەكەی لە دەشتێكی چۆل لێ ون بووە، وە هەر یەكێكیان خشڵێكی لە دەستدایە كە لە دونیا و ئەوەشی لە دونیادایە باشترە.

٢٧٩٩- عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لِلشَّهِيدِ عِنْدَ اللَّهِ سِتُّ خِصَالٍ: يَغْفِرُ لَهُ فِي أَوَّلِ دُفْعَةٍ مِنْ دَمِهِ، وَيُرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَيُجَارُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَيَأْمَنُ مِنَ الْفَزَعِ الْأَكْبَرِ، وَيُحَلَّى حُلَّةَ الْإِيمَانِ، وَيُزَوَّجُ مِنَ الْحُورِ الْعِينِ، وَيُشَفَّعُ فِي سَبْعِينَ إِنْسَانًا مِنْ أَقَارِبِهِ»[٢].

واتە: میقدامی كوڕی مەعدیكەریب ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەهید شەش تایبەتمەندی لەلای خوا هەیە، لەگەڵ یەكەم دڵۆپی خوێنی كە لێی دەڕژێ خوا لێی خۆش دەبێ، وە شوێنی خۆی لە بەهەشتدا پیشان دەدرێ، وە لە سزای گۆڕ دەپارێزرێ، وە لە ترس و لەرزی گەورەی ڕۆژی قیامەت دەپارێزرێ، وە دەڕازێنرێتەوە بە نیشانە ڕازاوەكانی ئیمان، وە حۆری بەهەشتی لێ مارە دەكرێ، وە تكا و شەفاعەت بۆ حەفتا كەس لە خزمەكانی پێدەدرێ.

٢٨٠٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: لَمَّا قُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ حَرَامٍ يَوْمَ أُحُدٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا جَابِرُ، أَلَا أُخْبِرُكَ مَا قَالَ اللَّهُ ﷻ لِأَبِيكَ؟» قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: «مَا كَلَّمَ اللَّهُ أَحَدًا إِلَّا مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ، وَكَلَّمَ أَبَاكَ كِفَاحًا فَقَالَ: يَا عَبْدِي، تَمَنَّ عَلَيَّ أُعْطِكَ، قَالَ: يَا رَبِّ، تُحْيِينِي فَأُقْتَلُ فِيكَ ثَانِيَةً، قَالَ: إِنَّهُ سَبَقَ مِنِّي أَنَّهُمْ إِلَيْهَا لَا يُرْجَعُونَ. قَالَ: يَا رَبِّ، فَأَبْلِغْ مَنْ وَرَائِي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًا ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران» الْآيَةَ كُلَّهَا[٣].

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٦٦٣.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٠١٠.

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: کاتێک کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەڕام کوژرا لە غەزای ئوحود، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی جابیر پێ، نەڵێم خوا ﷻ چی بە باوکت فەرموو؟ گوتم: بەڵی پێم بڵێ، فەرمووی: بێگومان خوا لەگەڵ هیچ کەسێک بەبێ پەردە قسەی نەکردوە، بەڵام لەگەڵ باوکتدا ڕووبەڕوو قسەی کرد و پێی فەرموو: بەندەکەم داوا بکە و خۆزگە بخوازە تاکو پێتی بدەم، (باوکیشت) گوتی: ئەی پەروەردگارا زیندووم بکەوە تاکو بۆ دووەم جار لە پێناوی تۆدا بکوژرێمەوە، (خوا) پێی فەرموو: من بڕیارم داوە کە کەس بۆ دونیا ناگەڕێتەوە دوای مردن، گوتی: ئەی پەروەردگارا هەواڵ بدە بەوانەی لە دوای من ماون لە دونیا، ئنجا خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند تا کۆتایی: ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَاۢ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران، واتە: هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی کە کوژران لەڕێی خوادا مردوون (نەخێر وانیە). تاکو کۆتایی ئایەتەکە.

٢٨٠١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَاۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران، قَالَ: أَمَا إِنَّا سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «أَرْوَاحُهُمْ كَطَيْرٍ خُضْرٍ تَسْرَحُ فِي الْجَنَّةِ فِي أَيِّهَا شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إِلَى قَنَادِيلَ مُعَلَّقَةٍ بِالْعَرْشِ، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ، إِذِ اطَّلَعَ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ اطِّلَاعَةً، فَيَقُولُ: سَلُونِي مَا شِئْتُمْ، قَالُوا: رَبَّنَا، مَاذَا نَسْأَلُكَ وَنَحْنُ نَسْرَحُ فِي الْجَنَّةِ فِي أَيِّهَا شِئْنَا؟ فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَا يُتْرَكُونَ مِنْ أَنْ يَسْأَلُوا، قَالُوا: نَسْأَلُكَ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا إِلَى الدُّنْيَا حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ، فَلَمَّا رَأَى أَنَّهُمْ لَا يَسْأَلُونَ إِلَّا ذَلِكَ، تُرِكُوا»[1].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەربارەی ئەو ئایەتە: ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَاۢۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران، واتە: هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی کە کوژران لەڕێی خوادا مردوون (نەخێر وانیە) بەڵکو ئەوانە زیندوون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن، گوتی: بەڵام بۆ ڕاڤەی ئەو ئایەتە پرسیارمان کرد (لە پێغەمبەر ﷺ)، ئەویش فەرمووی: ڕووحی شەهیدەکان وەکو باڵندەیەکی سەوز لە ناو بەهەشتدا دێن و دەچن بە ئاسودەیی، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ چراخانێک کە بە عەرشەوە هەڵواسراوە، جا لەو کاتەدا کە ئەوان لەو حاڵەدان پەروەردگارت تەماشایان دەکات و دەفەرموێ: چیتان

---

(١) صحیح. أخرجه مسلم: ١٨٨٧، والترمذي: ٣٠١١.

پێ خۆشە لێم داوا بکەن، ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگارا جا داوای چی بکەین لە کاتێکدا کە ئێمە لەناو بەهەشتدا بە ئارەزووی خۆمان دێین و دەچین؟ جا کاتێک دەبینن کە وازیان لێ ناهێنرێ تا داوا نەکەن، دەڵێن: داوات لێ دەکەین کەوا ڕووحمان بەبەر لاشەماندا بکەیتەوە و بمانگێڕیەوە بۆ دونیا تاکو بجەنگین لە پێناوتدا، جا کاتێک خوا دەبینێ کە تەنها داوای ئەوە دەکەن وازیان لێ دەهێنرێ (لە پرسیار لێکردن).

٢٨٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا يَجِدُ الشَّهِيدُ مَسَّ الْقَتْلِ، إِلَّا كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمْ مِنَ الْقَرْصَةِ»[1].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک کەسێک شەهید دەبێ ئازاری کوشتنەکەی تەنها ئەوەندەیە کە یەکێک لە ئێوە مێروولەیەک بیگەزێ.

## بابەت: ئەوانەی ئومێد دەکرێ بە شەهید هەژمار بکرێن

٢٨٠٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّهُ مَرِضَ فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُهُ، فَقَالَ قَائِلٌ مِنْ أَهْلِهِ: إِنْ كُنَّا لَنَرْجُو أَنْ تَكُونَ وَفَاتُهُ قَتْلَ شَهَادَةٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ شُهَدَاءَ أُمَّتِي إِذًا لَقَلِيلٌ، الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ شَهَادَةٌ، وَالْمَطْعُونُ شَهَادَةٌ، وَالْمَرْأَةُ تَمُوتُ بِجُمْعٍ شَهَادَةٌ - يَعْنِي الْحَامِلَ -، وَالْغَرِقُ، وَالْحَرِقُ وَالْمَجْنُوبُ، - يَعْنِي ذَاتَ الْجَنْبِ - شَهَادَةٌ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جابیری کوڕی عەتیک لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە نەخۆش کەوتووە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ بە سەردان هاتۆتە لای، یەکێک لە بنەماڵەکەی گوتی: ئێمە ئومێدمان وابوو کە مردنەکەی بۆ بە شەهیدی هەژمار بکرێ، وەک ئەو کەسەی کە لە پێناو خوادا دەکوژرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر وابێ (تەنها کەسێک لە ڕێگەی خوادا بکوژرێ بە شەهید هەژمار بکرێ)، شەهیدی ئوممەتی من کەم دەبن، (بەڵام) ئەوەی لە ڕێگەی خوا بکوژرێ شەهیدە، ئەوەی بە نەخۆشی تاعون بمرێ شەهیدە، ئەو ئافرەتەی لەسەر منداڵ دەمرێ شەهیدە، ئەوەی بخنکێت و بسوتێت و بە نەخۆشی سیل بمرێ شەهیدە.

---

(١) حسن لغيره. أخرجه الترمذي: ١٦٦٨، والنسائي: ٣١٦١.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣١١١، والنسائي: ١٨٤٦.

٢٨٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَا تَقُولُونَ فِي الشَّهِيدِ فِيكُمْ؟» قَالُوا: الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ. قَالَ: «إِنَّ شُهَدَاءَ أُمَّتِي إِذًا لَقَلِيلٌ، مَنْ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ مَاتَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَالْمَبْطُونُ شَهِيدٌ، وَالْمَطْعُونُ شَهِيدٌ» قَالَ سُهَيْلٌ: وَأَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مِقْسَمٍ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، وَزَادَ فِيهِ: «وَالْغَرِقُ شَهِيدٌ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئێوە لە ناو خۆتاندا دەربارەی شەهیدی چی دەڵێن؟ گوتیان: ئەو کەسەیە کە لە پێناوی خوا بکوژرێ، فەرمووی: ئەگەر ئاوا بێ، کەواتە شەهیدەکانی ئوممەتی من کەمن، هەر کەسێک لە پێناوی خوادا بکوژرێ شەهیدە، ئەوەشی لە پێناوی خوادا بمرێ شەهیدە، ئەوەی بە سک ئێشەش بمرێ شەهیدە، ئەوەشی بە تاعون بمرێ شەهیدە، سوهەیل گوتی: عوبەیدوڵڵای کوڕی میقسەم لە ئەبو صاڵیحەوە بۆی گێڕامەوە و ئەوەشی زیاد کرد: ئەوەی کە بخنکێ ئەویش شەهیدە.

## بابەت: چەک

٢٨٠٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ الْمِغْفَرُ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو شاری مەککە لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا کڵاوێکی زرێی لەسەر بوو.

٢٨٠٦- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ أَخَذَ دِرْعَيْنِ، كَأَنَّهُ ظَاهَرَ بَيْنَهُمَا»[٣].

واتە: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا دوو زرێی لەسەر یەک لەبەرکردبوو.

٢٨٠٧- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ حَبِيبٍ ﷺ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى أَبِي أُمَامَةَ، فَرَأَى فِي سُيُوفِنَا شَيْئًا مِنْ حِلْيَةِ فِضَّةٍ فَغَضِبَ وَقَالَ: «لَقَدْ فَتَحَ الْفُتُوحَ قَوْمٌ مَا كَانَ حِلْيَةُ سُيُوفِهِمْ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَلَكِنِ الْآنُكُ وَالْحَدِيدُ وَالْعَلَابِيُّ» قَالَ أَبُو الْحَسَنِ الْقَطَّانُ: الْعَلَابِيُّ: الْعَصَبُ[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩١٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ١٨٤٦، ومسلم: ١٣٥٧، وأبو داود: ٢٦٨٥، والترمذي: ١٦٩٣، والنسائي: ٢٨٦٧ و ٢٨٦٨.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٩٠ بنحوه.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٠٩.

واتە: سولەیمانی کوڕی حەبیب ﷺ دەڵێ: چووینە لای ئەبو ئومامە، ئەویش بینی کە هەندێک لە شمشێرەکانمان بە زیو ڕووکەش کرابوو، جا توڕە بو و گوتی: لە ڕاستیدا خەڵکانێک چەند شوێنیان ئازاد کرد، کە شمشێرەکانیان هیچ بە زێڕ و زیو ڕووکەش نەکرابوو، بەڵکو تەنها ڕووکەشی شمشێرەکانیان قوڕقوشم و ئاسن و شاڕەگی ملی وشتر و سیرمە بوو. ئەبو حەسەنی قەتانی گوتی: (العلابي): شادەمار و شاڕەگە.

**٢٨٠٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَنَفَّلَ سَيْفَهُ ذَا الْفَقَارِ يَوْمَ بَدْرٍ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەنگی بەدردا شمشێرەکەی کە «ذو الفقار» بوو بە سەربەش وەرگرت.

**٢٨٠٩-** عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ إِذَا غَزَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ حَمَلَ مَعَهُ رُمْحًا، فَإِذَا رَجَعَ طَرَحَ رُمْحَهُ حَتَّى يُحْمَلَ لَهُ، فَقَالَ لَهُ عَلِيٌّ: لَأَذْكُرَنَّ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «لَا تَفْعَلْ، فَإِنَّكَ إِنْ فَعَلْتَ لَمْ تُرْفَعْ ضَالَّةٌ»[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێ: موغیرەی کوڕی شوعبە کاتێک دەچوو بۆ غەزا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕمەکەی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت، جا کاتێک دەگەڕایەوە ڕمەکەی فڕێدەدا هەتا بۆی هەڵبگرن و دواتر بیدەنەوە، ئنجا عەلی پێی گوت: ئەو شتە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس دەکەم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ (بە موغیرەی) فەرمووو: ئەو کارە مەکە، چونکە ئەگەر هەڵیانگرتەوە، وەکو ونبوو هەژمار ناکرێ و بۆت ناگەڕێنرێتەوە (چونکە بە ئەنقەست فڕێی داوە).

**٢٨١٠-** عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: كَانَتْ بِيَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَوْسٌ عَرَبِيَّةٌ، فَرَأَى رَجُلًا بِيَدِهِ قَوْسٌ فَارِسِيَّةٌ، فَقَالَ: «مَا هَذِهِ؟ أَلْقِهَا، وَعَلَيْكُمْ بِهَذِهِ وَأَشْبَاهِهَا، وَرِمَاحِ الْقَنَا، فَإِنَّهُمَا يَزِيدُ اللَّهُ لَكُمْ بِهِمَا فِي الدِّينِ، وَيُمَكِّنُ لَكُمْ فِي الْبِلَادِ»[٣].

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي بإثر: ١٥٦١.

(٢) حسن.

(٣) ضعيف الإسناد.

واتە: عەلی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کەوانێکی عەرەبی بەدەستەوەبوو، ئنجا پیاوێکی بینی کە کەوانێکی فارسی بەدەستەوەبوو (دیارە جۆرەکەی جیاواز بووە)، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە چییە؟ فڕێی بدە، ئەوەو وێنەی ئەو جۆرە بەکاربێنن لەگەڵ ڕمی قینا (جۆرێکە لە چەکی ئەوکات)، چونکە بە دڵنیاییەوە بەو دووانە خوا هێزی زیادەتان پێدەدات بۆ دین، وە دامەزراوتان دەکات لە وڵاتاندا.

## بابەت: تیر هاویشتن لە ڕێگەی خوادا

٢٨١١- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَيُدْخِلُ بِالسَّهْمِ الْوَاحِدِ الثَّلَاثَةَ الْجَنَّةَ: صَانِعَهُ يَحْتَسِبُ فِي صَنْعَتِهِ الْخَيْرَ، وَالرَّامِيَ بِهِ، وَالْمُمِدَّ بِهِ» وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ارْمُوا وَارْكَبُوا، وَأَنْ تَرْمُوا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ تَرْكَبُوا، وَكُلُّ مَا يَلْهُو بِهِ الْمَرْءُ الْمُسْلِمُ بَاطِلٌ، إِلَّا رَمْيَهُ بِقَوْسِهِ، وَتَأْدِيبَهُ فَرَسَهُ، وَمُلَاعَبَتَهُ امْرَأَتَهُ، فَإِنَّهُنَّ مِنَ الْحَقِّ»[1].

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە یەک تیر کە کەسێک دەیهاوێژێ لە جەنگدا خوا سێ کەس دەباتە بەهەشت: ئەوەی کە لەبەر خاتری خوا دروستی کردوەو نیەتی خێری هەبووە، ئەوەشی کە دەیهاوێژێ، ئەوەشی کە تیر دەداتە هاوڕێکەی بۆ هاویشتن، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فێری ڕەمی و تیرهاویشتن و سواری ببن، خۆ ئەگەر تیرهاوێژی بکەن من لەلام خۆشەویستترە لە سواری، وە هەر گاڵتە و یارییەک مرۆڤ بیکات بە گاڵتە و هیچ هەژمار دەکرێ تەنها تیرهاوێژی و ڕاهێنانی ئەسپەکەی و گاڵتەکردن لەگەڵ خێزانەکەی نەبێ، چونکە بێگومان ئەوانە لە هەق و مافەکانن.

٢٨١٢- عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ رَمَى الْعَدُوَّ بِسَهْمٍ، فَبَلَغَ سَهْمُهُ الْعَدُوَّ، أَصَابَ أَوْ أَخْطَأَ، فَعَدْلُ رَقَبَةٍ»[2].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٥١٣، والترمذي: ١٦٣٧، والنسائي: ٣١٤٦ و ٣٥٧٨.

(٢) صحيح. أخرجه أبو داود: ٣٩٦٥، والترمذي: ١٦٣٨، والنسائي: ٣١٤٣.

واتە: عەمری کوڕی عەبەسە ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: هەر کەسێک تیرێک بگرێتە دوژمن و بگاتە دوژمنەکەی، بیپێکێ، یان نەیپێکێ، وەکو ئەوە وایە کۆیلەیەکی ئازاد کردبێ.

٢٨١٣- عَنْ أَبِي عَلِيٍّ الْهَمْدَانِيِّ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ الْجُهَنِيَّ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ عَلَى الْمِنْبَرِ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ﴿٦٠﴾﴾ الأنفال، «أَلَا وَإِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[١].

واتە: ئەبو عەلی هەمەدانیی ﷺ دەگێڕێتەوە گوێی لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی بووە، دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، لەسەر مینبەر ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ﴿٦٠﴾﴾ الأنفال، واتە: (ئەی ئیمانداران) ئامادەی بکەن بۆیان ئەوەی لەتواناتاندا هەیە لەهێز. ئنجا سێ جار فەرمووی: ئاگاداربن هێز کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، مەبەستی پێ لە تیرهاوێژییە.

٢٨١٤- عَنْ عُقْبَةَ بْن عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَعَلَّمَ الرَّمْيَ ثُمَّ تَرَكَهُ فَقَدْ عَصَانِي»[٢].

واتە: عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیی ﷺ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: هەر کەسێک خۆی فێری تیرهاوێژی بکات، پاشان لە بیر خۆی بباتەوە، ئەوە سەرپێچی منی کردوە.

٢٨١٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِنَفَرٍ يَرْمُونَ فَقَالَ: «رَمْيًا بَنِي إِسْمَاعِيلَ فَإِنَّ أَبَاكُمْ كَانَ رَامِيًا»[٣].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە لای چەند کەسێکدا تێپەڕی تیرهاوێژییان دەکرد، جا فەرمووی: تیرهاوێژی بکەن ئەی نەوەی ئیسماعیل، چونکە بەڕاستی باوانتان تیرهاوێژ بوو.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٩١٧، وأبو داود: ٢٥١٤، والترمذي: ٣٠٨٣.

(٢) صحيح بلفظ: «فَلَيْسَ مِنَّا».

(٣) صحيح.

## بابەت: ئاڵا و بەیداخ

**٢٨١٦-** عَنِ الْحَارِثِ بْنِ حَسَّانَ ﷺ، قَالَ: «قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَائِمًا عَلَى الْمِنْبَرِ، وَبِلَالٌ قَائِمٌ بَيْنَ يَدَيْهِ مُتَقَلِّدٌ سَيْفًا، وَإِذَا رَايَةٌ سَوْدَاءُ» فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ، قَدِمَ مِنْ غَزَاةٍ»(١).

**واتە: لە حاریسی کوڕی حەسانەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: هاتمە مەدینە بینیم پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوانگە وەستاوە بیلالیش لەبەردەمیدا ڕاوەستاوە و شمشێرەکەی بەملیەوە بوو، لەوکاتەدا ئاڵایەکی ڕەش دەرکەوت، منیش گوتم: ئەوە کێیە؟ گوتیان: ئەوە عەمری کوڕی عاصە لە غەزا هاتۆتەوە.**

**٢٨١٧-** عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ، يَوْمَ الْفَتْحِ وَلِوَاؤُهُ أَبْيَضُ»(٢).

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێک چوو بۆ شاری مەککە لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا، بەیداخەکەی سپی بوو.**

**٢٨١٨-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ «رَايَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانَتْ سَوْدَاءَ وَلِوَاؤُهُ أَبْيَضُ»(٣).

**واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڵایەکەی ڕەش بوو، وە بەیداخەکەی سپی بوو.**

## بابەت: پۆشینی پۆشاکی ئاوریشم لە جەنگدا

**٢٨١٩-** عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﷺ، أَنَّهَا أَخْرَجَتْ جُبَّةً مُزَرَّرَةً بِالدِّيبَاجِ فَقَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَلْبَسُ هَذِهِ إِذَا لَقِيَ الْعَدُوَّ»(٤).

---

(١) حسن. أخرجه الترمذي: ٣٢٧٣ و ٣٢٧٤.

(٢) حسن لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٥٩٢، والترمذي: ١٦٧٩، والنسائي: ٢٨٦٦.

(٣) حسن. أخرجه الترمذي: ١٦٨١.

(٤) ضعيف. أخرجه مسلم: ٢٠٦٩/١٠، وأبو داود: ٤٠٤٥.

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەگێڕێتەوە کە جوبەیەکی (عەبایەکی) هێنا نەخشەکانی بە ئاوریشم دروست کرابوو، ئنجا گوتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێک بەرەوڕووی دوژمن دەبۆوە ئا ئەوەی دەپۆشی.

٢٨٢٠- عَنْ عُمَرَ ﵁، أَنَّهُ كَانَ يَنْهَى عَنِ الْحَرِيرِ وَالدِّيبَاجِ إِلَّا مَا كَانَ هَكَذَا، ثُمَّ أَشَارَ بِإِصْبَعِهِ ثُمَّ الثَّانِيَةِ ثُمَّ الثَّالِثَةِ ثُمَّ الرَّابِعَةِ، وَقَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَانَا عَنْهُ»[١].

واتە: عومەر ﵁ دەگێڕێتەوە کە نەهی دەکرد لە پۆشینی ئاوریشمی تەنک و ئەستوور، مەگەر ئەوەندە نەبێ کە بە پەنجەکانی ئاماژەی کرد تا چوار پەنجە و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە پۆشینی ئاوریشم.

## بابەت: لەسەرنانی مێزەر لە جەنگدا

٢٨٢١- عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ «وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ، قَدْ أَرْخَى طَرَفَيْهَا بَيْنَ كَتِفَيْهِ»[٢].

واتە: جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی حورەیس لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: وەکو ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر چاوم بێت و تەماشای بکەم، مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بوو کە لکەکانی بە نێوان شانەکانیدا بەردەدایەوە.

٢٨٢٢- عَنْ جَابِرٍ ﵁، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»[٣].

واتە: جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ کاتێ چوو بۆ ناو شاری مەککە مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بوو.

## بابەت: کڕین و فرۆشتن لە جەنگ و غەزادا

٢٨٢٣- عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدٍ ﵁، قَالَ: رَأَيْتُ رَجُلًا يَسْأَلُ أَبِي عَنِ الرَّجُلِ يَغْزُو فَيَشْتَرِي وَيَبِيعُ وَيَتَّجِرُ فِي غَزْوِهِ؟ فَقَالَ لَهُ أَبِي: «كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِتَبُوكَ نَشْتَرِي وَنَبِيعُ، وَهُوَ يَرَانَا وَلَا يَنْهَانَا»[٤].

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٥٨٢٨، ومسلم: ٢٠٦٩، وأبو داود: ٤٠٤٢، والترمذي: ١٧٢١، والنسائي: ٥٣١٢.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٥٩، وأبو داود: ٤٠٧٧ مطولًا، والنسائي: ٥٣٤٣ و ٥٣٤٦.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٣٥٨، وأبو داود: ٤٠٧٦، والترمذي: ١٧٣٥، والنسائي: ٢٨٦٩ و ٥٣٤٤ و ٥٣٤٥.

(٤) ضعيف جداً.

واتە: خاریجەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پیاوێکم بینی پرسیاری لە باوکم دەکرد دەربارەی پیاوێک کە لە غەزاکردندا بێت و کڕین و فرۆشتن و بازرگانی بکات؟ باوکم پێی گوت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین لە غەزای تەبووک، جا شتمان دەکڕی و دەفرۆشت و پێغەمبەریش ﷺ ئێمەی دەبینی و ڕێگریشی لێ نەدەکردین.

## بابەت: ئامادەسازی کردن بۆ موجاهیدان و بەڕێکردنیان

**٢٨٢٤-** عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَأَنْ أُشَيِّعَ مُجَاهِدًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأَكُفَّهُ عَلَى رَحْلِهِ غَدْوَةً أَوْ رَوْحَةً، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»[١].

واتە: سەهلی کوڕی موعازی کوڕی ئەنەس لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یارمەتی موجاهیدێک بدەم و بەڕێی بکەم لە پێناو خوا، وە پاسەوانی کەلوپەلەکەی بکەم لە بەرەبەیانێک یان لە ئێوارەیەکدا، خۆشەویستترە لەلام لە دونیا و ئەوەشی کە لە دونیادا هەیە.

**٢٨٢٥-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: وَدَّعَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَسْتَوْدِعُكَ اللَّهَ الَّذِي لَا تَضِيعُ وَدَائِعُهُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان بەڕێیکردم و فەرمووی: بەو خوایەت دەسپێرم کە هەرگیز سپاردەکان زایە ناکات.

**٢٨٢٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَشْخَصَ السَّرَايَا يَقُولُ لِلشَّاخِصِ: «أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِينَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک سوپاکانی بەڕێدەکرد، بە ئەوانەی کە دەچوون لەگەڵ سوپاکە پێی دەفەرموون: دین و ئەمانەت و کۆتایی کردەوەت بە خوا دەسپێرم.

---

(١) ضعيف جداً.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٦٠٠، والترمذي: ٣٤٤٢ و ٣٤٤٣.

## بابەت: سوپاکان

٢٨٢٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لِأَكْثَمَ بْنِ الْجَوْنِ الْخُزَاعِيِّ: «يَا أَكْثَمُ، اغْزُ مَعَ غَيْرِ قَوْمِكَ يَحْسُنْ خُلُقُكَ وَتَكْرُمْ عَلَى رُفَقَائِكَ، يَا أَكْثَمُ، خَيْرُ الرُّفَقَاءِ أَرْبَعَةٌ، وَخَيْرُ السَّرَايَا أَرْبَعُمِائَةٍ، وَخَيْرُ الْجُيُوشِ أَرْبَعَةُ آلَافٍ، وَلَنْ يُغْلَبَ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا مِنْ قِلَّةٍ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەکسەمی کوڕی جەونی خوزاعی فەرموو: ئەی ئەکسەم تۆ لەگەڵ غەیری هۆزەکەی خۆت بچۆ بۆ غەزا، ئەوکات ڕەوشت جوانیت دەردەکەوێ، وە ڕێز بگرە لە هاوڕێکانت، ئەی ئەکسەم باشترینی هاوڕێیەتی ئەوەیە کە چوار هاوڕێ بن (لە گەشتدا)، وە باشترین سوپا ئەوەیە چوار سەد کەس بێ، وە باشترین لەشکر ئەوەیە کە چوار هەزار کەس بێ، وە ئەگەر بوو بە دوازدە هەزار کەس لەبەر کەمی لەشکر، ئەو لەشکرە دوازدە هەزار کەسییە تێناشکێ و دوژمن بەسەریدا زاڵ نابێ.

٢٨٢٨- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، قَالَ: «كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانُوا يَوْمَ بَدْرٍ ثَلَاثَمِائَةٍ وَبِضْعَةَ عَشَرَ، عَلَى عِدَّةِ أَصْحَابِ طَالُوتَ، مَنْ جَازَ مَعَهُ النَّهَرَ وَمَا جَازَ مَعَهُ إِلَّا مُؤْمِنٌ»[٢].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: ئێمە باسی هاوەڵانی پێغەمبەری خوامان ﷺ دەکرد کە لە ڕۆژی بەدردا سێسەد و سێزدە کەس بوون (وەک لە شوێنی دیکەدا هاتوە)، بە ئەندازەی ژمارەی هاوڕێکانی «طالوت» بوون، ئەوانەی کە لە ڕووبارەکە لەگەڵی ڕەت بوون، کە تەنها بڕوادارەکانیش لەگەڵیدا لە ڕووبارەکە ڕەت بوون.

٢٨٢٩- عَنْ لَهِيعَةَ بْنِ عُقْبَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الْوَرْدِ صَاحِبَ النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُ: «إِيَّاكُمْ وَالسَّرِيَّةَ الَّتِي إِنْ لَقِيَتْ فَرَّتْ، وَإِنْ غَنِمَتْ غَلَّتْ»[٣].

واتە: لەهیعەی کوڕی عوقبە ﷺ دەڵێ: گوێم لە ئەبو وەردی هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوو، دەیگوت: خۆتان بەدووربگرن لە سوپایەک کە ترسنۆک بێ و لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەدا پشت هەڵبکات، یان ئەگەر غەنیمەتی دەستکەوت خیانەتی پێبکات.

---

(١) ضعيف جداً. لكن شطره الثاني : «خَيْرُ الرُّفَقَاءِ...» صحيح من وجه آخر.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٥٧، والترمذي: ١٥٩٨.

(٣) ضعيف.

## بابەت: خواردن لە قاپ و قاچاخی هاوبەشدانەراندا

٢٨٣٠- عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هُلْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ طَعَامِ النَّصَارَى فَقَالَ: «لَا يَخْتَلِجَنَّ فِي صَدْرِكَ طَعَامٌ ضَارَعْتَ فِيهِ نَصْرَانِيَّةً»[1].

واتە: قەبیصەی کوڕی هولب لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: دەربارەی خواردنی نەصرانییەکان پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: با هیچ گومان لە دڵتدا دروست نەبێ لە خواردنێکدا کە بە هی نەصرانییەکان دەچێ.

٢٨٣١- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ رُوَيْمٍ اللَّخْمِيِّ، عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ ﷺ - قَالَ وَلَقِيَهُ وَكَلَّمَهُ - قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلْتُهُ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُدُورُ الْمُشْرِكِينَ نَطْبُخُ فِيهَا؟ قَالَ «لَا تَطْبُخُوا فِيهَا». قُلْتُ: فَإِنِ احْتَجْنَا إِلَيْهَا فَلَمْ نَجِدْ مِنْهَا بُدًّا؟ قَالَ: «فَارْحَضُوهَا رَحْضًا حَسَنًا، ثُمَّ اطْبُخُوا وَكُلُوا»[2].

واتە: عورووەی کوڕی ڕوەیمی لەخمیی دەگێڕێتەوە لە ئەبو سەعلەبەی خوشەنیی ﷺ: کە پێی گەیشتووەو قسەی لەگەڵدا کردوە و گوتوویەتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارم لێی کرد گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە مەنجەڵ و قاپ و قاچاخی هاوبەشدانەران چێشت دروست بکەین؟ فەرمووی: نەخێر چێشتی تێدا دروست مەکەن، گوتم: ئەی ئەگەر پێویستمان بو و هیچی ترمان دەستنەکەوت؟ فەرمووی: بە جوانترین شێوە بیشۆن، پاشان شیوی تێڕا لێ بنێن و بیخۆن.

## بابەت: داوای هاوکاریکردن لە هاوبەشدانەران

٢٨٣٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّا لَا نَسْتَعِينُ بِمُشْرِكٍ»[3].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێمە داوای یارمەتی لە کەسی هاوبەشدانەر ناکەین.

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٣٧٨٤، والترمذي: ١٥٦٥.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨١٧، وأبو داود: ٢٧٣٢، والترمذي: ١٥٥٨.

## بابەت: فێڵ و پیلان لە جەنگدا

٢٨٣٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْحَرْبُ خَدْعَةٌ»(١).

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جەنگ بریتیە لە فێڵ و پیلانی جەنگی.

٢٨٣٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْحَرْبُ خَدْعَةٌ»(٢).

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جەنگ بریتیە لە فێڵ و پیلانی جەنگی.

## بابەت: جەنگاوەری و بەرخۆدان و حوكمی كەل و پەلی كوژراو بۆ موجاهید

٢٨٣٥- عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ يُقْسِمُ: «لَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ فِي هَؤُلَاءِ الرَّهْطِ السِّتَّةِ يَوْمَ بَدْرٍ» ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ﴿١٩﴾﴾ الحج، إِلَى قَوْلِهِ ﴿ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾﴾ الحج «فِي حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَعُبَيْدَةَ بْنِ الْحَارِثِ، وَعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَالْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ اخْتَصَمُوا فِي الْحُجَجِ يَوْمَ بَدْرٍ»(٣).

واتە: قەیسی كوڕی عوباد ﵁ دەڵێ: گوێم لە ئەبو زەڕ بوو سوێندی دەخوارد ئەو ئایەتە لەسەر ئەو كۆمەڵە شەش كەسییە دابەزی لە ڕۆژی بەدردا: ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ﴿١٩﴾﴾ الحج، واتە: ئەمانە دوو كۆمەڵی دژ بە یەكن دەمەقاڵێ و كێشەیانە دەربارەی پەروەردگاریان، تاوەكو گەیشتە: ﴿ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾﴾ الحج، واتە: سوتێنەر. لەسەر حەمزەی كوڕی عەبدولموتەلیب و عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب و عوبەیدەی كوڕی حاریس و عوتبەی كوڕی ڕەبیعە و شەیبەی كوڕی ڕەبیعە و وەلیدی كوڕی عوتبە دابەزی كە لە ڕۆژی بەدردا لەگەڵ بێبڕوایان بە كێشە هاتن بۆ بەرگری كردن لە ئیسلام.

---

(١) صحيح متواتر.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٦٦، ومسلم: ٣٠٣٣.

٢٨٣٦- عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: «بَارَزْتُ رَجُلًا فَقَتَلْتُهُ، فَنَفَّلَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سَلَبَهُ»[١].

واتە: ئیاسی کوڕی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: لەگەڵ پیاوێک بەرانبەر بووم لە جەنگداو کوشتم، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ کەل و پەلی کوژراوەکەی دا بە من.

٢٨٣٧- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَفَّلَهُ سَلَبَ قَتِيلٍ قَتَلَهُ يَوْمَ حُنَيْنٍ»[٢].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کەل و پەلی ئەو کوژراوەی پێداوە کە لە غەزای حونەین کوشتوویەتی.

٢٨٣٨- عَنْ ابْنِ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَتَلَ فَلَهُ السَّلَبُ»[٣].

واتە: ئیبنو سەمورەی کوڕی جوندەب لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک (لە جەنگدا) کەسێک بکوژێ، ئەوە کەل و پەلی ئەو کوژراوە بۆ خۆیەتی.

## بابەت: هێرشکردن بەشەو لە جەنگداو کوژرانی ژن و منداڵ

٢٨٣٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنَا الصَّعْبُ بْنُ جَثَّامَةَ، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ، عَنْ أَهْلِ الدَّارِ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يُبَيَّتُونَ، فَيُصَابُ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ قَالَ: «هُمْ مِنْهُمْ»[٤].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: صەعبی کوڕی جەسامە بۆی گێڕاینەوەو، گوتی: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی شوێنی ئەو موشریکانەی کە شەو لە جەنگدا بەسەریان دادەرێت و ژن و منداڵیان بەردەکەون (بە هەڵە نەک بە ئەنقەست)، فەرمووی: ژن و منداڵەکانیشیان لەوانن.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٥١، ومسلم: ١٧٥٤، وأبو داود: ٢٦٥٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٤٢، ومسلم: ١٧٥١، وأبو داود: ٢٧١٧، والترمذي: ١٥٦٢.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠١٢ و ٣٠١٣، ومسلم: ١٧٤٥، وأبو داود: ٢٦٧٢، والترمذي: ١٥٧٠.




**٢٨٤٠- عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: «غَزَوْنَا مَعَ أَبِي بَكْرٍ هَوَازِنَ، عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَتَيْنَا مَاءً لِبَنِي فَزَارَةَ فَعَرَّسْنَا حَتَّى إِذَا كَانَ عِنْدَ الصُّبْحِ شَنَنَّاهَا عَلَيْهِمْ غَارَةً، فَأَتَيْنَا أَهْلَ مَاءٍ فَبَيَّتْنَاهُمْ، فَقَتَلْنَاهُمْ تِسْعَةً أَوْ سَبْعَةَ أَبْيَاتٍ»[١].**

**واتە: ئیاسی کوڕی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لە شەڕێکدا لەگەڵ ئەبو بەکر ڕۆیشتین بۆ غەزای، هەوازین جا هاتینە سەر ئاو و کانیاوەکانی بەنو فەزارە و شەو لەوێ بارگەمان خست، هەتا کاتی بەرەبەیان، ئنجا لە ناکاو لە هەموو لایەکەوە بەسەرمانداندان و کەوتینە سەریان، هاتینە سەر خەڵکی کە بە شەو بەسەرمانداندان و شەڕ و کوشتارمان لەگەڵیاندا کرد کە نۆ یان حەوت ماڵ بوون.**

**٢٨٤١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، رَأَى امْرَأَةً مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ الطَّرِيقِ «فَنَهَى عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ، وَالصِّبْيَانِ»[٢].**

**واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بینی کە ژنێک لەسەر ڕێگایەکدا کوژراوە، بۆیە ڕێگری کرد لە کوشتنی ژن و منداڵ (لە جەنگدا مادام جەنگاوەر نەبن).**

**٢٨٤٢- عَنْ حَنْظَلَةَ الْكَاتِبِ ﷺ، قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَمَرَرْنَا عَلَى امْرَأَةٍ مَقْتُولَةٍ، قَدِ اجْتَمَعَ عَلَيْهَا النَّاسُ، فَأَفْرَجُوا لَهُ، فَقَالَ: «مَا كَانَتْ هَذِهِ تُقَاتِلُ فِيمَنْ يُقَاتِلُ» ثُمَّ قَالَ لِرَجُلٍ: «انْطَلِقْ إِلَى خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ، فَقُلْ لَهُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُكَ، يَقُولُ: «لَا تَقْتُلَنَّ ذُرِّيَّةً، وَلَا عَسِيفًا»[٣].**

**واتە: حەنزەڵەی کاتیب ﷺ دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە غەزا بووین، جا بەلای ئافرەتێکی کوژراودا تێپەڕ بووین کە خەڵک لە دەوری کۆببوونەوە، جا ڕێگایان چۆڵ کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئنجا فەرمووی: ئەوە نەدەبوو لەگەڵ ئەوانە بکوژرێ کە دەبێ بکوژرێن (واتە: نەدەبوو بکوژرابایە مادام جەنگاوەر نیە)، پاشان**

---

(١) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٥٩٦ و ٢٦٣٨، وانظر مسلم: ١٧٥٥.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠١٤، ومسلم: ١٧٤٤، وأبو داود: ٢٦٦٨، والترمذي: ١٥٦٩.

(٣) صحيح لغيره. أخرجه البخاري: ٣٠١٤، ومسلم: ١٧٤٤، وأبو داود: ٢٦٦٨، والترمذي: ١٥٦٩.

بە پیاوێکی فەرموو: بچۆ بۆلای خالیدی کوڕی وەلید و پێی بڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت پێدەکات کە ژن و منداڵ و کرێگرتە نەکوژی (مادام جەنگاوەر نەبن و تەنها خزمەتکاربن).

٢٨٤٢م- حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الْمُرَقِّعِ، عَنْ جَدِّهِ رَبَاحِ بْنِ الرَّبِيعِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ قَالَ أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ: يُخْطِئُ الثَّوْرِيُّ فِيهِ[1].

واتە: بەم سەنەدەش ئەم فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: سوتاندنی خاکی دوژمن

٢٨٤٣- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى قَرْيَةٍ يُقَالُ لَهَا أُبْنَى فَقَالَ: «ائْتِ أُبْنَى صَبَاحًا، ثُمَّ حَرِّقْ»[2].

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارد بۆ گوندێک کە پێی دەڵێن: ئوبنا، ئنجا فەرمووی: بەرەبەیان بەسەر ئوبنادا بدە و پاشان گوندەکە بسوتێنە.

تێبینی: ئەم فەرموودە لاواز (ضعيف)ـەو، ڕاست نیە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوترابێ.

٢٨٤٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ «حَرَّقَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ، وَقَطَعَ، وَهِيَ الْبُوَيْرَةُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً ﴿٥﴾ ﴾ الحشر» الْآيَةَ[3].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ خورماکانی «بنو النضير»ی بڕیەوەو سوتاندنی، ئەو شوێنەی کە دارخورماکانی لێبوون پێیان دەگوت: «البويرة»، ئنجا خوا ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً ﴿٥﴾ ﴾ الحشر، واتە: ئەوەی بڕیتان لە دارخورما یا لێی گەڕان بە وەستاوی.

---

(١) صحيح لغيره. أخرجه أبو داود: ٢٦٦٩.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٦١٦.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٠٣١، ومسلم: ١٧٤٦، وأبو داود: ٢٦١٥، والترمذي: ١٥٥٢ و ٣٣٠٠.

٢٨٤٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «حَرَّقَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَقَطَعَ» وَفِيهِ يَقُولُ شَاعِرُهُمْ:

فَهَانَ عَلَى سَرَاةِ بَنِي لُؤَيٍّ... حَرِيقٌ بِالْبُوَيْرَةِ مُسْتَطِيرُ[١].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دارخورماكانی «بنو النضیر»ی بڕیەوەو سوتاندنی، لەوبارەوەیە شاعیر دەڵێ:

سەرانی بەنی لوئەی تووشی سەرشۆڕی هاتن ... بەهۆی ئەو ئاگرەی لە «البويرة» كەوتەوەو پرش و بڵاوبوو

## بابەت: فیدیە دانی دیل (گۆڕینەوەی دیل بە دیل)

٢٨٤٦- عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ أَبِي بَكْرٍ هَوَازِنَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَفَّلَنِي جَارِيَةً مِنْ بَنِي فَزَارَةَ مِنْ أَجْمَلِ الْعَرَبِ، عَلَيْهَا قَشْعٌ لَهَا، فَمَا كَشَفْتُ لَهَا عَنْ ثَوْبٍ، حَتَّى أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ، فَلَقِيَنِي النَّبِيُّ ﷺ فِي السُّوقِ، فَقَالَ: «لِلَّهِ أَبُوكَ هَبْهَا لِي» فَوَهَبْتُهَا لَهُ، فَبَعَثَ بِهَا، فَفَادَى بِهَا أُسَارَى مِنْ أُسَارَى الْمُسْلِمِينَ كَانُوا بِمَكَّةَ»[٢].

واتە: ئیباسی كوڕی سەلەمەی كوڕی ئەكوەع لە باوكییەوە ﷺ دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لەگەڵ ئەبو بەكر ڕۆشتم بۆ غەزای هەوازین، جا كچێكی پێدام لە كچەكانی بەنو فەزارە كە لە جوانترینی عەرەب بوو، كەوڵەیەكی كۆنی لەبەردا بوو، منیش پۆشاكم لەبەر دانەنا تاكو هێنامەوە مەدینە، ئنجا بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتم لە بازاڕ، ئەویش فەرمووی: ڕەحمەت لە باوكت ئەو كچە بدە بە من، منیش بەخشیمە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش ناردی دیل بە دیلی پێكرد لەگەڵ ئەو دیلە مسوڵمانانەی كە لە مەككە بوون.

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٤٦/٣١. وانظر الحديث (٢٨٤٤).

(٢) حسن. أخرجه مسلم: ١٧٥٥، وأبو داود: ٢٦٩٧.

## بابەت: شتێک بکەوێتە لای دوژمن دواتر بەردەستی مسوڵمانان بکەوێت

٢٨٤٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ، قَالَ: «ذَهَبَتْ فَرَسٌ لَهُ، فَأَخَذَهَا الْعَدُوُّ، فَظَهَرَ عَلَيْهِمُ الْمُسْلِمُونَ، فَرُدَّ عَلَيْهِ فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: وَأَبَقَ عَبْدٌ لَهُ، فَلَحِقَ بِالرُّومِ، فَظَهَرَ عَلَيْهِمُ الْمُسْلِمُونَ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر  دەڵێ: ئەسپێکی هەبووە و ئەسپەکەی ڕۆشتووە و دوژمن گرتوویەتیەوە، دواتر بەردەستی مسوڵمانان کەوتووە، ئنجا بۆی گەڕێنراوەتەوە کە ئەوە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو، ڕاوی دەڵێ: کۆیلەیەکی هەڵاتبو و ڕۆشتبوو بۆ ڕۆم ئنجا مسوڵمانان دیتیانەوە و بۆیان گێڕایەوە لەسەردەمی خالیدی کوڕی وەلیددا لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

## بابەت: خیانەتکردن لە دەستکەوتی جەنگی

٢٨٤٨- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ، قَالَ تُوُفِّيَ رَجُلٌ مِنْ أَشْجَعَ بِخَيْبَرَ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ» فَأَنْكَرَ النَّاسُ ذَلِكَ، وَتَغَيَّرَتْ لَهُ وُجُوهُهُمْ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ قَالَ: «إِنَّ صَاحِبَكُمْ غَلَّ فِي سَبِيلِ اللَّهِ» قَالَ زَيْدٌ: فَالْتَمَسُوا فِي مَتَاعِهِ، فَإِذَا خَرَزَاتٌ مِنْ خَرَزِ يَهُودَ، مَا تُسَاوِي دِرْهَمَيْنِ[2].

واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی  دەڵێ: پیاوێک لە ئەشجەعییەکان لە خەیبەر مرد، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن، خەڵکەکەش سەریان سوڕما و ڕەنگی ڕوخساریان گۆڕا، جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ ئەوەی بینی فەرمووی: هاوڕێکەتان خیانەتی لە غەنیمەت کردوە لە جیهاددا، زەید گوتی: ئەوانیش کەل و پەلەکەیان پشکنی لە پڕ دیتیان چەند مروویەکی لە مرووەکانی جوولەکە تێدا بوو، کە بەهای دوو درهەم نەدەبوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٦٧ و ٣٠٦٨ و ٣٠٦٩، وأبو داود: ٢٦٩٨ و ٢٦٩٩.

(٢) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٧١٠ مطولًا، والنسائي: ١٩٥٩.

٢٨٤٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ، قَالَ: كَانَ عَلَى ثَقَلِ النَّبِيِّ ﷺ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ كِرْكِرَةُ فَمَاتَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هُوَ فِي النَّارِ» فَذَهَبُوا يَنْظُرُونَ، فَوَجَدُوا عَلَيْهِ كِسَاءً أَوْ عَبَاءَةً، قَدْ غَلَّهَا[١].

واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەڵێ: پیاوێک کە ناوی کیرکیرە بوو لەسەر کەل و پەلەکانی پێغەمبەر ﷺ بوو، ئنجا ئەو کابرایە مرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەو کەسە لەناو ئاگردایە، جا ڕۆیشتن تەماشایان کرد بینیان کراسێک یان عەبایەکی دزی بوو.

٢٨٥٠- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ، إِلَى جَنْبِ بَعِيرٍ مِنَ الْمَقَاسِمِ، ثُمَّ تَنَاوَلَ شَيْئًا مِنَ الْبَعِيرِ، فَأَخَذَ مِنْهُ قَرَدَةً، يَعْنِي وَبَرَةً، فَجَعَلَ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ هَذَا مِنْ غَنَائِمِكُمْ، أَدُّوا الْخَيْطَ، وَالْمِخْيَطَ، فَمَا فَوْقَ ذَلِكَ، وَمَا دُونَ ذَلِكَ، فَإِنَّ الْغُلُولَ عَارٌ، عَلَى أَهْلِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَشَنَارٌ وَنَارٌ»[٢].

واته: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: لە غەزای حونەین پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆ کردین لە تەنیشت یان لەلای وشترێکی غەنیمەت، پاشان هەندێ تووکی لە وشترەکە کردەوە و هێنای و لەناو پەنجەکانی دانا و پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئا ئەوە بەشێکە لە غەنیمەتەکەتان، داو و دەرزیش و کەمتر یان زیاتریش لە داو و دەرزی لەگەڵ غەنیمەت بخەنەوە، چونکە خیانەت کردن بە غەنیمەت عەیبە و نەنگییە بۆ خاوەنەکەی و لە ڕۆژی دواییدا عەیبەیە و هۆی سزا دان و ئاگرە.

## بابەت: زیادە بەش

٢٨٥١- عَنْ حَبِيبِ بْنِ مَسْلَمَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «نَفَّلَ الثُّلُثَ بَعْدَ الْخُمُسِ»[٣].

واته: حەبیبی کوڕی مەسلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دوای جیاکردنەوەی پێنجیەک، سێیەکی بەشە زیادەکانی لە دەستکەوتدا دابەش دەکرد.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٠٧٤.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٧٤٨.

٢٨٥٢- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «نَفَّلَ فِي الْبَدْأَةِ الرُّبُعَ، وَفِي الرَّجْعَةِ الثُّلُثَ»[1].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ زیادە بەشی لە دەستکەوتەکانی بەو جۆرە دابەش دەکرد: ئەگەر لە سەرەتاوە پێش گەڕانەوە دابەشی بکردایە، چوارییەکی پێ دەدان، ئەگەر لە گەڕانەوەشدا دابەشی بکردایە، سێیەکی پێ دەدان.

٢٨٥٣- عَنْ عَمْرِو بْن شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: «لَا نَفَلَ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يَرُدُّ الْمُسْلِمُونَ، قَوِيُّهُمْ عَلَى ضَعِيفِهِمْ»[2].

قَالَ رَجَاءٌ: فَسَمِعْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ مُوسَى، يَقُولُ لَهُ: حَدَّثَنِي مَكْحُولٌ، عَنْ حَبِيبِ بْنِ مَسْلَمَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «نَفَّلَ فِي الْبَدْأَةِ، الرُّبُعَ، وَحِينَ قَفَلَ الثُّلُثَ» فَقَالَ عَمْرٌو: أُحَدِّثُكَ عَنْ أَبِي عَنْ جَدِّي، وَتُحَدِّثُنِي عَنْ مَكْحُولٍ»[3].

واتە: عەمرى کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیریەوە ﷺ دەڵێ: لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ زیادە بەشێک لە دەستکەوتەکان نەماوە، بەڵکو ئەوەی مسوڵمانە بە هێزەکان بە دەستی دێنن بۆ لاوازەکانیش دەگێڕدرێتەوە، (واتە: ئەگەر سوپایەک دەرچوو پێش سوپایەکی دیکە، هەردووکیان لە دەستکەوتی سوپای یەکەم بەشدارن).

(ڕەجاء) گوتی: گوێم لە سولەیمانی کوڕی موسا بوو پێی دەگوت: مەکحول لە حەبیبی کوڕی مەسلەمەوە بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای غەزا چواریەکی بە زیادە بەش دابەش دەکرد، وە ئەگەر لە گەڕانەوە دابەش بکرایە، سێیەکی بە زیادە بەش دابەش دەکرد، ئنجا عەمرِ گوتی: من لە باوکم و باپیرمەوە بۆت دەگێڕمەوە کەچی تۆ لە مەکحولەوە بۆم دەگێڕیەوە؟

---

(١) ضعيف. أخرجه الترمذي: ١٥٦١.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٧٤٨.

## بابەت: چۆنیەتی دابەشکردنی غەنیمەت

٢٨٥٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «أَسْهَمَ يَوْمَ خَيْبَرَ لِلْفَارِسِ ثَلَاثَةَ أَسْهُمٍ: لِلْفَرَسِ سَهْمَانِ، وَلِلرَّجُلِ سَهْمٌ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ غەنیمەتی دابەش کرد لە غەزای خەیبەر، بۆ سوار سێ بەشی پێدەدا، بۆ ئەسپ دوو بەش، بۆ پیاو بەشێک.

## بابەت: کۆیلەو ئافرەت کە بەشداری دەکەن لەگەڵ مسوڵمانان

٢٨٥٥- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ مُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ عُمَيْرًا، مَوْلَى آبِي اللَّحْمِ، - قَالَ وَكِيعٌ: كَانَ لَا يَأْكُلُ اللَّحْمَ - قَالَ: «غَزَوْتُ مَعَ مَوْلَايَ، يَوْمَ خَيْبَرَ، وَأَنَا مَمْلُوكٌ، فَلَمْ يَقْسِمْ لِي مِنَ الْغَنِيمَةِ، وَأُعْطِيتُ، مِنْ خُرْثِيِّ الْمَتَاعِ سَيْفًا، وَكُنْتُ أَجُرُّهُ إِذَا تَقَلَّدْتُهُ»[2].

واتە: موحەممەدی کوڕی زەیدی کوڕی موهاجیری کوڕی قونفوز ﷺ دەڵێ: گوێم لە عومەیری کۆیلەی ئابی لەحم بوو - وەکیع گوتی: گۆشتی نەدەخوارد- کە گوتی: لەگەڵ گەورەکەم ڕۆشتم بۆ غەزای خەیبەر، منیش کۆیلە بووم، بۆیە هیچ بەشێکیان لە غەنیمەت بۆ دانەنام و هەندێک کەل و پەلی ناوماڵیان پێدام، شمشێرێکیشیان پێدام کە (لەبەر بچووکی تەمەن یان کورتی قەد و باڵام) کاتێک لە شان، یان لە ملم دەکرد بە دوای خۆمدا ڕامدەکێشا.

٢٨٥٦- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ الْأَنْصَارِيَّةِ ﷺ، قَالَتْ: «غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَبْعَ غَزَوَاتٍ، أَخْلُفُهُمْ فِي رِحَالِهِمْ، وَأَصْنَعُ لَهُمُ الطَّعَامَ، وَأُدَاوِي الْجَرْحَى، وَأَقُومُ عَلَى الْمَرْضَى»[3].

واتە: ئوممو عەتیەی ئەنصاڕیی ﷺ دەڵێ: لە حەوت غەزا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی غەزا بووم، لەلای بارگە و بنەکەیان دەمامەوە و خواردنم بۆ دروست دەکردن و بریندارەکانم تیمار دەکردن و ئاگام لە نەخۆشەکان دەبوو.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٨٦٣ و ٤٢٢٨، ومسلم: ١٧٦٢، وأبو داود: ٢٧٣٣، والترمذي: ١٥٥٤.

(٢) حسن. أخرجه أبو داود: ٢٧٣٠، والترمذي: ١٥٥٧.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨١٢.

## بابەت: وەسیەت و ڕاسپاردەکانی پێشەوا

**٢٨٥٧-** عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ ﷺ، قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَرِيَّةٍ فَقَالَ: «سِيرُوا بِاسْمِ اللَّهِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، وَلَا تَمْثُلُوا، وَلَا تَغْدِرُوا، وَلَا تَغُلُّوا، وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا»[١].

واتە: صەفوانی کوڕی عەسسال ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سوپایەکدا ناردینی، جا فەرمووی: بە ناوی خوا و لە پێناوی خوا بەڕێ بکەون، جەنگ لەگەڵ ئەوانە بکەن کە بێبڕوان، وە جەستەی کوژراوەکانیان مەشێوێنن، وە پەیمان هەڵمەوەشێننەوە و غەدر مەکەن و خیانەت بە دەستکەوتی جەنگی مەکەن و منداڵ مەکوژن.

**٢٨٥٨-** عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَمَّرَ رَجُلًا عَلَى سَرِيَّةٍ، أَوْصَاهُ فِي خَاصَّةِ نَفْسِهِ، بِتَقْوَى اللَّهِ، وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا، فَقَالَ: «اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، اغْزُوا وَلَا تَغْدِرُوا، وَلَا تَغُلُّوا، وَلَا تَمْثُلُوا، وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا، وَإِذَا أَنْتَ لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَادْعُهُمْ إِلَى إِحْدَى ثَلَاثِ خِلَالٍ: أَوْ خِصَالٍ، فَأَيَّتُهُنَّ أَجَابُوكَ إِلَيْهَا، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، وَكُفَّ عَنْهُمْ، ادْعُهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ، فَإِنْ أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ، وَكُفَّ عَنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ، مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ، وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ، أَنَّ لَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ، وَأَنَّ عَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ، وَإِنْ أَبَوْا، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ، يَجْرِي عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللَّهِ، الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، وَلَا يَكُونُ لَهُمْ فِي الْفَيْءِ، وَالْغَنِيمَةِ شَيْءٌ، إِلَّا أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا، أَنْ يَدْخُلُوا فِي الْإِسْلَامِ، فَسَلْهُمْ إِعْطَاءَ الْجِزْيَةِ، فَإِنْ فَعَلُوا، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا، فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ عَلَيْهِمْ، وَقَاتِلْهُمْ، وَإِنْ حَاصَرْتَ حِصْنًا، فَأَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ اللَّهِ، وَذِمَّةَ نَبِيِّكَ، فَلَا تَجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّةَ اللَّهِ، وَلَا ذِمَّةَ نَبِيِّكَ، وَلَكِنِ اجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّتَكَ، وَذِمَّةَ أَبِيكَ، وَذِمَّةَ أَصْحَابِكَ، فَإِنَّكُمْ إِنْ تُخْفِرُوا ذِمَّتَكُمْ، وَذِمَّةَ آبَائِكُمْ، أَهْوَنُ عَلَيْكُمْ مِنْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اللَّهِ، وَذِمَّةَ رَسُولِهِ، وَإِنْ حَاصَرْتَ حِصْنًا، فَأَرَادُوكَ أَنْ يَنْزِلُوا عَلَى حُكْمِ اللَّهِ، فَلَا تُنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ، وَلَكِنْ أَنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِكَ، فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي أَتُصِيبُ فِيهِمْ حُكْمَ اللَّهِ، أَمْ لَا» قَالَ عَلْقَمَةُ: فَحَدَّثْتُ بِهِ مُقَاتِلَ بْنَ حَيَّانَ، فَقَالَ: حَدَّثَنِي مُسْلِمُ بْنُ هَيْصَمٍ، عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ مُقَرِّنٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ ذَلِكَ[٢].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٣١، وأبو داود: ٢٦١٢ و ٢٦١٣، والترمذي: ١٤٠٨ و ١٦١٧.

واتە: ئیبنو بوڕەیدە لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر کەسێکی بکردبایە فەرماندە بەسەر سوپایەکەوە، وەسیەتی لێ دەکرد کە خودی خۆی پارێزکار بێت و لەگەڵ مسوڵمانانیدا باش بێ، ئنجا دەیفەرموو: بە ناوی خواو لە پێناوی خوادا بجەنگن و غەزا بکەن، بجەنگن لەگەڵ ئەوانەی کە بێبڕوان، غەزا بکەن و پەیمان مەشکێنن و خیانەت مەکەن لە غەنیمەت و جەستەی کوژراوان مەشێوێنن و منداڵ مەکوژن، وە هەرکات بە دوژمنەکەت گەشتی لە هاوبەشدانەرەکان، سێ خاڵیان بخە بەردەم یەکیان هەڵبژێرن جا کامیان هەڵبژارد وازیان لێ بێنە و لێیان وەرگرە: بانگیان بکە بۆ ئیسلام، جا ئەگەر وەڵامیان دایەوە، لێیان وەربگرە و وازیان لێ بێنە، پاشان داوایان لێبکە کە بێنە وڵاتی کۆچەران و وڵاتی خۆیان بەجێ بێڵن، هەواڵیشیان پێبدە ئەگەر ئەوە بکەن، هەرچی بۆ کۆچەران هەیە بۆ ئەوانیش هەیە و هەرچی لەسەر کۆچەرییانیشە لەسەر ئەوانیش دەبێ، خۆ ئەگەر ئەوەیان قبووڵ نەکرد، پێیان بڵێ کە ئەوانیش وەکو مسوڵمانە دەشتەکییەکانن هەمان ئەو بڕیارەی خوایان بەسەردا جێبەجێ دەکرێ کە بەسەر بڕواداراندا جێبەجێ دەکرێ، وە لە دەستکەوتی جەنگی هیچ بەشێکیان نابێ مەگەر بێن و لەگەڵ موجاهیدە مسوڵمانەکان بچنە جەنگ، جا ئەگەر ئیسلامیان وەرنەگرت داوای سەرانەیان لێبکە، جا ئەگەر کردیان لێیان وەرگرە و وازیان لێ بێنە، جا ئەگەر نەیانکرد، پشت بە خوا ببەستە و داوای یارمەتی لێبکە و لەگەڵیاندا بجەنگە، جا ئەگەر قەڵایەکت گەمارۆدا و داوایان لێ کردی کە بیانخەیە ژێر پەیمانی خواو پێغەمبەرەکەت ﷺ، مەیانخە ژێر پەیمانی خوا و پێغەمبەرەکەت ﷺ بەڵکو بیانخە ژێر پەیمانی خۆت و باوانت و هاوەڵەکانت چونکە ئێوە ئەگەر پەیمانی خۆتان بشکێنن لەسەرتان ئاسانتر و سوکترە لەوەی کە پەیمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ بشکێنن، وە ئەگەر قەڵایەکیشت گەمارۆدا و داوایان لێکردی کە خۆیان تەسلیم دەکەن لەسەر بڕیاری خوا، ئەوا لەسەر بڕیاری خوا تەسلیم بوونەکەیان وەرمەگرە بەڵکو لەسەر حوکم و بڕیاردانی خۆت تەسلیم بوونەکەیان وەربگرە، چونکە تۆ نازانی کە ئەو بڕیارەی دەری دەکەی ئاخۆ پێکاوتە و وەکو بڕیاری خوایە دەربارەیان یان نا. عەلقەمە گوتی: (ئەو فەرموودەیەم) بۆ موقاتیلی کوڕی حەییانم گێڕایەوە، ئەویش گوتی: موسلیمی کوڕی هەیصەم لە نوعمانی کوڕی موقەرینەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە هەمان شێوەی ئەو فەرموودەیە بۆی گێڕاومەوە.

## بابەت: گوێڕایەڵی پێشەوا (ئیمام)

٢٨٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَطَاعَنِي، فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ عَصَانِي، فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ أَطَاعَ الْإِمَامَ، فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ عَصَى الْإِمَامَ، فَقَدْ عَصَانِي»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک گوێڕایەڵی من بکات، فەرمانبەرداری خوای کردوە، هەر کەسێکیش سەرپێچی فەرمانەکانم بکات، سەرپێچی خوای کردوە، وە هەر کەسێک گوێڕایەڵی پێشەوایەکەی بکات ئەوا گوێڕایەڵی منی کردوە، هەر کەسێکیش سەرپێچی پێشەوایەکەی بکات، ئەوە سەرپێچی منی کردوە.

٢٨٦٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا، وَإِنِ اسْتُعْمِلَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ، كَأَنَّ رَأْسَهُ زَبِيبَةٌ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری پێشەواکەتان بکەن، ئەگەر پێشەواکەتان بەندەیەکی حەبەشیش بێت و سەریشی وەکو مێوژ گچکە و ڕەش بێت.

٢٨٦١- عَنْ يَحْيَى بْنِ الْحُصَيْنِ، عَنْ جَدَّتِهِ أُمِّ الْحُصَيْنِ، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُول اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ مُجَدَّعٌ، فَاسْمَعُوا لَهُ وَأَطِيعُوا، مَا قَادَكُمْ بِكِتَابِ اللَّهِ»[3].

واتە: یەحیای کوڕی حوصەین لە ئوممو حوصەینی داپیریەوە دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی کرا بە فەرمانڕەواتان، گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بکەن مادام بەپێی کتێبی خوا فەرمانڕەواییتان بەسەردا دەکات، جا با ئەو بەندەیە ئەندامی لوت، یان گوێچکەشی بڕابێت.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٩٥٧، ومسلم: ١٨٣٥، والنسائي: ٤١٩٣.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٦٩٣ و ٦٩٦ و ٧١٤٢.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٢٩٨، والترمذي: ١٧٠٦، والنسائي: ٤١٩٢.




٢٨٦٢- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ «أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى الرَّبَذَةِ، وَقَدْ أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَإِذَا عَبْدٌ يَؤُمُّهُمْ، فَقِيلَ هَذَا أَبُو ذَرٍّ، فَذَهَبَ يَتَأَخَّرُ، فَقَالَ أَبُو ذَرٍّ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ أَنْ أَسْمَعَ وَأُطِيعَ، وَإِنْ كَانَ عَبْدًا حَبَشِيًّا مُجَدَّعَ الْأَطْرَافِ»(١).

واتە: لە ئەبو زەڕەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە کاتێک چووەتە «الربذة» (شوێنێکە لە نزیک مەدینە) لەو دەمەدا قامەت کراوە بۆ نوێژ، لەوکاتەشدا بەندەیەک پێشنوێژی بۆ کردوون، جا گوترا: ئەوە ئەبو زەڕە، (بەندەکەش) ویستی بێتە دواوە تاکو ئەبو زەڕ پێش بکەوێ، ئەبو زەڕیش گوتی: خۆشەویستترین کەسم (کە پێغەمبەرە ﷺ) وەسیەتی پێ کردووم کە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بکەم، ئەگەر فەرمانڕەواکەم بەندەیەکی حەبەشی چوار پەل بڕاویش بێ.

## بابەت: گوێڕایەڵی نیە لە سەرپێچی کردنی خوادا

٢٨٦٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ عَلْقَمَةَ بْنَ مُجَزِّزٍ عَلَى بَعْثٍ، وَأَنَا فِيهِمْ. فَلَمَّا انْتَهَى إِلَى رَأْسِ غَزَاتِهِ، أَوْ كَانَ بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، اسْتَأْذَنَتْهُ طَائِفَةٌ مِنَ الْجَيْشِ، فَأَذِنَ لَهُمْ، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ حُذَافَةَ بْنِ قَيْسٍ السَّهْمِيَّ، فَكُنْتُ فِيمَنْ غَزَا مَعَهُ، فَلَمَّا كَانَ بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، أَوْقَدَ الْقَوْمُ نَارًا لِيَصْطَلُوا، أَوْ لِيَصْنَعُوا عَلَيْهَا صَنِيعًا، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَكَانَتْ فِيهِ دُعَابَةٌ: أَلَيْسَ لِي عَلَيْكُمُ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: فَمَا أَنَا بِآمِرِكُمْ بِشَيْءٍ، إِلَّا صَنَعْتُمُوهُ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنِّي أَعْزِمُ عَلَيْكُمْ، إِلَّا تَوَاثَبْتُمْ فِي هَذِهِ النَّارِ، فَقَامَ نَاسٌ، فَتَحَجَّزُوا، فَلَمَّا ظَنَّ أَنَّهُمْ وَاثِبُونَ، قَالَ: أَمْسِكُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، فَإِنَّمَا كُنْتُ أَمْزَحُ مَعَكُمْ، فَلَمَّا قَدِمْنَا ذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَمَرَكُمْ مِنْهُمْ بِمَعْصِيَةِ اللَّهِ، فَلَا تُطِيعُوهُ»(٢).

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ عەلقەمەی کوڕی موجەزیزی وەکو وەزیر نارد، منیشیان لەگەڵدا بووم، جا کاتێک گەیشتە کۆتایی جەنگەکەی، یان لە ڕێگادا بوو هەندێک لە لەشکرەکەی مۆڵەتیان لێ خواست، ئنجا مۆڵەتی دان و عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی کوڕی قەیسی سەهمی کرد بە فەرماندەیان، من یەکێک بووم لەوانەی کە لەگەڵیدا غەزایان کردوە، جا کاتێک کە

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٣٧.

(٢) حسن.

هەر لە ڕێگادا بوون، خەڵکەکە ئاگرێکیان کردەوە بۆ ئەوەی خۆی پێ گەرم بکەنەوە، یان خواردنێکی پێ ساز بکەن، جا عەبدوڵڵا کە کەمێک سوعبەت چی بوو، گوتی: ئایا لەسەرتان نیە کە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریم بکەن؟ گوتیان: بەڵێ لەسەرمان پێویستە، گوتی: کەواتە هەرچی فەرمانتان پێبکەم دەیکەن؟ گوتیان: بەڵێ، گوتی: من فەرمانتان پێدەکەم کە دەبێ خۆتان هەڵدەنە ناو ئەو ئاگرە، جا هەندێکیان هەڵسان و خۆیان ئامادەکرد کە خۆیان فڕێبدەنە ناو ئاگرەکە، جا کاتێک گومانی کرد کە دەچنە ناوی گوتی: ئاگاتان لە خۆتان بێ، وا نەکەن، تەنها سوعبەتێک بوو لەگەڵتانم کرد، جا کاتێک هاتینەوە ئەوەیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر یەکێک لە فەرماندەکانتان ئەگەر فەرمانی پێکردن بە شتێک کە سەرپێچی خوای تێدابوو، ئەوە فەرمانبەرداری مەکەن.

**٢٨٦٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ الطَّاعَةُ، فِيمَا أَحَبَّ أَوْ كَرِهَ، إِلَّا أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَلَا سَمْعَ وَلَا طَاعَةَ»[1].**

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مرۆڤی مسوڵمان لەسەری واجبە کە فەرمانبەردار بێ لە هەر شتێک پێی خۆش بێ، یان پێی ناخۆش بێ، مەگەر ئەوە نەبێ کە فەرمانی پێ بکرێ بە تاوانکردن، جا ئەگەر فەرمانی سەرپێچی و تاوانی پێکرا، ئەوە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری دروست نیە و نامێنێ.

**٢٨٦٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «سَيَلِي أُمُورَكُمْ بَعْدِي، رِجَالٌ يُطْفِئُونَ السُّنَّةَ، وَيَعْمَلُونَ بِالْبِدْعَةِ، وَيُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ عَنْ مَوَاقِيتِهَا» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَدْرَكْتُهُمْ، كَيْفَ أَفْعَلُ؟ قَالَ: «تَسْأَلُنِي يَا ابْنَ أُمِّ عَبْدٍ كَيْفَ تَفْعَلُ؟ لَا طَاعَةَ، لِمَنْ عَصَى اللَّهَ»[2].**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە دوای من کاروبارتان دەکەوێتە دەست کەسانێک کە ڕێبازی من دەکوژێنێتەوە (کاری پێناکەن)، کار بە بیدعە و ڕێچکەی ناشەرعی دەکەن و نوێژەکان دوا دەخات و لەکاتی خۆیاندا نایانکات، (دەڵێ:) منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٥٥، ومسلم: ١٨٣٩، وأبو داود: ٢٦٢٦، والترمذي: ١٧٠٧، والنسائي: ٤٢٠٦.

(٢) صحيح.

گەیشتمە ئەو کەسانە چی بکەم؟ فەرمووی: ئەی کوڕی دایکی عەبد لێم دەپرسی چی بکەی؟! هیچ فەرمانبەرداریيەکت لە ئەستۆدا نیە بۆ کەسێک کە سەرپێچی خوای گەورە بکات.

## بابەت: پەیمان و بەڵێن دان

**٢٨٦٦-** عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، قَالَ: «بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ، وَالْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ، وَالْأَثَرَةِ عَلَيْنَا، وَأَنْ لَا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ، وَأَنْ نَقُولَ بِالْحَقِّ حَيْثُمَا كُنَّا، لَا نَخَافُ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لَائِمٍ»[1].

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ دەڵێ: بەڵێنمان‌دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری لە ناخۆشی و خۆشیدا و لە ئاسانی و گرانیدا و لەسەر ئەوەشی کە ئەگەر کەسێک بەسەرمانەوە هەڵبژێردرێ، وە لەسەر ئەوەش کە کێشە لەگەڵ کەسی شایستە نەکەین لە کار وباردا، وە هەمیشە ڕاست و هەق بڵێین لە هەر کوێیەک بین و لە پێناوی خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسین.

**٢٨٦٧-** عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ سَبْعَةً أَوْ ثَمَانِيَةً أَوْ تِسْعَةً، فَقَالَ: «أَلَا تُبَايِعُونَ رَسُولَ اللَّهِ» فَبَسَطْنَا أَيْدِيَنَا، فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا قَدْ بَايَعْنَاكَ، فَعَلَامَ نُبَايِعُكَ؟ فَقَالَ: «أَنْ تَعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُوا الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، وَتَسْمَعُوا وَتُطِيعُوا، وَأَسَرَّ كَلِمَةً خُفْيَةً، وَلَا تَسْأَلُوا النَّاسَ شَيْئًا» قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ بَعْضَ أُولَئِكَ النَّفَرِ، يَسْقُطُ سَوْطُهُ، فَلَا يَسْأَلُ أَحَدًا، يُنَاوِلُهُ إِيَّاهُ[2].

واتە: عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیی ﷺ دەڵێ: ئێمە حەوت یان هەشت یان نۆ کەس لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین، ئەویش فەرمووی: ئایا بەیعەت و بەڵێن نادەن بە پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ ئێمەش دەستمان درێژ کرد (بۆ بەیعەت دان)، یەکێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان ئێمە بەیعەتمان پێتداوە جا لەسەر چی بەیعەتت پێ بدەین؟ ئەویش فەرمووی: لەسەر ئەوە کە تەنها خودا بپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٧٠٥٦ و ٧١٩٩، ومسلم بإثر: ١٨٤٠، والنسائي: ٤١٤٩_٤١٥٣.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٠٤٣، وأبو داود: ١٦٤٢، والنسائي: ٤٦٠.

نەدەن، وە پێنج نوێژە فەرزەکە بکەن، وە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بکەن و داوای هیچ شتێک لە خەڵک مەکەن، ڕاوی دەڵێ: هەندێک لەو ئامادەبووانەم بینی دواتر کە ئەگەر قەمچییەکی لێ کەوتبایە خوارەوە بە هیچ کەسی نەدەگوت پێی بداتەوە.

**٢٨٦٨-** عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: بَايَعْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فَقَالَ: «فِيمَا اسْتَطَعْتُمْ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: ئێمە بەیعەتمان بە پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەر گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری، ئنجا فەرمووی: بە گوێرەی تواناتان (پێیانەوە پابەندبن).

**٢٨٦٩-** عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ عَبْدٌ، فَبَايَعَ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى الْهِجْرَةِ، وَلَمْ يَشْعُرِ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّهُ عَبْدٌ، فَجَاءَ سَيِّدُهُ يُرِيدُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «بِعْنِيهِ» فَاشْتَرَاهُ بِعَبْدَيْنِ أَسْوَدَيْنِ، ثُمَّ لَمْ يُبَايِعْ أَحَدًا بَعْدَ ذَلِكَ، حَتَّى يَسْأَلَهُ أَعَبْدٌ هُوَ؟[٢].

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: کۆیلەیەک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەیعەتی پێدا لەسەر کۆچ کردن، پێغەمبەر ﷺ هەستی پێنەکرد کە کۆیلەیە، ئنجا گەورەی کۆیلەکە هات و داوای کردەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: پێمی بفرۆشە، جا بە دوو کۆیلەی ڕەش کڕی، پاش ئەوە بەیعەتی لە کەس وەرنەدەگرت تاکو لێی نەپرسیبا ئاخۆ کۆیلەیە، یان نا؟

**٢٨٧٠-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ، وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِالْفَلَاةِ، يَمْنَعُهُ مِنَ ابْنِ السَّبِيلِ، وَرَجُلٌ بَايَعَ رَجُلًا، بِسِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ، فَحَلَفَ بِاللَّهِ، لَأَخَذَهَا بِكَذَا وَكَذَا، فَصَدَّقَهُ، وَهُوَ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ، وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا، لَا يُبَايِعُهُ، إِلَّا لِدُنْيَا، فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا، وَفَى لَهُ، وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ مِنْهَا، لَمْ يَفِ لَهُ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کۆمەڵ هەن لە ڕۆژی دواییدا خوا قسەیان لەگەڵدا ناکات و ڕوویان تێناکات و لە تاوان پاکیان ناکاتەوە و سزایەکی بە ئێشیشیان بۆ هەیە: پیاوێک کە لە بیابانێک خاوەنی ئاوی زیادەیە و

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح. أخرجه مسلم: ١٦٠٢، وأبو داود: ٣٣٥٨، والترمذي: ١٢٣٩ و ١٥٩٦، والنسائي: ٤١٨٤ و ٤٦٢١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٣٥٨، ومسلم: ١٠٨، وأبو داود: ٣٤٧٤ و ٣٤٧٥، والترمذي: ١٥٩٥، والنسائي مختصراً: ٤٤٦٢.

ڕێبوارانی لێ بێ بەش دەكات، وە پیاوێک كە شتومەک دوای ئێوارە بە كەسێک دەفرۆشێ و سوێندی لەسەر دەخوات بە ئەوەندە و ئەوەندە كڕیویەتی و ئەویش بڕوای پێدەكات و ڕاستیش ناكات، وە كەسێكیش كە پەیمان بە پێشەوایەک بدات كە تەنها لەبەر بەرژەوەندی دونیایی پەیمانی پێدەدات، جا ئەگەر دنیای بۆ مسۆگەر كرد، وەفا بە پەیمانەكە دەكات، خۆ ئەگەر دونیای پێنەدا، وەفادار نابێ بە پەیمانەكە.

**٢٨٧١-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَتْ تَسُوسُهُمْ أَنْبِيَاؤُهُمْ، كُلَّمَا ذَهَبَ نَبِيٌّ، خَلَفَهُ نَبِيٌّ، وَأَنَّهُ لَيْسَ كَائِنٌ بَعْدِي، نَبِيٌّ فِيكُمْ» قَالُوا: فَمَا يَكُونُ؟ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ «تكُونُ خُلَفَاءُ، فَتَكْثُرُ» قَالُوا: فَكَيْفَ نَصْنَعُ؟ قَالَ: «أَوْفُوا بِبَيْعَةِ، الْأَوَّلِ، فَالْأَوَّلِ، أَدُّوا الَّذِي عَلَيْكُمْ، فَسَيَسْأَلُهُمُ اللَّهُ ﷻ، عَنِ الَّذِي عَلَيْهِمْ»[1].

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان جوولەكە لە سەردەمی خۆیاندا پێغەمبەرەكانیان سەرپەرشتییان دەكردن و كار وباریان بەڕێوە دەبردن، جا هەر پێغەمبەرێک وەفاتی بكردبایە یەكسەر پێغەمبەرێكی تر جێگای دەگرتەوە، بەڵام بێگومان لە دوای من هیچ پێغەمبەرێكی تر نایەت بۆ ناوتان، گوتیان: ئەی چۆن و چی دەبێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: جێنشینی (خەلیفە) زۆر لە دوای من دەبن، گوتیان: چۆن هەڵسوكەوت بكەین؟ فەرمووی: بەیعەتی یەک لە دوای یەكیان جێبەجێ بكەن (كامەشیان یەكەم جار بوو بە خەلیفە ئەوە بەیعەتی ئەو ببەنە سەر)، وە ئەوەی لەسەرتانە جێبەجێی بكەن، ئنجا خوا لەوان دەپرسێتەوە بەرانبەر بە بەرپرسیارییەتییەكەیان.

**٢٨٧٢-** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُنْصَبُ لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُقَالُ: هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانٍ»[2].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک غەدر و پەیمان شكێنی بكات، لە ڕۆژی دواییدا ئاڵایەكی بۆ هەڵدەدرێ و دەگوترێ: ئەوە پەیمانی فڵانەی شكاندووە.

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣٤٥٥، ومسلم: ١٨٤٢.

(٢) صحيح متواتر. أخرجه البخاري: ٣١٨٦ و ٣١٨٧، ومسلم: ١٧٣٦ و ١٧٣٧.




٢٨٧٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا إِنَّهُ يُنْصَبُ، لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، بِقَدْرِ غَدْرَتِهِ»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە ڕۆژی دواییدا هەر کەسێک پەیمان شکێنی کردبێ بە ئەندازەی پەیمان شکێنییەکەی ئاڵای بۆ هەڵدەدرێ.

## بابەت: بەیعەت و پەیمان بەستنی ژنان

٢٨٧٤- عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتَ رُقَيْقَةَ ﷺ، تَقُولُ: جِئْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي نِسْوَةٍ نُبَايِعُهُ، فَقَالَ لَنَا: «فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ وَأَطَقْتُنَّ، إِنِّي لَا أُصَافِحُ النِّسَاءَ»[2].

واتە: ئومەیمەی کچی ڕوقەیقە ﷺ دەڵێ: لەگەڵ کۆمەڵێک ئافرەت هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بەیعەتی پێبدەین، جا فەرمووی: بەیعەتتان لێ وەردەگرم بە پێی توانا و هێزی خۆتان، وە بێگومان من لەگەڵ ئافرەت (ی بێگانە) دەست ناخەمە ناو دەست (واتە: تەنها بە قسەکردن بەیعەتی لێ وەرگرتوون).

٢٨٧٥- عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَتِ الْمُؤْمِنَاتُ إِذَا هَاجَرْنَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يُمْتَحَنَّ بِقَوْلِ اللَّهِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَنْ أَقَرَّ بِهَا مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ، فَقَدْ أَقَرَّ بِالْمِحْنَةِ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، إِذَا أَقْرَرْنَ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِنَّ، قَالَ لَهُنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «انْطَلِقْنَ، فَقَدْ بَايَعْتُكُنَّ» لَا وَاللَّهِ مَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ، غَيْرَ أَنَّهُ، يُبَايِعُهُنَّ بِالْكَلَامِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: وَاللَّهِ مَا أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى النِّسَاءِ إِلَّا مَا أَمَرَهُ اللَّهُ، وَلَا مَسَّتْ كَفُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَفَّ امْرَأَةٍ قَطُّ، وَكَانَ يَقُولُ لَهُنَّ، إِذَا أَخَذَ عَلَيْهِنَّ قَدْ بَايَعْتُكُنَّ، كَلَامًا[3].

---

(١) صحيح. أخرجه مسلم: ١٧٣٨، والترمذي: ٢١٩١ ضمن حديث طويل.

(٢) صحيح. أخرجه الترمذي: ١٥٩٧، والنسائي: ٤١٨١.

(٣) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٨٩١، ومسلم: ١٨٦٦، وأبو داود: ٢٩٤١، والترمذي: ٣٣٠٦.

واتە: عورووەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە، عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: ئەگەر ئافرەتە بڕوادارەکان کۆچیان بکردبایە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، بەو ئایەتە تاقی دەکردنەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ ﴿١٢﴾﴾ الممتحنة، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێک ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆلات کە پەیمانت لەگەڵ ببەستن. تا کۆتایی ئایەتەکە، عائیشە گوتی: جا هەر ئافرەتێکی بڕوادار دانی نابایە بەو تاقی کردنەوەیە، بێگومان داننانی بوو بە تاقیکردنەوە لەسەر هەر بەڵێنێکی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کە ئەوان بە قسە و گوفتار دانیاننا بەو پەیمانە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی دەفەرموو: بڕۆن (بەدەم کارتانەوە) ئەوە بەیعەتم لێتان وەرگرت، نەخێر سوێند بە خوا دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بەر دەستی هیچ ئافرەتێک نەکەوتووە هیچ کات (ئافرەتی بێگانە) جگە لەوەی کە بە قسەکردن پەیمانی لێ وەردەگرتن، عائیشە گوتی: سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ هیچیتری لە ئافرەتان وەرنەدەگرت لە پەیان جگە لەوەی کە خوا فەرمانی پێکردبوو، وە هەرگیز دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بەر دەستی هیچ ئافرەتێک نەکەوتووە، وە کاتێک بەیعەتی لێ وەردەگرتن پێیانی دەفەرموو: ئەوە پەیمانم لێتان وەرگرت بە قسەکردن (نەک بە تەوقەکردن).

## بابەت: گرەوکردن لەسەر پێشبڕکێ

٢٨٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَدْخَلَ فَرَسًا بَيْنَ فَرَسَيْنِ، وَهُوَ لَا يَأْمَنُ أَنْ يَسْبِقَ، فَلَيْسَ بِقِمَارٍ، وَمَنْ أَدْخَلَ فَرَسًا بَيْنَ فَرَسَيْنِ، وَهُوَ يَأْمَنُ أَنْ يَسْبِقَ، فَهُوَ قِمَارٌ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ئەسپەکەی بخاتە نێوانی دوو ئەسپ و دڵنیا نەبێ لەوەی کەس پێشی ناکەوێتەوە، ئەوە دروستە و قومار نیە، بەڵام ئەگەر کەسی سێیەم ئەسپەکەی خستە نێوان دوو ئەسپەوە و دڵنیاش بوو کەس پێشی ناکەوێتەوە ئەوە قومارە (دروست نیە).

٢٨٧٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: «ضَمَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْخَيْلَ، فَكَانَ يُرْسِلُ الَّتِي ضُمِّرَتْ مِنَ الْحَفْيَاءِ إِلَى ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ، وَالَّتِي لَمْ تُضَمَّرْ مِنْ ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ»[2].

---

(١) ضعيف. أخرجه أبو داود: ٢٥٧٩ و ٢٥٨٠.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٤٢٠، ومسلم: ١٨٧٠، وأبو داود: ٢٥٧٥_٢٥٧٧، والترمذي: ١٦٩٩، والنسائي: ٣٥٨٣ و ٣٥٨٤.




واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕکێی کرد بەو ئەسپانەی کە لە «الحفیاء» دابەستە کرابوون تاکو «ثنیة الوداع»، وە ئەوانەشی کە دابەستە نەکرابوون لە «ثنیة الوداع» هەتاکو مزگەوتی «بنو زریق».

**٢٨٧٨**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا سَبْقَ، إِلَّا فِي خُفٍّ أَوْ حَافِرٍ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێشبڕکێ تەنها بەوانە دەکرێ کە خوفیان هەیە (وەکو: وشتر) یان سمیان هەیە (وەکو: ئەسپ).

## بابەت: قەدەغەکردنی قورئان بردن بۆ وڵاتی دوژمنان

**٢٨٧٩**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، نَهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ، مَخَافَةَ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ»[٢].

واتە: ئین عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردوە لە کاتی گەشتکردندا قورئان ببرێ بۆ خاکی دوژمن، لە ترسی ئەوەی بکەوێتە دەستی دوژمن (ئەوانیش سووکایەتی پێ بکەن).

**٢٨٨٠**- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ «يَنْهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ، إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ، مَخَافَةَ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ»[٣].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە نەهی کردوە لە کاتی گەشتکردندا قورئان ببرێ بۆ خاکی دوژمن لە ترسی ئەوەی کە بکەوێتە دەستی دوژمن (و سووکایەتی پێ بکەن).

---

(١) صحيح. أخرجه أبو داود: ٢٥٧٤، والترمذي: ١٦٩٩، والنسائي: ٣٥٨٥_٣٥٨٧ و ٣٥٨٩.

(٢) صحيح. أخرجه البخاري: ٢٩٩٠، ومسلم: ١٨٦٩، وأبو داود: ٢٦١٠.

(٣) صحيح. أخرجه مسلم: ١٨٦٩/٩٣.

## بابەت: دابەشکردنی پێنج یەک

٢٨٨١- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، أَنَّ جُبَيْرَ بْنَ مُطْعِمٍ ﷺ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ جَاءَ هُوَ وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، يُكَلِّمَانِهِ فِيمَا قَسَمَ مِنْ خُمُسِ خَيْبَرَ، لِبَنِي هَاشِمٍ، وَبَنِي الْمُطَّلِبِ، فَقَالَا: قَسَمْتَ لِإِخْوَانِنَا بَنِي هَاشِمٍ، وَبَنِي الْمُطَّلِبِ، وَقَرَابَتُنَا وَاحِدَةٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا أَرَى بَنِي هَاشِمٍ، وَبَنِي الْمُطَّلِبِ شَيْئًا وَاحِدًا»[1].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب دەگێڕێتەوە، جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە کە ئەو لەگەڵ عوسمانی کوڕی عەففان چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە قسەی لەگەڵ بکەن دەربارەی بەشە پێنجیەکی خەیبەر کە بەشی بۆ بەنو هاشم و بەنو موتەڵیب دانابوو، جا گوتیان: بەشت بۆ براکانمان داناوە لە بەنو هاشم و بەنو موتەڵیب لە کاتێکدا وەکو ئێمە لێتەوە نزیکن، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من وای دەبینم کە بەنو هاشم و بەنو موتەڵیب هەردووکیان یەکن.

* * *

---

(١) صحيح. أخرجه البخاري: ٣١٤٠ و ٣٥٠٢ و ٤٢٢٩، وأبو داود: ٢٩٧٨_٢٩٨٠، والنسائي: ٤١٣٦.

## نـــاوەڕۆک

